# بیرەوەرییەکانی
# مارشاڵ ژۆکۆڤ



وەرگێڕانی

شێخ عەلی شێخ محەمەد بەننا

سەرچاوە:  مذكرات زوكوف
اشرف على نشرها و أختيارها:  عمر أبو النصر
"تصدر عن مكتب (عمر أبو النصر) للتأليف و الترجمة و الصحافة" -شارع سورية - بيروت

ناوی کتێب: بیرەوەرییەکانی مارشاڵ زۆکۆف
نووسینی: مارشاڵ زۆکۆف
وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: عومەر ئەبو نەسر
وەرگێڕانی: شێخ عەلی شێخ محەمەد بەننا
بابەت: یاداشت
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: بەختیار ئەورەحمان
هەڵەچنی: مهاباد رەحیم
تیراژ:  ١٠٠٠ دانە
نرخ: ٥٠٠٠ دینار
ژمارەی سپاردن:
چاپخانەی: دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی یەکەم: ساڵی ٢٠٠٩
کوردستان -سلێمانی

www.serdam.net
www.serdam.info
www.serdam.org

# بیرەوەرییەکانی مارشاڵ زۆکۆف

وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: عومەر ئەبو نەسر
وەرگێڕانی: شێخ عەلی شێخ محەمەد بەننا

سلێمانی - ٢٠٠٩

# ناوەڕۆك



مارشاڵ زۆکۆف

# بیرەوەرییەکانی مارشاڵ زۆکۆف

زۆکۆف لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا، کە لە ژێر ناونیشانی(بیرەوەری و تێڕوانینندا) نووسیویەتی.. پێشکەشی سەربازانی سۆڤێتی کردووە.. مارشاڵی وڵاتی سۆڤێتی زۆکۆف. لە ماوەی ژیانی کەسایەتی خۆیدا زۆرێکی زۆر لە ترسناکترین ڕووداو و بەسەرهاتی سەرنج ڕاکێشی ئەوزەمانە دەگێڕێتەوەو پێشکەشمانی دەکات ئەو ڕووداوانەش لە جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دەستپێدەکات، تاسەرهەڵدانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ئیشتراکی لە ڕووسیادا و پێکهێنان و دروستبوونی سوپای سووری سۆڤێتی لەناو ئەو گێژاوی خەبات و تێکۆشانەی گەلی ڕووسیا لە دژی(قەیسەر) و سەرمایەداری. وخۆتێهەڵقورتانی چەکدارانەی بیانییەکان.

جەنگی نێوان ڕووسیا و یابان لە ساڵی ١٩٣٩داو پاشان سەرهەڵدان و دەستپێکردنی جەنگی دووەمی جیهانی و ئەو هەوڵ و خەباتە بەردەوام و خۆڕاگرییەی(ستالین) بۆ لەناوبردنی نازییەکان و سەرکەوتن بەسەریاندا، لە سەرەتای دوژمنایەتیکردنیان بەسەر ئەورووپادا. و ئەو ڕێکەوتننامەیەی لە نێوان ئەڵمانیای نازی و یەکێتــی سۆڤێتی ئەوسادا مۆرکرا. کە ڕووسیاو ئەڵمانیا، هیچ یەکێکیان هێرش و دەستدرێژی نەکەنەسەر ئەوی تریان.

هێرشکردنی ئەڵمانیا بۆسەر ڕووسیا و تێکشکانی هێزە چەکدارەکانی ڕووسیا لە سەرەتای جەنگدا. و ئەو بەرگری و بەرەنگاربوونەوە قارەمانییەی گەلی سۆڤێتی بەرامبەر داگیرکەران. هەروەها ئەو سەرکەوتنە مێژووییەی کەلە(ستالینگراد)دا بەدەستهێنرا. کە بووە سەرەتای ڕمان و ڕاوەدوونانی هێزە فاشیستی و نازییەکان بۆ ناوخاك و زێدی خۆیان. تێکشکان و لەناوچوونیان لە(بەرلین)ی پایتەختدا...

(زۆکۆف) بۆ یەکەمجارە، لەم بیرەوەرییانەیدا زۆرێکی زۆر بەڵگەنامەو دانووسانی

نەهێنی و ڕووداوی ترسناك و ئەو کۆبوونەوەو چاو پێکەوتنننانە ئاشکرا دەکات کە لە پشت پەردەوە لە بەڕێوەبەرێتییە هەواڵگرەکان و لە نێوان کەسایەتییە سیاسی و سەربازییەکاندا کراون. هەروەها –زۆکۆف- ئەو شایەتییە مێژووییە دەدات و ئەو هۆیانە هەڵدەسەنگێنێت کە بوونەتە تێکشکان و سەرکەوتنی یەکێتی شوورەوی ئەوساو، ئەو دەورەی(ستالین) کە لەو هەموو کارانەدا هەیبووەو پێی هەستاوە، هەروەها بیروڕای خۆی بەرامبەر زۆرێکی زۆری کەسایەتی و پیاوانی دیار و بەناوبانگی وەك.. (ئەبزنهاوەر) و (دیگۆل) و (خرۆشۆف) و (چەرچل) و (مۆنتیگۆمری) و (هیتلەر) دەردەبڕێت...

عومەر ئەبو نەسر
سەرپەرشتیی بڵاوبوونەوەو هەڵبژاردنی کردووە
شێخ عەلی شێخ محەمەدی بەننا
کردویێتی بە کوردی

# پێشەکی ئەم بیرەوەرییانە

ئەم پەڕتووکە کراوە بە دووبەشەوە، بەشی یەکەمی تەرخانکراوە بە باسی ئەو سێ کەسەی فەرمانڕەواو بەرپرس و کاربەدەست بوون و لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانییدا فەرمانڕەوا بوون.. ئەوانیش:-

ستالین و هیتلەر وتشرشل (چەرچڵ) بوون ئەغفلت.. (ڕۆزفلت)یش دواجارهات و پێش کۆتایی هێنانی جەنگ دەستی لە کارکێشایەوە.

بەشی دووەمی ئەم پەڕتووکە، تایبەتە بەبیرەوەرییەکانی مارشاڵ زۆکۆف یان(جۆکۆف)ی سووپاسالاری گەورەی ڕووس کە توانی بەربەستی هێرشی هێزەکانی ئەڵمانیا لە(ستالینگراد)دا بکات و بیانشکێنێت و ڕاوەدووی ئەڵمانەکان بنێت و(بەرلین) داگیربکات، پێش ئەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان بگەنە ئەوێ.

زۆکۆف لەم بیرەوەرییانەدا وێنەیەکی ورد و ڕاستی ئەو جەنگ و هەڵمەتانەمان بۆ باس دەکات کە لە بەرەی ڕووسیادا ڕوویداوە و خۆی لەگەڵ سەرکردەکانی تردا کردوویەتی و هاوبەشبووە. شێوەو وێنەکانی ڕاستگۆیانە باسی دەکات و هیچ پڕوپاگەندەشی تیادانییە و هیچ درۆوناڕاستییەکی لە گێڕانەوەی بەسەر هاتەکاندا بۆ مێژوو تێدانییە.

بەگشتی زۆکۆف یەکێکە لە مەزنترین سەرلەشکرانی سەردەم و زۆر لەوانیش دووربینترو لە زۆربەیان زیاتر بە تواناو خۆڕاگرتر بوو دەیزانی لە کوێدا هێرش بکات و لەکوێدا بەرگری بکات.

لە بیرەوەرییەکانیدا وێنەیەکی ڕاست و تەواوی جەنگ لە بەرەکانی ڕووسیادا پێشکەش خوێندەواران دەکات، کە بە پێنووسی سووپاسالارێکی ڕووسی نوسرابێت و خۆی هاوبەشی تێدا کردووە و لەسەر کەوتوانیش بووە...!!

# وتەیەک

## بەپێنووسی شێخ عەلی

جەنگی دووەمی جیهانی ڕووداوێك نییە كە بە چەند نووسینێك و بە چەند باسێك و بە چەند پەڕاوێك باسی ڕووداوەكانی تەواوبێت و ئیتر دوای ئەوە بیربچێتەوە.

ئەوە جەنگێك بوو سەرانسەری جیهانی گرتبۆوە و تەنها پەیوەست نەبوو بە شوێن و ولاٌتێكەوە و بەس بەڵكو جیهانی بوو.. ئەوانەشی لەو جەنگەدا هاوبەشیان كردوو كوژران هەروابە ئاسانی لەناو مێژووی میللەتەكەیاندا فەرامۆش ناكرێن و كەس و ژمارەی كوژراوانیش بیر ناچێتەوە و مێژوو لە دووتوێی لاپەڕەو بەسەرهاتەكانیدا تۆماریان دەكات.

ئەوەی باش بێت بەباشی باسیان دەكات و ئەوەشی خراپ.. بەخراپی ناویان دەبات.

هەندێ لەو كەسانەی هاوبەشی ئەو ڕووداوە مێژووییەیان كردووە، ڕەنگەلای ئێمە و لای ئەوانەی ماڵ و نیشتمانیان وێران بووە بەخراپی باسیان بكەن و نەفرەتیان لێ بكەن.

بەلاٌم ڕەنگە لای میللەتی خۆیان شانازی و ئافەرینیان بكەن و بەقارەمان و خەباتگێڕ و تێكۆشەری ولاٌتی خۆیانیان بزانن و لە مێژووی ولاٌتەكانیاندا بەگەورەو پێشمەرگەیان دابنێن. كەسانی وەك هیتلەر و ستالین و چەرچڵ و هەزارەها سەركردەی تری سەربازی. كە هۆكاری هەڵگیرسانی ئەو جەنگەبوون و ئاگر خۆشكەری بوون و هەر ئەوانیش فەرمانڕەوا و فەرماندەبوون بۆ هێرشكردن و داگیركردن و وێرانكردن. لای زۆركەس پیاوی خراپ و خوێن ڕێژن.

بەڵام ڕەنگە لەناو میللەت و خاك و نیشتمانی خۆیاندا وانەبن و جێگای شانازی و پیاهەڵدان بن.

ئەوە مێژوو خۆی حیسابی باشەو خراپەی ئەوانە دەكات و ڕەوڕەوەكـەی هەرلەڕۆیشتن و لە پێش چووندایە.

بۆ مێژووش و بۆ بیرنەچوونەوە كەسانی زۆرهەن هاوبەشی ئەو ڕووداوانەیان كردووە و بەچاوی خۆیان كاروبەسەرهاتەكانیان بینیوە و بۆ هاوكاری لەگەڵ مێژوودا.. ئەو بیرەوەری و بەسەرهاتانە دەگێڕنەوە و لە دووتوێی پەڕاوەكاندا دەیاننووسن. وەك ئەوانەی كە لەم پەڕتووكەدا ناویان هاتووە كەئەوانیش (هیولومنجن)ی تەرجومانی چەرچڵ سەرۆك وەزیرانی بەریتانی و(ئەلبرت شبیر)ی وەزیری ئەڵمانی زەمانی هیتلەر و(هانز لینغ)ی نۆكەرو كارگوزاری هیتلەر كەماوەی بیست ساڵ زیاتر خزمەتی هیتلەری كردو(فروێناند زاوربروخ)ی نەشتەرگەری بەناوبانگی ئەڵمانی... و شارلزمورنی و جۆن دانینیووت. و مارشاڵ (زۆكۆف)ی ڕووسی كە خۆی هاوبەشی زۆربەی شەڕەكانی ناو ڕووسیاو دەرەوەی یەكێتی سۆڤیەتی(ئەوسا)ی كردووەو لە سەربازێكی ئاساییەوە گەیشتە جەنەراڵ و مارشاڵ و یاریدەدەری ستالین و هاوبەشی شەڕی(ستالینگراد) و مۆسكۆی كردووە. ئەو ستالینگرادەی ماوەی(١٨٠) ڕۆژ میللەتەكەی بەرگرییان لێكردوو نەیانهێشت ئەڵمانییەكان بچیتە ناوشارەكەوە. زۆكۆف یەكەم ژەنەراڵی ڕووس بوو دوای تێكشكاندنی هێزەكانی ئەڵمانیای هیتلەری توانی بچێتە ناو بەرلینەوەو بەرلین داگیر بكات، بەڵام ئەوەی ئێمە لێرەدا دەمانەوێت گوێیان لێ بگرین و بزانین چییان كردووەو چییان لێبەسەرهاتووە ئەوانەن كە لە سەرەوە ناوی هەندێكشیانمان نووسی و گوێ لە خۆیان دەگرین كە لەو مێژووەدا زیندوبوون و هاوكاری ئەو ڕووداوە گەورەیەیان كردووە و بەچاوی خۆیان دیویانە و پێنووسی خۆیان بەڕاست و دروست بۆمان دەگێڕنەوە و مێژووش لەناو لاپەڕەكانی خۆیدا ئەو بیرەوەرییانە تۆماردەكات. لەم دەورو زەمانەشدا میدیاكان لەسەر شاشەی سینەما و تەلەفزیۆن و گۆڤار و ڕۆژنامەكاندا بەشێوەی جۆراوجۆر ئەو جەنگەو شێوەی ئەو كەسانە پیشان دەدرێت. جەنگ هەر جەنگەو كوشتن و وێرانكردنی

لێدەکەوێتەوەو ئاسەواری دڵتەزێن لە دوای خۆی جێدێڵێت.

بەڵام هەندێك جەنگ هەیە، یەخەت دەگرێت و میللەتان ناتوانن خۆیانی لێهەڵدێرن و پشتی تێ بکەن. بەناچاری دەبێت بەرامبەری لێ بکەیت و بەرگری لە خاك و میللەت بکەیت. لەم حاڵەتەشدا نەوە تازەپێگەیشتووەکان زیاتر دەبنە تێشووی ئەو جەنگانەو لەو پێناوەدا شەهیددەبن و تیادەچن.

بەم جۆرە چەکداری و بەرگرییە دەوترێت شۆڕش و بەکەسانی شەڕکەریش دەوترێت پێشمەرگە. ئەوەی لە ستالینگراد و مۆسکۆدا کرا، ڕاپەڕین بوو دژی داگیرکەر و ئەوەی کوژران پێشمەرگە و شەهیدی خاك و نیشتمانی خۆیان بوون، و ئێستاش ئەو چەکە قەناسەی کە پێشمەرگەی ڕووس(فاسیلی زایستف) بەرگری لە ستالینگراد پێکرد... لە مۆزەخانەی مۆسکۆدا بۆ مێژوو لەو شوێنەدا دانراوە...

لە جەنگی دووەمی جیهانیدا زیاد لە(٥٠) پەنجا ملیۆن کەس کوژراوە و تیاداچوون، ئەوە باس لە بریندار و پەککەوتە مەکە. لەو وڵاتانەی ئەو جەنگە گرتییەوە وێرانکردن و ئاوارەبوون گشت لایەکی ئەم جیهانەی گرتەوە.. جەنگ شتێك نییە هیچ لایەنێك بڵێت من سەرکەوتووم تیایدا.

نابێت ئەو ئازایی و لە خۆبوردنەی گەلی ڕووسیا ڕەچاوبکەین لە بەرگری و خۆفیدایی کردنیان لەئاست دوژمن و داگیرکەراندا لە پێناو خاك و نیشتمان و داراییاندا. بەتایبەت لە ژێر ئەو فشارە زۆرو دڕندانەییەی ئەڵمانییە نازییەکان کە دەیانکردە سەر ئەو گەلە هەژار و ڕووت و برسییە. بە تایبەت ئەو قارەمانی و خۆڕاگرییەی خەڵکانی شاری(برست) و شاری مۆسکۆو لینینگراد نواندیان و داستانێکی قارەمانی و ئازایی و خۆڕاگریان لەئاست دوژمندا نواند. ئەو شەڕی پارتیزانی و پێشمەرگە پەتییەی لاوان و کچ و کوڕانی ڕووسیا نواندیان لەسەرانسەری وڵاتدا و خۆفیدایی کردنیان لە پێناوی خاك و نیشتماندا هەرگیز بیرناچێتەوەو فەرامۆش ناکرێن و لە مێژووی سەروەری وڵاتەکەیاندا بە شانازییەوە باسی دەکەن.

هیتلەر لە ڕۆژی(٣٠)ی نیسان و لە کاتژمێری (١٥,٥٠) دەقیقەدا بەدەستی

خۆی(ئیفابراون)ی خێزانی و خۆی کوشت. بەوە کۆتایی بە جەنگی دووەمی جیهانی هێنرا...

منیش لە کۆتاییدا دەڵێم.. بەرێزان من لەم تەمەنەمدا هەر ئەوەندەم لەدەست دێت بە پێنووسەکەم خزمەتی گەڵ و نیشتمانی پێ بکەم. و لە کوێشدا نووکی پێنووسەکەم شکا.. دەڵێم ماڵئاوا گەل و نیشتمانەکەم، ئێوە ساغ و تەمەن درێژبن.

شێخ عەلی شێخ محەممەد
سلێمانی

# بەشی یەکەم
## سێ سەرکردەکە

**ئەوانەی هاوبەشی جەنگی دووەمی جیهانییان کردوو کاریگەرییان لە پاشەڕۆژیدا هەبوو.**
**وە دەستی باڵاشیان لە بەڕێوەچوونی جەنگدا بووە.**
**ئەوانیش:-**
**ستالین**
**هیتلەر**
**چەرچڵ**




پیاوە ئاڵۆزەکە

# (١)
# ستالین

## پیاوە ئاڵۆزەکە

ستالین چەندەها ساڵ بەر لە ئێستا کۆچی دوایی کردو مردو نەما.. لە شوێنیدا کەسانێکی تر جێگایان گرتەوە؟!!

ئەو پیاوە کێیە کە لەرووی هیتلەردا ڕاوەستاو فەرمانڕەوایی ڕووسیای بەدەستێکی پۆڵا و ئاسنین کرد. کە لەوەوپێش هیچ کەسێك بەو شێوەیە فەرمانڕەوایی ڕووسیای نەکردبوو.

(هیولومنجی) کە لە کاتی خۆیدا وەرگێڕ(تەرجومان)ی ونستون (تشرشڵ)ی سەرەك وەزیرانی ئینگلیزبووە و زۆرێکی زۆر و چەندەهاجار لەگەڵیدا-لەگەڵ ستالیندا- کۆبۆتەوە و چۆتە ناو کۆڕو دانیشتنە تایبەتییەکانیەوە. کە جگە لە نزیکترین کەسانی ئەو، کەسی تر نەیاندەتوانی لێی نزیك ببنەوە.

لەم بەشەدا نوسەری بەریتانی، لێکۆڵینەوەو تێڕوانینێکی وردی ئەو پیاوە ترسناکە دەکات.. کە ناوەکەی بەداخراوی و ئاڵۆزییەوە ماوەتەوە.

ستالین زیاد لە چەندەها ساڵ پێش ئێستا مرد... دووجار نێژراوە... جاری یەکەم لە گۆڕستانی گەورە پیاوانی ڕووسیادا بەنمایشێکی گەورەو بەشکۆ لە

گۆڕەپانی سووردا نێژرا. جاری دووەم لە گۆڕدەریان هێناو بەدزییەوە لە نزیك یەكێك لە دیوارەكانی(كرملین)ەوەنێژرا.

لە یەكێتی سۆڤێتی ئەوسادا دوای هەژدە مانگ لە مردنی ستالین(پێش دەیەها ساڵ بەر لە ئێستا) سێ كەسم بینی، یەكێك لەوسیانە پیاوێكی پیرەمێردبوو. بە ترسەوە، هەروەك ئەوەی ستالین زیندوبێتەوە و مابێت بە دەنگێكی لەرزۆكەوە وتی:"ستالین مردوو نەما... بەڵام هێشتا تارماییە قورس و ترسناكەكەی وابەسەرمانەوەیەو لە كۆڵمان نابێتەوە". سەركردەكانی حیزبی شیوعی كە لە دوای ئەو هاتن و سەركردایەتیان كرد. لەسەرووهەموویانەوە(تیكیستا خرۆشۆف) دەڵێت:"ئەو پیاوەی كە ئەو تارماییە قورس و ترسناكە درێژخایەنەی بەسەرمانەوە هەبوو، بێشك پیاوێكی ترسناك و خوێن ڕێژبوو... تاوانێكی زۆر و نارەواو كۆمەڵ كوژی خەڵكانێكی زۆری وایكرد باس ناكرێت.

لەگەڵ ئەوەشدا كە لەگەڵیدا دادەنیشتین و كۆدەبووینەوە بیروڕاو هەڵوێستەیەكی ترمان لە ئاستیدا دەردەبری.."

زۆرێكم لە سەركردەكانی ڕۆژ ئاوام دەبینی، لە كاتی كۆنگرە و كۆڕوكۆمەڵ و دەعوەتەكانی كاتی جەنگدا.

دەبینین و لێم دەبیستن مەدح و ستایشی ستالینیان دەكرد و بەنەهێنی و ئاشكرا مەراییان بۆ دەكرد و خۆیان لێدەبردە پێشەوە و ستالینیش لەلایەن خۆیەوە ئەویش ڕووپامایی بۆ دەكردن.

دەمبینی زۆر بەگەرم ئەو دەستە خوێناوییانەیان دەگوشی و تەوقەیان لەگەڵدا دەكرد.. وەك خرۆشۆف دەیوت.. هەر ئەو دەستە خوێناویانە بوون كە بوونە هۆی كوشتنی هەزارەها كەسی بێتاوان..!!.

ئەگەر منیش لە بارودۆخێكی وەك ئەوان بوومایە، منیش بێشك وەك ئەوان مەرایی و مەدح و شانازیم بۆ ئەو پیاوەدەكرد.

چونكە من لە ڕاستیدا تا ئەم دواییە هیچ شك و گومانێكم لە ڕاستی و خودی ئەو پیاوە نەبوو. تێنەگەیشتبووم ئەویش بەهۆی ئەوەی كە من وەرگێربووم و لەگەڵیدا دانەنیشتبووم تابتوانم لە نزیكەوە چاودێری بكەم و هەڵسوكەوتی بزانم و هەڵیسوڕێنم و لێی بكۆڵمەوە.

## پۆلیسی نهێنی:-

هەندێ وەڵامی ئەو مەتەڵە، ڕەنگەڵەو ئاڵۆزی و تارماییەدا بێت کەوا ستالین بە دەوری خۆیدا کێشابووی. ئەو ناوەندە دەست کردوو دروستکراوە قورس و گرانەی خەڵکی دەیبینی و هەستی پێدەکرد، هەتا پێش ئەوەی بچێتە ناو دەروازەی(کرملینە)وە کاریگەری ئەوە زۆرجارکاری دەکردە سەری گەرچی بە شێوازێکی بێ هەستانەش بێت. ئێمە و میوانە بیانییەکانیش کە دەچووین بۆلای ستالین... هەموو کاتێك داوایان لێدەکردین بەرەو دەروازەی(بورفیتسکی) بڕۆین، کە زۆرزۆر دووربوو لە بارەگاو نوسینگەکەی ستالینەوە. ئێمە بە ئۆتۆبیل بەرەو کرملین بەناو کۆمەڵێك پۆلیسدا دەڕۆیشتین. هەر کۆمەڵەیەی پێکهاتبوو لە دوو پۆلیس یان سێ پۆلیس. ئەو پۆلیسانە بەردەوام لەبەردەم سەرە ڕێگاکاندا ڕاوەستابوون، بەتەلەفۆن پەیوەندییان بە پۆلیسی سەر ڕێگاو سەرسووچەکانی ئەملاوئەولاو پێش خۆیانەوە دەکرد. ئەوانیش ڕێگای ڕۆیشتنیان بۆ چۆڵ دەکردین و ڕەتدەبووین.

ئۆتۆمبیلێکی ڕەش ماوەی پەنجا مەترێك لە پێشمانەوە بەرەو دەروازەی سەرەکی چاوساغ و ڕێنماییکەرمان بوو. هەر کە دەگەیشتینە بەر دەروازەی دەرەوەو پیایدا ڕەتدەبووین جەرەسێك بەردەوام دەستی بەلێدان دەکرد.

دەروازەکەی دەرەوە بریتیبوو لە دەرگایەکی سەر بە گومەز و لەملاوئەولای دەرگاکەوە ژووری پاسەوانەکان بوو.

یەکێك لە ئەفسەری ئاسایشەکان بە پلەی ماجۆر تەماشای ناسنامەی سایەقەکانی دەکرد و تەماشای ناو ئۆتۆمبیلەکەی دەکرد و سێ چوار نایب زابت دەست بە چەکەوە بە ئامادەباشی لە دەوروبەرییەوە ڕاوەستابوون.

زەنگەکە لە لێدان نەدەکەوت بەردەوام بوو هەتا لە دەروازەی پشکنینی دەردەچووین. لەبەردەم دەرگای چوونە ژوورەوەی هۆڵی ئەنجومەنی پیراندا

کۆمەڵێکی تری پاسەوانانی چەك بەدەست پێشوازییان لێدەکردین کە پێکهاتبوون لە ژەنەراڵێك و دووسێ ئەفسەر بە پلەی کاپتن و ژمارەیەك ئەفسەری پلەدار.

بەمەسعەد بۆ نهۆمی دووەم بە هێواشی لەگەڵ ژەنەراڵەکەدا سەریان دەخستینە سەرەوەو پاشان بەرارەوێکی بنمیچ بەرزی دوورودرێژدا دەرۆیشتین. لە هەموو سەرسووچێکدا پاسەوانێك بەچەکەوە راوەستابوو.

بێجگە لەو پاسەوانانە هیچ شتێکی تر لە رارەوەکاندا نەبوو.. چۆڵ و هۆڵ بوو، ناوخانووەکە وەك گۆرەپانەکەی دەرەوە بێدەنگی یەکی ترسناك باڵی بەسەرداکێشابوو. ئەو شوێنە یەك پارچە بۆنی دووکەڵی تووتنی رووسی رەشی لێدەهات. و ناو رارەوەکەی پرکردبوو.

رارەوەکە دەرگای گەورە گەورەی تێدابوو. دەرگاکان بە چەرمی سەوزوقاوەیی داپۆشرابوو. لە یەکێك لەو دەرگایانەوە چووینە شوقەیەکی نزیك نوسینگەکەی ستالینەوە.

لەو شوقەیەدا ژمارەیەکی کەم ئەفسەری چەکداری لێ بوو. پاسەوانی تایبەتی(ستالین) بوون.. لە سووچێکی ژوورەکەدا راوەستابوون. ئەفسەرێکیش بەپلەی جەنەراڵ بەرپرسیان بوو. بێ ئەوەی ئاماژە بە هاتنی ئێمە بکەن، بە هێواشی ئەو دەرگایە کرایەوە کە دەچوو بۆ ژووری خوێندنەوەو کۆبوونەوە.

لەوبەری ژوورەکەوە، چەند هەنگاوێکی کەم لە کتێبخانەکەوە پیاوێکی بەتەمەن بێ فیز بەپێوە راوەستابوو. دەستی راستی خستبووە سەرکەلەکەی و بە کەلەکەیدا چەماندبوویەوە.

چاکەتێکی خاکی ئاسایی لەبەردابوو. لە خوارەوە تاملی بە قۆپچە داخرابوو.. تەنها یەك مەدالیای بەسنگەوەبوو. مەدالیاکە ئەستێرەیەکی زێرین بوو کە نیشانەی قارەمانیی سۆڤێتی بوو. پانتۆڵێکی گەورەو فشی لە بەردابوو.. سەری لووتی پێڵاوەکەی داپۆشیبوو لە پیرە پیاوێکی کۆنە ساڵ دەچوو.

هەر کە چووینە ژوورەوە یەك دوو هەنگاو بەسەر فەرشە نایابەکەی ژێرپێیدا بەرەو رووومان هات. وەرگێرەکەی بە تەنیشتییەوە کەمێك دوورتر لە دوایەوە راوەستابوو.

تۆزێك خۆی چەماندەوە سەری بەلادا لارکردەوە، بێ ئەوەی یەکسەر تەماشای هیچ کەسێکمان بکات، دەستی درێژکرد یەك یەك تەوقەی لەگەڵ هەریەکەی شاندەکەماندا کرد و دەستی بە توندی گوشین. دەستی بە هێزنەبوو، ناو لەپی دەستی گەورەنەبوو.. بەڵام نەرم و نۆڵ بوو.

ستالین فەرمووی دانیشتنی لێکردین بۆ سەر ئەو کورسیانەی لە نزیك نووسینگەکەی خۆیەوە، بەدەوری مێزە درێژەکەی کۆنگرەکۆبوونەکانەوە دانرابوون.

ژوورەکە سی(٣٠) پێ درێژبوو، مێزو کورسییەکان یەك لەسەر سێی ژوورەکەی داگیرکردبوو. لەسەر مێزی نووسینگەکە سێ قوتووی خڕی لەسەر بوو.. دەیەها قەڵەم ڕەساسی تیژیان تێدابوو، لەگەڵ مەرەکەب دانێکی مەڕمەڕی گەورە و مۆمدانێکی کانزا کە لەسەر بنکەیەکی مەڕمەڕ دانرابوو.

پی مەی:

ستالین لەسەرو مێزەکەوە دانەنیشت بەڵکو ڕووبەڕوومان دانیشت و پشتی کردە ئەو دیوارەی وێنەی هەندێ گەورە پیاوانی سۆڤیاتی پیادا هەڵواسرابوو، وەك سۆفۆروفتی دوژمن و بەرهەڵستکاری ناپلیۆن و کۆنۆزوف.. ئێمەش پشتمان لەو پەنجەرانە بوو کە بەشەو بە پەردەی سپی ئاوریشم دادەپۆشرا.

لەسەر مێزەکە ژمارەیەك تەپڵەکی جگەرەو ژمارەیەك پاکەتی سەوزی جگەرە دانرابوون.. بەخەتی ئاڵتوونی ڕازابوونەوە. پاکەتە جگەرەکان جگەرەی(دۆکان) و (لۆکس) یان تێدابوو. کە لە نایابترین جگەرەی رووسی بوون.

زۆرجار ستالین خۆی لەو جگەرانەی دەکێشا. لەماوەی شەش ساڵدا من جارێك یادووجاربینیم بەسەبیلەکەی خۆی سەبیل بکێشێت ستالین لە کاتی قسەکردندا قەڵەم ڕەساسێکی بەدەستەوە دەگرت و لەسەر کاغەزێك نەخشەو شێوەی ئەندازیاری دەکێشاو دەیکرد بە ئاژەڵێکی کێوی کە بە شێوەی درندانە دەیڕوانی.

جاری واش هەبوو وێنەی تیرێکی ڕەشی درێژی دروستدەکرد لەو جۆرە تیرانەی لە نەخشە سەربازی و جەنگەکاندا بەکاردەهێنرا. دوای سەعاتێك کەمتر یا زیاتر بە پیاڵە چاو هەندێ قاشە لیمۆو چەند دەنکە چکلێتیان لەناو قاپێکی زیویندا دەگێرا.. لەم جۆرە بۆنانەدا(مەی)ی یان نەدەخواردەوە.

ستالین باڵای لە پێنج پێ و پێنج پەنجە بەرزتر نەبوو.. لەش و لارێکی بەهێز و بەتوانای هەبوو.. بەڵام ناوشان و سنگی زۆرپان نەبوو. لەوکاتی جەنگەدا تەمەنی لە شەست و چوار ساڵیدابوو..

زۆر گورج و گۆڵ و سووکەڵەبوو، لە گورج و گۆڵیدا لە پشیلەدەچوو. مووی سەری پڕو ڕەش و سپی بوو واتە خۆڵەمێشی بوو.. سمێڵەکانی گەورەو پڕبوون.. پێستی لەشی و سیمای بۆربوو.. هەر کەوێنەو سیمای ئەو ئیمپراتۆرەت دەبینی لە خۆتەوە لە ئاستیدا دەهانییەوە یەك و بچووك دەبووینەوە، وەك پیاوێکی بچوکۆلەو ئاسایت لێدەهات.

هەر کە گوێت لە دەنگیشی دەبوو، لە خۆتەوە تووشی دا خورپان و سەرسوورمان دەبوویت. دەنگەکەی شێوەو شێوازێکی تایبەتی نەبوو.. قسەکردنەکەی شێوازی جورجی پێوەدیاربوو. ئەویش تەنها لە کاتی گاڵتە پێکردندا هەستت بەو شێوازە جۆرجیە دەکرد.

لە چرکە کەمەکانی سەرەتای قسەکردنیا ستەمبوو لە ڕاستی قسەکانی ستالین بگەیت، بۆ ماوەیەك قسەکانی لە گاڵتەو پێکەنین دەچوو.

دوایی تێگەیشتم و بۆم دەرکەوت ستالین هەڵوێستە دەکات و لە بۆنەکاندا چۆنی بویستایە خۆی دەگۆڕی و هەڵوێستەی بۆ دەکرد. جاری واهەبوو لەبەردەم میوانان و ئەوانەی دەهاتن بۆ لای وا خۆی پیشان دەدا پیاوێکی بێ فیز و خۆنەویستەو لە هەمووشتێکدا قەرزاری میللەتەو جاری واش هەبوو لە بەردەم برادەر و دۆستانیدا خۆی زۆر بە گەورە و سەرکردەیەکی مەزن پیشان دەدا.

لە ماوەی شەش ساڵی ڕەبەقدا جارێك گوێم لێنەبوو بە دەنگێکی بەرز و قاقا پێ بکەنێت. جارێك نەبێت گوێم لێ بوو بەدەنگێکی بەرز قاقا پێکەنی ئەویش ئەوکاتەبوو کە مارشاڵ مۆنتۆگۆمری لە ئاهەنگێکی ناو کرملیندا گاڵتەو گەپی

لەگەڵ مۆلۆتۆفدا دەکرد.

مۆنتۆگۆمری باسی ئەو قسەوباسانەی بۆ ئەو وەزیرە مۆنەی دەرەوەی ڕووسیا دەگێڕایەوە کە گوایە ئەو کاتەی بەسەردان بۆ نیویۆرك چووە، سەردانەکەی بەڕابواردن و هەوسکردنەوە بردۆتەسەر.

ستالین بە توانجەوە، درێژەی بە نوکتەکەدا و گەورەی کرد. وات هەست دەکرد لە ناو نوکتەکەدا هەڕەشەی تێدابێت. مۆلۆتۆف بێدەنگ خۆی مت کردبوو، چونکە وایدەزانی نوکتەکانی ستالین مەبەستی لەوە.

بەڵام من بەهیچ شێوەیەك هەستم بە بێزارکردنی نێوانیان نەکرد، وهیچ یەکێکیان مەبەستی ڕابواردن و بێزارکردنی ئەوی تری نەبوو، بەڵام لە ئاهەنگێکی تردا بینیم سیمای(مایسکی) گۆڕاو زەرد هەڵگەڕا وەك ڕەنگی مردووی لێ هات کاتێك ستالین پێکەکەی بە ژیانی ئەو بەرز کردەوە و ئاماژەی بۆ ئەوەکرد کە(مایسکی) شاعیرێکی دبلوماسییە.. لەوەوپێش لە پۆستی دبلۆماسی دەرەوەی ڕووسیادا شاعیرێکی دبلوماسی هەبوو ئەویش(ئەلکساندەر گریبویدوف)ی باڵوێزی قەیسەری ڕووسیابوو لە ئێراندا..

ئەو باڵیۆزە لەناو باڵیۆزخانەی ڕووسیادا کوژرا و قەیسەریش هیچ تۆڵەیەکی نەسەندەوە.

ڕۆژێکیان(بافلوف)ی تەرجەمانی(ستالین)م بینی لە ترسی ستالین دەلەرزی.

یەکێك یەك دوو بەرگ لە دیوانی شاعیرێکی بەریتانیدا بوو، دیاربوو ستالین بەو کارەی زانی بوو.

ڕووبەڕووی خۆی بە گاڵتە پێکردنێکەوە پێیووتبوو...

"دیارە بافلوف وای لێهاتووە، پەیوەندی دۆستانەی باش لەگەڵ بێگانەکاندا پەیدا بکات.."

دوای ئەوە وایلێهاتبوو نە لە پێش کۆبوونەوەو نەلە دوای کۆبوونەوەش بەهیچ جۆرێك لێم نزیك نەدەکەوتەوە و قسەی لەگەڵدا نەدەکردم. جارێك ویستم بانگهێشتی میوانداریییەکی بکەم... پۆزشی بۆ هێنامەوە، وتی.."داوای لێبوردن دەکەم.. بۆهیچ میوانداری و دەعوەتێك ناچم.."

# وەک بێدەنگی ناوگۆڕ

کەسایەتی و نوێنەرانی سۆڤیاتی لە بۆنەو ئاهەنگەکاندا هەرکە ستالین دەربکەوتایە لەرزیان لێدەهات و بێدەنگ و بێ چپە دادەنیشتن وەك ئەوەی لەناو گۆڕدابن هەناسەیان لە خۆدەبڕی. هەرکە ستالین دەکەوتە قسەوقسەی دەکرد.. تۆزێك ترس و ودڵەڕاوکێیان دەڕەوێوە، بەڵام ئەو ترسەیان هەر بە ڕووەوە دیاربوو.

برواناکەم لە ژیانمدا هێندە دڵگران و خەمناك بوو بێتم بۆ نێوان دووکەس، وەك ئەوەی بینیم لە نێوان(فیشنیسکی) دیبلومات و جێگری باڵای پێشووی دڵ ڕەقی سۆڤێتی و ستالیندا ببینم.. فیشنیسکی دڵ ڕەق وەك سەگێکی تۆقیو، هێندە بە ترس و زەلیلییەوە ڕادەوەستاو سەری دادەنەواندو بەسەر شۆڕییەوە سەری ڕادەوەشاند و ڕەزامەندی بۆ ستالین دەردەبڕی. و هەربەو شێوەیەش پاشەوپاش دەکشایەوە.

ستالینیش زۆر بە ئاشکرا بە سووکیی و قینەوە تێیدەڕوانی...!! لە یەکێك لە دانیشتنەکانی کۆنگرەی(یالگە)دا گوێم لێ بوو ستالین بە ژمارەیەك لەوانەی لەگەڵیدابوون.. کە لە نێوانیاندا (فیشنیسکی)یش تێدابوو.. دەیوت.."لەگەڵ فیشنیسکیدا هەموو شتێك دەگونجێ و دەکرێت.. فیشنیسکی هەر کارێکی پێبسپێرێت و پێی بڵێت ئامادەیەو ئەنجامی دەدات".

ترس و لەرز لەناو کارەکەر و خزمەتکارەکانی ناو کرملینیشدا هەبوو کە لەوێدا کاریان دەکرد. لە دەعوەتەکاندا هەردوو کارەکەر پۆلیسێکی نەهێنی بە جلوبەرگی ئاساییەوە لە دوایانەوە ڕادەوەستا.

ستالین هەڵسوکەوتی لەگەڵ سیاسەتمەدارە گەورەکاندا وەك(مالیك) و زۆرین) و (گرومیکۆ) و گەورە ئەفسەرانی وەك (بۆلگانین) و (فاسیلفسکی) و (کۆنییف) و (فورونوف)دا وەك تەتەرێك تەماشای دەکردن.

ئەوانیش لەبەردەم و لە ئاستیدا هەر بەو شێوەیە هەڵسوکەوتیان دەکرد لە ناو سیاسەتمەدارەکاندا تەنها (لیتفینوف) گەورەیی و سەروەری و کەرامەتی خۆی پاراستبوو. بەڵام (لیتنفینوف) هەموو کات تەریك و تەنها بوو... تەنها(مولوتوف) نەترس بوو... وەك ئەوانی تر نەبوو کە هەردەم ترس و لەرز بەسیمایانەوە دیاربوو..

ستالین زۆرجار بە ئاشکرا گاڵتەی پێدەکرد... ئەویش گوێی بە گاڵتەکانی نەدەدا و شانی دابووەبەر. پەیوەندی ئەم دووانەم وەك پەیوەندی مامۆستای قوتابخانەو قوتابییەکی زیرەك دەهاتە پێش چاو. لەکاتی قسەو وتووێژدا هەرکاتێك برگەیەکی گرنگ باس بکرایە و گفتوگۆی وردو گەرمی لەسەر بکرایە... وەك ئەو قسەو گفتوگۆیەی لە کرملیندا دەربارەی بەرلین کرا(مولوتوف) وەك قوتابییەکی زیرەك کە دەرسەکەی ئامادە کردبێت، وەڵامەکەی دەدایە دەست ستالین. هەندێ جاریش خۆی دەدا بەسەر مێزەکەدا بۆ ئەوەی ژمارەیەك بۆ سەرۆکەکەی ڕاست بکاتەوە.

هیچ ڕاوێژکارێکم لەناو ڕاوێژکارەکانی ستالیندا نەدی، بوێرێت قسە بە ستالین ببڕێت، یا شتێکی بۆ ڕاست بکاتەوە.. جگە لە(مولوتوف) زیاتر.

لە کاتی ناشتنی تەرمەکەی ستالیندا کە لە(٩ی ئازاری ساڵی ١٩٥٣)دا بوو. (مولوتوف) و (مالینکوف) و (بیریا) هەر یەکەیان وتارێکی ماتەمییارییان خوێندەوە. تەنها ئەو لە ناویاندا وتی من بۆ ستالین گریام و خەمباربووم منیش بە تەواوی بڕوام بە قسەکانی هەبوو..

ستالین لە ئاهەنگ و بۆنە کۆمەڵایەتێکاندا داوای لە ئەمیراڵەکان دەکرد پیاڵە چای بۆ بێنن و داوای لە جەنەراڵەکانیش دەکرد قاوەی بۆ بێنن، جارێکیان دوای نان خواردنی ئێوارە ستالین بە مارشاڵ(مونتۆگومری) وت.. حەزدەکەیت ئەمشەو لە سینەمای تایبەتی کرملیندا فلیمێك ببینیت..؟

مارشاڵ(مۆنتۆگۆمری) پۆزشی بۆ هێنایەوە کە ناتوانێت.. چونکە بەیانی زوو هەڵدەسێت و دەڕواتەوە بۆ بەریتانیا... ئەو ئەفسەرە ڕووسیانەی لەوێبوون و گوێیان لەوەبوو هەر هەموویان حەپەسان و سەریان سوڕما و باوەڕیان بە گوێی خۆیان نەکرد. بەچپە بە یەکتریان دەوت(سمیلو) واتە ئەمە(بوێری)یە.. بەڵام

کاتێك ستالین ڕووی تێکردن و چاوی لێزەق کردنەوە.. هەر هەموویان گورج بێدەنگ بوون.



# سەگە پیرێکی بێکەڵک:

ستالین بەزەیی بە(فورشیلوف)دا دەهاتەوە، بەڵام بەزەییەکەی دووربوو لە سۆز و خۆشەویستییەوە.

فورشیلوف لەبەردەم ستالیندا هەمیشە وەك ئەفسەرێکی سەربازی خاوەن سەرەوەرییەکی کۆن رادەوەستا، ستالینیش وەك سەگە پیرێکی بێکەڵك هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرد.

ئەو ئەمی وەك یادگارێکی رۆژانی رابوردووی پڕ سەرکێش هێشتبووەوە، بەپێی داستانەکانی سۆڤیاتی(فورشیلوف) لە شەرە میللییەکانی دژ بەسپییەکان یەکێك بووە لە ئەفسەرە پایەدار و گەورەکانی ئەو شەرە.. لە هەموو شوێنێکدا بە جلکی مارشاڵییەوە دەردەکەوت و دەبینرا. بەئەندامی لە ئەنجومەنی جەنگیدا مابۆوە. بەڵام ستالین هەرکات بیویستایە سووکایەتی پێ دەکرد..

لە یەکەم دانیشتنی کۆنگرەی(تاران)دا ستالین وتی من چاوەروانم نەدەکرد هیچ گفتوگۆیەکی سەربازی بکرێت. لەبەرئەوە هیچ شارەزایەکی بواری سەربازیم لەگەڵ خۆمدا نەهێناوە.

پاشان وتی کە(فورشیلوف) هەموو هەوڵێکی لەو بوارەدا دەخاتە کارو ئەم کارەجێبەجێ دەکات.

فورشیلوفیش بە دووچاوە بچکۆلەو درێژکۆلەکانییەوە تەماشای ستالینی دەکرد و چاوی لێنەدەتوورکاند.

بەڵام هەڵسوکەوتی ستالین لەگەڵ بیانییەکاندا جیاواز بوو.

زۆربە گرنگییەوە تێیدەروانین و هەرگیز خۆی بێزار نیشان نەدەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەزی بە بێزارکردنی خەڵکانی تردەکرد.

لە ساڵی(١٩٤٨)دا، ستالین لە کرملیندا. واتە دوای سێ ساڵ ئیمزاکردن لە رێکەوتننامەی پوتدام. سێ نێراوی رۆژئاوایی هاتن بۆ لای. دەیانویست حەلێك

بۆ گەمارۆی بەرلین بدۆزنەوە. پێش ئەوەی پێشوازی و سڵاوکردنی ئاسایی کۆتایی بێت.

ستالین رووی کردە نوێنەرەکان وتی...

ـ "ئایا ئێوە بۆ دانووسان دەستەڵاتتان هەیە..؟"

ستالین دەشیزانی لەو کاتەدا، ئەو هەنگاو و گفتوگۆ کردنە تەنها بۆ راوەرگرتنە، ئەو تێبینییەی بۆ ئەوەکرد کە خۆی دەست پێشکەری بکات و رۆژئاواییەکان بخاتە هەڵوێستێکی بەرگرییەوە.

لە کۆبوونەوەی دوای ئەویشدا هەمان خۆنواندنی دووبارە کردەوە کاتێك ـ وتی.."ئایا ئێوە دەتانەوێت کێشەکە بە تەواوی چارەسەربکەن؟ من دەربارەی کێشەی بەرلین پلانێکی نووسراوی ئامادەکراوم پێیە.. چاوەڕوانی بڕیار و رازی بوونی هەموان دەکات.."، لە زۆر هەڵوێستدا زۆر توندوتیژبوو، لە زۆریشدا شل بوو.. چۆنی بویستایە و پێویست بوو وایدەکرد.

هەندێ جار بروسکەی توندوتیژی بۆ چەرچڵ و رۆزفلت دەنارد، لە بروسکەکەدا سەرنەکەوتنی ناردنی قافڵەی ئازووقە جەنگی وڵاتە هاوپەیمانییەکانی بۆ رووسیا باس دەکرد، بەڵام هەر لەدوای ئەوە لە ماوەیەکی کەمدا نوێنەرانی(چەرچڵ) (ئیدن) و (ئیسمان) هاتن بۆ لای و سەردانیان کرد.

ستالین لەبەردەمیاندا ئەوپەڕی لوتف و رووخۆشی نواند، دەمبینی لە ماوەی خولەکێك کەمتردا کتوپڕ لەوپەڕی هەرەشەو گورەشەدا خاودەبۆوە و دەهاتەوە سەر سفر و ئاسایی دەبۆوە. زۆرجاریش لە کاتی دڵنەوایی و لوتف و رووخۆشیدا گورج دەگۆڕاو ئەکەوتە سەرزەنشت و قسەی ڕەق و سەرکوتکردنی بەرامبەرەکەی بێ ئەوەی دەنگ هەڵبڕێت...

# سەردانی مونتغمری(مونتوگۆمری)



ستالین بە هەموو شێوەیەك دەیویست گەورەیی خۆی بسەپێنێت بەسەر بەرامبەرەکەیدا.. جا رێکیا ن ( مو نتو گۆ مر ی ) هات بۆ لای و سەردانی کرد. لەگەڵ خۆیدا هەندێ دیاریی بۆ هێنابوو.. لەناو دیارییەکاندا دووپەرتووکی خۆی و سنووقێك ویسکی بۆ هێنابوو.

من خۆم سنووقە ویسکی و دیارییەکانم بردە ژووری نوسینگەکەیەوە. بێ ئەوەی ئاوڕ لە سندوقەکە بداتەوە و تەماشای بکات.

پێش ئەوەی(مۆنتۆگۆمری) سلاّو و قسەکانی تەواو بکات.. ستالین قسەکانی پێبڕی.. وتی..

"بەڵێ؟ ... ئێستا تۆ چیت لە من دەوێت...؟"

ستالین بە درێژایی ماوەی سەردانەکە هەرلووت بەرز و خۆبە گەورە خۆی دەنواند.. پێش ئەوەی چاوپێکەوتنەکە کۆتایی بێت... (مونتوگۆمری) کتێبە ئۆتۆگرافەکەی دەرهێناو زۆر بە رێز و ئەدەبانەوە داوای لە ستالین کرد، شتێکی لەسەر بنووسێت.

ستالین وا خۆی نیشاندا لە قسەکانی نەگەیشتووە...

"منیش لە یەکێك لە بۆنەکاندا ئەوەم بیرکەوتەوە، جارێکیان لە(بوتسدام) ستالین بەدەوری مێزەکەدا سوورایەوە بەدەستی خۆی هەرچی ئۆتۆگرافێك لەسەر لیستی نان خواردنەکە بوو هەر هەمووی کۆکردەوە..."

ئێستاش واخۆی نیشان دەدات کە تێناگات چی دەڵێت، هەتا مۆنتۆگۆمری مەجبوور کەوتە هەڵوێستەیەکەوە هەروەك ئەوەی لێی بپارێتەوە.

پاشان ستالین بەهێواشی لەسەر مێزی کۆبوونەوەکە هەستا و بەرەو مێزی نووسینگەکەی خۆی ڕۆیشت و پێنووسێکی هەڵگرت و بەخێرایی ڕستەیەکی لەسەر نووسی مۆنتۆگۆمری نوسراوەکەی خستەلای منەوە بۆ ئەوەی، ئەوەی لەسەری نووسی بۆی وەربگێڕمە سەر زمانی ئینگلیزی.

تەنها هەر ئەوەندەی لەسەر نووسیبوو...

"سڵاوم بۆ سەربازانی بەریتانی..."



## بیرێکی بەهێز

(لە پۆتسدام) ستالین بەلاقرتێ و نەهێنی گریبیەوە، گاڵتەی بە چەرچڵ کرد... کاتێك بەریتانییەکان باسی ئەو ناخۆشی و تەنگە شانەیان دەکرد کە لە زستانی داهاتوودا تووشی گەلی بەریتانی دەبێتەوە. گەر ستالین بتوانێت پێشنیار بکات هەروەك خۆشی بەڵێنیداوە، هەندێك لە سامانی ئەو خەڵووزە هەیانە بیدات بە بەشێکی ئەورووپا و لەو تەنگەشەو ناخۆشیانە ڕزگاریان بکات...

ستالین گورج وەڵامیدایەوە، وتی.." رووسیا لە بوارێکی زۆرلەوە ناهەموار و خراپتردایە.. من لەوە دەترسم ئەگەر ئەوەبکەم و باسی ئەو هەموو ناخۆشی

و نالەبارییە بکەم کە گەلی سۆڤیاتی تێدایە.. لەوەیە چەرچڵ خۆی پێ نەگیرێت ودەست بە گریان بکات.

چەرچڵ کە گوێی لەوەبوو تۆزێك سوور هەڵگەراو شەرمەزاربوو. لەو قسە هیچوپووچ و خەرافیاتەی لە دەرەوەی وڵاتاندا هەبوو.. ئەوەبوو.. دەیانووت..
ستالین مێشکێکی باش و زیرەکانەی هەیە و قسەکانی کورت و مانادارن.

راستە بیرومێشکێکی باشی هەبوو، گشت کات مەبەستی لە پێش چاودابوو.. بەڵام ستالین کە زۆری نەدەوت و قسەکانی بە کورتی دەکرد و لە قسەکردندا بێ پێچ و پەنابوو.. هۆیەکەی ئەوەبوو ستالین بەباشی نەیدەتوانی وتاربدات و درێژەی پێ بدات.

تەنها یەك جار گوێم لێ بوو بە دوورودرێژی بدوێ و قسە بکات، ئەویش ئەوجارەبوو کەباسی خۆی کرد و شانازی بە خۆیەوەکرد، لەو جارەشدا ویستی سەرکردەکانی هاوپەیمانان باوەری پێبێنن کە ئەو دەستی بەسەر بەرلیندا گرت و داگیری کرد.. نەك ژەنەراڵ زۆکۆف.

لەم بۆنانەدا تەنها نزیکەی سێ خولەك زیاتر نەیدەتوانی قسە بکات، هەروەها قسەکردن بەهۆی وەرگێرەوە هەلێکی باش و گونجاوی بۆ دەخولقێنێت بۆ ئەوەی چی لە مێشکیدایە کۆی بکاتەوەو دەری برێت، زۆربەی زۆری سەرکردە رۆژئاواییەکان، ئەوانەی چاویان بە ستالین کەوتووە، و قسەیان لەگەڵدا کردووە ئەوە دەسەلمێنن و جەخت لەسەرئەوەدەکەن کە ستالین پیاوێکی ئازاو نەترس بووە.. ستالین ئەو سیفەتەی تێدابوو..، بەڵام ئەوسەر قاڵبیە نائاساییەی کە هەیبوو بۆ ساغ و سەلامەت راگرتنی خۆی و ئەو ترسەی لە مردن هەیبوو.. هەر هەمووی ترسنۆکی دەگەیەنێت و ترسنۆك بووە. کەواتە لە ناخ و کانگای دڵییەوە پیاوێکی ترسنۆك بوو.

## پێداگری لەسەر ساغ و سەلامەتی

لە (یالگە)و لەو ڕۆژەی بڕیاربوو ستالین لە باڵەخانەی(فورتشوف) کە نوێنەرانی بەریتانی تێدا نیشتەجێ بوون، ئامادە بێت بۆ نان خواردنی ئێوارێ.

هەر لە بەیانییەوە بۆ پاراستنی ژیانی ستالین، دەستکرا بە کارو پشکنین، پشکنینێکی زۆر توندو وردتر لەوەی چەرچڵ حسابی بۆ کردبوو، سەربازانی سۆڤێتی بەردەوام بەناو باخچەکەدا دەسوورانەوە و هاتوچۆیان دەکرد، لەوەش زیاتر لەو بەیانییەدا خۆقایمکردن لە پشتەوە گەیشتە سەرشاخەکان و سەربازانی نوێ هاتنە پاڵ پاسەوانانی ناوباخچەکە.

لە ملاولەولای ئەو پێپلیکانە مەرمەڕییانەی دەچوو بۆ ناو باخچەکە، کۆمەڵێك پەیکەری شێری لێ بوو. سەربازە ڕووسییەکان هەر هەموو ئەو پەیکەرانەشیان پشکنی لە ترسی ئەوەی نەبادا لەناو ئەو پەیکەرانەدا بۆمبی تەوقیت و تەقینەوەیان تێدابێت. هەروەها بنمیچی هەر هەموو باڵەخانەکەشیان پشکنی.

پێش کاتی نان خواردنی ئێوارێ بە ماوەیەکی کەم هەرهەموو ئەو دەرگایانەیان داخست کەدەچوو بۆ هۆڵی نان خواردنەکە. ستالین لە ناخییەوە تووشی نوقسانی و کەموکوری ببوو.. لەگەڵ ئەوەی لەکاتی قسەکردندا ڕاستەوخۆ تەماشای نەدەکردیت، بەڵام من وەك سەرنجم دابوو، کە وێنەیەك دەگیرا دەچوو لە شوێنێکی تۆزێك بەرزتر لە هەموان ڕادەوەستا یان خۆی قوت دەکردەوە ئەگەر شوێنەکە تۆزێك سەرەولێژ یان نزم بوایە بۆ ئەوەی بەباشی دەربکەوێت.. لە پۆتسدام هەروەك منداڵ جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوەو پێی دادەگرت کە دەبێت ئەو لە پێش هەمواندا بڕیاری کۆتاییەکە ئیمزا بکات.

ستالین زۆرحەزی لە شانازی و پیاهەڵدان و مەرایی بوو.. نەفسییەتی وەك نەفسی (خرۆشۆف) نەبوو.. جارێك لە (یالگە) لەسەر مێزی نان خواردن

(روزفلت) بۆ گاڵتە و سوعبەت کردن پێی وت.. "من و چەرچڵ لە بەینی خۆماندا پێتدەڵێین(مامەجو) ستالین زۆر بە قسەکەی تێکچوو.. پێی ناخۆشبوو... لەو ۲۰۰ دووسەد ملیۆن کەسەی لە ڕووسیادا بوون کەمێکی زۆر کەمیان لە نزیکەوە ستالینیان بینی بوو.

زۆربەی زۆری دانیشتوانی ڕووسیا لە کاتی نمایشەکانی گۆڕەپانی سووردا لە دەرەوە لە هەیوانی کۆشکەکاندا دەیانبینی. کەمێکی زۆرکەمی میللەتی سۆڤیاتی دەیانزانی ستالین لە کوێدا نیشتەجێیە و لە کوێدا کاردەکات، تەنها لە ڕێگای سندوقی پۆستەوە، کە لە دیوارەکانی کرملین هەڵواسرابوو میللەت دەیتوانی دەنگی خۆی بگەیەنێتە ستالین ئەو سندوقانەش تەنها ناوە نهێنییە حوکومییەکەی ستالینیان لەسەر نووسیبوو. نەك ناوە ڕاستییەکەی خۆی. لەوێوە ئەو خەڵکە کڵۆڵ و کەساسانە سکاڵانامەکانیان دەنووسی و دەیانخستە ناو ئەو سنووقانەوەو تیایدا دەپاڕانەوە و داوای ڕەحم و بەزەییان بۆ ئەو خزم و کەسە گیراوانەیان دەکرد، کە مابوون و بڕیاری لە سێدارەدانیان بەسەردا درابوو.. چاوەڕوانی لە سێدارەدانیان دەکرد، لە پێناومان و ژیانی ستالین و پارێزگاری دەستەڵاتەکەیدا..

ستالین هەروای لە میللەتەکەی نەکردبوو، تەنها لە خۆی بترسن و بەس بەڵکو وای لە میللەتەکەی کردبوو یەك لە یەکتریش بترسن و نەوێرن قسەبکەن، لێدانی دەرگا لە نیوەشەودا لەلایەن پۆلیسی نەهێنی(ئاسایش)ەوە ببووە شتێکی ئاسایی و ڕاهاتن لەگەڵیدا.. وەك سەردانی کارمەندانی نامەبەریان لێ هاتبوو، لە مۆسکۆدا نوکتەیەك بڵاوببۆوە.. ئەویش ئەوەبوو کە دەرگاوانێکی دەروازەی باڵەخانەیەك لە نیوەشەودا لە دەرگای یەکێکی بدایە.. لەو دیو دەرگاکەوە دەیووت.. "هاوڕێیان مەترسن هیچ نییە تەنها باڵەخانەکە ئاگری تێبەربووە."

# ئامێری تەمەن درێژکردنی ستالین

ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٧، ئۆتۆمبیلێکی ڕەش لە مۆسکۆ لە بەردەم عیادەکەی پزیشکی هەناو دڵی بەناوبانگ(فلادیمیر فرومۆفین)دا ڕاوەستا.

ئەفسەرێك جلکێکی سەوزی تۆخی لەبەردابوو، ئەملاولای قۆڵی چاکەتەکەی و یەخەی ملی چاکەتەکەی بە شریتێکی سوور نەخشێنرابوو. لە ناو ئۆتۆمبیلەکەوە هاتەخوارەوە و دابەزی.. بەونیشان و شریتانەدا دیاربوو، یەکێکە لە گەورە ئەفسەرانی پۆلیسی ئاسایش، ئەفسەرەکە یەکسەر چووە ژووری پزیشکەکەوە.. پاش ئەوەی سڵاوێکی کتوپڕی لێکرد.. پێی ووت.."من بۆ ئەوە هاتووم هەرئێستا لەگەڵ خۆمدا بتبەم..!!". جەنابی دوکتۆر یەك قسەی نەکرد و فزەی لێوەنەهات.. چونکە باش دەیزانی قسەکردن و بەرەنگار بوونەوەو دژایەتی کردن لەم حاڵەتانەدا ئەنجامی چی دەبێت و چی دەگەیەنێت. لەبەرئەوە سووك پاڵتۆ سپییەکەی لەبەرخۆداکەند، هەندێ ئامۆژگاری کورتی ئەو پەرستیارەی لەبەر دەستیدابوو کرد، پاشان دوای ئەفسەرەکە کەوت بۆ ناو ئەو ئۆتۆمبیلە ڕەشەی لەبەر دەرگادا چاوەڕوان بوو.. ئۆتۆمبیلەکە بە شەقامی(ئەریات)دا ڕۆیشت کە یەکێك بوو لە قەشەنگترین و نوێترین شەقامەکانی مۆسکۆ. هەتا گەیشتە لای کرملین بە دەرگایەکی لاوەکیدا چووە ژوورەوە، پاش نیو سەعات دوکتۆر(فرۆموفین) لەبەردەم پیاوێکی سەر ڕووتاوەی لاوازی تەمەن پەنجا ساڵاندا ڕاوەستا... چاویلکەیەکی لە چاودابوو دوو عەدەسەی ئەستووری تێدابوو.

ئەویش(ئەلکسەندەر فرانکلی) گەورە پزیشکانی ستالین بوو، کە لەمەوپێش یاریدەدەری زانای ڕووسی(بوجومولتز)ی خاوەن ئەزموونی بەناوبانگ بوو بۆ درێژکردنی تەمەن.

دکتۆر(فرانکل) بە تووڕەییەوە پێی وت..

ـ من ئێستا بۆ ئەوە بانگم کردوویت کە پێترابگەیەنم کە (لیژنەی کرملین بۆ لێکۆڵینەوەی پزیشکی نەهێنی" بڕیاریان داوە تۆ بخاتە ناو لیژنەکەوە، لە نەخۆشخانەی تایبەت لە قوقازدا کاری سەرپەرشتیارییان لە بەشی دڵدا پێ سپاردویت.

(فروموفین) تۆزێك بە بێدەنگی ڕاما، پاشان لەبەرخۆیەوە بە هێواشی سوپاسی کردن بۆ ئەو ئیشەی پێیان سپاردبوو، هیچ هەفتەیەك بەسەر ئەوەدا تێنەپەڕی خۆی لە شاری (کسلوفووسك) لە قوقازدا بینییەوە.. لەوێ ئۆتۆمبیلێکی ڕەشی بینی ڕاوەستابوو، پیاوێکی ئاسایش لە ناو ئۆتۆمبیلە ڕەشەکەدا دانیشتبوو چاوەڕوانی ئەوی دەکرد.

سواربوو بردی بۆ کۆمەڵێك خانوو کە بەدیواری بەرز شوورا کرابوون، کۆمەڵە پۆلیسێك بە ڕەشاش و هاوەنەوە پاسەوانیان دەکرد.. لەوێ پزیشکێك پێشوازی لێکرد کە لەوەوپێش دەیناسی ئەویش دوکتۆر(سابورسکی) بوو. ئەویش یەکێك بوو لە لایەنگرانی پێشووی(بوجومولتز).

پاشان- بۆ یەکەمجار- بەدوورودرێژی باسی کارەکەی بۆکرد. ئەو لیژنە لێکۆڵینەوە نەهێنییە پزیشکییە لە ساڵی(١٩٣٩)وە پێکهاتبوو. تاقیکردنەوەی تایبەتییان ئەنجام دەدا بۆ مەبەستی ئەوەی تەمەنی ستالین بۆ سەدساڵ درێژ بکەن.. لەو ساڵەدا کۆمەڵێك پزیشکی هەڵبژاردەی سەر بە خۆیان نارد بۆ وڵاتی قوقاز، بەزۆرێکی زۆر لە شاروشارۆچکەو دێهاتەکانی ئەوێدا گەڕان، ژمارەیەکی زۆری پیاوانی ئاسایش و ئۆتۆمبیلیان لەگەڵدا بوو.. کە ئامێری زۆرچاك و پێشکەوتووی تیشکی و ئامێری شیکاری بەکتریۆلۆجییان تێدابوو..

پاش ئەوەی هەزارەها پیاوانی پیرو بە تەمەنیان فەحس کرد و تێروانینیان بۆ کردن.. لەناو ئەو هەزارەها کەسەدا تەنها دووسەد کەسیان هەڵبژارد کە ئەوانیش خەڵکی ناوچە شاخاوییەکان بوون.. ناوشان پان و باڵا بەرز و گەورەو بەهێز و بەتوانابوون...

ئەوانەیان نارد بۆ پەیمانگای تاقیکردنەوەی بایەلوجی لە شاری(کیف) لەوێش زنجیرەیەك باس و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرا.. لەناو ئەوانیشدا ٣٠ سی کەسیان هەڵبژارد.

بۆ ئەوانیش ئەوەیان ڕەچاوکرد، کە بەشێوەیەکی دروست و بەرچاو پێکهاتەی لەشیان

وەك پێكهاتەی لەشی ستالین بێت، لەبارەی بە ژن و باڵاو كێش و هێزی ماسولكەو جۆری خوێنەكەیەوە، ئەوەشیان ڕەچاوكرد كە هەر هەموویان هێندەی ئەو جگەرەكێش بن و هێندەی ئەو مەشروباتی دروستكراوی وڵات بخۆنەوە. شارەزایان و پزیشكان لەو دەرمان و شرینقانەی ئامادەیان كردبوو.. بۆ تەمەن درێژی ستالین، هاتن بەسەر ئەو ٣٠ سی كەسەدا تاقییان كردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەشیان بەسەردا سەپاندن كە كاتەكانی خۆیان وەك چۆن ستالین دەیباتە سەر، دەربارەی ئەو سەعات و كاتە فەرمییانەی ستالین لە نوسینگەكەی خۆیدا دادەنیشێ و بەسەری دەبات و چەند سەعات دەنوێت و چەند وەرزش دەكات و پەیڕەوكردنی ئەو خواردنەی ئەو دەیخوات و ژمارەی ئەو جگەرانەی ئەو دەیكێشێت.. ئەوانیش بەو شێوەیەی ستالین ببەنەسەر.

لەسێ مانگی یەكەمدا یانزەكەسیان لێمردن، دوای نۆ مانگی تر سیانی تریان لێمردن، لە جیاتی ئەو چواردە كەسەی مردن.. چواردە كەسی تریان لە وڵاتی قۆقازەوە هێنا... ئەو تاقیكردنەوەیە بەردەوامبوو هەتا ساڵی(١٩٤٦) كە بەهۆی دووەم جەنگی جیهانییەوە وەستا... دوای ئەوە سەرلەنوێ دەستی پێ كردەوە، بۆ ئەو مەبەستە لە جیاتی پەیمانگای لێكۆڵینەوە لە(كیف) خەستە خانەیەكی تایبەتیان بۆ ئەو مەبەستە لە شاری(كسلوفووسك)دا دامەزراند. لەناو ئەوكەسانەی ئەو تاقیكردنەوانەیان لەگەڵدا دەكردن، ئامۆزایەكی ستالین بوو، ناوی (جاكۆف جیلادزی) بوو.. هاوشێوەی ستالین بوو، زۆر لەودەچوو.. هەتا هەندێ جار لە كاتی جەنگدا لە جیاتی خۆی دەینارد بۆ ئەوەێ لە هەندێ بۆنەدا لە بری ئەو لەبەردەمی جەماوەردا دەركەوێت.. ئەوانەی سەرپەرشتی ئەو ئەزموونەیان دەكرد.. جەختیان لەسەر ئەوەدەكردەوە.. (جاكۆف) لە هەموو شتێكدا لە ژیانی رۆژانەیدا لاسایی ستالین بكاتەوە.. كاتێك لەساڵی ١٩٤٦دا بە ستالینیان وت كێشی خۆی كەم كاتەوە، ئەویش بەوەی پەیڕەوی ڕێگاو جۆری خواردن و خواردنەوەیەكی تایبەت بكات.

هەروەها بە(جاكۆف)یشیان وت پەیڕەوی ڕێگا بكرێت، كێشی زۆردابەزی و كێشی (ستالین)یش یانزە ڕەتڵ دابەزی...

# نەخۆشخانە سەیرەکە

ئەو نەخۆشخانە تایبەتە لە چوار خانوو پێکهاتبوو، هەر یەکەیان لە دوونهۆم پێکهاتبوو.. تەویلەیەکی هاوچەرخی ولاغیشی لەسەربوو.. چەند ئامێرێکی هەوا پاڵێویشی تێدابوو.. لەو تەویلەیەدا سێ ئەسپی رەسەنی تێدابوو.. سەرپەرشتیارێکی شارەزای پلازمای خوێن و دوو دوکتۆری ئاژەڵ و ژمارەیەکی زۆر سەرپەرشتی تەویلەکەیان دەکرد.. بۆ ئەوەی پلازمایەکی تایبەتی لێوەرگرن کە دوکتۆر(بوجومولتز)ی زانا دۆزیبوویەوە ناوی نابوو..(ئەی - ك - س) (A.K.C) جەختی تەواوی لەسەر ئەوە دەکرد کە ئەو پلازمای خوێنە بە دڵنیاییەوە بەرگری لە پیری شانەکان و دەمارەکانی لەشی دەکات، بەتایبەت دەمارەکانی خوێن، بۆوەدەست هێنانی ئەو پلازمای خوێنە ئەوەبوو ئەو مادەو پلازمایانەی کە لە ئێسقان و سپڵی ئەو گەنجە بەهێزانە دەردەهێنا کە لە رووداوەکاندا دەکوژران، بە شرینقە دەیاندا لەو ئەسپە تایبەتانەو پاشان لە خوێنی ئەو ئەسپانەوە بە شرینقە ئەو پلازمایە دەردەهێنران و دەیاندا لەکەسەکە.

خەستەخانە رووسییەکان لەماوەی ئەو ساڵانەدا هاوکاری ئەوسەرپەرشتیارانەیان بۆ ئەو تاقیکردنەوانە دەکرد، ئەویش بەوەی لاشەی ئەو گەنجە بەهێزانەی لە رووداوەکاندا دەبوونە قوربانی، بە فرۆکە دەنارد بۆ ئەو خەستەخانانە.

ئیشی دوکتۆر(فرومونین)ی شارەزا لە دڵ و هەناودا، لەو خەستەخانەیە ئەوەبوو چاودێری دڵی ئەوانەی دەکرد کە لەوخەستەخانەیەدا بوون، بۆ ئەوەی کاریگەری ئەو پلازمای خوێن و دەرمانانە بزانێت، لەو دەرمانانەی پێیان تاقیدەکرایەوە، دەرمانێك بوو پێیان دەوت.. (رەقەم٣٧) دوکتۆر (فروموفین) سەرنجیدا ئەو دەرمانە لێدانی دڵ کەمدەکاتەوە بۆ ٣٠ سی لێدان لە دەقیقەیەکدا بێ ئەوەی هیچ کاریگەرییەك بکاتە سەر تەندروستی نەخۆشەکە و هیچ کەموکورتیەکیشی(موزاعەفاتێکیشی) لێنەدەکەوتەوە. فروموفین کە لەو خەستەخانەیەدا بوو یەکەمجاری بوو، ببینێ لە

رووسیادا ئامێرێك دروستكراوە پێیدەڵێن (ئامێری ژیان)، ئەو ئامێرەش پزیشكێكی كرملین دروستی كرد و دایهێنا.

ئامێرەكە هەڵدەستێ بەكاری دڵ و هەردووسییەكان و سووری خوێن لەماوەی شەش دەقیقە كە دڵ تیایدا لە لێدان دەكەوێت و دەمارەكانی مۆخ تیادەچێت و لەكاردەكەوێت ئەگەر خوێنی بۆ نەچێت. بەهۆی ئەو ئامێرەوە هەلێك دەدات بە دوكتۆرانی نەشتەرگەری و شارەزایانی دڵ بۆ چارەسەركردنی ئەو خراپی و تێكشكاندنەی بۆ نەوەستاندنی ئامێرەكانی لەش لە جێبەجێ نەكردنی كارەكانیاندا. خاوەنی داهێنەری ئەو ئامێرە، ئامێرێكی تایبەتی بۆ ستالین دروست كرد بوو، قەبارەكەی هێندەی قەبارەی(پیانۆ) یەك بوو.. تایەی بۆ دروستكردبوو هەتا بە ئاسانی هاتوچۆی پێ بكرێت.

لەو چەند ساڵانەی دواییدا داهێنەر و ئامێرەكەی بەهیچ جۆرێك لە ستالین دوورنەدەكەوتەوە، هەتا لەو سەفەرانەشدا كە بەشەمەندەفەر دەیكرد، ئەوانەی سەرپەرشتیاری ئەو تاقیكردنەوانەیان دەكرد بۆ تەمەن درێژی ستالین بەهیوای ئەوەبوون تەمەنی بگاتە(١٠٠) سەد ساڵ نەك تەنها بەهۆی ئەو پلازماو دەرمانانەوە، بەڵكو بەهۆی بۆماوەیی(وراسی) خانەوادەكەیەوە كە ئەوەش هۆیەكی گرنگە بۆ تەمەن درێژی، چونكە باپیرەی ستالین تەمەنی گەیشتبووە هەشتاونۆ ساڵ و دوومامیشی تەمەنیان گەیشتبووە نەوەد و چوار خزمێكی تریشی تەمەنی لە سەد ساڵ تێپەری كردبوو لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵدان و تاقیكردنەوە دووروردرێژ و هیلاكییە قورس و گرانەدا، كە ئەوزانایانە كردیان بۆ ستالین(ستالین) لە تەمەنی حەفتا و سێ ساڵیدا كۆچی دوایی كرد و مرد.



هێتلەر لە ژیانی تایبەتی خۆی و گشتیدا

(٢)

## (هێتلەر لە ژیانی تایبەتی خۆی و گشتیدا)*
## بە پێنووسی (ئەلبرت شبیر)ی (وەزیری پێشووی ئەڵمانی)

هیچ کەسێك لە دنیادا نییە، کە دەستەڵاتێك بگرێتە دەست(هەردەستەڵاتێك بێت) جا بەڕێوەبەری دامودەزگایەك بێت یان سەرۆکی حوکومەتێك، یان دیکتاتۆرێك بێت. کە تووشی ئەو کێشەو دەردە کۆنە نەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە کەسانی دەوروبەری، دەبنە مرۆڤی ڕیاییکەر و کاسە لێسو چڵکاوخۆر و جل تەکێنی دەستەڵاتدار.

ئەمانە ناوەندی فەرمانڕەوایی و نیزامەکەش دەشێوێنن و پیس و بۆگەنی دەکەن

و ناوی گەورەکەیان دەزرێنن و لەکەداری دەکەن، (هیتلەر) لە ساڵی(١٩٣٧)ەوە کە دەستەڵاتی گرتەدەست و بوو بە فەرمانڕەوا.. ڕێگایەکی تایبەت و سەیری لە بەڕێوەبردنی کارەکانیدا گرتبووەبەر، ئەویش ئەوەبوو زۆر تەریك و بەتەنهایی کاتی دەبردەسەر و دەژیا، ئەوەی لە هەمووشت ناخۆشتر و ئاڵۆزتربوو، ئەوەبوو.. پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەدەبەست، لەوشاندو کۆمەڵەکەسانەی لە هیتلەری سەرکردەی نازییەوە نزیك بووبن، لە خەڵوەتگا شاخاوییە تایبەتە تەرکییەکەیەوە، زۆر جار هەلی ئەوەمان بۆ دەڕەخسا، سەرنجی ئەو تەریکییەی بدەین (مارتن بورمان) لە ڕاستیدا هەرخۆی بە تەنها گەورە و بەڕێوەبەری سەرەکی سەیرانگای(ئوبرسالزبورگ) بوو، کەس نەیدەتوانی قسە لە قسەی بەرامبەر و ململانێی لەگەڵدا بکات.

بە زۆرەملێ زۆرێکی زۆری خانووبەرەو کێڵگەی کۆنی کڕی و ڕووخاندی، ئەوخانووبەرانەی کەوتبوونە ئەملاوئەولای ڕێگاکەوە هەر هەمووی کڕی و هەموویانی ڕووخاند، خەڵکی ناوچەکە لەم کارە بێزاربوون و ڕقیان هەستاو تووڕەبوون. پاشان ڕووبەری ناوچەکەی بە ڕێگاوبان و شەقامی پان و بەرین ڕازاندەوەو بەیەکێیەوەبەستن، هەرچی دارسنەوبەربوو هەر هەمووی بڕییەوە و لەرەگوڕیشەوە هەڵکێشاو ڕێگای شیوو دۆڵ و گردەکانی تەختکرد و چیمەنتۆڕێژی کرد، چەند نیشینگەیەکی بۆ پاسەوانەکانی هیتلەر تیادا دروست کرد.

گەراجێکی گەورەی بۆ چاککردنی ئۆتۆمبیلەکانی سەرۆك تیادا دروست کرد، میوانخانەیەکی بۆ میوانانیش دروست کرد، کێڵگەیەکی گەورەشی بۆ دەستەبەرکردنی پێویستییەکانی سەرۆك و دەستوپێوەندەکەی دروست کردبوو.. خانووی نیشتەجێکردنی بۆ بەڕێوەبەر و کارمەندانی میری کە بەردەوام لە زیادبووندابوون دروست کرد.

(بۆرمان) لە دۆڵ و نشێوو ڕێگاکاندا سەدەها خانوو بەرەی بۆ ئەو کرێکارانە دروستکرد کە لە وەرشەکانی بۆرماندا کاریاندەکرد، هەروەها سەدەها ئۆتۆمبیلی بارهەڵگر بەو ناوەدا دەهاتن و دەچوون، پێداویستی خانووەکانی دەهێنا بۆ بارەگای سەرۆك.

شەوانەش زۆرێکی زۆری خانووەکان کارەبای زۆروبەهێزیان تیادا دادەگیرساند بۆ یارمەتیدانی ئەو کرێکارانەی شەوانە بە نۆبە کاریاندەکرد بۆ ئەوەی کارەکانیان بە زووترین کات تەواوبکەن.

هەندێ جار بۆ تەختکردنی ڕێگاوبانەکان بۆمب و مینیان دەخستەژێر تاشە بەردە گەورەکانەوە و دەیانتەقاندنەوە، گرمەی تەقینەوەکە لە دۆڵەکاندا بە توندی دەنگی دەدایەوە.

## شارەزایی بۆرمان

هیتلەر لەگەڵ ئەو هەموو دەنگەدەنگ و گرموهوڕی تەقینەوانەشدا کەمێشکی کەڕدەکرد، بێزاری دەرنەبڕی و پێیناخۆش نەبوو.. دەیووت.."ئەم کارە پەیوەندی بەسەر شارەزایی و لێهاتوویی (بورمان)ەوە و نابێت من دەست بخەمە ناوکاروباری ئەوەوە". لەبۆنەیەکی تردا وتی..."هەر کاتێك لێرە کارەکان بەگشتی کۆتایی هات.. ئەوا ئەو کاتە شوێن و دۆڵێکی هێمن و ئارامتر دەدۆزمەوە و لەو شوێنەدا خانوویەکی بچووك لە دار وەك خانوەکەی پێشووترم دروست دەکەم، دووربێت لە دەنگەدەنگ و ژاوەژاوەوە.

هەر بەڕاستی کاری ئەو شوێنە کۆتایی نەدەهات، چونکە بەردەوام(بورمان) هەر خەریکی دروست کردنی خانوو و ڕێگاوبان بوو.. کاتێکیش دووەم جەنگی جیهانی هەڵگیرسا.. بورمان لە ژێر زەویدا بارەگایەکی بۆ هیتلەر و یاریدەدەر و دامودەزگاکانی دروستکرد.

کاتێك کۆبوونەوە و گفتوگۆیەکی فەرمی ببوایە، میوانە تایبەتییەکانی هیتلەر دەچوونە نهۆمی یەکەمی خانووەکە، چونکە پێپلیکانەکانی ئەوێ یەکسەر دەچووە ژووری چاوەڕوانی تایبەتی نووسینگەکەی هیتلەر، دەبوا هەر کەسێك بیویستایە بڕوات بۆ گەڕان و پیاسەکردن دەبوو لە پێش خۆیدا پاسەوانێکی بناردایە بۆ ئەوەی ئیزنی بۆ وەرگرێت تا بەشوێنەکەدا بڕوات...

هیتلەر زۆر شانازی بە پەنجەرەی ژووری دانیشتنەکەی خۆیەوە دەکرد،

چونکە ئەگەر پەنجەرەکە بە تەواوی بکرابایەوە، لەو پەنجەرەیەوە، بەتەواوی دەتوانی تەماشای ناوەندێکی بەرفراوانی دیمەنە سروشتییەکان بکەیت، و هەموو دەوروبەرێکیش لێوە دیاربوو.

پەنجەرەکە لە گەورەیی و بەرفراوانیدا بەناوبانگبوو، لەو پەنجەرەیەوە دەتوانی...(ئەنترسبورگ) و(بەرشفارد) و (سالزبورگ) ببینیت...

## داهاتەکانی پەڕتووکی خەبات و تێکۆشانم

شایانی باسە لەسەر داوای هیتلەر خۆی پێشنیازی کردبوو گەراجی ئۆتۆمبیلەکانی لەژێر ئەو پەنجەرەیەدا دروست بکرێت، زۆرجار کە باهەڵیبکردایە بۆنی بەنزینەکەی دەکرد بە لووتی خۆی و هاوەڵەکانیدا.. بەداخەوە نەخشەوپلانی دارشتنی چینی ژێرزەوییەکە بە شێوەیەکی هونەری جوان نەبوو، کە شارەزایی و زانایی تەواوی پێوە دیار بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ژیان لەو بارەگا دێهاتییەی هیتلەردا شێوازێکی تایبەتی هێمن و گەورەیی لە هەموو بوارێکدا پێوە دیاربوو.. (بورمان) لە پارەخەرج کردندا یەکجار دەست بڵاوبوو... کەمتەرخەمی لە پارەخەرجکردن نەدەکرد، ئەمە باری دارایی هیتلەری شێواندبوو، هیتلەر جارێکیان وتی.."هەرچی داهاتی پەرتووکی خەبات و تێکۆشانم هەبوو هەرهەموویم خەرج کرد، و لە بڵاوکەرەوەی پەرتووکەکە داوای هەندێ پارەی قەرزیشم لێکرد لەسەر حسابی ئەو سەد هەزار نوسخەیەی تر کە بڵاوی دەکاتەوە بمداتێ لەگەڵ ئەوەشدا(بورمان) هەرپێم دەڵێت هێشتا ئەو پارەیەش بەشی ئەو تێچوونە ناکات...!!"

ئاوا بەو شێوەیە هیتلەر بەو تەریکییە خۆی بەندکردبوو، دانیشتبوو سەرنجی(ئەنترسبورگ)ی دەدا... و بیری لەو ئەفسانەیە دەکردەوە کە دەیووت.. رۆژێك لە رۆژان ئیمپراتۆرێکی سەدەکانی رابووردووی ناوەراست راستدەبێتەوەو گەورەیی و شکۆ بۆ ئیمپراتۆریەتە رابوردووەکەی دەگێرێتەوە، هیتلەر وتەی ئەو

ئەفسانەیەی بەسەرخۆیدا جێبەجێ دەکرد و دەیووت...
(شاری ئەنترسبورگ)دەبینی؟ دیارە ڕوانینی ماڵەکەی من بەسەر ئەوێدا.. لە خۆوەو بەرێکەوت نییە."

ئەوچوونەپێشەوەوهەڵپەیدروستکردنیخانووەکانلەناوچەی(ئوبرسالزیورگ)دا هەمووشتێك نەبوو کە هیتلەر و بورمانی بەیەکەوە بەستبوو. لەوە گرنگتر(بورمان) هەموو ئامادە باشییەکی بۆ ئەوەکردبوو دەست بەسەر هەموو داهاتێکی دارایی تایبەت و پەیوەندیدار بە حوکومەتی هیتلەردا بگرێت.

هەتا وایلێهاتبوو یاریدەدەرەکانی هیتلەر، بۆچارەسەرکردنی کێشەداراییەکانیان پەنایان دەبردە لای بورمان. هەتا(ئیفابراون) خۆشی جارێك لە بەردەم مندا دانی بەوەدا نا ,کە بۆ جێبەجێکردنی داواکاری و پێویستیە کەمەکانی چاوی لە دەستی(بورمان)ە.

(بورمان) لە ساڵی(١٩٣٤)ەوە و لەوە دواتریش بەلووت بەرزی و پێداگرتنەوە بەردەوام جەختی لەسەر بیروڕایەکی سادە دەکردەوە کە هەردەم و لە هەموو ڕۆژگار و کاتێکدا دەیویست لەگەڵ هیتلەردا بێت و هەمووکات لە خزمەت ئەو سەردارەیدا بێت و لێی دوورنەکەوێتەوە(بورمان) لە بارەگای(بەرگهوف)دا هەمووکات لەگەڵ هیتلەردا بوو، لە هەموو سەفەرو هاتووچۆکانیدا هەمیشە و گشت کات لەگەڵیدابوو. یەك دەقیقە لە بنکەی ڕاوێژکاریدا لێی دوور نەدەکەوتەوە.. هەتا بەیانیان زووش لەگەڵیدابوو لێی دوورنەدە کەوتەوە، لەبەر ئەوە ببووە سکرتێری زیرەك و وریا و باوەڕپێکراوی و نەدەتوانرا پشتگوێ بخرێت و وازی لێبهێنرێت.

لەم کات و ساتەداو لە هەلومەرجێکی وەهادا یاریدە دەرەکانی هیتلەر هەریەکەیان ئیرەیی بەوەی تریان دەبرد و لە ئامادەباشیدا بوون بۆ ململانێ و ڕووبەڕووبوونەوە بەرامبەر یەکتر.

لەسەرەتای ڕۆژەکانی یەکەمدا بۆ دەستەڵاتدارێتی پاڵەپەستۆو هەڵپەی زۆرکرا لە نێوان( گۆبڵزوگۆرنگ و ڕوزنبرك و لیی و هملر و ڕیبنتروب و هس...)دا.

هەریەکە لەوانە دەیانزانی و دڵنیابوون لەوەی(بورمان) کەسێکی ماندو نەناسەو بێزاری نازانێت و هەڕەشە لە شوێن و دەستەڵاتیان دەکات. دڵڕەقی بورمانیش لە هەڵسوکەوت و کارەکانیدا بەرامبەر هەموو کاربەدەستان و فەرمانڕەوایانی میری بە ئاشکرا دیاربوو. من بەش بەحاڵی خۆم، خۆمم لە بۆرمان زۆر دەپاراست و لێی دوور دەکەوتمەوەو شانم لە شانی نەدەدا.

هەر لە سەرەتاوە یەکترمان خۆشنەدەویست، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە بۆنە فەرمییەکانی(ئوبرسالزیورگ)دا بە پێی پێویست بەرامبەر بەیەك ڕووخۆش و تەبابووین و سلاوومان لە یەکتردەکرد، زۆر جار هیتلەر ئەوەی دووبارەدەکردەوە لە مانەوەیدا لە(شاخەکە)، کەش و هەوایەکی ئارامی بیرو باوەڕبەخۆکردن و مێشك سافی پێویستی پێدەبەخشێت لە بڕیاردانی ڕاست و دروست لەسەر کارو فەرمانەکانیدا.

## بەرنامەی پشوو

هیتلەر لە کاتژمێری یانزەی بەیانیدا لە شوێنە تایبەتییەکەی خۆیەوە دەهاتە خوارێ و تەماشای هەواڵی ناو ڕۆژنامەکانی دەکرد و گوێی بۆ هەندێ زانیاری و هەواڵ لە بورمان دەگرت و بڕیاری پێویستی بۆ دەدا، پاشان بە هێواشی درێژەی بە خواردنی بەیانی دەدا. دوای ئەو نان خواردنە ئینجا ڕۆژەکەی دەگوزەراندو بەسەری دەبرد.

هەڤاڵەکانی لە هۆڵی چاوەڕوانیدا لەگەڵیدا دادەنیشتن و کۆدەبوونەوە، هیتلەر بۆ دۆستایەتی کردنی خۆی، خۆی(ئیفابراون)ی هەڵبژاردبوو، (ئیفابراون) هەمووکات لای چەپییەوە دادەنیشت.

(بورمان) له ساڵی(١٩٣٨)ەوە ئەركی بردنە ژوورەوەی ئیڤابراونی گرتبووە ئەستۆ، هەموو جارێك بۆ نان خواردن لەگەڵ خۆیدا دەیهێنا بۆلای هیتلەر، بەمەش لە دیوانی سەرۆكی نازییەكاندا پلەو پایەیەكی بەرزی پەیداكردبوو.

هۆڵی نان خواردن كە بۆ بردنە سەری ڕۆژەكانی هەفتە ئامادەكرابوو دیكورێكی جوان و تایبەتی هەبوو، لە ماڵی دەوڵەمەندەكان دەچوو. ئەو قاپانەی نانی تێدا دەخورا، سپی و زیوی بوون. قاپە سپییەكان، قاپێكی سپی ئاسایی بوو، بەڵام قاپە زیوییەكان بە دروشمی تایبەتی هیتلەر نەخشێنرابوون.

خواردنی هیتلەر خواردنێكی زۆرباش و ئاسایی بوو... بە زۆری ژەمە خواردنەكانی گۆشت و گۆشتاو و شیرینی و ئاوی كانزایی یاخود مەی بوو، ئەوانەی خزمەتیشیان دەكرد، هەرهەموویان لە خزمەتچییەكانی كەشتی (لیبیستاندارت)بوون.هەر هەموویان كراسی سپی و پانتۆڵی ڕەشیان لەبەردابوو، عادەت وابوو، نزیكەی بیست كەس لە دەوری مێزێكی درێژدا بۆ نان خواردن دادەنیشتن.

لەبەر دوورودرێژی و فراوانی مێزەكە كەس نەیدەتوانی لەگەڵ دەوروبەری خۆیدا قسە بكات.

هیتلەر لە ناوەڕاست و ڕووبــەڕووی پەنجەرەكەدا دادەنیشت، و لەگەڵ بەرامبەرەكەیدا قسەو گفتوگۆی دەكرد، ئەوكەسەی بەرامبەر هیتلەر دادەنیشت ڕۆژانە هەر جارەی یەكێكیانی هەڵدەبژارد. یاخود قسەی لەگەڵ ئەو خانمەدا دەكرد كە لای چەپییەوە دانیشتبوو.

## یانە یا خانووی چاخواردنەوە

دوای ئەوەی لە نان خواردن دەبوونەوە، پاش ماوەیەكی كەم ئاپۆڕەكە بەرەو ئەو خانووە دەڕۆیشتن كە بۆ چاخواردنەوە سازكرابوو، ئەم ڕۆیشتنەیان هەر بەڕاستی

لە ڕێ پێوان دەچوو.. چونکە ڕاڕەوەکەی پێیدا دەڕۆیشتن تەسك بوو لە دووکەس زیاتر نەدەتوانرا پێکەوە پیایدا گوزەربکەن.

لە پێش ئاپۆرەکەوە دووکەسی ئاسایش دەڕۆیشتن، کەمێك لەوان دوورتر هیتلەر و یاوەرێکی بەدوایاندا دەڕۆیشتن، لە دوای ئەوانیشەوە هەڤاڵەکانی تر دەڕۆیشتن، بەدوای ئەوانیشدا ژمارەیەکی زۆرتر لە پیاوانی ئاسایش دەڕۆیشتن.

ئەوەی(بورمان)ی تووڕەو بێزار دەکرد، ئەوەبوو هیتلەر بەو ڕاڕەو و ڕێگا سازکراوانەدا نەدەڕۆیشت کە ئەو سازی کردبوو. بەڵکو ماوەی نیو سەعات بەناو ئەو گیا و دار و دەوەنانەدا دەڕۆیشت کە چیمەنتۆ ڕێژنەکرابوو.



خانووی چا خواردنەوە کە لە شوێنێکدا دروستکرابوو، هیتلەر خۆی حەزی پێدەکرد، شوێنەکە بەسەر دۆڵی(برشتفادن)دا دەیڕوانی، هەڤاڵان بەردەوام باسی ئەو دیمەنە سرووشتییە دڵرفێنەیان دەکرد، کە خانووەکەی تیادا دروستکرابوو، هیتلەریش وەڵامی پێویستی دەدانەوە، خانووەکە بریتیی بوو لە کوخێك ژوورێکی

لاکێشەیی بوو... تیرەکەی نزیکی (٢٥) پێ گەورەبوو.

شاندی میوان لەسەر ئەو کورسییانەی بەدەوری مێزە لاکێشەییەکەدا دانرابوون دادەنیشتن.

ئیفابراون لەلایەکی هیتلەرەوە دادەنیشت و لەلایەکەی تریشییەوە خاتوونێکی تر دادەنیشت. ئەوانەشی لە کوخەکەدا جێگایان نەدەبۆوە، دەچوون لە ژوورێکی بچووکی تەنیشت کوخەکەوە دادەنیشتن. لە کوخەکەدا بەپێی ئارەزووی کەسەکە چا، یا قاوە، یا کاکاو دابەش دەکرا، لەگەڵ چاو قاوەکەدا شیرینی کێك دابەش دەکرا و پاشان مەشروباتی ساردی دابەش دەکرا.

هیتلەریش لەو ماوەیەدا بە ئارەزووی خۆی درێژەی بە قسەوباس دەداو نەیدەبرییەوە. باسی بابەتە شتێکی دەکرد، هەڤالان ئەو بابەتەیان باش دەزانی.. زۆر گرنگی و گوێ پێدانیان پێنەدەدا ئەو گرنگی و گوێ پێنەدانەشیان لە ژێر پەردەیەکی ئەستووری بێدەنگیدا دەشاردەوە.

هیتلەر زۆرجار لە کاتی قسەکردندا خەوی لێدەکەوت، برادەرانیش ئەم هەلەیان دەقۆستەوە و لەناو خۆیاندا بەچرپە دەکەوتنە قسەکردن حەزو هیواشیان ئەوەبوو لە کاتی گونجاودا خەبەری بێتەوە. ماوەی چاخواردنەوەکە تا نان خواردنی ئێوارە نزیکەی دوو سەعاتی دەخایاند.. لە کاتژمێری شەشدا کۆتایی بە چاخواردنەوە دەهێنرا.. دوای ئەوە ماوەی (٢٠) بیست دەقیقەی تر پیاسەی دەکرد و خاتوونەکانیش دەوەستان و چاوەڕوانیان دەکرد.

هیتلەر کە دەگەڕایەوە بۆ بارەگای(برگهوف) بە پێپلیکانەکاندا سەردەکەوت و دەچووە شوێنە تایبەتییەکەی خۆی و برادەرانیش بڵاوەیان لێدەکرد. بەپێی ئەو ڕێنماییەی(ئیفابراون) بە(بورمان)ی ڕاگەیاندبوو. زۆرجار(بورمان) لە ژوورێکی بچووکی یەکێك لە سکرتێرە کچەکاندا خۆی دەشاردەوەو دەمایەوە.

# بەرنامەی شەونخونی

هەر وەك هەمان ڕێورەسمی نان خواردنی بەیانی.. دوای دووسەعات، هەڤاڵان بۆنان خواردنی ئێوارە, کۆدەبوونەوە و نانیان دەخوارد. دوای ئەوە هیتلەر لەگەڵ برادەرەکانیدا بەرەو هۆڵی دانیشتن و حەسانەوە دەکەوتنە ڕێ. هەریەکەش لە ئێمە لە هۆڵەکەدا یان لەسەر قەنەفەکان یا کورسییەکان دادەنیشتین.

دوای ئەوەبەشی دووەمی شەو نشینەکە دەستی پێ دەکرد، بەسەر ئەو شاشەی سینامەیەی بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوو. فیلمێکی سینەمایی پیشان دەدرا.

فلیمەکانیش لەو جۆرانە بوو کە لە بەرلیندا نمایش دەکران، هەمەجۆرەبوو.. زیاتر باسی سۆز و خۆشەویستی بوو.. هیتلەر زیاتر حەزی لەو فلیمانە دەکرد کە مۆسیقاو قاچ ڕووتکردنی تێدابوو، دوای تەماشاکردنی فلیمەکە لە دەوری زۆپا گەورەکەدا دادەنیشتین، دانیشتنەکەمان زۆر ناخۆش و بێزاری بوو.. هیتلەریش لە نێوان(ئیفابراون) و یەکێك لە کچەکاندا بە ئیسراحەت لەسەر کورسییەك دادەنیشت.

لە ڕاستیدا لەبەرئەوەی کورسییەکان وادانرابوون کە زۆر نزیك بوون لەیەکەوە، ئامادەبوان نەیاندەتوانی پێکەوە قسەو گفتوگۆ بکەن. تەنها ئەوەندەت دەتوانی بە هێواشی و چرپە لەگەڵ ئەوکەسەی لە تەنیشتەوە دانیشتبوو قسەبکەی.

هیتلەریش بە هێواشی لەگەڵ ئەو دووخانمەی لە ملاولەولایەوە دانیشتبوون قسەی ئاسایی و هیچوپووچی دەکرد. یاخود دەستی(ئیفابراون)ی دەخستە دەستییەوە و بە هێواشی بە گوێیدا دەچرپاند. زۆرجاریش بێدەنگ دادەنیشت و قسەیەکی نەدەکرد، زەق دەیڕوانییە زۆپاکە و بە خەیاڵدا دەڕۆیشت و دەکەوتە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە.

ئێمەش هەموو وەك ئەو بێدەنگ دادەنیشتین و قسەمان نەدەکرد، لە ساڵەکانی

دووەمی جەنگی جیهانیشدا، هیتلەر لەگەڵ ئەو ڕێزو خۆشەویستییە بۆ ڕێزلێنانی سەربازەکانی کە لەم کاتانەدا لەو خۆشییە بێبەش بوون، ئەویش وازی لە فلیم پیشاندان هێنا، لە جیاتی ئەوە قەوانی مۆسیقای لێدەدا.

لەگەڵ ئەوەی هیتلەر کۆمەڵە قەوانێکی شازو نایابی پلەیەکی هەبوو، بەڵام بەرنامەکانی شەوانە هەرهەموویان چوون یەکبوون.بەشێ یادووبەشی ئۆپێرای(فاغنر) لێدەدرا دوای ئەوە دەبوو بە ئۆپەرێتێکی سووك.

هیتلەر زۆر حەزیدەکرد ناوی گۆرانی بێژە کورەکە یا کچەکە بزانێت کاتێك خۆی ناوی ئەو گۆرانی بێژە کورەیا کچەی دەزانی و ناوەکەی دەوت، ڕووی دەگەشایەوەو شانازی پێوەدەکرد، لەم شەونشینە ئاساییانەدا شەمپانیا دەگێردرا..و هیچ خۆشییەکی تێدانەبوو.

دوای ئەوەی(فەرەنسا) داگیرکرا.. لە دوای ئەو شەوانەوە شەمپانیایەکی زۆر هەرزانیان پێشکەش دەکردین.

## شەوی درێژ

بەڵام(گۆرەنگ) و مارشاڵانی هێزەکانی ئاسمانی، کەسەر بەوبوون. باشترین جۆری شەمپانیایان دەخواردەوە. کەس نەبوو لە ئێمە لەدوای سەعات یەکەوە چەند هەوڵی بدایە، بتوانێت خۆی ڕابگرێت و باوێشك نەدات. سەعاتێکی تەواو بێزار و بێتاقەت بە بێدەنگی دادەنیشتین.

لەو ماوەیەدا(ئیفابراون) چەند قسەیەکی بە گوێی هیتلەردا دەچرپاند و هەڵدەسا دەچووە ئەو ژوورە تایبەتەی کە بۆ ئەو تەرخانکرابوو. پاش چارەکێك هیتلەریش هەڵدەساو دەچووە شوێنە تایبەتەکەی خۆی، دوای ئەو هەموو کات و ساتە بێزاری و ماندوبوونە.. پشوویەکمان دەدا و هەناسەیەکی ماندووبوونمان هەڵدەکێشا.

وەك قوتابی قوتابخانە کە دوای دەرس خوێندن بۆ پشوودان بەردەبن، دەکەوتینە

قسەو ژاوەژاو بەردەبووینە شەراب خواردنەوە، لە کاتژمێری دووی شەودا هیلاك و ماندوو وپرزە لێبڕاو دەچووینەوە بۆ ماڵێ. دوای چەند ڕۆژێك لەو شەونخونییە و بەردەوامی و دابڕان و و بێکاری و کات بە فیڕۆدانە، هەستم کرد تووشی نەخۆشی(ئەلجیل) (ڕەقیتە) بووم.

بۆ جێبەجێکردنی کاروباری نووسینگەو بەڕێوەبردنی کارەکان من لەگەڵ ئەو کارمەندانەدا نەبووم کە لە ژێر دەستمدا بوون، ئەو کاتانە نەبێت کە وتووێژی فەرمی لەگەڵ فوهرەردا ساز دەکرا، ئیتر ئەوکاتە وازم لە بێکاری دەهێناو دەچوومەوە سەر کارو فرمانە بە سوودەکانمان، من نەمدەتوانی خۆم لەو شەونخونی و دانیشتنەبێزار و ناخۆشانە بدزمەوەو نەچم، چونکە من یەکێك بووم لە کەسە زۆر نزیکەکانی سەرۆك لە(ئورسالزبورگ)دا.

## بیروڕای سەرۆک دەربارەی ژن

ببوەعادەت(ئیفابراون)لەکۆڕودانیشتنیئەندامەگەورەودێرینەکانیحیزبدائامادەی ئەو دانیشتنانە دەبوو، بەڵام لە کۆڕوکۆبوونەوەکانی پیاوماقوڵان و وەزیرەکانی(ڕایخ)دا نەدەهات و لەگەڵیاندا دانەدەنیشت، لەکاتێکدا(گۆرەنگ) و ژنەکەی دەهاتن، دەبوا(ئیفابراون) لە ژوورەکەی خۆیدا بمابایەوە و نەیەتە دەرێ، هەندێ جار من لەگەڵیدا بۆ ژوورە تەنهاییەکەی کە لە تەنیشت ژووری نووستنی هیتلەرەوەبوو دەڕۆیشتم.

ئیفابراون وەك حەپسێك لەو ژوورەدا بەبێزاری و دڵەڕاوکێ دەمایەوە و نەیدەوێرا بۆ گەرانیش بچێتە دەرەوە، لە ترس ئەوەی نەدابا یەکتربببینن.

جارێك پێی وتم.. ڕەنگە ئەگەر بچمەدەرەوە لە ڕێگا بە گۆرەنگ و خێزانەکەی بگەم و یەکتربببینین. هیتلەر زۆر گرنگی بەبوون و ئارای ئیڤابراون نە دەدا.. زۆرجار بەرەورووی، بێ ئەوەی شەرمی لێ بکات بیروڕای خۆی بەرامبەر ژن دەردەبڕێ و دەیووت:"پێویستە پیاوانی ژیرو تێگەیشتووی خاوەن دەستەڵاتی گەورە ژنی تێنەگەیشتوو نەخوێندەواریان هەبێت.. سەرنج لەوەبدەن چی دەبوو ئەگەر من ژنێکی زیرەك و ژیرم ببوایە، دەستی بکێشایەتە کاروبارمەوە و چەنەحانێی لەگەڵدا بکردمایە.



من لە کاتی بێکاریمدا حەز دەکەم بە تەنهابم و کەسم لانەبێت، ئا لەبەر ئەوەیە حەز ناکەم ژن بهێنم و ژنم هەبێت، ئای لە منداڵ چەند ئێش و ئازار و دەردی سەریان هەیە.. بەهەرحاڵ ئەگەر کوڕم هەبوایە، ئاسایی دەیانکردە جێنشینم، لە ڕاستیدا کەسێکی وەك من هیچ هیواو ئاواتێکم بەوەنییە کە کوڕێکی بەتوانام هەبێت ئەمە ژیانە و هەرواش دەبێت، بۆنموونە کورەکەی (گوتە).

ئەو کورە کەسێکی بێزراو دەست لێ شۆردراوە.." هیتلەر درێژەی بە قسەکانی دەداو دەیووت.."زۆرێکی زۆری ژنان دەوروخولم دەدەن، چونکە من پیاوێکی بێ ژنم ئەمە کاریگەری گەورە دەکاتە سەرم، بە تایبەت بۆ ئەم کاتە کە ئێمە ئێستا لە خەبات و تێکۆشانداین،.

ئەم کێشەیە هەر هەمان کێشەیە کە بەرەنگاری ناودارانی سینەماو ئەستێرەکانی دەبێتەوە، ئەوانە کە ژن دێنن و هاوسەری پێکدێنن لە پێش چاوی ئەوانەی خۆشیان دەوێت و پابەندن پێیانەوە پلەوپایەیان کەم دەبێتەوە، لەبەرئەوە

ئیتر وەك خۆشەویست و پەرستیارێك لە پێش چاویاندا نانوێنن".

هیتلەر لە ناخی دەروونییەوە بڕوای بەخۆی بوو لەلایەنی جنسییەوە لە پێش چاوی ژناندا زۆر سەرنج ڕاکێشە، لێرەشدا هیتلەر زۆر دڵنیا نەبوو لە خودی خۆی، ئایا ژنان بۆیەکی خۆشیان دەوێت و پابەندن پێیەوە چونکە ڕاوێژکاری(ڕایخ)ە... یاخود ئەو هیتلەری ئاساییەو بەس، ئەوەی شایانی باسە هیتلەر حەزی نەدەکرد لەگەڵ هیچ ژنێکی زیرەك و تێگەیشتوودا پەیوەندی ببەستێت.

دیارە هیتلەر ئەوەشی نەدەزانی بەم قسەوقسەلۆکانەی دەریبدەبڕێ چەند سووکایەتی بەو ژنانە دەکات کەلەو کۆڕودانیشتنەدا بەرامبەری دانیشتبوون و پێیان ناخۆشە.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هیتلەر زۆرجار هەندێ سۆزوبەزەیی دەروونی و لێپرسیارێتی خێزانی دەردەبڕی، جارێکیان(ئیفابراون) بۆ خلیسکانێی سەربەفر چووە دەرەوە، بۆ کاتی چاخواردنەوە دواکەوت و نەهاتەوە، هیتلەر زۆر بە ئاشکرا بۆ ئەو دواکەوتنەی بێ ئارامی و دڵەڕاوکێی پێکەوتبوو، بەردەوام بەبێ ئارامی و دڵە کوتییەوە هەر تەماشای کاتژمێرەکەی دەکرد. لە ترسی ئەوەی نەبادا تووشی ڕووداوێکی خراپ بووبێت.

## شوێن و پێگەی ئیفابراون

ئیفابراون لە نێوان خێزان و ناوەندێکی مامناوەندیدا پێگەیشتبوو، من خانەوادەو کەس و کاریم نەدەناسی و کەسیش ئەوانی نەدەناسی کەسوکاری حەزیاندەکرد تا کۆتایی نادیاربن و دووربن لە خەڵکییەوە کەس نەیانناسێت، کاتی خۆی باوکی مامۆستابوو.

ئیفابراون لە هەمووشتێکدا مامناوەندی بوو.. جلوبەرگی ئالاّووالاّی نەدەپۆشی، حەزی بەڕێکوپێکی و جوانی و هێمنی بوو. هەردەم خۆی بەو ملوانکە هەرزان و کەم نرخانە دەڕازاندەوە کە هیتلەر لە جەژنەکانی سەری ساڵ و لە دایکبوونیدا

پێشکەشی دەکرد، ئەو خشڵانە بە جۆرە بەردێکی نایابی کەم نرخ ڕازابوونەوە، هیچ یەکێکیان لە چەند سەد مارکێك زیاتری پێنەدرابوو، ئەوەش شایستەی پلەوپایەی ئەوکەسە گەورەیە نەبوو کە پێشکەشی دەکرد.

بۆ ئەو کارە(بورمان) کاری هێنان و کڕینی ئەو جۆرەخشڵانەی خستبووە سەرشانی خۆی بۆ ئەوەی هیتلەر ئەوەی باش و گونجاوبێت هەڵی بژێرێت.



ئیفابراون زۆر گرنگی و گوێی بە سیاسەت نەدەدا و هەوڵیشی نەدەدا کار بکاتە سەر هیتلەر و خۆی لە کاروباریدا هەڵنەدەقورتاند و کاریگەری هەبێت بۆی.

هەستێکی ناسك و زیرەکانەی باش و تەواوی هەبوو... هەندێ جار ڕەخنەو بۆچوونی خۆی لە هەندێ کێشەدا کە لە میونیخدا دەبوو، دەردەبڕی.

ئیفابراون حەزی لەوەرزش بوو.. بەتایبەت خلیسکانەی سەر بەفر.. من خۆم زۆرجار لە نزیك بارەگای شاخاوییەکەوە خلیسکێنەی سەر بەفرم لەگەڵدا دەکرد، جارێك هیتلەر هەفتەیەك بۆ بارەگا شاخاوییەکەی خۆی نەڕۆیشت ئەو هەفتەیە پشوویدا بە ئیفابراون..

ئیفابراون بێ ئەوەی کەس بزانێت لەگەڵماندااهات و چووین بۆ ناوچەی(تسیرول) لە نەمسا، ئەفسەرە لاوەکان لێمان کۆبوونەوە و وازیان لێ نەدەهانین هەتابەرە بەیانی ڕۆژی دوایی سەمایان لەگەڵدا کرد.

ئیفابراون ژنێك نەبوو وەك (مادام دی بومبیدۆز) خۆی بە ژنێکی گەورەولووت بەرز پیشان بدات.. لە ڕاستیدا وەك ژنێکی ئاسایی خۆی دەنواند کە ماوەیەك بە ژیانی هیتلەردا گوزەری کردبێت و بەس من زۆر بەداخ و خەم و پەژارەوەم بۆی.. بەڕاستی هیتلەری زۆر خۆشدەویست، من کە لەو ڕاستییەی گەیشتم لە پێش چاومدا زۆر ڕێزدار و گەورەتربوو، ئێمە هەردووکمان یەك هەستمان هەبوو، بۆرمانمان خۆشنەدەویست و هیچمان حەزمان نەدەکرد بەرەنگاری بۆرمان ببینەوە چونکە ئەو جوانی و سیمای لادێکانی نەدەپاراست و ڕێزی نەدەگرت و کاول و وێرانی دەکردن، دارو دارستانەکانی لادێکانی دەبڕییەوەو شێوەکەی ناشیرین دەکرد، هەروەها بەرامبەر بەژنەکەی خۆی بێ وەفاو ناپاك بوو.

کاتێك لە دادگایی کردنی(تورنبرگ)دا بیستم هیتلەر پێش مردنی بە ڕۆژونیوێك(ئیفابراون)ی مارەکردبوو. زۆر دڵشادو شادومان بووم بەو هەواڵە. گەرچی من باش دەمزانی هیتلەر چۆن تەماشای دەکرد. وچۆن تێڕوانینێکی بەرامبەر هەموو ژنەخانمەکان هەبوو.

## هیتلەر و منداڵ

من هەمووکات ئەوەم دەپرسی ئایا هیتلەر، بەڕاستی منداڵی خۆشدەوێت، هەرکاتێك بە منداڵێك بگەیشتایە بیناسیایەو نەیناسیایە هەڵسوکەوتێکی سەیری دەکرد هەروەك ئەوەی هیچ سۆز و خۆشەویستی باوکایەتی یەك بزانێت.

نەیدەزانی بەباشی قسەی لەگەڵدا بکردنایە... تەنها یەك دوو قسەی لەگەڵدادەکردن و پاشان ڕووی لێوەردەگێڕان و لەگەڵ ئەو کەسەی لەگەڵیدابوو دەکەوتەوە قسەو گفتوگۆ.

لەگەڵ ئەوەشدا وایدەڕوانییە منداڵ کە خوێنی نوێ و منداڵان نەوەو هیوای دوارۆژن، هیچ گرنگی بەلەشولارو سیمایان نەدەدا. هیتلەر گەرچی چەندەها

جار مناڵەکانی منی بینییوو، ڕۆژێك لە ڕۆژان جارێك نەمدی هیچ هەواڵ و سۆز و قسەیەکیان دەربارە بکات، لەو خانووەی چامان تێدا دەخواردەوە، دوای چاخواردنەوە باسی زۆرشتی وەك جلوبەرگ و پەروەردەی سەگ و شانۆ و فلیم و ئۆپێراو ئەکتەری ناوداری ئۆپێراو سینەماو هەندێ شتی هیچ و بێ مانای هەندێ خێزان دەکرا، بەڵام ئەو شتەی زۆر شاز و دەگمەن بوو لە هیتلەردا لەو کۆڕو کۆمەڵانەدا بەهیچ جۆرێك باسی دوژمنانی خۆی نەدەکرد، بەڵام لەلایەکی ترەوە گاڵتەی بە نزیکترین کەسانی دەوروپشتی خۆی دەکرد، لە دانیشتنە تایبەتییەکانی هیتلەردا هیچ نەهێنییەکی تێدانەبوو، بەڵام دەربارەی ژن هەمووشتێکی بێمانای پێدەووتن، سەرنجی ناخۆش و خراپی دەربارەی دوویاریدەدەرەکانی دەردەبڕی.

## هێتلەر و کەنیسە(دێر)

فوهرەر.. لە بەردەم یاریدەدەران و ڕاوێژکارە سیاسییەکانیدا لە سەرکەنیسە دنیای بەسەریاندا ژێروژوور و وێران دەکرد، بەڵام لەبەردەم ئافرەتاندا تۆزێك لەو هێرش و هەڵمەتانەی کەمدەکردەوە و دەیووت:"کەنیسە بۆ میللەت شتێکی زۆر زەرورو پێویستە، کەنیسە هۆکارێکی بەهێزو بەتوانایە بۆ ئاسایش و سەقام گیری وڵات" هیتلەر واتەماشای کەنیسەی دەکرد کە ئامێرێکە لە دەستیدا چۆنی بوێت وای هەڵدەسووڕێنێت، هەتا دوا کاتەکانی ژیانی لە کۆڕو دانیشتنەکانیدا کەنیسەی وادادەنا کە هۆکارێکی پێویستە بۆ دەوڵەت.

سەرزەنشتی و ڕیسوای ئەو کۆڕولایەنە نەیارانەی دەکرد کە دژی کەنیسە بوون، بەوەباسی دەکردن کە ئەوەتاوانێکە دژی پاشەڕۆژی گەل دەکرێت، و دەیووت بیروباوەڕی حیزبی نازی جێگای کەنیسە ناگرێتەوە دەربارەی کەنیسە بیروڕایەکی لا دروست ببوو، دەیووت..

کەنیسە لەگەڵ دەوروزەماندا ئامانجی سیاسی ئیشتراکی نیشتمانی(نازی) تەبەنی دەکات و بەهۆی ئەوەوە لە نیشتماندا ئاینێکی حیزبی نوێ لە جیاتی

بیروڕای سۆفییە کۆنەکانی سەدەی ناوەڕاستدا دێتەکایەوە.

(بورمان) هەرکە دەبینی هیتلەر لە مونولوجەکانیدا هێرش دەکاتە سەر کەنیسە، کاغەزی دەگرت بەدەستەوەو ئەو قسانەی لە قسەکانی سەرۆکەکەیدا گرنگ بوون دەینووسی، هیتلەر لە ساڵی(١٩٣٧)دا کەزانی زۆرێکی زۆری دەسوپێوەندو لایەنگرانی بەپێی ڕێنمایی حیزب لەسەر ئەو بەرهەڵستی کردنەی کەنیسەکە بۆ پلانەکانی هەیەتی، وازیان لە کەنیسە هێناوەو پشتیان تێکردووە.

فەرمانیدا بە گەورە یاریدەدەرانی.. گورنگ و گوبلز و کەسانێکی تر، کە ئەوانیش بچنە پاڵ ئەوان و پشت لە کەنیسە بکەن، وتی.."من خۆم بە تەنها بە ئەندامی کەنیسەی کاسولیکی دەمێنمەوە."،

گەرچی خۆشی هیچ مەبەست و سۆزێکی بەرامبەر بە کەنیسەش نەبوو، بەڵام بەهۆی پلەوپایە گەورەکەیەوە بوو، هەتا ئەو ڕۆژەی خۆی کوشت هەروا بەو شێوەیە مایەوە، بەڵام ئەمانەهەموو ڕووکەشی و هەڵپەرستی بوو، هیتلەر حەزارەتی ئیفریقیەکانی لە هەموو بوارولایەنێکدا بە پێشکەوتوترین حەزارەتەکان دادەنا، دەیووت.. بەروون و ئاشکرا زیرەکی و شارەزایی ئەغریقییەکان لە ئەندازیاریدا بەباشی دەردەکەوێت.

ڕۆژێکیان وێنەی کچە مەلەوانێکی جوانی بەمایۆیەکی مەلەوە بینی.. وتی.."ئای لەم لەشولارەجوانە.. گەنجان لەم سەدەیەدا بەهۆی وەرزشەوە خەریکن دەگەنە ئاستی جوانی و شۆخوشەنگی ئەغریقییەکان". هەروەها هیتلەر لە قسەوباسەکانیدا باسی ئەو حەزوئارەزووی ڕاوکردنەی(گۆرەنگ)ی دەکرد... دەیوت.."مرۆڤ چۆن حەز و ئارەزووی شتێکی وایدەبێت.. کوشتن و سەربرینی ئاژەڵ کاروپیشەی قەسابە، خەرجکردنی پارەیەکی زۆر لەو پێناوەدا نەگبەتی و زەرەر و زیانە.. من دڵنیام لەوە ڕاوچی شارەزا لە ڕاودا دەچن ئەو ئاژەڵانە دەکوژن کە زیان بەخشن و زیان بەوانی تر دەگەیەنن، بەڵام ئەمرۆ دەبینین کابرایەکی زەبەلاح لە دوورەوە ئاژەڵێك دەکوژێت ئەمە لە پێناو سوود و بەرژەوەندی خۆیدا ئەم کارەدەکات، ڕاوکردن و پێشبڕکێی ئەسپ و ئەم جۆرە شتانە ئەمانە لە پاشماوەکانی سەدەکانی دەرەبەگایەتی لە ناوچووە".

# ئیفا و سەگەکە



پێش هەڵگیرسانی جەنگ هەندێ جار هیتلەر دەیووت.. هەرکە هەموو ئامانجەکانم هاتەدی.. ئەوکاتە بە فەرمی دەست لەکاردەکێشمەوەو دەچم لە زێدی لە دایکبوونمدا ژیان دەبەمەسەر و لەسەر شانۆی سیاسی حەقی هیچم نابێت و واز لە هەمووشتێك دێنم و ئەم کارە بۆنەوەکانی دوای خۆم جێدەهێڵم با ئەوان کاربکەن، ئەو کاتە خەڵکی بەزووترین کات هیتلەر لە بیردەکەن و پشتی تێدەکەن و وازیلێدێنن.

بەسۆز و بەزەییەکەوە بەرامبەر خودی خۆی دەیووت.."رەنگە لە بۆنەکانیشدا هەندێ لە برادەرو هاوکارە کۆنەکانم بێن بۆ لام و سەردانم بکەن، بەڵام ئەوەم زۆر لاگرنگ نییە و گوێی پێنادەم لە خاتوو براون زیاتر کەسی تر لەگەڵ خۆمدا نابەم.. خاتووبراون و سەگەکەم، بەتاقی تەنها بە تەریکی بۆخۆم لەو شوێنەدا ژیان

دەبەمەسەر، کێ حەزدەکات ماوەیەکی زۆر لەگەڵ کەسێکی تەنهادا بمێنێتەوە..؟ بێگومان هیچ کەس. خەڵکی دەچن بۆلای ئەو کەسەی شوێنی منی گرتۆتەوە، ڕەنگە لە ساڵێکدا جارێك خەڵقانێك بەهۆی جەژنی لە دایکبوونمەوە بێن بۆ لام و سەردانم بکەن.. هەڤاڵەکانیش کلکە لەقێ و شان تەکاندنیان بۆ دەکرد و خۆیان لێدەبردە پێشەوەو جەختیان لەسەرئەوە دەکردەوە کە هەردەم بەوەفادەبن بۆی و هەتاهەتایە وازی لێناهێنن و لە دەوری دەبن و لێیدوورناکەونەوە.

## دووڕەنگە(إحتمالان)

ئێمە کۆمەڵە کەسانێك بووین زۆر نزیك بووین لە هیتلەرەوە، لەبەرئەوە لە قسەکردن و ناوبردنیدا پێمان نەدەووت(فوهرەر) بەڵکو هەر پێماندەوت(سەرۆك) و بەسەرۆك ناومان دەبرد، هەروەها ئەو سەلامەش کە دەوترا..(هایل هیتلەر) ئێمەئەو سەلامەمان بۆ نەدەکرد.. بەڵکو تەنها پێماندەووت(بەیانیت باش) گەرچی ئەو زۆر جاریش ماوەی ئەوەشی نەدەداین ئەو بەیانی باشەی لێ بکەین، بەڵکو ئەوخۆی بەیانی باشی لێدەکردین، هەندێ جار لە ناوخۆماندا بە هەندێ قسەی پێدەکەنین. یەکێك لە سکرتێرە کچەکانی کە ئەویش خاتوو...(عزولسین شرویدەر) بوو، لاسایی قسەکانی دەکردەوە و دەیوت: دوو(ئیحتمال) هەیە.. ئەم برگەیەی(ئیحتمال)ەی لە زۆربەی قسەو باسەکانیدا بەکاردەهێنا دەیووت..."دوو ئیحتماله.. ئەشێ ئەمرۆ باران بباریێ و ئەشێ بارانیش نەبارێ..".

ئیفابراون زۆرجار لەسەر نان خواردنی بەیانی یا ئێوارەدا بێ ئەوەی بترسێ یا شەرمی لێ بکات.. پێیدەوت.."ئەم بوینباخەت(گەردن پێچ)ەت لەگەڵ جلەکانتا ناگونجێت.. ئیفا ناوی خۆی نابوو(دایکەلادێییەکە) من زۆرجار لە دڵی خۆمدا دەمووت.. بۆچی نابێت من خۆم بە هاوڕێی یا برادەری هیتلەردانەنێم.. چونکە لە هەموو کاتێکدا لەگەڵیدا بووم و چرکەیەك لێی جیانەدەبوومەوە. هەروەها یەکێك بووم لە یاریدەدەرو ڕاوێژکارە نزیکەکانی بەتایبەت بەهۆی کاری ئەندازییەمەوە

كه سەركردەی نازییەكان لە هەموو كارێك زیاتر دڵی پێخۆشبوو.

لە هەموو ژیانمدا كەسێكم وەك ئەو نەدیبوو هێندە بەكەمی هەست و سۆزی دەربڕێ.. هەركە سۆزیشی دەربڕیایە، جاتوورەبوون بێت یاشتێكی تر.. دوای ئەوە گورج خاودەبۆوە هەروەك ئەوەی هیچ رووی نەدابێت و بەوە هەمووشتێكی كردبێت. لە بەندیخانەدا لەگەڵ(هس)دا دەربارەی ئەولایەنەی ژیانی هیتلەر قسەمان كرد.. و هاتینە سەر ئەوە كە مرۆڤ هەندێ جار وادەزانێ زیاد لە پێویست لە خەڵكی نزیك بۆتەوە، ئینسانیش هەردەم قابیلی گۆران و هەڵەكردنە.

هیتلەر لە ژیانیدا هەرگیز لەگەڵ ئیفابراوندا زۆر ئارام و دڵخۆش نەبوو، هەڵسوكەوتیشی لەگەڵیدا شێوەیەكی ئینسانی نەبوو، گەرچی زۆرجاریش بە(پشەبچكۆل) بەچكە پشیلە بانگی دەكرد، بەڵام هەردەم لە نێوان فۆهرری وڵات و كیژە ئاساییەكەدا بۆشاییەكی بەردەوام لە پەیوەندییەكانیاندا هەبوو.

لە تشرینی دووەمی ساڵی(١٩٣٦)دا هیتلەر لە بارەگا شاخاوییەكەیدا ماوەیەكی زۆر لەگەڵ(كاردینال فولهایبر)دا پێكەوە كۆبوونەوەو دانیشتنیان كرد، لەوەدەچوو كاردینال لەو دانیشتنەدا ئەو سەركەشییە ترسناك و ترسەی خستبێتە پێش چاوی كە پێی هەڵدەسێت. پاش ئەوەی كاردینال رۆیشت، من و هیتلەر بەتەنها پێكەوە لەبەردەم پەنجەرە گەورەكەدا دانیشتبووین.. رووی تێكردم.. وتی.."دەربارەی ئەو پلانانەی دامرشتووە.. دوو رێگام لە پێشدایە یەكەم پێویستە لە پلان و كارەكانمدا بەردەوام بم تا كۆتایی.. جا یا سەركەوتوو دەبم تێیدا.. یاخود ژێركەوتوو دەبم و لەناودەچم، ئەگەر سەركەوتووبم تیایدا ئەوائەوكاتە دەبم بەگەورەترینی پیاوی ناو مێژوو. خۆ ئەگەر سەركەوتووش نەبووم، دەبا نەوەكانی دوای خۆم نەفرەتم لێ بكەن وببم بە پەندی رۆژگار، مێژوو بە سووكی و خراپی ناوم بهێنێت.

هیتلەر پێش جەنگ لەوە دەترسا زۆر نەژی، چونكە لە ساڵی(١٩٣٥)ەوە تووشی ئازاری گەدە ببوو.. هەوڵی تەواوی دەداو دەیویست بەسەر ئازارەكانیدا زاڵ بێت.. لەبەرئەوە خواردنی كەمی دەخوارد و جۆری خواردنەكانی دەست نیشان كردبوو، هەموو خواردنێكیشی نەدەخوارد كە تەماشای سەر سفرەی دەكرد بەو

هەموو خواردنە بەتام و خۆشانە ڕازاوەتەوە.. دەیوت.." ئاخر ئینسان ئەم هەموو خواردنە خۆشانە بینێت.. چۆن دەتوانێت خۆی پێڕابگیرێت و لێیان نەخوات... دەتەماشای ئەم هەموو خواردنانە بکەن.. پێویستە دوکتۆر ڕێگا بە ئینسان بدات حەزی لەچییە بیخوات، ئەمانە هیچیان بۆ من باش نین، دوای هەر ژەمە خواردنێك ئازارم بۆ دێتەوە و تووشی ئازاردەبمەوە".

ئەی ئەگەر خواردن نەخۆم.. چی بخۆم..؟ و چۆن بژیم..؟ زۆرجار ئازاری گەدەی وایلێدەکرد بۆ ماوەی نیو سەعات زیاتر قسەو گفتوگۆی نەدەکرد، زۆرجاری تریش هەبوو لەتاو ئازار نەدەهاتەوە ناو ئەو کۆڕوکۆمەڵانە. زۆرجار هاواری لەوەبوو کە تووشی سك ئێشە و باکردن و هەزم نەکردنی خواردن و دڵەکزەو بێخەوی بووە.

جارێك ئیفابراون پێی وتین.. هیتلەر گەرچی تەمەنی نەگەیشتۆتە پەنجا ساڵان... پێمدەڵێت.. "پێویستە بەزووترین کات وازت لێبێنم.. تۆ چ سوودێك لە پیاوێکی پیری وەك من دەبینیت..؟".

## ئازارەکانی هیتلەر

ئامادەباشی بۆ ئەوەکرا کە تێڕوانینی پزیشکی تایبەت بۆ تەندروستی هیتلەربکرێت، وابڕیاردرا کە هیتلەر ببرێت بۆ خەستەخانەیەکی سەربازی و لەوێدا تێڕوانینی بۆ بکرێت، چونکە لەو خەستەخانە سەربازییەدا دەتوانرێت لە هەموو خەستەخانەکانی تر زیاتر نەهێنی ئەو کارە بپارێزرێت، بەڵام هیتلەر هەر هەموو ئەو پێشنیارانەی ڕەتکردەوە، وتی من توانای ئەوەم نییە، کە بیریش لەوە بکەمەوە کە نەخۆشم و پێویستم بە چارە هەیە.. چونکە ئەمە دەبێتە ئەوەی پلەوپایەی سیاسیم لاواز بکات، بەتایبەت لە دەرەوەی وڵاتدا.

بەهیچ جۆرێك نەیدەهێشت هیچ پزیشکێکی شارەزا تێڕوانینی پزیشکی بۆ بکات گەرچی لە بارەگاو شوێنە تایبەتییەکەی خۆشیدا بوایە.

ئەوەی من بزانم وبیرم بێت بەهیچ جۆرێك هیتلەر هیچ تێڕوانینێکی پزیشکی

نەهێنی بۆ نەکرابوو، خۆی بڕوای بەوەبوو کە ئیش و کارەکانی ئەوەدەسەلمێنێت کە سەرۆك دەتوانێت بەرگەی هەموو ئازارێك بگرێت و دەتوانێت بەرەو ڕووی هەموو کێشەو ناخۆشییەك بێتەوە.

(هزیك هوفمان)ی وێنەگری تایبەتی هیتلەر توانی هیتلەر ڕازی بکات، کە دوکتۆر(موریل) فەحسی بکات و لە تەندروستی بڕوانێت، هزیك هەوڵەکەی سەری گرت و کارەکانی دوکتۆر(موریل) هەر بەڕاستی ئەنجامێکی خێراوباش و سەرورهێنەری هەبوو، دوکتۆر بۆ ئەم کارە شانازی دەکرد کە توانی ژیانی هیتلەر ڕزگار بکات، بۆ یەکەمجار هیتلەر بڕوای بەوە هێنا.. پزیشك ئەندامێکی سوود بەخش و باشن لە کۆمەڵگادا.. وتی"کەس لەمەوپێش وا بەڕوون و ئاشکرا بەم شێوەیە بە دووردرێژی و بەوردی باسی ئەو نەخۆشییەی منی بۆ نەکردبووم کە بەدەستییەوە دەمناڵاند، ئەو دەرمان و چارەسەرییانەی دوکتۆر مۆریل بۆ منی کردووە، کارێکی زۆر مەعقول و ژیرانەبوو.. من بڕوای تەواوم بەم پزیشکە هەیە.. چیم پێ بڵێت و چ فەرمانێك بدات بەسەرمدا جێبەجێی دەکەم و لە قسەی دەرناچم.

براندت خۆی حەبی دەدایەو دەرزی لێدەدا، دوکتۆر(براندت) پزیشکی تایبەتی هیتلەر، دەیووت.. من بۆ ئەم چارەسەری و دەرمانانە پرس و ڕام بە هەندێ پزیشکی برادەری خۆم کردووە دەیانووت.. ئەم حەب و چارەسەرییە تووشی ئالوودەبوون (إدمان)ی دەکات و لەسەری ڕادێت... هەر لە ڕاستیشدا ئەو چارەسەرییە بوو بە چارەسەرێکی درێژخایەن و ئالوودەبوون و نەیدەتوانی وازی لێ بهێنێت.

چارەسەرێکەش بریتی بوو لە مادەیەك کە لە گونی ئاژەڵ و گەدەدابوو، هەندێ ئامادەکراوی کیمیاوی و سەوزەواتیشی تێکەڵ دەکرا.

# گەورە پزیشکی شرینقە لێدەری ڕایخ

جارێکیان(گۆرەنگ) گاڵتەی بە دوکتۆر(موریل)کردوو بە(گەورە لێدەری شرینقە لە رایخ)دا ناوی برد.

لە ڕاستیدا ئەو برینە درێژخایەنەی لە قاچی هیتلەردابوو بەتەواوی بەهۆی ئەو شرینقانەوە کە بۆی بەکاردەهێنا سارێژ بوون و نەمان و گەدەی سەرۆکیش پاش چەند هەفتەیەکی کەم چاکبۆوەو ئازاری نەما، خواردنی زۆر بەئیشتیهاو بە دڵ دەخوارد، ژەمە خواردنەکانی وەك ئامێر هەڵدەلووشی و دەیخوارد.

هیتلەر هەمیشە سوپاس و باسی (دوکتۆر مۆریلی) دەکرد، و دەیووت"ئەگەر (دوکتۆر مۆریل) نەبوایە من چیم لێ بەسەردەهات، بەڕاستی ئەو چارەسەری منی کرد.. چارەسەرییەکی زۆر سەیرو بێ هاوتابوو..".

هیتلەر بەشێوەیەکی زۆر سەیر دەیتوانی کار بکاتە سەرکەسانی ترو دەوروبەری، بەڵام لەم حاڵەتەدا بەپێچەوانەوەبوو، قسەکانی دوکتۆر کاری تێکردبوو، بڕوای تەواو و زۆری بە پزیشکە شارەزاو زانا گەورەکەی هێنابوو، بڕوای تەواوی پێی بوو، ڕۆژێ لە ڕۆژان بەتەنها وشەیەکیش ڕەخنەی لێ نەدەگرت، لەبەرئەوە دوکتۆر موریل لە ناو کۆمەڵەکەدا بوو بە ئەندام و کەسێکی زۆر نزیکی سەرۆك.

لە کۆتایی ساڵی(١٩٣٧)دا کە چارەسەرییەکانی (موریل) شکستی هێنا و سەرکەوتوو نەبوو.. هیتلەر لە بەخت و شانسی خۆی کەوتە گلەیی و دەیووت.. نازانم من چەندی تر دەژیم، ڕەنگە دوای مردنی من ئەو ساکاری بیناسازی لێرەدا کۆتایی بێت.

هیتلەر لە(٢دووی ئایاری ساڵی ١٩٣٨)دا وەسیەتنامە یاساییەکەی خۆی نووسییەوە. و لە(٥) پێنجی تشرینی دوومی ساڵی ١٩٣٧دا وەسییەتنامە سیاسییەکەی بەزارەکی ئاشکرا کرد، لە بەردەم وەزیری ناوخۆو سەرکردە

سەربازییەکانیدا پلانەکانی خۆی ناوزەدکرد و وتی.. ئەمە دوا وەسییەتمە پێش مردنی خۆم بۆتانی ئاشکرا دەکەم، بەڵام ئەوکەسانەی لە دەوروبەری سەرۆك بوون و لێینزیك بوون و هەموو شەوێك بەبێزارییەوە بەردەوام ئەو فلیمە ئوپێرا کورتانەیان دەبینی و گوێیان لەو قسانە دەبوو کە بەردەوام دەربارەی کەنیسەی کاسۆلیکی دەکرد و ئەو قسەوباسە زۆرەی دەربارەی خواردن و خۆلێپاراستنی لەوخواردنانەو ئەو باسی سەگە ئەلزاسییانەی بۆ دەکردن.. و گوێیان لەو مۆنۆلۆجانە دەگرت کە دەربارەی پەرستگا ئەغریقییەکان دەیکرد، نەیان دەزانی و بیریان لەوە نەدەکردەوە کە هیتلەر خەو بە ئیمپراتۆرییەتێکی سەرانسەری جیهانییەوە دەبینی لە ساڵی(١٩٣٨)دا ئەوانەی لە هیتلەرەوە زۆرنزیکبوون وایاندەزانی بەهۆی باری خراپی تەندروستی و ئەو شکست خواردنەی دوکتۆر مۆریل لەچارەسەرکردنیدا تووشی هات، هیتلەر مەبەست و ئامانجەکانی گۆڕیوەو پاشگەزبۆتەوە.

منیش لەو باوەڕەدابووم، بەهیچ جۆرێك هیتلەر مەبەست و ئامانجی خۆی نەگۆڕیوەو ناشی گۆڕێت، بەڵام نەخۆشی و ترس لە مردن وایلێکرد بوو خێراتر بکات بۆ هێنانەدی جێبەجێکردنی مەبەست و ئامانجەکەی شتێکی ئاشکراو نەگۆڕیش بووەمەبەست و ئامانجەکەی شکستی و سەرنەکەوتنی پێ نەدەهات.. ئەگەر هێزێکی زۆر گەورەو بەتوانا ڕووبەڕووی نەوەستایە.

لە ساڵی(١٩٣٨)دا کەس نەیدەزانی و بۆ کەسیش ئاشکرانەبوو تابزانێت ئەو هێزە چ هێزێکە و کام هێز دەتوانێت لە ڕووی هیتلەر و ئامانجەکەیدا ڕاوەستی و بەرهەڵستی بکات.

ئەو سەرکەوتنە خێراییانەی لەو ساڵەدا بەدەستی هێنا وایلێکرد خێراترکات و بەرەو ئامانجەکەی هەنگاو بنێت.

ئەو ژیانەی لە باڵەخانەی ڕاوێژکاری بەرلیندا بەڕێوەدەچوو هەر لەسەر ئەو ڕێبازەبوو کە لە(ئوبرسالزبورگ)دا بەڕێوەدەچوو، هەروەك عادەتی.. بۆنان خواردنی بەیانیان نزیکەی(٤٠-٥٠) کەس بەشێوەیەکی بەردەوام نانی بەیانییان لەگەڵ هیتلەردا دەخوارد، دەبوا هەریەکێك لەو کەسانە پەیوەندی بە یاریدەدەرەکەی هیتلەرەوە بکردایە و پێیان ڕابگەیاندایە کە ئامادەی ئەونان خواردنە دەبن

زۆربەی زۆری ئەو کەسانەش لە نوێنەر و هەڵبژاردەکانی ناو حیزب یان ڕایخ و هەندێ وەزیر و کەسانی نزیکی دەوروبەری خۆی بوون.

منیش هەمووکات ئەو مافەی خۆمم بەکاردەهێنا. عادەتیش وابوو ئەو سڵاوە بەکارنەهێنین کە دەڵێت(هایل هیتلەر)، بەڵام لە جیاتی ئەوە تەنها دەمانوت...(بەیانیت باش)، لەناو ئەم جۆرە کۆمەڵانەدا بەهیچ جۆرێك.. دروشم و نیشانی حیزبی لەسەرسنگ و بەرۆك و جلوبەرگەکاندا نەدەبینرا..

## ژوانەکانی هیتلەر

هیتلەر بۆکاتی ژوانەکانی ڕاست نەبوو.. هەمووکات لە کاتی ژوانەکانیدا دوادەکەوت و درەنگ دەهات، کە دەشهات وەك ئەو خەڵك و کەسانەی تر بە شێوەیەکی ئاسایی دەهات.. یەك یەك ئەو قسەی لەگەڵ ئەوانەدا دەکرد کە لەدەوری کۆدەبوونەوە، ماوەی (١٥ تا ٢٠) دەقیقە لە ناو ئامادەبواندا دەمایەوە هەتا پەردەی سەردەرگاو جامخانە شووشەکانیان لادەبرد، پاشان بەرپرسی کارەکان دەهات و بە گوێی سەرۆکدا دەیچرپاند کە نانوخوان ئامادەیە، ئەو کاتە دەچووە ژووری بۆ نان خواردن.

ئەندازەی ژووری نان خواردن (٢٤) پێ چوارگۆشەبوو، لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا مێزێکی لاکێشەیی تێدابوو، نزیکەی (١٥) کەس دەیانتوانی بەدەوریدا دابنیشن، سەرمێزێکی چەرمی سووری بەسەردا درابوو، ئەو کورسییەی هیتلەری لەسەر دادەنیشت ئاسایی بوو هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ کورسیەکانی تردا نەبوو لە داری چنار دروست کرابوون و بەچەرمی سوور ڕووکەش کرابوون، لە سووچەکانی هۆڵەکەدا چوار مێزی بچووکی تر دانرابوون. (٤ تا ٦)کەس دەیانتوانی لەسەر ئەو کورسیانە دانیشن کە بەدەوری ئەو مێزانەوە بوون، کورسییەکانیش هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ کورسییەکانی تردا نەبوو.. قاپی نان خواردنەکانیش لە

بۆرسلینی کاشی سپی ئاسایی بوون، پەرداخەکانیش شووشەی ئاسایی بوون.

چێشتخانەکە وەك هیتلەر ناوی نابوو بە(چێشتخانەی راوێژکاری بەختیاری) بەو شێوەیە بوو، هیتلەر گشت کات کە دادەنیشت، پشتی دەکردە پەنجەرەکەو دەهاتە ژوورەوە دووکەسی لە میوانەکان هەڵدەبژارد و لە راست و چەپی خۆیدا دایدەنیشاند و ئەوانی تریش بێ هیچ رەسمیاتێك چۆن رێبکەوتایە بەدەوری مێزەکەدا دادەنیشتن. خۆ ئەگەر هۆڵەکە میوانی زۆری تێدابوایە و جێگانەبوایەتەوە راوێژکارەکانی ترو پلەدارەکان لەسەر مێزە لاوەکییەکانی تر دادەنیشتن، من خۆم یەکێك بووم لەو کەسانەو ئەمەش تایبەتمەندییەکی گەورەبوو بۆ من، چونکە لەوێدا دەمتوانی زیاتر سەربەست بم و بەئارەزووی خۆم قسەبکەم.

## ژەمە خواردنی ئاسایی

ژەمە خواردنەکان زۆرئاسایی بوون، بریتی بوو لە شۆربا و گۆشت و پەتاتەو سەوزە و ئیشی هەویر و شیرینی، خواردنەوەش بە ئارەزووی خۆمان دەمانخواردەوە، یا ئاوی کانزایی یا بیرەی ئاسایی بەرلین یان جۆرە مەیەکی هەرزان بوو.. هیتلەر بۆ پارێزکردن تەنها سەوزەی دەخوارد و ئاوی کانزایی دەخواردەوە، لە قسەکردنیشیدا هەر هەموو قسەکانی ئاسایی و سادەبوون، چونکە دەیزانی و لەوە دڵنیابوو کە قسەکانی لە سەرانسەری ئەڵمانیادا بڵاودەکرێتەوە.

رۆژێکیان راوچییەکانی(هلنفولاند) کەرکەدەنێکی دەریایی گەورەیان راوکرد و هێنایان پێشکەشی هیتلەریان کرد، ئێمەش کە ئەوەمان لەسەر مێزی نان خواردن بینی زۆر شادو دڵخۆشبووین، هیتلەر کە ئەوەی لەسەر خوانەکە بینی.. وتی.."خواردنی ئەم جۆرە شتانە زیادەڕەوییەکی بێ مانایە.. نامەوێ جارێکی تر شتی وا لەسەر مێزی نان خواردن ببینمەوە..".

(گۆرەنگ) زۆرکەم بۆ ئەم میوانداری و خواردنانە دەهات.. جارێکیان لەدوای

نان خواردن، من خۆم (گورەنگم) بە ڕێکرد لەوکاتەدا پێیی وتم.."بەراشکاوی دەڵێم ئەو خواردنانەی لەوێدا دەخورێن، پیسن.. ئەم میوانداری و ئاهەنگانەی لەم میوانخانەیەدا دەکرێت، کارێکی نابەجێ و خراپە و لە توانابەدەرە"، (هس) بە دوو هەفتە جارێك ئامادەی ئەم میواندارییە دەبوو، کەدەشهات یاریدەدەرەکەی لە(سەفەر تاسێکدا) ژەمەخواردنە تایبەتییەکەی خۆی بۆ دەهێناو لە چێشتخانەکەدا بۆی(گەرم) دەکردەوە.

ماوەیەکی زۆر هیتلەر نەیدەزانی(هس) خواردنی تایبەتی خۆی دەخوات، کە زانی(هس) خواردنی خۆی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، ڕۆژێکیان بانگی کرد.. لەبەردەم هەمووماندا قیژانی بەسەریدا و وتی.."من لێرە چێشتخانەو چێشتلێنەری باش و تایبەتی پلە یەکەم هەیە، ئەگەر دوکتۆر پێی وتوویت خواردنێکی تایبەتی بخۆی.. ئەوا چێشتکەرەکان بە دڵ فراوانی و خۆشییەوە لێرە بۆت دروست دەکەن، واپێتدەڵێم جارێکی تر نەکەیت بەهیچ جۆرێك خواردنی خۆت لەگەڵ خۆتدا بۆ ئێرە بهێنیت.."

هس لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو، چیت پێ دەوت، لە کاتی خۆیدا وەڵامیدەدایەوە، وەڵامی هیتلەری دایەوە و بۆی ڕوونکردەوە، وتی.."ئەو خواردنەی من دەیخۆم دەبێت مادەیەکی بیولوجی دەست نیشانکراوی تایبەتی تێدابێت". هیتلەر پێی وت.."لەم حاڵەدا پێویستە نەیەیتە ئێرە بڕۆ لە ماڵی خۆتدا نانی خۆت بخۆ.."، ئیتر لەدوای ئەوەوە(هس) بۆ هیچ نان خواردنێك نەدەهات، مەگەر بۆ مناسەبەتێکی تایبەت نەبوایە.

کاتێك حیزب داوایکرد با ئەو هەموو خواردنانە لەو ڕۆژانەدا نەخورێت با نرخی ئەو هەموو خواردنەی لە یەکشەموان و ڕۆژەکانی تردا سەرف دەکرێت نرخی قاپێکی بۆ گوللە تۆپێك سەرف بکرێت.. ئیتر لە دوای ئەوەوە لەسەر مێزی نان خواردنی هیتلەر جگە لە شۆرباو ئیشی هەویر زیاتر هیچی تر پێشکەش نەدەکرا، میوانەکانیش کەم کرانەوە، لە دووسێ کەس زیاتر نەبوون، ئەو شاندەی لەدەوری هیتلەر دابوون، لەو جۆرە کەسانە نەبوون کە لە ژیان قاڵ بووبن و شارەزابن.

زۆربەی زۆری ئەو کەسانەی لەو کۆڕوکۆبوونەوانەدا بوون، جگە لە ئەڵمانیا هیچ

شوێنێکی تریان نەدیبوو، بۆ دەرەوەی ئەڵمانیا نەچووبوون، خۆ ئەگەر رێبکەوتایە یەکێکیان بە ئیجازە یا کارێك بۆ نموونە بۆ ئیتاڵیا بچوایە.. ئەمە دەبوو بە رووداوێکی گەورەوگرنگ، لەسەر سفرە و مێزی نان خواردن دەبوو بە جێگای قسەوباس، کەسانی کۆمەڵەکەش وا تەماشای ئەوکەسەیان دەکرد هەروەك ئەوەی گەشتی بەدەوری جیهاندا کردبێت.

هیتلەر خۆشی هیچی لە دنیای دەرەوە نەدەزانی و شارەزای نەبوو، لەسەر ئەوەشەوە سیاسەتمەدارەکانی حیزبیش کە لە دەوری هیتلەر کۆببوونەوە، بەگشتی کەلتوور و زانیاری و خوێندەواری و شارەزاییەکی کەمیان هەبوو.

لە ناو ئەو پەنجا کەسە بالآدەست و گەورانەی لە ناو حیزب و دەوڵەتدا بوون، تەنها لە (١٠) کەسیان زیاتر دەرچووی زانکۆکان نەبوو. زۆربەی زۆریان لە خوێندگا ناوەندییەکاندا سەرکەوتوو نەبوون و زانست و زانیارییەکی ئەوتۆیان نەبوو، خوێندن و زانیارییەکانیان لە زانیاری خوێندگا دواناوەندییەکان تێ پەڕی نەدەکرد، هیتلەر خۆشی حەزی لەم جۆرەکەس و ناوەندانە دەکرد و حەزی دەکرد لەناو ئەم جۆرە کەم خوێندەوارانەدا کاربکات.

هیتلەر کە لەگەڵ ئەو کەسە ئاست نزمانەدا کاری دەکرد وایدەزانی لەناوکەسوکار و خزمان و عەشیرەتی خۆیدایە.

هیتلەر هەمووکات ئەوەی دووپات دەکردەوە، دەیوت "زۆر هەڵەیە ئێمە بیروباوەڕی ئیشتراکی نیشتمانی خۆمان لە دەرەوەی وڵاتدا بڵاوبکەینەوە.. دەیوت ئەگەر وابکەین ئەوا دەبێتە پەرەپێدانی هەستی نەتەوایەتی لەو وڵاتانەدا و دەبێتە هۆی ئەوە پلەوپایەی ئێمە لەو وڵاتانەدا کەم بێتەوە".

زۆر شادو پێخۆشحاڵبوو بەوەی حیزبە نازییەکانی وڵاتانی تر ئەوانەی سەرکردایەتی ئەو وڵاتانەیان دەکرد.کەس لەو زیرەکترو بەتواناتری تێدا نییە.

هیتلەر لەو بڕوایەدا بوو کەسانی وەك(موسلی) سەرکردەی فاشییەکانی بەریتانی، لاسایی ئەو دەکاتەوەو ئەوان هیچ بیروباوەڕێکی نوێ و ڕەسەنایەتی تریان نییە.

## هیتلەر و نوکتە

هیتلەر لە نوکتەدا بەهرەدارنەبوو، هیچ نوکتەیەکی نەدەزانی و توانای نوکتە گێڕانەوەی نەبوو.

هەرکەسێك نوکتەیەکی بۆ دەگێڕایەوە، لە کانگای دڵییەوە پڕ بەدەم بەدەنگی بەرز قاقا پێدەکەنی، ئەوەندە پێدەکەنی ئاو بەچاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە. هیتلەر دەم بە پێکەنین بوو.. ئەگەر کەسێك شتێکی خۆشی بۆ بگێڕایەتەوە، دەستی بە پێکەنین دەکرد، (گۆبڵز) زۆرجار بۆ ئەوەی هیتلەر پێبکەنێت نوکتەی بۆ دەگێڕایەوە.

ئەمە لایەك، لەلایەکی ترەوە بۆ ئەوەی لە قیمەت و ڕێزی ئەوانە کەمکاتەوە کە لە دەستەڵاتدا ململانێیان لەگەڵدا دەکرد و خۆی زیاتر بباتەپێشەوە.

هیتلەر زۆر حەزی دەکرد دەربارەی خواردن باسی منداڵی خۆی بگێڕێتەوە، باسی ئەو توندوتیژی و دڵڕەقییەی خانەوادەکەی دەکرد کە لەسەر ئوسوڵی نان خواردن لێیان دەدا دەیووت.."باوکم لەسەر فێرکردن و ئوسوڵی خواردن زۆری لێدەدام ئەوەش لەو کاتانەدا بۆ من پێویست بوو.. سوودی زۆرم لەو لێدانانە وەرگرت".

(فریك)ی وەزیری ناوخۆ، دوابەدوای ئەوە خۆی تێهەڵدەقورتاندو دەیوت.."گەورەم ئەگەر حوکم لەسەر ئەوەی ئێستا کە دەیبینین بدەین، ئەوە ئەو لێدانە سوودێکی زۆری پێگەیاندوویت.." ئیتر دوای ئەوە کشوماتی بەسەر دانیشتوانی دەوری مێزەکەدا باڵی دەکێشاو بێدەنگ دەبووین... (فریك)یش بۆ ئەوەی سنووری ئەو کشوماتی و بێدەنگییە بڕەوێنێتەوە.. دەیوت"گەورەم فوهرەر مەبەستم لەوەیە، هەر ئەو پەروەردەیە بووە کەوای لە تۆ کردووە ئێستا ئەم پێگەیەت پێ ببەخشێت و تۆی گەیاندوتە ئەم ئاستە گەورەیە".

(گۆبڵز)یش کە(فریك)ی بەکەسێکی هیچوپووچ دادەنا بە گاڵتەپێکردن و

توانجەوە پێی وت.."فریکی ئازیز دیارە تۆ لە منداڵیتدا کەس لێی نەداوی..."

## پێچوپەنایی کردنی وەزیرەکان

هیتلەر زۆر بە گومان بوو.. ئەو پێچوپەنایی کردنەی نەدەبینی کە وەزیرەکانی دەیان کرد بۆ ئەوەی بیرو هەڵسوکەوتی بگۆڕن.

هیتلەر هەستی بەو شێوازانە نەدەکرد و لەوە نەگەیشتبوو کە(گورنگ و گۆبلز و بورمان و مسن و هملر..) لێزان بوون تێیدا.

لەو بوارانەدا ئەوان لێزان و شارەزابوون، کەسی تر لەوان شارەزاو لێزانتر نەبوو، چونکە دەیانزانی قسەو گفتوگۆکردن لەگەڵ هیتلەردا بەڕاشکاوی سەرکەوتو نابێت و ئەنجامەکەی فەشەل بوونە. لەبەرئەوە ئەوان پەنایان دەبردە بەر ئەو جۆرە قسەو پێچوپەنایانە بۆ ئەوەی بەڵکو ئەگەر بەخت یاربێت.. بتوانن بیروڕاو تێڕوانین بگۆڕن.

## شەوانە دانیشتنەکانی بەرلین

ئەوانەی شەوانە لە ئەنجومەنی ڕاوێژکاری لەبەرلیندا دەوری مێزی نان خواردندا دەمانەوە ژمارەمان لە شەش کەس تا هەشت کەس زیاتر تێ نەدەپەڕی... ئێمە.. یاریدەدەرەکانی هیتلەر و پزیشکە تایبەتییەکەی خۆی و هۆفمانی وێنەگرو دوو برادەری میونیخی و هەندێ جاریش(بویر)ی فڕۆکەوانی تایبەتی هیتلەر و یاریدەدەری لاسلکی و بێتەلی ناو فڕۆکەکەی و بۆرمان و کابرای میکانیکی... بووین.

ئەم کۆمەڵە ئەو بازنە نزیکەبووین کە لە بەرلیندا شەوانە لە دەوری فوهرەربووین، شەوانە پیاوانی سیاسی وەك(گۆبلز) و کەسانی وەك ئەو بانگهێشت نەدەکران، زۆرجاریش

قسەو گفتوگۆکان وەك قسەو گفتوگۆکانی سەر مێزی نان خواردنی بەیانیان نەبوو، تەنها باسی شتی ئاسایی دەکرا، خواردنەکانی شەویش هەر وەك خواردنەکانی بەیانیان سادەو ساکاربوون، ناوبەناو یەك دووجارێك ئامادەکارو لێپرسیاری خواردنەکان خواردنی باش و بەلەزەتی بۆ دروست دەکردین.

ماوەی هەفتەیەك یا دووهەفتە هیتلەر هەر(کافیار)ی دەخوارد و زۆری حەز لێ دەکرد، چونکە لەمەوپێش شتی وابەلەزەتی نەخواردبوو، بەڵام کاتێك پرسیاری لە ئامادەکارو بەرپرسی ئەو خواردنە کرد، کەچەندی تێدەچێت.. هەرکەزانی گرانە زۆری تێدەچێت.. دوای ئەوە قەدەغەی کردوو نەیهێشت لەسەر سفرەوخوان پێشکەش بکرێت، بەرێوەبەری چێشتخانەکە لە جیاتی ئەوە جۆرێکی هەرزانی لە کافیاری سوور ئامادەکردو پێشکەشی کرد، هیتلەر ئەوەشی قەدەغەکرد، گوایە ئەوەش گرانە و زۆری تێدەچێت چونکە فوهرەر لەو باوەڕەدابوو.. "فۆهرەرێك کافیار بخوات مانای وایە(فوهرەر) ئینسانێکی دەستبڵاوە پارە بەفیڕۆدەرە.."

# دووبارەبوونەوەی پیشاندانی فلیمی سینەما

کۆمەڵەکە دوای نان خواردنی ئێوارە ڕوویاندەکردە هۆڵێکی گەورە کە بۆ بۆنە فەرمێکان بەکاردەهێنرا. ئێمە هەریەکەمان بە ئیسراحەت لەسەر کورسی دادەنیشتین و هیتلەر چاکەتەکەی دادەکەندو وردە وردە قاچی لێرادەکێشا، یەکەم فلیمی شەو بردنەسەر پیشان دەدرا.

هەر کە فلیمەکە دەستی پێ دەکرد، ئیتر ئێمەش ئەو کاتە بێدەنگ دەبووین، هەروەك چۆن لە سالزبورگدا بێدەنگ دادەنیشتین، ماوەی سێ سەعات تا چوار سەعات بێدەنگ دادەنیشتین تا ئەو هەموو فلیمانە تەواو دەبوون، لە کاتژمێری یەکی شەودا هەڵدەساین هەرهەموومان گۆج ببووین دەمارەکانی لەشمان لەو دانیشتنەدا گرژببوون.

لە بێدەنگی و قسە نەکردنیشماندا ناودەم و قورگمان وشك ببوونەوە، جارێکیان بۆ ئەوەی ئەو بێدەنگی و دووبارەبوونەوەیە، دووبارە نەبێتەوەو نەمێنێت، پێشنیارم کرد کە لەم شەوبردنە سەرانەماندا با شارەزایانی پیانۆو مۆسیقازانە گەورەو بەناوبانگەکان لەم شەوانانەدا هاوبەشی بکەن، یاخود شارەزایان و زانایان کۆڕی زانستی و نیشتمانیمان بۆ سازکەن و سوودیان لێ وەرگرین، بەڵام هیتلەر پێشنیارو داواکارییەکەمی پەسەند نەکرد و وتی..."هەروەك من بزانم هونەرمەندان پێیان خۆش نییە و ئارەزوو ناکەن بێن بۆ ئێرە وەك تۆ تێگەیشتووی".

لەڕاستیدا زۆرێکی زۆر لەو هونەرمەندانە دەشیا بانگهێشت بکرانایەو پێیان خۆشبوو، بە شەرەفێکی گەورەشیان دەزانی لەبەردەم هیتلەردا مۆسیقا بژەنن و نمایش بکەن. لەوەش

دەچوو هیتلەر حەزی لەوەنەبوو دوا ساتەکانی ڕۆژانی ژیانی خۆی بگۆڕێت کە لە هەموو شتێك زیاتر پێی خۆشبوو.

چەندەها جار دەمبینی و سەرنجم دەدا بەشەرمەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکرد.. کە لەمەوپێش لە هەندێ کاروپیشەدا مامۆستا و گەورەی بوون، هیتلەر ئەگەر بیویستایە پلانێك بخاتە ڕوو، زۆر بە پارێزەوە باسی ئەو پلانەی دەکرد، هەروەك ئەوەی لە چاوپێکەوتنێکی فەرمیدابێت، ڕەنگە هەر ئەو هۆیەش بێت وای لێکردبێت بڕوای بە ئەندازیارێکی گەنجی وەك من بێت، لە ڕاستیدا لەبەردەم مندا هەستی بەکەم و کوڕی و شەرم نەدەکرد.

## ئاهەنگەکانی سەماکردن

لە ساڵەکانی یەکەمی دەستەڵاتیدا هیتلەر ڕێگای بە یاریدەدەرەکانی دەدا... ئەویش بەرازی بوونی(گۆبلز) کە ژنەکانیان با دۆست و برادەرەکانیان و هەندێ لەوانەی لە دنیای هونەردا کاریاندەکرد، بۆ ئاهەنگەکان بانگهێشت بکرایە.

لەو ئاهەنگ و بۆنانەدا ئاسایی بوو ژنان لەگەڵ مێردەکانیاندا بهاتنایە و هاوبەشی ئەو ئاهەنگانە بکەن، ئەم بڕیارە(گۆبلز) بۆ ئەوە دای تاکو شێوازی ئەو قسەوباسە نارەزایانەی دەربارەی فۆهرەری پاك و لەسەرخۆ هەڵبەسترابوو بڕەوێنێتەوە.



هیتلەر لە کۆتایی ئەو ئاهەنگی سەماکردنانەدا لەگەڵ ئەو خانمانەدا ڕووخۆش و قسەخۆشبوو، بە شێوەیەك هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردن هەردەتووت خۆی دەرچووی پەیمانگای سەماکردن بێت، ئەوەی پێویست بوایە بە شەرمەوە لەگەڵیاندا دەی کرد، لە کۆتایی و کاتی ڕۆیشتنیاندا بە شێوەی نەمساوییەکان دەستی خانمەکانی ماچ دەکرد و چۆنی و چاکی لەگەڵدا دەکردن و خواحافیزی لێ دەکردن.

کاتێك میوانەکان دەڕۆیشتن هیتلەر کەمێك لەگەڵ کۆمەڵەکەیدا دادەنیشت، بەشێوەکەی خۆی مەدح و سەنای ئەو ژنانەی دەکرد کە ئامادەی ئاهەنگەکەبوون.

زیاتر باسی قەدوباڵاو لەشولارو شێوەکانیانی دەکرد، وەك لەوەی باسی جوانی و سەرنج ڕاکێشان و زیرەکییان بکات، هیتلەر دەتووت هێشتا خوێندکارێکی

دواناوەندیە.. دەیووت.."ئەو ژنەی من دەمەوێت و دڵی من بکاتەوە و لە پێش چاوو دڵی مندا جوان بێت هێشتا نەمدیوە و لە دایك نەبووە، هیتلەر زۆر حەزو ئارەزووی لە ژنی قەڵەو تۆزێك گۆشتن بوو گەرچی(ئیفابراون) لەو جۆرە ژنە قەڵەوانە نەبوو کە ئەو لای جوان بێت و دڵی پێخۆش بێت.

بیرمە.. هیتلەر لە ساڵی(١٩٣٥)دا کتوپڕ ئەو عادەتەی گۆڕی کە بۆ ئاهەنگەکان بانگهێشتی ژنانی دەکرد، بە تەواوی لەبەرنامەیدا نەیهێشت، من نەمزانی ئەوەی بۆچی کرد... دیاربوو لەبەر ئەو قسەوباس و چرپوهوورە نابەجێیانەبوو کە دەکرا.

## بۆ هیمس هێتلەر... تەریکی هێتلەر

لە ساڵی(١٩٣٩)دا ئەو ژوورەی لە تەنیشت ژووری نوستننەکەی هیتلەرەوەبوو، دایان بە(ئیفابراون)، ژوورەکە بەسەر گۆڕەپانێکی بچووکدا دەیڕوانی، لەو ژوورەدا (ئیفا) زیاتر بەتەنهایی و تەریکی دەژیا، وەك لەوەی لە بارەگا شاخاوییەکەی (ئوبرسالزبورگدا) بوو، ئیفا بە ڕاڕەوێکی لاوەکی و پێپیلکانەکانی پشتەوەدا هاتوچۆی دەکرد، بە پێپیلکانە سەرەکییەکەدا هاتوچۆی نەدەکرد مەگەر لەو کاتانەدا نەبوایە کە ئەو کەسانەی لە (فوهرەرە)وە نزیکبوون لەوێدا بوونایە.

من زۆرجار چەندەها سەعات لەگەڵیدا دەمامەوە، هیتلەر لە پێش چاوی خەڵکیدا ئەو فۆهرەرەبوو، بێ وچان و ماندووبوون شەووڕۆژ لە کاردابوو، لە ڕاستیدا ئەوەی شارەزابێت و شێوازی هونەرمەندان لە کارکردندا بزانێت، تێدەگات ئەو ژیانە بۆ هیمیەی هیتلەر تێدا دەژیا هیچ پەیڕەویی و ڕێکوپێکییەکی تێدانەبوو.. هەروەك خۆم بە چاوی خۆم ئیشەکانیم دەدی، دەمبینی هیتلەر چەندەها هەفتە خۆی بە کێشەو شتێکی بێ بایەخەوە خەریکدەکرد، تا بڕیارێکی تایبەت و دیاری کراوی لەسەربدات، کتوپڕ بڕیاری دەست پێکردنی ئەو کارەی دەدا، و دەبوو یەکەم

ڕۆژ ئەو کارە بکرێت کە بڕیاری لەسەردابوو.. هەرکە بڕیارەکەشی دەردەکرد.. دوای ئەوە پاڵی لێدەدایەوە بە ئیسراحەت و تەمەڵییەوە دادەنیشت.

## هێنامنە پاڵ خۆم.. (بوونە هاوپەیمانم)

لە سەرەتای مانگی ئابی ســاڵــی(١٩٣٩)دا هەندێ میوان هاتن و لە(ئوبرسالزبورگ)دا سەردانی بارەگای هیتلەریان کرد و لەگەڵ فۆهرەردا بەرەو(کۆشکی چا) خواردنەوە بەرێکەوتن.

ڕیزێکی درێژی ئۆتۆمبیل بەو ڕێگایەی(بورمان) بڕیبووی و سازی کردبوو کەوتینە ڕێ.. پاشان لەبەردەم باڵەخانەیەکدا دابەزین و هەموو چووینە ڕارەوێکی مەرمەڕەوە و بە مەسعەدێکی مسی بریسکاوەدا سەرکەوتینە سەرێ لە کاتی بەرزبوونەوەمان بۆ بەرزی سەدوپەنجا پێ، کتوپڕ هیتلەر لەبەرخۆیەوە وتی.."بەم زوانە کارێکی گەورەوگران دەکرێت.. ئەگەر پێویست کات (گۆرەنگ) بۆ ئەوێ دەنێرم.. خۆ ئەگەر پێویست بە خۆشم بکات ئەوا خۆشم دەچم.. من لە پێناو دەسکەوتنی ئەو وەرەقەیەدا هەمووشتێك دەکەم".

ئەو هەموو شتەش ئەوەبوو پاش سێ هەفتە لە(٢٣ی ئابدا) بیستمان وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا لە مۆسکۆ خەریکی دانووستانە، کاتێك لەسەر مێزی نانخواردن دانیشتبووین و نانی ئێوارەمان دەخوارد کاغەزێکیان دایە دەست هیتلەر و گورج کاغەزەکەی خوێندەوە پاشان تۆزێك تەماشای پێش خۆی کرد و سیمای سوورهەڵگەڕا بە مستەکۆڵە توندکێشای بە مێزەکەی بەردەمیدا، هەرچی پەرداخ و قاپێکی لە سەربوو کەوتنە جووڵەو لەرزە.. هاواری کرد.. وتی.."بوونە هاوپەیمانم.. بونە هاوپەیمانم.. هێنامنە پاڵ خۆم.." دوای ئەوە گورج هاتەوە سەرخۆو هێواش بۆوە.. کەس نەیوێرا و غیرەتی ئەوەی نەبوو پرسیاری لێ بکات.. بە بێدەنگی دەستمان بە نان خواردن کردەوە، شوێنەکەش بێ چرپەیی و

کشوماتییەکی ترسناك باڵی بەسەردا کێشابوو.

دوای ناخواردن هیتلەر یاریدەدەرەکانی خۆی بانگ کرد و پێی وتن.."ئێمە خەریکین پەیماننامەیەکی دەست درێژی نەکردن لە نێوان ئێمە و رووسیادا ببەستین.."، پاش هەناسە هەڵکێشانێکی کەم وتی.."ها ئەمە بروسکەی ستالینە بیخوێننەوە.." برووسکەکە بۆ هیتلەری راوێژکاری رایخ نێردرابوو... بروسکەکە نووسینێکی کورتی تێدابوو.. ئەو رێکەوتننامەیەی نێوان هەردوو وڵاتی رووسیاو ئەڵمانیای تێدانوسرابوو، لە راستیدا لەو شەوانە کۆرانەی کۆمەڵەکە، ئەو بروسکەیە ببووە گەورە رووداو جێگای قسەوباس.

بروسکەیەك تیایدا، پێکەوە ناوی هیتلەرو ستالین لەسەر رووپەرەکەیدا و رێزو خۆشەویستی هەردووکیانی تێدابێت رووداوێکی گەورەو مەزن بوو.

# لێدانی زەنگی خەم و خەفەت لەسەر دڵی ئیمپراتۆرییەتی بەریتانیا

ئەو شەوە لەسەر شاشە فیلمێکیان بۆ لێداین.. فلیمەکە لەسەر لەشکری سووری سۆڤێتی نمایشدەکرا، لەو فیلمەدا زۆرێکی زۆری سەربازان و ژمارەیەکی بێشوماری هێزو سەربازانی سۆڤێتی بەبەردەم ساباتەکەی ستالیندا رەتبوون، هیتلەر تەماشای فیلمەکەی دەکرد، بۆ ئەو چەك و تەقەمەنی و هێزانە خۆشی خۆی دەردەبری.. روویکردە یاریدەدەرە سەربازییەکانی و دەربارەی ئەو هەموو سەربازە زۆرو ئەو چەکە گەورەو زۆرانە قسەی لەگەڵدا کردن و بە سەرسامییەوە هەڵیسەنگاندن.

هەر ئەو شەوە(گۆبلز) رێکەوتننامەکەی نێوان رووسیاو ئەڵمانیای ئاشکراکرد و لە کۆنگرەییەکی رۆژنامەوانیدا ئاماژەو قسەی خۆی لە سەرکرد.

هیتلەر ئەو شەوە پەیوەندی پێوەکرد و هەڵوێستی نوێنەر و رۆژنامەنووسە

بیانێکانی لێپرسی.. هیتلەر خۆشی و شادی لە چاوەکانیدا دەبریسکایەوە، بەشادییەوە ئەوەی (گۆبلز) پێی ڕاگەیاندبوو.. پێیوتین"ئەو ڕێکەوتننامەیە کارێکی گەورەو سەرسوڕمانێکی بێ وێنە بوو.."، کاتێك کەنیسەکانی بەرلین کەوتنە زەنگ لێدان و دەنگی زەنگەکان بڵندبۆوە.. یەکێك لە نوێنەرە ڕۆژنامەنووسە بەریتانیاییەکان وتی.."دەنگی ئەم زەنگانە، دەنگی خەم و پەژارەیە بۆ سەر دڵ و دەروونی ئیمپراتۆرییەتی بەریتانیا"، ئەم تەعلیق و وتەیەی ئەو ڕۆژنامەوانە لەو شەوەدا خۆشترین شت بوو بۆ هیتلەر.

لە ڕاستیدا ئەو لەوباوەڕەدا نەبوو، بەو شێوەیە بگاتە ئەو چڵەپۆپەیەو بەرزییە، چونکە لای شتێکی ستەمبوو کە قەدەر شتی وای پێبەخشێت.

لە کاتێکدا ئێمە ئەو شەوە لەگەڵ هیتلەردا لە پێش باڵەکۆنەی بارەگای شاخاوییەکەدا ڕاوەستابووین، ئەو دیمەنە ناوازەو سەرسوڕهێنەرەی سروشتمان دەبینی و تەماشامان دەکرد، شاری(ئەنتەرسبورگ) لە پێش چاوماندا لەناو ڕۆشنایدا لە نمایش و خۆشیدابوو، شارەکە بەرەنگێکی سووری سەیرو سەرنج ڕاکێش ئاسمانی شارەکەی داپۆشیبوو.

ڕۆشنایی ئەو سوورییە، وەك پەلکە زێڕینە، دەدرەوشایەوە سوورییەکەی زۆر لە بەشی کۆتایی شانۆگەری(غونزدامیرانگ)ی گۆرانی ئامێز سوورتربوو، تیشکی سوورییەکەی دەم و چاو و دەستەکانی ئێمەشی سوورکردبوو. خستبووینە ناو سەرنج و بیرکردنەوەوە، کتوپڕ هیتلەر ڕووی کردە یەکێك لە یاوەرە سەربازییەکانی وتی.. "ئەوە لە ڕەنگی خوێن دەچێت.. خوێنێکی هێجگار زۆر ئەمجارە ئێمە لەو خوێنە دەربازنابین.. هەتا پەنانەبەینە بەر هێز..!!"، دوای چەند ڕۆژێك کەژاوەی هیتلەر لە (میونیخ)ەوە بەرەو (ئوتوستراد) بەڕێکەوت.. کاروانەکە پێکهاتبوو لە دە ئۆتۆمبێل و هەر یەکەمان ماوەیەکی باش لە یەکترەوە دووربووین، من خۆم و خێزانەکەم لە ناوەڕاستی کاروانەکەدا بووین. ئەو ڕۆژە دوا ڕۆژەکانی هاوین بوو، کەشوهەوا خۆش و سایەقەبوو، تیشکی خۆر ئەدرەوشایەوە. کاروانەکە بە (میونیخدا) تێپەڕی، خەڵکی شارەکە لەناو بێدەنگییەکی نائاساییدا هیتلەریان بەڕێکرد.

# ئێوارەی دووەم جەنگی جیهانی

دوای ڕێکەوتننامەی (میونیخ).. (هیتلەر) لەو باوەڕەدابوو، هێزەکانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا.. دەربارەی کێشەی پۆڵندە و قەناتی دانزیغ ملدەنێن و وازدێنن.

ئەو بڕوایەشی لەوەوە هاتبوو، یەکێك لە هەواڵگرەکانی نوسراوێکی ئاراستەکردبوو، لەو نوسراوەدا وتبووی.."ئەفسەرێکی پلەبەرزی گەورەی بەریتانی ڕەوانەی پۆڵندە کراوە بۆ ئەوەی تەماشای هێزی سەربازی پۆڵندە بکات، نوسراوەکەی بەوە کۆتایی پێ هێنابوو.. گوایە گەورە ئەفسەرەکە وتبووی هێزی پۆڵندە، توانای نییە و ناتوانێت بەرەنگاری هێزەکانی هیتلەر بکات، و هەرزووبەزوویی لەبەردەم ئەو هێزانەدا دەشکێ."

هیتلەر هەموو هیواو پشت بەستنێکی بەو نوسراوە بەستبوو، کە ئەو گەورە ئەفسەرەی بەریتانیا هەموو هەوڵێکی خۆی دەخاتە گەڕ، بۆ ئەوەی حکومەت ڕازی بکات لەو کارە دوورکەوێتەوە و خۆی لە جەنگێك هەڵنەقورتێنێت، کە هیچ هیواو ئامانجێکی تێدانییە.

هیتلەر کە لە (یەکی ئەیلولی ساڵی ۱۹۳۹)دا ئەو ئاگادارییەی لەلایەن دەوڵەتانی ڕۆژئاواوە پێگەیشت، بەرامبەر ئەو هەڵوێستەی دەربارەی قەناتی(دانزیغ) هەیبوو، کەمێك تووشی نا ئومێدی و تێکشکان بوو، بەڵام خۆی و ئێمەشی بەو تێبینییە ئارام و دڵنیا کردەوە کە وتی..(بەریتانیا و فەرەنسا) وەك مەبدەئێك بانگهێشتی جەنگ دەکەن بۆ ئەوەی لەبەردەم جیهاندا ئابڕویان نەچێت."، دڵخۆشی خۆی بەوە دەدایەوە.. دەیوت.. گەرچی بانگهێشتی جەنگیش کراوە، بەڵام هەرچۆنێك بێت هەرگیز جەنگ ڕوونادات و هەڵناگیرسێت.

هیتلەر فەرمانی بۆ لە شکرە سەربازییەکانی دەرکرد، لە ئامادەباشیدابن و لایەنی بەرگری کردن بگرن، هیتلەر لەسەر مێزی نان خواردن بەو هاوڕێیانەی

لەوێدا کۆبووونەوە..وتی.."ئێمە گەرچی ئێستا لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسادا لە حاڵەتی جەنگداین..، بەڵام ئەگەر ئێمە لەلایەن خۆمانەوە نەجەنگێن و شەڕنەکەین، کێشەکە کۆتایی پێدێت.

لەڕاستیدا ئێوە هیچ بیروبۆچوونێکتان لەسەر ئەو دیموکراتی خوازانە نییە، ئەوان پێخۆشحاڵ دەبن لەو تەنگەشەیە ڕزگاریان بێت و بچنە دەرەوەو واز لە پۆڵندە و کاروباری بێنن."

ژێر دەریا گەڕەکان(غەواسەکان)ی ئەڵمانیا لە کاتێکدا لە ئاستێکی ئەوپەڕی ئامادەباشییەکی وادابوون، دەیانتوانی بە ئاسانی لە (باریجە) جەنگییەکەی (دانکرك) بدات، هیتلەر بۆ ئەو کارە هیچ ڕەزامەندییەکی بۆ ئەو کارە دەرنەبڕی و نەیهێشت لێی بدەن، هەتا ئەو کاتەی هێزەکانی بەریتانیا هێرشێکی ئاسمانیان کردەسەر(وبلهمهاڤن) و کەشتی (ئەسینایان) نوقم کرد. هیتلەر زۆر جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، بڕوای وابوو ڕۆژئاواییەکان زۆر نەرم و شلن و بیروڕا ڕووخاون و لە توانایاندا نییەو ناتوانن خۆیان بخەنە ناوگێژاوی جەنگێکی ڕاستەقینەوە.

هیتلەر سەبارەت بەخۆی لای زۆرگران و ستەمبوو، ددان بەوەدا بنێت خۆی هەڵەیەکی گەورەوگرانی کردووە.

## چەرچڵ دەچێتە ئەنجومەنی وەزیرانەوە

ئەو ئاڵۆزی و ڕووگرژی و دەموچاو بەیەکدادانە گەورەو سەرانسەرییەم باش لەبیرە، کاتێك ئەو دەنگ و باسە بڵاوبۆوەکە دەیوت(چەرچڵ چۆتە پۆستی وەزیرانی بەریتانیاوە بە سیفەتی وەزیری دەریاوان، لەو کاتەدا(گۆرەنگ) خۆیکرد بە ژووورداو ڕۆژنامەیەکی بە دەستەوەبوو.. لەسەر نزیکترین کورسی دانیشت و وتی.."چەرچڵ یان خستە ناو پۆستی وەزیرانی بەریتانیاوە.. و بوو بە وەزیری دەریاوان. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، جەنگ بەڕاستی دەستیپێکرد، ئێمە ئێستا بە ڕاستی لەگەڵ بەریتانیادا لە جەنگداین"، ئەم قسەو تێبینیانە دەریخست، جەنگ ڕێ لە جێبەجێکردنی هەموو پلان و خەونەکانی هیتلەر دەگرێت و پووچەڵی دەکاتەوە.

خەون و خەیاڵەکانی هیتلەر کە لە کارەکانیدا بەکاری دەهێنا بوو بە کارێکی نەشیاو و گەڕاندییەوە بۆ بیروبیرکردنەوەیەکی تر.. لە ڕاستیدا هیتلەر دەربارەی دوژمنەکانی خۆی هیچی نەدەزانی و هەرچی زانیارییەکیش کە خرابووە بەردەستی وەلایەوەنا.. ئەوەی بەلاوە باشبوو گورج پشت بە بیرو بۆچوونی خۆی ببەستێت گەرچی ئەمەش سەرپێچییە لە ڕاستی و لەسەر هیچ بنەماو هەڵساندنێکی ڕوون و ئاشکراش نەبێت.

من برواناکەم هیتلەر لە ڕۆژەکانی یەکەمی مانگی ئەیلولدا لەوەگەیشتبێ کە جیهانی لە جەنگێکی سەرانسەرییەوە گلاندووە، و بەهیچ شتێك چارەسەرناکرێت تەنها بەجەنگ نەبێت، لە ڕاستیشدا ویستی هەنگاوێك بنێت بۆ ئەوەی سەرکەوتنێکی سپی و بێخەوش و بێ خوێن ڕشتن بەدەست بهێنێت.

## سەرکێشی و سەرکەوتن

دەبێ ئەوە بڵێین ئەو ئامادەبووکە شان بداتە بەر ئەو سەرکێشی و و ترسەی لەدەرەوە تووشی دەبێت.. هەروەك لە ساڵی ڕابوردوودا لە کێشەی چیکۆسلوفاکیادا کردی..، بەڵام ئەو، ئەو هەموو ئامادەباشییەی کرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی گشت ترس و مەترسیەك کە تووشی ببێت، نەك بۆ جەنگ کردن، بۆچەسپان و ڕاستی قسەکانمان دەبێت ئاماژە بۆ ئەوەبکەین هیتلەر هیچ گوێی بەپرچەککردنی دەریایی نەدا.. لە پاشاندا نەبێت، لەسەرەتای ڕۆژەکانی یەکەمی مانگی ئەیلوولی **١٩٣٩**دا بەهۆی ئەو سەرکەوتنە کتوپڕیانەی هێزەکانی ئەڵمانیا لەو هێرشەی کردیانە سەر پۆڵندا.. هەر هەموو ترس و لەرزێك ڕەوییەوە و نەما، هەتا هیتلەر خۆشی جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە.

لە گەرمەی جەنگدا من خۆم هەمووکات گوێم لەوەدەبوو، دەیوت.."دەبوو ئەو هێرش و هەڵمەتە بۆسەر پۆڵندا بەزیانێکی گیانی زۆرتر کۆتایی بهاتایە، چونکە مەعنەویاتی هێزەکان لەو مەعنەویات و سەرکەوتنە سپی و بێخەوش

و بێزیانیانەی لە نەمسا و چیکۆسلوفاکیادا بەدەست هێنرا.. گەورەتر و باشتر نەبوو، بروام پێبکەن باشترین هێز ناتوانێت هێرشێکی تر بکاتە سەر پۆڵندا و داگیری بکات، هەر لەبەر ئەوەی دەستمایەیەکی گەورەی سەرکەوتنی سپی و بێ شەرکردنی هەیە..".

ئەم قسەو رونکردنەوەیە هیتلەر دەیـوت.. "دەشێ بۆ داپۆشینی ئەو خراپ هەڵسەنگانە دبلۆماسییەی مانگی (ئابی ١٩٣٩) بێت"، کۆلۆنیل-جەنەراڵ(هزیکی) پێش کۆتایی جەنگ باسی وتارێکی پێشووی هیتلەری بۆ کردم کە لە ناوجەنەراڵەکاندا دابووی و هەرهەمان بیروڕای دووپات کردبۆوە.. قسەو لێدوانەکانی(هزیکی) سەیربوو، منیش بەو شێوەیە تۆمارم کرد.."هیتلەر یەکەم کەسێك بوو دوای(شارلمان) هێزێکی گەورەو بێ سنووری بەو شێوەیە لە ژێر دەستدا کۆبێتەوە، ئەو دەستی بەسەر ئەو هێزەدا لە پێناو(هیچ)دا نەگرتبوو.. بەڵکو ئەو دەیویست ئەو هێزە لە کۆڕی جەنگدا لە پێناو ئەڵمانیادا بەکاربهێنێت خۆ ئەگەر ئەڵمانیا ئەو جەنگە نەباتەوە و تیایدا سەرنەکەوت و لەو تاقیکردنەوە و ئەزموونەدا خۆی بۆ ڕانەگیرا، ئەوا لەو حاڵەتەدا ژێر دەکەوێت و تیادەچێت".

هیتلەر لە ساڵی(١٩٤١)دا لە کاتێکدا سەرگەرمی ئەو هێرش و هەڵمەتەبوو بۆ سەر رووسیا، بیری لەو سەرکەوتنە گەورەیە دەکـردەوە، کە بڕیاربوو لە ساڵی(١٩٥٠)دا بەدەستی بهێنێت و ڕێگای کەژاوەی گەورەیی و سەرکەوتن لە ژێر تاقی سەرکەوتندا لەبەردەمیدا واڵا دەبێتەوە.

## یەکەم تێکشکان

لە کاتێکدا هیتلەر خەونی بە جەنگێکی نوێ و سەرکەوتنێکی مەزن و بەشکۆ و فێستیڤاڵێکی سەرکەوتوانەوە دەبینی، گەورەترین تێکشکان لە ژیانیدا سەری هەڵدا..

پاش سێ ڕۆژ لەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ منداکردی ئەو پلانە ئاوەدانکردنەوەیەی

بۆ منی باسکرد، فەرمانم پێدرا خۆم و نەخشەو هێڵکارییەکانم لەگەڵ خۆمدا بهێنم و بێم بۆ(ئوبرسالزبورگ) لە هۆڵی چاوەڕوانکردنی بارەگای(برغهوف)ی شاخاویدا دوویاریدەدەری(هس)م بینی. ئەوانیش (لینجن) و(بێش)بوون، چاوەڕوانییان دەکرد و خەم و ڕەنگ زەردی و پەژارە بەسەروسیمایانەوە دیاربوو.

داوایان لە من کرد ئەو چاوپێکەوتنەم لەگەڵ(فوهرەر)دا دوابخەم بۆ کاتێکی تر.. چونکە ئەمان نامەیەکی تایبەتی گرنگی(هس)یان پێیەو دەیانەوێت تەسلیمی هیتلەری بکەن، هەرلەو کاتەدا هیتلەر لە پێپلیکانەکانەوە هاتە خوارەوەو بانگی لە یەکێك لە یاریدەدەرەکان کرد بێتە ژووری دانیشتنەوە. منیش لە هۆڵەکەدا دانیشتبووم تەماشای وێنەو نەخشەکانی خۆمم دەکرد و ئەمدیو ئەودیوم دەکرد و خۆمم پێوە خەریك کردبوو، کتوپڕ گوێم لە هاوار و دەنگێ بوو، لە بۆرەی گادەچوو، دوای ئەوە هیتلەر هاواریکرد.. وتی.."بورمان.. بورمان.. هەر ئێستا وەرە.. دەی زووبە وەرە.. کوا بورمان..؟"

بە بورمانی وت.."هەر ئێستا یەکسەر تەلەفۆن لەگەڵ گورنگ و ڕیبنتروب و گوبلز و هملردا بکات".

داوای لە هەموو ئامادەبوان و میوانان کرد.. هەموویان بچنە نهۆمی سەرەوە پاش چەند سەعاتێکی دوورودرێژ زانیمان چی ڕوویداوە.. لە نێوان گەرمەی جەنگدا(هس)ی جێگری هیتلەر بە فڕۆکە بەرەو ئینگلتەرە ڕۆیشتبوو.

هیتلەر هێمن بۆوە و توورەییەکەی دامرکایەوە و هاتەوە سەرخۆ، بەڵام پەشۆکاو و نائارام بوو.. لە ترسی ئەوەی نەبادا چەرچڵ ئەو کارە بقۆزێتەوە بیکات بەکارێك بۆ سەرلێشێوانی هاوپەیمانەکانی ئەڵمانیا بەکاری بێنێت بیر لەوەبکەنەوە گوایە ئەمە پێوەرێکە بۆ زانینی لێدانی دڵیان بۆ ئاشتی و کۆتایی جەنگ.

هیتلەر وتی.."کێ باوەڕ بەوەدەکات.. (هس) لە خۆیەوە، سەربەخۆ بەرەو ئینگلتەرە ڕۆیشتووە..؟"

هەمووکەس بیر لەوەدەکەنەوە و واتێدەگەن من پێم وتووە ئەم کارە بکات و بچێت بۆ ئەوێ، خەڵکی بیر لەوەدەکاتەوە ئەم کارە فێڵێکە بە دزی و بێ ئاگاداری و لە پشت هاوپەیمانانمانەوە کراوە. یابانیش سیاسەت و هەڵوێستی خۆی لە ئاستماندا

دەگۆڕێت، هیتلەر لە گەورە بەرپرسی فڕۆکەوانانی ئەڵمانی(ئەرنست ئۆدیت)ی پرسی.."ئایا ئەو فڕۆکە دووپەروانەیەی(هس) بۆ ئەو سەفەرەبەکاری هێناوە، لەو کەشوهەوایەی بەرەنگاری دەبێتەوە دەتوانێت بگاتە ئۆسکوتلەندە..؟"

ئەویش وەڵامیدایەوە، ئەو فڕۆکەیەی(هس) بەکاری هێناوە بەهۆی ئەو کەشوهەوا ناسازە ئاسمانییەوە، لەوەدەچێت کەمێك بە ئاسمانی ئینگلتەرەدا سووڕابێتەوە و تێکشکابێت.. و کەوتبێتە ناودەریاوە، هیتلەر ئاواتی خواست ئەو بۆچوون و نوقلانەیە ڕاست بێت..

وتی.."ئاه.. خۆزگە دەکەوتە ڕووباری باکورەوە و غەرق بوایە و هیچ ئاسەوارێکی لە دواجێ نەمایە.. ئەو کاتە ئێمە کاتی ئەوەمان دەبوو بتوانین ڕوونکردنەوەیەکی تەواو و بۆچوونێکی ڕەوان و بێگەرد بەدوایدا بکەین."

پاش چەند کاتێکی کەم هیتلەر لەو کارەکەوتە گومان و دوودڵییەوە.. بڕیاریدا بەرادیۆ ئیعلان بکرێت و بلاوبکرێتەوە کە(هس) شێت بووەو عەقڵی لەدەستداوە".

هەردوو یاریدەرەکەی(هس) لە پێناو ئەو دەنگوباسە ناخۆش و نابەجێیەی ڕایانگەیاند دەسگیرکران.

لەو کاتەوە ئیتر لەناو دەست و پێوەندەکانی هیتلەردا بەهیچ جۆرێك ناوی (هس) نەدەهێنرا، بەلام (بورمان) سوودی لەوە وەرگرت و هەردەم ئاگاداری هەڵسوکەوت و دەنگوباسەکانی بوو، هەموو ڕێگایەکی چەوساندنەوە و توندوتیژی بەرامبەر ژنەکەی(هس) بەکاردەهێنا.

ئیفابراون لەو پێناوەدا، لەبەرخودی ژنەکە لای هیتلەر تکای بۆ کرد، بەلام هیچ سوودێکی نەبوو.. دوای ئەوە بەدزی هیتلەرو بێ ئەوەی بهێڵێت هیتلەر بەو کارەبزانێت یارمەنی زۆرباش و پێویستی ژنەکەی(هس)ی دەدا.

## وتەکانی هس

هس لەبەندیخانەی(شباندو) دوای (٢٥) ساڵ زۆر بەهێمنی و لەسەرخۆییەوە لەو بارەیەوە پێی وتم.."بیرۆکەی چوونم بۆ ئینگلتەرە، بەهۆی هێزێکی نادیاری

توانا بەدەری سروشتییەوەو بەرێگای خەوبینینەوەبوو، ئەو نەیدەویست نەیارو بەرهەڵستکاری هیتلەر بکات.. و هەڵوێستی شڵۆق بکات و کەرامەتی بریندار بکات.. ئەو نامەیەی لەگەڵ خۆیدا بردبووی بۆ ئینگلتەرە، ئەوەی تێدابوو.."ئێمە دەستەبەری و دڵنیایی ئیمپراتۆرییەتی بەریتانی دەکەین، بەرامبەر بەوەی ئینگلتەرە لە ئاستماندا لە ئەوروپادا هیچ دەست تێوەردانێك لە کاروبارماندا نەکات و لەو کاروبارانەدا ئازاد و سەربەستمان کات..

ئەم بیرۆکەیەش یەکێك بوو لەو بنەما سەرەکییانەی هیتلەر لە جەنگدا بانگهێشتی بۆ دەکرد.

(هس) هەتا کۆتایی هەر ئەم باس و قسانەی دەکرد، من لەو باوەڕەدا بووم هیتلەر بۆ ئەو کارە خراپ و نابەجێیەی یاریدەدەرەکەی کردبووی هەرگیز لێخۆشبوونی نەبوو.

جارێکیان دوای کودەتای (٢٠ی تەمموزی ١٩٤٤)، دەربارەی بواری گشتی لە خەیاڵ و بۆچوونەکانی خۆیدا کێشەی(گەڕاندنەوەی خائین)ی لەناو مەرجەکانی ڕێکەوتننامەکەیدا لەگەڵ دوژمنەکانیدا دانابوو دەیوت.. (هس) هەردەبێت لەسێدارە بدرێت.

کاتێك من ئەوەم بە(هس) وت..

وتی.."بێگومان ئیعدامی دەکردم.." ئەی لە ساڵی(١٩٤٥)دا لە کاتێکدا هەمووشتێك بەرەو کۆتایی بوون ڕۆیشت.. تۆ لەوباوەڕەدا نیت ئەو کاتە هیتلەر وتبێتی"هس لە سەر حەق بوو..؟"

## وەزیرێک مرد و وەزیرێکی نوێ لە شوێنیدا دانرا

لە مانگی شوباتی ساڵی(١٩٤٢)دا دوکتۆر(تودت)ی وەزیری پیشەسازی ئازووقەو ئاوەدانیکردنەوەی حوکومەتی هیتلەر لە ڕووداوێکی فڕۆکەوانیدا کوژراو لە ناوچوو.

لە هۆڵی نان خواردن لە کاتی نان خواردندا، باس لەسەر ئەوەکرا چ کەسێك لە شوێنی(تودت)دا دادەنرێت، هەرهەموان لەسەر ئەوە کۆکبوون، کەس جێگای ئەو کەسە شارەزاو نەمرە ناگرێتەوە، چونکە ئەو لەیەککاتدا ئیشوکاری سێ وەزیری رادەپەراند و بەرپرسبوو.. لە دروستکردنی رێگاوبان و قەنات و رووبارو ئێستگەی وەبەرهێنانی کارەباو نوێژەن کردنەوەی گشتیدا، وەزیرەکەی هیتلەر بەرپرسیش بوو لە چەکسازی لەشکرو ئازووقەشدا، سەرەتا ئاشکرابوو من بەشێکی زۆری راپەراندنی ئەو کارانەم پێدەسپێردرێت.

لە بەهاری ساڵی(١٩٣٩)دا لە کاتێکدا هیتلەر گەرانێکی چاوپێکەوتنی هێڵی(زیفگرید)ی دەکرد.. پێی وتم.."ئەگەر تودت، ژیانی تووشی لەناوچوون و هەر ناخۆشی و خەتەرییەك بوو.. دەبێت تۆ ئەوکاتە کاری پیشەسازی بگریتە ئەستۆ.."

لە هاوینی(١٩٤٠)دا هیتلەر بە فەرمی لە نوسینگەکەی خۆی لە راوێژکاری رایخدا لە بەرلیندا بانگهێشتی کردم.. و پێیراگەیاندم(تودت) سەرقاڵی گەلێك ئیشوکارە و دەستی ناپەرژێت، دەبێت تۆکاری پیشەسازی و ژێرزەمین دروستکردن لە رۆخی (دەریای ئەتلەسی)دا بگریتە دەست و بەوکارە هەڵسیت.

لەو کاتەدا هیتلەرم قایلکرد، وا باشەکاری بیناسازی و پرچەککردن لەبەرئەوەی پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە.. بەدەست یەك کەسەوە بێت دوای ئەوە ئیتر هیتلەر ئەولایەنەی باس نەکردەوە نەکردەوە و منیش لای کەس باسم نەکرد..

لە کاتێکدا من یەکەم کەسبووم لە دوای کاتژمێری یەکی نیوەشەودا بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ هیتلەردا بانگهێشتکرام، دڵنیابووم شتێك لە ئارادا هەیە.

تەنها یەك تەماشاکردن و سەرنجدان لە(شوب)ی گەورە هاریکاری هیتلەر بەسبوو بۆ ئەوەی بڵێت شتێکی گەورەو گرنگ لە ئارادایە.

بەفەرمی هیتلەر، پێشوازی لێکردم بەو سیفەتەی فوهرەری رایخە، فوهرەر بە پێوە راوەستابوو، بەوردی گوێی بۆ سەرەخۆشیکردنەکەی من گرت و هیچی نەگوت..، بەڵام هەردوای ئەوە یەکسەر وتی.. "هرشبیر.. بەوەزیری لە شوێنی وەزیر دوکتۆر(تودت) بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئیش و کارەکانی ئەو تەعینم

کردوویت!!" هەرحەپەسام و زمانم لاڵ بوو.. هیتلەر دەستی بۆ ڕاکێشام و تەوقەی لەگەڵدا کردم.. خەریکبوو خواحافیزیم لێ بکات و ئیزنم بدات.. وامزانی قسەکانی زۆر ڕوون و ئاشکرا نییە.. پێم وت.."گەورەم هەرچی لە توانامدا بێت دەیکەم بۆ ئەوەی لە گشت کارێکی بیناسازیدا جێگای(تودت) بگرمەوە.. هیتلەر وتی.."نەخێر لە هەموو کارو پیشەکانیدا و وەك وەزیرێك پێویستی جەنگ و هەموو تەقەمەنی جەنگیش..!!

پێمووت.. ئاخر.. ئاخر من هیچ شتێك نازانم.. لە..

هیتلەر قسەکەی پێ بڕیم وتی.."من بڕوام بەتۆیە، تۆ دەتوانیت چیم بەو سپاردووە لەسەر ئەوەشەوە بەزیادەوە بیکەیت، لە تۆ زیاتر کەسیتر شکنابەم هەر ئێستا بڕۆ پەیوەندی بە ئەنجومەنی وەزیرانەوەبکە.. وتم.."فوهرەری گەورەم کەواتە نوسراوێکی فەرمانی خۆتم بدەرێ من دڵنیانیم لەوەی بتوانم ئەو کارە بکەم.. هیتلەر بەدەستی خۆی فەرمانەکەی بۆ نووسیم.. بێدەنگ لێم وەرگرت، هەروەك عادەت بوو لە نێوان هەردووکماندا بێ ئەوەی یەك قسەم لەگەڵدا بکات، هیتلەر بە کارێکی ترەوە خۆی خەریککرد.

منیش بۆ ڕۆیشتن خۆم ئامادەکرد.. ئەمەیەکەم سیمای گۆڕانی پەیوەندی نێوانمان بوو.. چونکە فۆهرەر وەك دۆست و برادەرێکی ئەندازیار هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردم، بەڵام ئێستا وەك وەزیرێکی فۆهرەر پارێزگاری لەو میانەی نێوانماندا دەکرد.

## هیتلەر لەبەردەم مندا سەرکوتی(گۆرەنگ)دەکات

لە کاتێکدا من وەرچەرخام لە دەرگاکەوە بچمە دەرەوە(شوب) هاتە ژوورەوە و وتی.."گەورەم فۆهرەر مارشاڵی ڕایخ لێرەیەو دەیەوێت بێتە ژوورێ و بەپەلە چەند قسەیەکت لەگەڵدا بکات و و مەوعیدیشی وەرنەگرتووە.." هیتلەر بە بێزارییەوە وتی.."بابێتە ژوورەوە.." ڕوویکردە منیش وتی.."مەڕۆ کەمێك

لێرە بمێنەرەوە.." (گۆرەنگ) بە ماندوویی خۆیکرد بە ژووردا و چەند وتەیەکی کورتی سەرە خۆشی بە هیتلەر وت.. بەگەرمی و پەرۆشییەوە وتی.."چاکتر وایە من ئیشوکارەکانی(تودت) لە پرۆژەکانی چوار ساڵی داهاتوودا بگرمە دەست، بەوەش هەرچی ناکۆکی و گۆرانکارییەکیش کە لە نێوانماندا هەبووە نایهێڵم".

بێشك گۆرەنگ بەشەمەندەفەرە تایبەتییەکەی خۆی لە بارەگای راوکردنەکەیەوە لە(رومنتین) و لە دووری شەست میل لە بەرلینەوە و لە سەعات نۆونیوی شەوەوە، کە ئەو رووداوە روویدابوو بۆ ئەو مەبەستە بەپەلە کەوتبووە رێ و هاتبووە ئێرە هیتلەر لەسەر قسەکانی(گۆرەنگ) هیچی نەوت.. تەنهائەوەندەی وت.."من کەسێکی ترم لە شوێن (تودت)داناوە.. لەم کاتەوە وەزیر.. (شبیر) بە هەموو ئیش و کارەکانی دوکتۆر(تودت) هەڵدەستێت، قسەکانی هیتلەر یەکلایی کەرەوەبوو.. بەشێوەیەك بوو هیچی بۆ موناقەشەو گفتوگۆکردن نەهێشتەوە.

(گۆرەنگ) ئەوەی زۆر لاسەیربوو..، بەڵام هیچ قسەیەکی لەسەر قسەکانی هیتلەر نەکرد، تەنها بە ساردییەکەوە وتی.."گەورەم فۆهرەر بێگومان رێگام پێبدەدەیت لە ماتەمینی و پرسەی دوکتۆر(تودت)دا هاوبەشی نەکەم..؟!! تۆ خۆت ئەو ناکۆکییەی نێوانمان باش دەزانیت و هەرگیز شتێکی نەشیاوە من هاوبەشی لەو پرسەیەدا بکەم..!!" بەتەواوی بیرم نایەت ئەوکاتە هیتلەر چی وت.. ، بەڵام منیش تەسووری ئەوەناکەم لەو قسەو گفتوگۆ فەرمییەوە لە سەرەتای کاری وەزیریمدا بێدەنگ بووبێتم و هیچ قسەیەکم نەکردبێت، ئەوەم لە بیرە دوای ئەوە(گۆرەنگ) بێ هیچ سێ و دووکردن و دوودڵییەك رازی بوو لەبەر قسەوتوانجی خەڵکی لەو پرسەو ماتەمییەدا هاوبەشبوو.. بێشك گۆرەنگ بەوە دەیویست هەڵوێستی هیتلەر شلۆق(حرج)کات بەوەی فەرمانی بۆ دەرکات ئەم ئیشوکارەکانی(تودت) راپەرێنێت.

هیتلەر زیادەرەوی و سەرکێشییەکی گەورەی کرد بە دانانی من بە وەزیر، کەمن ئیش و کاری وەزارەتێك بخەمە سەرشانم کە لە هەموو وەزارەتەکانی دەوڵەت گەورەترو گرنگتر بوو.. چونکە پاشەرۆژی هەرهەموو وڵات بەندبوو بەو وەزارەتەوە، من خۆم وەك کەسێك دەربارەی لەشکر وحیزب و پیشەسازی نامۆبووم

و هیچم لێ نەدەزانین، چونکە لە هەموو ژیانمدا کارێکم نەکردووە پەیوەندی بەچەك و تەقەمەنی سەربازی و لەشکرەوە هەبێت، چونکە لە ژیانمدا من نە سەربازبووم نە چەکیشم لە شەڕداو هەتا لە ڕاویشدا هەڵنەگرتبوو، بەکاریشم نەهێنابوو.. لەو چاوپێکەوتنەدا شتێکم بۆ دەرکەوت.. ئەویش ئەوەبوو گۆرەنگ ڕۆژگار هەر چۆنێك بێت بەهیچ جۆرێك هەرگیزاوهەرگیز هاوکاری و پشتیوانیم ناکات..

(١٣)

# "ئەو کەسەی بۆ دواجار هێتلەری بە زیندوویی بینی"

"(هانزلینغ) زیاد لەبیست ساڵ خزمەتی هیتلەری کرد هەر ئەوکەسەش بوو، بۆ دواجار هیتلەری بەزیندوویی بینی و یەکەم کەسیش بوو بە مردوویی بیبینێت، رووسەکان (لینغ)یان گرت و لە گرتووخانەکانیاندا (١١) یانزە ساڵ بەبەندکراوی مایەوە و ژیانی بردەسەر دوای بەربوونی لە بەندیخانە، لەسەر ژیانی سەرکردەی ئەڵمانی پێشوو.. ئەمەی باس کردووە..."

## فیشەک

نیوەڕۆی ڕۆژی (٣٠ نیسانی ١٩٤٥) لە کاتژمێری چوار دە دەقیقە کەمدابوو، بینیم دووکەڵێکی ڕەش بەرزبۆوە.. گورج تێگەیشتم ئەو دووکەڵە لە لوولەی ئەو دەمانچەیەوە بەرزدەبێتەوە کە ئەدولف هیتلەر ژیانی خۆی پێکۆتایی هێناوە، ئەوکاتە من لەبەردەم دەرگای دەرەوەی ژووری نەخشەکانی ژێر زەمینەکەدا ڕاوەستابووم.. کە ٣٠ پێ لە ژێر داروپەردووی ڕووخاوی بینای ڕاوێژکاری

بەرلینداببوو.. دەنگی بەردەوامی تۆپەکانی ڕووسەکان بێدەنگی ناو ژێر زەمینەکەی هەراسان کردبوو.. نەمویست کات بەفیڕۆبدەم، بەسەر مێشکی خۆمدا زاڵبووم، خۆمکرد بە ژووری نەخشەکاندا.. هەر کە چوومە ژوورەوە هیتلەرم بینی لەسەر یەکێك لە قەنەفەکان لاربیبۆوە، خوێن لای ڕاستی مێشکییەوە بەسەر ڕوومەتیا دەهاتە خوارەوە.. ئەو جلە سەربازییە فەرمییانەی لەبەردابوو، کەمن پێش چەند سەعاتێکی کەم بۆم ئامادەکردبوو.. جلەکانی هەروا بەجوانی و ئوتوکراوی مابوونەوە، بێ ئەوەی یەك تۆز چرچ و لۆچ بووبێت.. لە ژێر دەستی ڕاستیدا لەسەر زەوییەکە دەمانچەکەی کەوتبوو.. مەترێك دوورتر لەوەوە تفەنگێکیش کەوتبوو..

لاشەی(ئیفابراون)یش لە تەنیشت ئەوەوە کەوتبوو، وابزانم پێش خۆکوشتنی هیتلەر بە چەند دەقیقەیەك پێش ئەو خۆی کوشتبوو، دەم و چاو و سیمای تێك نەچووبوو.. لەدەم و چاوی مردوو نەدەچوو.. دەتووت نوستووە.. ئیفا حەبی ژەهراوی خواردبوو، بەو حەبە ژەهراوییە خۆی کوشتبوو..

هیتلەری بەڕێزو سەروەرم بەیانی ئەو ڕۆژە سەگە ئەلزاسییەکەی(بلوندی) و دوو سەگی تری ماڵەکەی خۆی کوشت.

پێنج ڕۆژ پێش خۆکوشتنەکەی عەسری ڕۆژی (٢٥ نیسان) بانگی کردمە ژووری نەخشەکانەوە، کە هیتلەر کردبوویە بارەگای سەرکردایەتی خۆی و بنکەی پەیوەندییەکانی و ببووە ناوەندی حکومەتە ڕووخاوەکەی، لەو ڕۆژانەوە کە ڕووسەکان هەڕەشەی گرتنی بەرلینیان دەکرد، کردبووی بە جێگای دانیشتن و نیشتەجێ بوونی خۆی.

ئەو ژوورەش ژوورێکی بچووك و هەندێ فەرش و پێویستی سادەوکەمی تێدابوو ئەم ژوورە وەك ژوورە گەورەکانی بینا ڕووخاوەکە نەبوو کەبەسەر زەویدا ڕمابوو.. لەلایەکی ژوورەکەوە دەرگایەکی تێدابوو، دەچووە ئەو ژوورەی فۆهرەری تێدا دەنووست، لەلایەکی تریشیەوە دەرگایەکی تری تێدابوو دەچوو بۆ ئەو ژوورەی(ئیفابراون)ی تێدابوو.. ژوورەکەی(من)یش لەولاوە نووسابوو بەو ژوورانەوە کە خێزان و مناڵەکانی(گۆبلز)ی تێدابوو..

کاتێك چوومە ژوورەوە هیتلەرم بینی وەك پەیکەر لەبەردەم مێزی نان خواردنەکەدا ڕاوەستابوو.. ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو چاوەکانی گەشی تێدانەمابوو.. ساردوسڕ نیشانەی ترس و نائومێدی پێوەدیاربوو، سڵاو وچاکوچۆنیمان لەگەڵ یەکدا کرد، وەك خووی جارانی تەماشای چاومی کرد، بەڵام هەستم کرد چاوەکانی وەك لەمەوپێش بینیبووم ئەو هێزە موگناتیسییەی جارانی نەمابوو..!!

## بڕۆ بەلای کەسوکاری خۆتەوە

هیتلەر پێی وتم..

"لینغ.. ئیتر من پێویستیم بە خزمەتی تۆ نییە.. بڕۆجێم بهێڵە و بڕۆرەوە بۆ ناو کەسوکاری خۆت.."

وتم.."سەروەرم.. من لە ڕۆژە خۆش و پڕشکۆکاندا لەگەڵتدابووم لەمەودواش هەرچی ڕوویدا هەردەم لە تەکتادەبم و جێت ناهێڵم.." سیمای هەربەماتی بێهەست مایەوە.. تۆزێك دەستی بەرزکردەوە.. وتی"من لەمە زیاتر چاوەڕوانی هیچی ترم لێ نەدەکردی.." پاشان کتوپڕ وەك ئەوەی بۆ کارێکی ئاسایی قسە بکات.. وتی"من کارێکی تایبەتیم پێتە.. من و ئیفابراون بڕیارمانداوە پێکەوە بمرین".

ئەو کارە تایبەتییەی من لە تۆم دەوێت، ئەوەیە، خۆت بەدەستی خۆت لاشەی هەردووکمان بسووتێنیت، نامەوێت دوای مردنمان کەس بمان ناسێتەوە..!! لاشەکانمان لە بەتانییەکەوە بپێچەو هەندێ غاز بێنەو بیکە بەسەر بەتانییەکەدا و ئاگری تێ بەردە، و لاشەکانمان بسووتێنە کە لەوەبوویتەوە بڕۆ بۆ ژوورەکەی خۆم هەرچی شتێکم هەیە و پەیوەندی بەمنەوە هەیە و خەڵکی دوای مردنم بەهۆی ئەو شتانەوە من دەناسنەوە کۆی بکەرەوە هەر هەموو شتەکانم.. و جلوبەرگی ڕەسمی و سەربازیم و کاغەز و هەرهەموو ئەو شتانەی بەکاردێت

و خەڵکی پێیان وایەو دەڵێن ئەوە هی(فۆهرەر) بوو هەر هەموویان کۆبکەرەوە و بیان سووتێنە بانەمێنن، بەڵام.. ئەوەت پێدەڵێمەوەو دووبارەی دەکەمەوە.. ئاگاداربە نەکەیت ئەو تابلۆیەی(فریدریکی گەورە) کەوا لەسەر نووسینگەکەمەوە هەڵواسراوە بسووتێنیت..!!

ئەو وێنەیە لای هیتلەر زۆر بەرێز و خۆشەویست بوو.. هەردەم شانازی پێوەدەکرد، چەندەها شەوی دوورودرێژی بە ئیشکردنەوە بەسەربردبوو، چەندەها رۆژی سەرکەوتن و ژێرکەوتنی بەسەردا هاتبوو.. لە نووسینگەکەیدا لە تابلۆکەدا(فریدریك) ئیمپراتۆری گەورەی ئەڵمانی بە ژوور سەرییەوە بەچاوەکانی سەرنجی هیتلەری دەدا، هیتلەر وتی:"لینغ.. لە فەرمانەکانم گەیشتیی..؟"

وتم"بەڵێ گەورەو سەروەرم... تۆ چۆن ئەفەرموویت من هەروا فەرمانەکانت یەکەیەکە جێبەجێ دەکەم.. من خۆم هەر ئەوەم زوو دەزانی هیتلەر لەبەرلیندا مردنی پێخۆشتربوو وەك لەوەی رابکات و خۆی بشارێتەوە لە ترسی ئەوەی رووسەکان بە زیندوویی بیگرن، یان لاشەکەی بە مردوویی بدۆزنەوە و دەستیان بکەوێت.. هەستی کردبوو دەیزانی چییان لەلاشەی(مۆسۆلین) و دۆستەکەی کرد. دەیزانی هەرواش لەلاشەی ئەو و ئیفابراونی دۆستی دەکەن.

پێی وتم.."ئەگەر بە زیندوویی یا مردوویی دەستیان بکەوم و بمگرن.. دەمبەن بۆ مۆسکۆ، لەوێ وەك بووکەڵەیەکی لە مۆم دروستکراو پیشانی خەڵکم دەدەن و دەمکەن بەپەند.. وەك فێی لێهاتبێت بە هەموو دەنگی قیژانی.."نا.. نا.. ناشێ و نابێت شتی وابێت.. من بە تۆ دەڵێم.. نا.. نا.. نا.. نابێت شتی وا رووبدات.."

## دە رۆژ پێشتر



دە رۆژ پێش ئەوەی مۆمی ژیانی(ئەدۆلف هیتلەر) بۆ هەتاهەتایە بکوژێتەوە و کۆتایی بە ژیانی بێت.. ژێر زەمینەکە دوو ئاهەنگی گەورەو خۆشی بە خۆوەبینی..

ئاهەنگی یەکەم ڕۆژی(٢٠ نیسان)بوو.. لە کاتێکدا هیتلەر ئاهەنگی جەژنی لە دایکبوونی پەنجاوشەش ساڵەی خۆی تیادا گێڕا.. ئاسایی شادو دڵخۆش و بێ خەم و خەفەت بوو..

هەریەکە لە(گۆرەنگ) و(ریبنتروب) و(کیتل) و(بورمان) و ئەفسەرە پلەدارەو گەورەکان هاتن بۆ ژێر زەمینەکەو سلاوو پیرۆزباییان لە هیتلەر کرد.. ئەندامانی حیزب هەر هەموویان یەك قسەیان دەکرد ئەویش ئەوەبوو دەیانووت.."هەتا مردن پابەند و موخلسین..".

هیتلەر پەرداخێك چای خواردەوە.. دوای ئەوە پەرداخێکی تریشی خواردەوە لەو ڕۆژانەدا چا زۆر بەگران دەستدەکەوت هەتا بۆ هیتلەریش هیتلەر چای لە هەموو خواردنەوەیەك پێخۆشتربوو، لەو زیاتر کەس تر چای نەدەخواردەوە.

قاوەو شەمپانیا پێشکەش میوانەکان دەکرا، خاتو ئیفابراون بە خۆشی و شادییەوە پێشنیاری کرد.. هەر هەموان پێکی ژیانی لە دایکبوون بخۆنەوە.. ئێستاش ئەو ڕۆژانەم لەبیرە کە هەردووکیان پێکەوە لە ژێر زەمینەکەدابوون.. هیتلەر چەند بە تەنگ ژیان و تەندروستی(ئیفابراون)ەوە بوو..

هیتلەر هەموو جارێك فەرمانی پێدەکردم لەگەڵ ئیفادا بڕۆم بۆ پیاسەکردن. بە ناو کەلاوەودار و پەردووی بیناروخاوەکانی بەرلیندا وەك هاوڕێی یەکتر پێکەوە دەگەڕاین و پیاسەمان دەکرد جارێکیان پێش کۆتایی لە ناوچوون..

ئیفابراون ڕووی تێکردم..وتی...

ـ مەگەرخوا بە موعجیزەی خۆی ڕزگارمان کات... خۆ ئەگەر ئەوە نەبوو.. ئەوا گەورەترین ئاوات و هیوای من ئەوەیە وەك ژنێکی شەرعی لەگەڵ فوهرەردا پێکەوە هاوسەرێتی ببەستین و پێکەوە بمرین.

ماوەیەك لەو سۆز و خۆشەویستییەدا بێدەنگ مایەوە.. دەنگی لە قورگیدا قەتیسماو قسەی بۆ نەکرا، منیش وەك(نۆکەر) و خزمەتچییەك نەمتوانی هیچ قسەیەك لە قسەکانی ئەودا بکەم، بەڵام لەو بەیانییەی ڕۆژی ٢٩ی نیسانەدا قسەکەیم بیرکەوتەوە، کاتێك هیتلەر بانگیکردم، ئەو ژوورەی هەموو کات بۆ فیستڤاڵ و کۆبوونەوە گرنگەکانی جەنگی، تیادا دەبەسترا بۆ ئاهەنگی

هاوسەری لەگەڵ ئیفابراوندا ئامادەبکەم و بیرازێنمەوە پێی وتم.."لەسەر ئەو مێزە دادەنیشین و شاهیدی هاوسەریمان(بورمان) و(جوبڵز) دەبێت. ناردومە بە دوای(والترناجز)دا بێت، گرێبەستی هاوسەرییەکەمان بۆ ساز بکات، هەر ئەویش گرێبەستی هاوسەری(جوبڵز)یشی کردووە."

کتوپڕ بێدەنگ بوو.. لە ژوورەکە ڕۆیشتە دەرەوە.. وابڕیاربوو گرێبەستی هاوسەرییەکە لە عەسری ئەو ڕۆژەدا بێت، بەڵام ئەوکەسەی بەدوای(والتر)دا چووبوو نەیدۆزیبۆوە.. مارەکردنەکە دواکەوت..

لە نیوەشەودا مارەبڕینەکە کرا.. ئاخری هیتلەر و ئیفابراون بوون بەژن و مێردی شەرعی..

## خۆکوشتن

ئاوا بەو شێوەیە ژووری نەخشەکان، ئاهەنگێکی تری بەخۆوە بینی، لەو ئاهەنگەدا شەمپانیا بۆ میوانەکان و چا پێشکەش هیتلەر کرا. شادی و خۆشی لە سیمای هەمواندا دەدرەوشایەوە، ئەو ترس و لەرزەی بەسەر بەرلیندا باڵی کێشابوو.. پشتگوێیان خستبوو.. ئامادەبوان لەناو خۆیاندا پێشبڕکێ و پەلەیان بوو.. بۆ دەست ماچکردنی خاتوو(ئیفابراون).

زۆر دەمێك بوو خاتوو ئیفابراونم دەناسی، بەڵام هەرگیز هێندەی ئەو ڕۆژە ئیفام وا بەدڵخۆشی و شادییەوە نەبینیبوو.. بێگومان خۆشی و شادییەکە تۆزێك ڕووکەشی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو باوەڕەدا بووم هیچ یەکێك لەو میوانانە بە خەیاڵیاندا نەهاتبوو کەوا بەوەدەم و دەست و زوویییە مردن ئەو دووهاوسەرە بگرێتەباوەش.

هەردوو لاشەکەم بەجوانی هەریەکە لە بەتانییەکەوە پێچا هەتا هیچ شوێنێکیان دیارنەبێت. بۆ دەرەوەی ژێر زەمینەکە دوو پێشمەرگە یارمەتی هەڵگرتنی لاشەکانیان دام، ماجور(جوینش) یاوەری پاشکۆی نوسینگەی هیتلەر(ئیفابراون)ی

هەڵگرت، ئیفا کراسێکی کونجی لەبەردابوو کراسەکە بە نوقتە نوقتەی شینێکی تۆخ ڕازابۆوە.. جوتێ پێڵاوی ئیتالی سووکی لە پێدابوو.. قاچەکانی جووتێ گۆرەوی نایلۆنی تێدابوو.

سەعاتێکی قۆردونی پلاتینی لە مەچەکدابوو.. بە ئەڵماس ڕازێنرابۆوە، ئەوە تەنها خشڵێك بوو خۆی پێڕازاندبۆوە، ئەویش چەند ساڵێك لەمەوپێش کاتی خۆی هیتلەر بەدیاریی پێشکەشی کردبوو، یەك لە دوایەك بوتڵە غازم دەکرد بەسەر لاشەکاندا.. (ماجورجوینش) و هەندێ ئەفسەر یارمەتییان دەدام.. لەو کاتەشدا بەردەوام گوێمان لە دەنگ و گرمەی بۆمبی تۆپەکان و ڕەشاشەکان بوو لە نزیکمانەوە دەتەقی و گرمەیان دەهات. هەرکە ئاگرم دەنا بە غازەکەوە خێرا کڵپەیەکی گەورەی دەکرد و کڵپەکە ڕووناکییەکی لێ بەرزدەبۆوە و هەر بەو خێراییەی کڵپەکەی دەکرد گورج دادەمرکایەوە.

تێگەیشتم ئەوەندە کاتمان بەدەستەوە نەماوە، وەسییەتەکەی هیتلەرم بیرکەوتەوە کە دەیووت، نابێت هیچ ئاسەوارێکی لاشەکانیان بمێنێت، ئیتر ئەو کاتە بیرم کردەوە چی بکەم..؟ ئەویش ئەوەبوو چەند دەبە بەنزینێك پەیدابکەین و لاشەکانیان پێ بسوتێنین وبیکەین بە خۆڵەمێش، جلە فەرمی و سەربازییەکانی بەری هیتلەر و کراسەکەی(ئیفابراون) سووتابوون، بەڵام هێشتا لاشەکانیان وەك خۆی مابوون و بەجوانی دەناسرانەوە.

بورمان فەرمانی پێ کرا بەو کارە هەستێت، ئەویش گورج کارەکەی جێبەجێکرد، تێنەگەیشتم کێ ئەو فەرمانەی بۆ دەرکرد و ئێمەی لەو کێشەیە ڕزگار کرد.

(گۆبڵز) و (بورمان) و(ئەکسمان)ی سەرکردەی لاوانی هیتلەری لە نزیك لاشە سووتاوەکانەوە ڕاوەستابوون، من بەجێمهێشتن و ڕوومکردە ژێر زەمینەکە بۆ ئەوەی کاری دووەمم جێبەجێ بکەم، ئەویش ئەوەبوو هەرچی شتێکی تایبەتی هیتلەر لە ژێرزەمینەکەدا هەیە.. کۆی بکەمەوە و لەناویان بەرم و نەیان هێڵم، دوای ئەوەی لە ژێر زەمینەکە هاتمەدەرەوە، بینیم پێشمەرگەکان هەردوولاشەکەیان بردبووە دەرەوە و لە شوێنێکی تردا سووتاندبوویانن و ناشتبویانن.

# هێلانەی خۆشەویستی

ئەوەی ئێستا دوای بەربوون و گەڕانەوەم لە بەندبوونم ئەوەم لاسەیرە، دەبیستم هێشتا خەڵکی ئەم جیهانە دەپرسن... ئایا ئیفابراون دۆستی هیتلەربوو..؟ ئەی ئەگەر دۆستی هیتلەر بووە.. چۆن هەر بەو حاڵە رازی بووە..؟ منیش وەڵامی ئەو پرسیارانە بەوە دەدەمەوە و دەڵێم من لە ساڵی(١٩٣٥)ەوە کە بوومە خزمەتکاری هیتلەر.. ئیفا براون هەر لەگەڵ هیتلەردابووە و تا ئەو رۆژەی مردنیش هەر لەگەڵیدابوو.. هەردەم پێکیشەوە لەو شوێنەی خەڵکی پێی دەڵێن(هێلانەی خۆشەویستی) پێکەوە دەژیان.

ئیفابراون کچی بەڕێوەبەری خوێندنگای(میونیخ)بوو، کچێکی لاوازبوو، ئەو کچە لاوازە لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا چوو بۆ سالزبورگ لەوێدابوو بە سکرتێرەی(هیزیخ خۆفمان)ی وێنەگر.

هۆفمان برادەری هیتلەربوو، لەیەکێك لە بۆنەکاندا هیتلەر لەوێدا(ئیفابراون)ی بینی و کەوتە بەردڵی بوو بە خۆشەویستی ئیفابراون کچێکی سادەو بێفیزبوو، هەروەك هیتلەر زۆرجار دەیووت کچێکی هاوڵاتی شەعبی بوو..

لەسەرەتای ساڵی(١٩٣٦)دا هیتلەر خانووە تەریکەکەی(برختگادن)ی نوێژەن کردەوە، خانوویەکی چوار هۆدەیی بۆخۆی و ئیفابراون تێدا دروستکرد.. ژوورەکانی خۆی و ئیفا تەریك و دووربوون لە هەموو ژوورەکانی تری خانووەکەوە.

ئیفابراون یەکەم ژن نەبوو لە ژیانی هیتلەردا، بەڵام لەو رۆژەوەی ناسی و خۆشیویست.. ئیفابووبە تەنها ژن کە هیتلەر کاتی بێکاری لەگەڵدا بەرێتەسەر، مەگەر چەند جارێکی کەم نەبێت، ئەویش وەك هەموو پیاوێکی ناو ئەم جیهانە نەبێت لەگەڵ کچانی تردابووەو رایبواردووە.

ژوورەکەی من لە نزیك ژوورەکانی ئەواندا بوو.. هیتلەر واراهاتبوو هەر کە ئیفا دەچوو بۆلای، لە پشتەوە دەرگای ژوورەکەی دادەخست بۆ ئەوەی کەس نەچێتە

ژوورەوە، جارێکیان هیتلەر بیری نەبوو دەرگاکە دابخات، کاتێك من چوومە ژوورەوە، کتوپڕ ئیفام بینی بەڕووتی لە باوەشیدابوو.. هیتلەر لێم توورەبوو.. پێشبینی خراپترین شتم لێکرد، ئەگەر ئیفا نەبوایە کەوتە نێوانمانەوە و هێتلەری دامرکاندەوە و هێنایەوە سەرخۆ تووشی کارەساتێك دەبووم.

ئیفامنی خۆشدەویست و بەنزیکترین کەسی دادەنام کە لە فۆهرەرەوە نزیك بێت، واتە نزیکترین پیاو لەو پیاوەی ئەم خۆشیدەویست.

## ئایا هیتلەر کەسێکی شێت بوو..؟

زۆرجار ئەم پرسیارەیان لێ دەکردم، زۆرێکی زۆریشم لەو حاڵەت و باسی شێتیانە دەخوێندەوە وەك گازی لە مافوور دەگرت و پەردەی پەنجەرەکانی دەدڕی و شتی لەوجۆرانە، ئەوەی من بتوانم وەڵامبدەمەوە، بەسیفەتی ئەوەی من چەندەها ساڵی دوورودرێژ نزیکی ئەوبووم و هەمیشە لەگەڵیدابووم.. دەڵێم بەهیچ جۆرێك جارێ لە جاران شتی لەو جۆرانەم لێنەدیبوو، هەرگیز نەمبینی بوو شتی وابکات.

زۆربەی زۆری وتارەکانی ئامادەدەکرد و پێش ئەوەی ئەو وتارەبدات دەیخوێندەوەو مەشقی لەسەردەکرد. عادەتی وابوو دوو ڕۆژ لەگەڵ سکرتێرەکانیدا دادەنیشت و کاتی دەبردە سەر پێش ئەوەی لە دەقی وتارە گرنگەکەی ڕازی بێت.

هەر کە بەباشی دەقی وتارەکەی ئامادەدەبوو، بەباشی لە بەریدەکرد دەچوو لەبەردەمی ئاوێنەکەدا ڕادەوەستاو سەعاتەکەی دەگرت بە دەستەوەودەستی بە خوێندنەوەی وتارەکە دەکرد و سەرنجی جووڵەی دەست و ئەندامەکانی تری خۆی دەداو چەند جارێك وتارەکەی دووپات دەکردەوە و کاتی بۆ زەبت دەکرد تا بە تەواوی بەدڵی دەبوو..

# چاویلکەکانی هیتلەر

لە ماوەی ئەو دەساڵەی من لە خزمەتیدابووم و خزمەتیم دەکرد.. هیتلەر بۆ خوێندنەوە چاویلکەی پزیشکی بەکارنەهێنا، بەڵام ئەگەر یەکێك بە چاویلکەوە بیبینایە پێی ناخۆشبوو.. بە بێزارییەوە دەیووت..(نابێت فۆهرەر چاویلکەی پزیشکی لەچاو بکات..).

ئامێرێکی چاپکردنی تایبەتییان بۆ دروستکردبوو.. پیتەکانی گەورەبوو.. بەو ئامێرەهەموو وتارەکانی دەنووسییەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر پێویستی بوو بچێتەوە سەردەقێکی وتارەکەی، تەماشای ئەو نوسراوەی دەکرد، بێئەوەی چاویلکە لە چاو بکات، بەڵام وەك ڕاهاتن لە کاتی وتار خوێندنەوەدا چاویلکەی دەردەهێناو دەیگرت بە دەستەوەو دەیخستە پشتی خۆیەوە، خۆ ئەگەر لە وتارەکانیدا برگەیەکی گرنگی تێدابوایە توند چاویلکەکەی بەدەست دەگوشی و زەختی لێدەکرد و دەیشکاند.. هیتلەر ئەم نەریتەی بۆ تەرك نەدەکرا، دەبوا من هەمیشە چاویلکەی یەدەگم پێببوایە، بیرم دێ بەلایەنی کەمەوە سی جار چاویلکەکانی بەمجۆرە شکاندووە.

هیتلەر عادەتێکی تریشی هەبوو، ڕەنگە هەر ئەمەش بووبێت لەناو خەڵکیدا بڵاوبووبێتەوە کە گازی لە مافوور و پەردەی پەنجەرەی دڕاندبێت هیتلەر لەسەر مێزەکەی سێ جۆر پێنووسی لەسەربوو.. پێنووسێکی سوور، و پێنووسێکی سەوزو پێنووسێکی شین.. جارێکیان پێی وتم.."لینغ.. من بۆ دوژمنانم بە پێنووسی سوور دەنووسم و بۆ دۆست و برادەرانم بە پێنووسی سەوز دەنووسم.. و پێنووسە شینەکەش بۆ کاتی وشیاری و ئاگادار کردنەوەم بەکاردێنم، ئەم قەڵەمانەی بە دەستەوە دەگرت، ئەگەر تووڕەبوایە قەڵەمەکانی بەتوند دەکێشا بەزەویدا و فڕێی دەدان پێنووسەکان دەشکان.

ئەمە هەموو بینین و یادەوەرییەکی منە کەلەکاتی تووڕەبوونی ئەودا بیرم بێتەوەو بینبێتم..

کاتێکیش هەموو شتێك بەرەو ڕمان و نسکۆ دەڕۆیشت سەرنجی هیتلەرم

دەدا لەگەڵ ئەو تەمەنە کەمەی هەیبوو دەبینی وەك پیاوێکی بەساڵاچوو، وردە وردە بەرەوپیری و دارمان دەچوو.. زۆر دەگمەن بوو لە-ئەڵمانیا-دا کەس هەبوو بێت هەستیان بەو ڕاستییە کردبێت، منیش ئەو ڕاستییەم زۆر بە وریاییەوە دەشاردەوە، و نەمدەدرکاند، فوهرەر لە کاتی ڕۆیشتنیدا بە گران قاچی چەپی ڕادەکێشا، چاوی چەپیشی لەکاتی توورەبوونیدا زوو زوو دەتروکاند و بەباشی شتی پێنەدەبینی، لەبەرئەوەی زۆربەی کاتەکانی ژیانی لە ژێرزەمیندا دەبردەسەر زۆربەی تووکی سەری سپی ببوو..

فرهەر بۆ نەخۆشییەکانی پەنای دەبردەلای..(دوکتۆر تیومۆریل) موریل پزیشکی تایبەتی فۆهرەربوو، یەکەم پزیشکیش بوو فۆهرەر بەردەوام بڕواو متمانەی پێ بوو.

دوکتور(موریل) لە ساڵی(١٩٣٦)ەوە لەسەر ژیانی هیتلەردا دەرکەوت و زۆر بەزوویی کاریگەری ئەفسووناوی بۆ ئازارەکانی کردە سەر هیتلەر و دەرمانی تایبەتی و باش بۆ نەخۆشی و ئازارەکانی ئامادە دەکرد، هیتلەر زۆری ڕێزدەگرت و خۆشی دەویست جارێك هیتلەر پێی وتم"موریل پزیشکی خۆمە.. هەر ئەویش لە ئێش و ئازار ڕزگاری کردم، من خۆم پێمووتووە بەردەوام چاودێری تەندروستیم بکات هیتلەر لەگەڵ ئەو هەموو ئێش و ئازارەی گەدەیدا.. کە بەدەستییەوە دەیناڵاند.. تووشی کەم خەویش ببوو.. نزیکەی دوانزەجۆر حەبی خەوی جۆراوجۆری بەکاردەهێنا، دوکتۆر موریل بە فۆهرەری وتبوو چەند حەب پێویستکات بۆ خەوتن.. بیخۆ، ترست نەبێت، بەشێوەیەك ئەو حەبانەی بۆ دروستکردبوو، هیچ زەرەرێکی بۆ سەر تەندروستی نەبێت.. هەر(موریل)یش بوو وای لە هیتلەرکرد پێش ئەوەی لەبەردەم خەڵکیدا لە بۆنەکاندا دەرکەوێت و وتاربدات شرینقە لە خۆی بدات.

هیتلەر لەوەدەترسا لەکاتی ڕاوەستان و وتار خوێندنەوەدا لەبەردەم جەماوەردا کتوپڕ ئازاری گەدەی تووشی بێتەوە، بۆ ئەوەی تووشی ئەو ئازارە نەبێت شرینقەیەکی لە خۆی دەدا، و شرینقەیەکی بەهێزی(مقوی)یش لە خۆی دەدا بۆ ئەوەی گورج و گۆڵبێت.. و بەر هەڵستی ئەو زیانە بکات کە بەهۆی شرینقەی

یەکەمەوە تووشی دەبێت هیتلەر لەسەر ئەو شرینقانە ڕاهاتبوو، ئالوودەیان ببوو پێی تەرك نەدەكرا و نەیدەتوانی وازیان لێ بهێنێت، جا وتاری بدایە یا نەیدایە هەر ئەو شرینقانەی لە خۆدەدا.

فوهرەر لەوە دەترسا قەڵەو بێت و قورسایی زیاد بکات، لەبەرئەوە حەبی ڕەوانی بە قووەتی دەخوارد، پاشان تۆزێك تلیاکیشی دەخوارد بۆ ئەوەی ئازاری گەدەی دامرکێنێتەوە چونکە توانای خۆراگرتنی ئەو ئازاری ڕەوانییەی نەدەگرت، دوای خواردنی تلیاکەکە حەبێکی تری دەخوارد بۆ ئەوەی هەرچی میکرۆبێك لەناو لەشیدا خۆیان مەڵاسداوە بیکوژێت و لەناویانبەرێت لە ئاخریدا منیش خەریکبوو ببم بە پزیشك، چونکە هەردەم جانتایەکی پڕ لە جۆرەها داودەرمان و حەب و شرینقەم بە کۆڵەوەبوو دەبوا هەمووشتێکیشم لەوداو دەرمانانە بزانیایە.. کە بۆچی بەکاردێت و ڕێگای بەکارهێنانیان.. و کاتی باش و گونجاو بۆ خواردن و بەکارهێنانیشیانم بزانیایە.

لەگەڵ ئەوەی سەرەتا دوکتۆر موریل توانی ئازاری گەدەی کەمکاتەوە و نەیهێڵێت، بەڵام ناوبەناو ئازارەکەی لێپەیدا دەبۆوە.. بۆ ئەوەش دوکتۆر بیرێکی تری کردەوە، ئەویش ئەوەبوو.. بۆ نەهێشتنی ئەو ئازارە دەبێت خواردنی سووك و گونجاوبخوات دوکتۆر هات بۆ ئەو مەبەستە سەرپەرشتی و چاودێری خواردنەکانی لە چێشتخانەکەدا دەکرد.

فەرمانیدا ئەو سەوزەومیوە و خواردنانەی ئەو دەیخوات دەبێت لە کێڵگەیەکی بۆ خاوی دابێت و بە جۆرەها سەماد گەورەبگرێن و دەبێت گڵوجۆری خواردنەکەش ناوبەناو فەحس بکرێت و تیڕوانینی لەسەربکرێت و دەبێت ئەو ئاوەشی سەوزەواتەکانی پێ ئاو دەدرێت ئەویش تیڕوانینی بۆ بکرێت بۆ ئەوەی دڵنیابین لەوەی هیچ جۆرە پیسی و میکروباتێکی تێدانییە.

کاتێك کاروباری سەربازی تێکچوو بەرەوخراپی ڕۆیشت هیتلەر بۆ سووککردنی ئازاری سەری حەبی(بلادنا)ی دەخوارد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕۆژی شەڕوپێکدادانی شاری(ستالینگراد)ەوە دەستی چەپی دەلەرزی نەیدەتوانی خۆی بەسەر ئەو لەرزینەدا زاڵکات.

ئەگەر سەرنجی وێنەکانی ئەو کاتانەی بدەیت.. دەبینیت هەموو کات دەستی چەپی بەلەشییەوە گرتووە، یاخود بەدەستی ڕاستی، دەستی چەپی گرتووە بۆ ئەوەی نەهێڵێت بلەرزێت کاتێك هیتلەر هەستی بەودەست لەرزینەکرد بە دوکتۆر(موریل)ی وت.. سەری زۆردێشێت و ئازارێکی زۆری هەیە.. لەوە دەترسێت تووشی فشاری خوێن ببوبێت دوکتۆر بڕیاریدا خوێن لە قۆڵی دەربێنن لەگەڵ هەرخوێن دەرهێنانێك لە قۆڵیدا.. هیتلەر هەناسەی حەسانەوەی هەڵدەکێشاو دەیوت"ئاه.. ئەمە باشبوو، ئێستا هەست بە حەسانەوە و ڕزگاربوونی خۆم دەکەم".

کاتێك هاوپەیمانان گەمارۆی بەرلینیان دا و چواردەوریان گرت.. هیتلەر هەموو کاتێکی لە ژێر زەمینەکەدا دەبردەسەر. ئەوانەی دەهاتن بۆلای ماوەیەکی زۆر نەیانبینیبوو، بەو شێوەیە چاویان پێدەکەوت و دەیانبینی واپیربووە.. زۆریان لاسەیربوو، کە خۆشی هەستی بەو ڕاستییەکرد.. پێی وتم"پێویستناکات سووپاسی دوژمنانم بکەم بۆ سەرەسپییەکەم شوکروسوپاس بۆ ئەو سەرسپی و پیربوونەم لە فەرماندە و سەرکردەکانی خۆم دەکەم کە منیان واشەرمەزار و ڕووزەرد کرد لە بەردەم دوژمناندا.

کاتێك من بەبەندکراوی کەوتمە دەست ڕووسەکان.. چەند جارێك منیان هێنا بۆ ئەو شوێنەی وایاندەزانی هیتلەری تیادا نێژراوە، بەڵام هەرگیز نەیانزانی لە کوێدا نێژراوە و گۆڕەکەیان نەدۆزییەوە.

منیش لەوبارەیەوە بۆچوونێکی تایبەتیم هەیە، ئەویش ئەوەیە زۆر پێدەچێت کە پێشمەرگەکان لاشەی هیتلەر و ئیفابراونی بووکی لە گۆڕێکی ئاساییدا لە نزیك خانووی ڕاوێژکارییەوە ناشتبێت، کێ دەزانێ ڕەنگە لەو ڕۆژەوە تاکو ئێستا لەوێدا نێژرابن.

# (٤)

# (ئەوەی دەربارەی هێتلەرەو بیرناچێتەوە)
# بە پێنووسی (فردیناند زاور بروخ)
# نەشتەرگەری ئەڵمانی بەناوبانگ

## ناخۆشترین هەڵوێستم لەگەڵ هێتلەردا

(فردیناند زاوربروخ)ی پزیشکی ئەڵمانی بە یەکێك لە شارەزاترین پزیشکە نەشتەرگەرییەکانی جیهانی دەژمێررێت، لە ساڵی(١٩٥١)دا پێش مردنی پەڕتووکێکی بڵاوکردەوە لە ژێر ناوی(ژیانی نەشتەرگەرێك).

ئێمە ئەولاپەڕانەی پەیوەندن بە ژیانی هیتلەرەوە، وەردەگرین:-

لەماوەی ئەو جەنگی دووەمی جیهانییەی ئەم دواییەدا، سەرپەرشتیاری بەشەکانی نەشتەرگەری خەستەخانە گەڕۆکەکانی هێزە چەکدارە تایبەتییەکانی ئەڵمانیایان پێسپاردم.

من بەردەوام لە گەڕان و پشکنیندا بووم لە نێوان ناوچەداگیرکراوەکانی فەرەنساو بەلجیکاو هۆڵەندەدا، بۆ سەرپەرشتی ئەو بەشانە، من شەوێك لە کاتێکدا لە یەکێك لەو خەستەخانانەدا بووم. بە تەلەفۆن پێیانڕاگەیاندم، لە

کاتژمێری پێنجی بەیانیدا ئۆتۆمبیلێك دێت بەدواتا و دەتبات بۆ فرۆکەخانە، لەو فرۆکەخانەیەدا فرۆکەیەك چاوەڕێت دەکات بۆ ئەوەی بتگەیەنێتە بارەگاکەی فۆهرەر لە(فینیتا) لە ئۆکرانیا.. هەر کە گەیشتە ئەوێ فۆهرەر دەیەوێت بتبینێ، ئەو شەوە خەوم لێنەکەوت، تا بەیانی بیرم لەو چاوپێکەوتنە دەکردەوە هەزارەها شك و گومان بە مێشکمدا دەهات و دەچوو، سەعات (٥)ی بەیانی خۆم بۆ ڕۆیشتن ئامادەکرد، بەڵام لەو کاتەدا کەس بەدوامدا نەهات، هەتا کاتژمێری یانزە من لە چاوەڕوانیدابووم، دڵەڕاوکێ خواردنیشی بیربردبوومەوە، لە کاتێکدا ویستم شتێك داوابکەم بیخۆم، لەوکاتەدا ئەفسەرێك و دوو سەرباز خۆیان کرد بەناو خەستەخانەکەدا و برینداریێکیشیان لەگەڵدابوو، ئەویش سایەقی ئەو ئۆتۆمبیلەبوو کە بەیانی ناردبوویان بەدوامدا لەبەرئەوەی باران بەخوڕباریبوو، دنیاش تەمومژبووە، باش چاوی لە ڕێگاکە نەبووە و ئۆتۆمبیلەکەشی خێرا لێخوڕیبوو، خۆی کێشابوو بە دیوارێکدا و پێشی ئۆتۆمبیلەکەی تێکشکابوو، خۆشی لە چەند لایەکەوە گیانی تێکشکاو بریندار ببوو.

ئۆتۆمبیلێکی تریان بەدوادا ناردبووم بۆ ئەوەی بمگەیەنێتە فرۆکەخانەکە، لەوێ سواری فرۆکەیەك بووم و گەیاندمییە بارەگاکەی فۆهرەر، بارەگاکە ژێر زەمینێکی گەورەو فراوان بوو، بەقووڵی (١٠٠)پێ لە ژێر زەویدا دروستکرابوو، هەرکە چوومە ژوورەوە ڕێکەوت پرۆفیسۆر(براند)ی پزیشکی تایبەتی هیتلەرم تووش هات.

(براند)ت لەو ڕۆژەوەکە یاریدەدەرم بوو دەمناسی، بەپەرۆشەوە لێم پرسی "دەبێت فۆهرەر منی بۆچی بێت؟" وتی "من ئەوە نازانم، چاکتروایە زووکەیت، بچیت بۆلای بیبینیت"، چەند سەعاتێکە ئێرە شڵەژاوە، لەبەرئەوەی تۆ دواکەوتوویت و لە کاتی دیاریکراودا نەگەیشتوویتە ئێرە". ویستم هۆی دواکەوتنەکەمی بۆ ڕوونکەمەوە، قسەکەمی پێبڕیم وتی "تکایە بێدەنگبە، پێویست بە قسەکردن ناکات و قسەکردن سوودی نییە، کات بە فیڕۆمەدە، هەرئێستا گورج بچۆ بۆ لای"، پێموت "نا.. نەخێر.. پێشەکی دەبێت نانی بەیانی بخۆم، من زۆرم برسییە، پیاوی چاکبە، کوپێك قاوە و هەندێ خواردنم بۆ بێنە"، بە ترس و

لەرزو دەنگێکی نووساوە، وتی"ئەگەر فۆهرەر ببینێ تۆ قاوەو خواردن دەخوێت و ئەویش چاوەڕوانتە تووشی بەڵامان دەکات و فەرمان دەدات تۆش و ئەوەی قاوەوخواردنەکەی داویتێ ئیعدام بکەن". قۆڵی گرتم و ڕایکێشام هەتا بەردەرگای ژووری ئەفسەری پاسەوانەکە کێشی کردم.

هەر کە ئەفسەرەکە ناسیمی بە تووڕەییەوە کەوتە سەرزەنشت و سەرکوتکردنم، منیش زۆر بێزار ببووم بە تووڕەییەوە وتم"ئۆتۆمبیلی یەکەم تووشی ڕووداوێك ببوو.. سایەقەکەشی ئێستا واڵە خەستەخانەدایە، ئۆتۆمبیلی دووەمیش کۆن بوو، باش نەدەڕۆیشت، ئێستا دەمەوێت شتێکم بدەنێ بیخۆم". ئەم قسانەی من تووڕەییەکەی دانەمرکاندەوە، هەر بە تووڕەییەوە، وتی"ئێستا لێرە شانزە ئەفسەر لە سەعات هەشتی بەیانییەوە چاوەڕوانن فۆهرەر ببینن، فۆهرەریش بەهۆی تۆوە تووشی قەلەق و دڵەڕاوکێیەتی بوو، دەی گورج بچۆرە ژوورەوە.

بێنە ئەو دەمانچەیەی لە گیرفانتدایە بمدەرێ، لێرە نابێت کەس چەك هەڵگرێت".

دەرگاکەی بۆ کردمەوە، منیش لە دەرگاکەوە چوومە ژوورەوە، من وابەخەیاڵمدا دەهات، یەکسەر فۆهرەرببینم، بەڵام خۆم لە هۆڵێکی فراواندا بینی، پێداویستی نایابی تێدابوو، بەڵام کەسی تێدانەبوو، بەسەرسامییەوە ڕاوەستام و تۆزێك سام و ترسم لێنیشت.

## سەگەکەی هیتلەر

کتوپڕ دەرگایەکی بچووك کرایەوە سەگێکی گەورە بەرەو ڕووم هات، ویستی هەڵمەت بۆ سەرسنگ و شانم بەرێت و کەڵبە لە قوڕگم گیرکات، بەڵام خۆشبەختانە من خۆم سەگ بازبووم و دەمزانی چۆن سەگ ڕام بهێنم و هێمنی بکەمەوە، بە نەترسیی و لەسەر خۆییەوە بۆ سەگەکە پێکەنیم و هەندێ قسەی هەلەق و مەلەقم بۆ کرد و دەستم هێنا بەسەر پشت و سەریداو کەوتمە خوراندنی

پشتی و سەری. خێرا سەگەکە لە ئاستمدا گۆڕرا و لەسەر قاچ و دووپاشوویدا لەبەردەممدا چیچکەی کرد، خوراندن و دەست پێداهاتینەکەی منی پێخۆشبوو، لەسەر کورسییەکی نزیکەوە دانیشتم و بە هەموو توانامەوە هەوڵی ڕاهێنان و مەیل ڕاکێشانیم بۆلای خۆم ڕادەکێشا.

دوای چەند خولەکێك هیتلەر هاتە هۆڵەکەوە، هەر کەمنی بەو شێوەیە بینی ماوەیەك بێدەنگ ڕاوەستا، سەگەکەی بینی خۆیم تێهەڵدەسوێ، بروسکە ئاسا بەسەرمدا تەقییەوەو قیژاندی وتی"چیت لە سەگەکەم کردووە..؟"

لە شوێنەکەی خۆم ڕاپەڕیم، نەمزانی چی بڵێم...

هیتلەر دەستی بەقسەکردەوە، لە تووڕەییدا بڵێسە لە چاوەکانیدا دەباریی"ئەمە تەنها گیانلەبەرێکە لە من زیاتر ناچێتە لای کەس و گوێڕایەڵی هیچ فەرمانێکی کەسیش ناکات". پێمبڵێ، بزانم چۆن هەڵتخەڵەتاند و چ ئەفسونێکت لێکردووە؟ من دەیکوژم..!! دوابەدوا لە ترساندا دەرۆیشتم و دەلەرزیم، سەگەکەش زیاتر خۆی تێهەڵدەسووم و خۆی پێوە دەنووساندم، هیتلەریش وەك ئەوەی بیەوێت لێمبدات، خێراخێرا بەرەو ڕووم دەهات و خێراخێرا دەیووت"تۆ چییت..؟ هەر لەبەرئەوەی تۆ نەشتەرگەرێکی شارەزایت وادەزانیت، دەتوانیت هەموو شتێك بکەیت..؟ واڵە من بکەیت چەند سەعاتێك دوای ئەوژوانەی من بۆمداناویت لێرە من چاوەڕێت بکەم..؟ کاتێکیش دێیت، سووکایەتیم پێدەکەیت..؟!! و گوێڕایەڵی و سەگەکەشم لێداگیردەکەیت..؟ هەر ئێستا فەرمان بەدەستگیرکردنت دەدەم..؟".

خێرا وتم"ئەوە گەورەیی و سەروەری تۆیە بۆ من کە ئەو فەرمانەم بۆ دەردەکەیت، و فەرمان بە ئیعدام کردنم نادەیت، چیم لێدەکەیت بیکە، من ئێستا لە ژێر دەستیی تۆو فەرمانەکانتدام..!!"، تووڕەبوونەکەی دامرکایەوە و رووە گرژەکەی گەشایەوەو لەسەر کورسی نووسینگەکەی دانیشت، ئاماژەی بۆ منیش کرد لەسەر کورسییەکی نزیکەوە دابنیشم، هەر لەوکاتەدا سەگەکە لێم دوورکەوتەوە و نێوانمان گرژی و ئاڵۆزی تێدانەما...

پاش چەند چرکەیەك وەك ئەوەی هیچ شتێك رووی نەدابێت، هیتلەر بە هێواشی و ژیرییەوە لەگەڵمدا کەوتە قسەکردن، وتی"وەزیری دەرەوەی تورکیا

نەخۆشە، پێی وتووم لەمەوپێش تۆ جارێك نەشتەرگەریت بۆ كردووە، ئێستا ئەو حەز دەكات لە ئەنقەرە چاوی پێتبكەوێت و ڕاوێژت لەگەڵدا بكات، تۆ خۆت باش دەزانیت پەیوەندی سیاسی توركیا بۆ ئێمە گرنگییەكی گەورەی هەیە، من فەرمانم دەركردووە بە فڕۆكەیەكی نوێ تۆبگەیەننە لای".

هیتلەر جارێكی تر تەماشای سەگەكەی كردەوە، بەتوورەییەوە وتی"پێم بڵێ چیت لە سەگەكەم كردووە..؟"

منیش تەماشای سەگەكەم كرد و هیچم نەوت..

ئەمجارەش بە توورەییەوە پرسیاری كردەوە..

چۆن ڕاتهێنا..؟ ئەو سەگە لە من زیاتر بۆ لای كەسی تر ناچێت..؟ پێم بڵێ.. بۆم باسبكە..؟

وتم"بەڵێ، بەس تۆ تەنها كەسێكی لە ڕوونكردنەوەكەم بگەیت".

بەشانازی كردنەوە.. وتی"من..؟.. چۆن..؟"

وتم"تۆ شارەزاترین كەسی لە هونەری هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكیدا، تۆدەتوانیت بچیتە كرۆكی ئەو كەسەی پەیوەندی پێوەدەكەیت و كاربكەیتە دەروونی ئەو كەسەوەو بۆ لای خۆتی ڕابكێشیت، منیش ئەو هونەرە تەنها لەگەڵ ئاژەڵدا دەزانم.."

چەند خولەكێك بە بێدەنگی سەرنجی خۆم و چاویدام، پاشان، وتی"نا..نا... بەو فڕۆكە تازەیە سەفەرمەكە، چونكە هێشتا تاقیكردنەوەی تەواوی لەسەر نەكراوە، تاكو لە تواناو تۆكمەیی ئامێرەكانی بگەن، فڕۆكە(یونكر٥٢٠)ە كۆنەكەی خۆم دڵنیاترو تۆكمەترە، من سوپاسی تۆدەكەم.."

هەستام و خۆم چەماندەوە و سڵاوم بۆ كرد و بەرەو دەرگاكە كەوتمەڕێ، بانگی كردمەوە، پاشان وتی.."ها.. واپێتدەڵێم.. دەبێت ئەو وەزیرە توركییە چاك بكەیتەوە.. لامان گرنگە بە ساغ و سەلامەتی بێتەوە ناومان".

# لەکاتەکانی تێکشکاندا

لەدوا دواییەکانی جەنگدا.. من و خێزانەکەم لە ژێر زەمینە گەورەکەی خەستەخانەی(شاریتی)دا بووین چونکە لەوێدا کەمێك بە دڵنیاییەوە دەمانتوانی نەشتەرگەری تێدا بکەین، ئەوکاتە ڕووسەکان هاتبوونە ناو بەرلینەوەو تۆپی ڕووسەکان دروێنەی گیانی هاوڵاتیانیان دەکرد و دەیانکوشتن.

شەڕوکوشتار لە جادەو کۆڵانەکاندا گەرم بوو، گەرچی بۆماوەی خولەکێکی کەمیش بوایە، لەبەر ئەو نەشتەرگەرییە زۆرەی ئێمە دەمانکرد و زۆری بریندااران، نەماندەتوانی لە ژێر زەمینەکە شەووڕۆژ سەر بێنینە دەرەوە، هەرچی ئامێری وێستگەی کارەباکانیش بوو، هەر هەموویان لە کارکەوتبوون، ناچار بۆ ڕووناکی شوێنەکە پاتری و مۆممان بەکاردەهێنا، لاشەی برینداران و مردوان لە چوار دەورماندا کەڵەکەببوو.. لەهەموو لایەکەوە دەنگ و نەوای برینداران و هاوار و نوکەنووکی ئەو بریندار و پێکراوانە، بەردەوام گوێی کەڕوپڕکردبووین، من و هاوسەرەکەشم(ئەویش پزیشك بوو) شەووڕۆژ چەند سەعاتێکی کەمی شەو نەبێت ئیسراحەتمان نەبوو، ئەویش ئەوەبوو لەو ڕاڕەوەی لە تەنیشت ژووری تیشکەکەوەبوو لەسەر جێگایەك ڕادەکشاین.

نەخواردنمان هەبوو، نەهیچ شتێك جگەلە چەند بسکیتێکی کەمی وشکەوەبوو نەبێت و چەند پەرداخێك ویسکی کەم زیاتر هیچی ترمان نەبوو. ئەویش نەمدەزانی ژنەکەم لە کوێ پەیدای دەکرد، لە(یەکی مایسی١٩٤٥)دا کتوپڕ ئەفسەرێکی ئەڵمانی خۆی کرد بە ژێر زەمینەکەدا، بەسەر لاشەی مردوان و لەش و ئەندامی بڕاوی بریندارەکاندا و بەسەر لاشەی ئەو نەخۆشانەی نەشتەرگەریمان بۆ کردبوون و لەسەر زەوییەکە بۆ چاك بوونەوە پاڵمان خستبوون، هەنگاوی دەناو بەملاولادا دەکەوت و سەرسمی دەدا و هاواری دەکرد و دەیقیژاند"فەرمانم پێیە بۆ دکتۆر زاور بروخی نەشتەرگەر"، بۆنی خوێن و ئارەق و دەرمان و ئیسپرتۆ و

پاکژکردنەوەی ئەو ناوەی پڕ کردبوو، کونە لووتی دەکوزاندەوە، منیش لە بەردەم یەکێك لە بریندارەکاندا ڕاوەستابووم و نەشتەرەکەشم بە دەستەوەبوو.

وەڵامم دایەوە، وتم"من دکتۆر زاور بروخم"، گورج خۆیگەیاندە لام، بەدەنگێکی بەرز وتی"ژمارەیەکی زۆری سەربازانی ئەڵمانی لێرەوە نزیکن، ڕووسەکان لەهەموو لایەکەوە بەدوامانەوەن و تەنگیان پێهەڵچنیووین و تاقیبمان دەکەن، هیچ ئومێدێکی ڕزگار بوونمان نەماوە، تەنها ئەوەنەبێت لێرە خۆمان حەشاردەین، لەبەر ئەوە دەبێت هەر ئێستا بە گورجی ئێرە چۆڵ بکەن".

بە سوکایەتی و گاڵتەپێکردنەوە تەماشامکردو بەردەوامبووم لە کارەکەشمدا...

پێم وت"ئێستا کاتی ئەوەمان نییە و بیریش لە چۆڵکردن ناکەینەوە". بە هەڕەشە کردنەوە قیژانی"لەم حاڵەتەدا بە زۆر شوێنەکەتان پێچۆڵ دەکەین"، دوای دە دەقیقەی تر سەربازەکان لێرەدەبن.

نەشتەرگەرییەکەم دوای سێ دەقیقە کۆتایی پێهێناو تـەواوم کرد، یاریدەدەرەکەمم بانگ کرد و نامەیەکم بۆ هیتلەر پێنووسی، ئەویش بە ئامێرێکی بچووکی چاپکردن کە لەسەر ڕانی دانابوو، دەستی بە نووسین کرد و لە نامەکەدا بۆ هیتلەرم نووسی، کە شوێنێکی تر بۆ سەربازەکان ئامادە بکات، داوام لە یەکێك کرد گورج ئەو نامەیەی پێبگەێنێت و خێرا وەڵامەکەیم بۆ بێنێتەوە.

ماوەیەکی زۆر تێپەڕی و نامەبەرەکە نەگەڕایەوە، داوام لە یەکێك لە یاریدەدەرەکانم کرد خۆی بچێت و بزانێت چی ڕوویداوە؟ یاریدەدەرەکەم بەرەو دەرگای ژێر زەمینەکە ڕۆیشت.. لەبەر دەرگاکە سەربازێکی ڕووسی بە ڕەشاشێکی بچووکەوە دەبینێ و گوڕج گەڕایەوە، بە دوایدا ژمارەیەکی زۆر سەربازی چەك بە دەستی ڕووسی هاتنە ژوورەوە، هەرکە ئەو هەموو کەڵەکە لاشەو ئەندامە بڕاوە زۆرانەی ئەو خەڵکانەیان بینی، لە شوێنی خۆیاندا حەپەسان هەر هەموویان چاویان بڕییە ئەو بریندارە ورگ هەڵدڕاوەی کە هێشتا ورگی هەڵدڕابوو بەنەدووراوی مابۆوە.

یەکێکیان زۆر خۆی بە ئازاو بەغیرەت زانی بەرەو مێزی نەشتەرگەرییەکە هاتە

پێشەوە.. یەکێك لە پەرستیارەکان پاڵێکی پێوەناو دای بە زەویدا خۆشبەختانە لەوکاتەدا ئەفسەرێکی ڕووسی بریندارى خەتەرهاتە لامەوە منیش بۆ ئەوەی هەڵوێستەکە هێمن بکەمەوە، گورج بۆ چارەسەرکردنی بەهانایەوە چووم، بەڵام پزیشکێکی ڕووسی لەگەڵ برینداره پێکراوەکەدا بوو، نەیهێشت لێی نزیك ببمەوە.

پرسیارێکی لێکردم، تێی نەگەیشتم چی دەڵێت، منیش وام بەچاکزانی خۆمی پێ بناسێنم، بەڵکو بمناسێت.

ئاماژەم بۆ خۆم کرد، وتم.. زاوربروخ .. زاوربروخ.

ئەویش دووجار ناوی منی وتەوەو.. پاشان ئاماژەی بۆ کردم ئەو فیشەکەی گەدەی ئەفسەرەکەی کونکردبوو، دەریبهێنم.

منیش سەری ڕەزامەندیم بۆ لەقاند و دەستم بەکارکردن کرد.. لەوکاتەدا سەربازە ڕووسەکان لە ژێر فەرماندەیی یەکێك لە ئەفسەرەکان کەوتنە پشکنینی ناو ژێر زەمینەکە.. گوێم لێ بوو لە ژنەکەمیان پرسی تۆکێیت..؟ ئەویش وەڵامی دانەوە کە پزیشکێکی ئەڵمانییەو ژنی دوکتۆر زاور بروخم.. وازیان لێهینا.

## کتوپڕی

جەنگ کۆتایی هات، سوپاسێکی زۆری خوام کرد چونکە من زۆر لە خەڵکی زیاتر بەختەوەربووم.. کەوا هیچ کەسێکی خێزانەکەم تووشی خراپی و تیاداچوون نەببوو.. جگە لە دوکتۆر فریدریکی کورم نەبێت، کەماوەیەکی دووروودرێژبوو هەواڵیم نەدەزانی.

ڕۆژێکیان ئەفسەرێکی ڕووسی تووشی شێرپەنجەی گەدەببوو ناردی بە شوێنمدا منیش نەشتەرگەرییەکی سەرکەوتووم بۆ کرد و تیایدا سەرکەوتووبووم، کاتێك چاك بۆوە، بۆ خواحافیزی هات بۆ لام پێی، وتم "نازانم من چۆن چاکەی تۆ بدەمەوە..؟"

منیش دەستم دابەپشتیدا و پێم وت..

"باشترین پاداشت بۆ من ئەوەیە، من تۆ دەبینم چاکییت و چاك بوویتەوە".

ئەفسەرەکە تۆزێك بێدەنگ بوو، تێگەیشتم شتێکی بیرکەوتەوە، پاشان وتی"من سەرپەرشتیاری بەندیخانەیەکی دەسگیرکراوانم لە سیبیریا، لە ناویاندا دەسگیراوی ئەڵمانی زۆری تێدایە، ئێستا بیرم کەوتەوە لەناو دەسگیراوە ئەڵمانیایەکاندا.. یەکێکی تێدایە دوکتۆرە.. ئەو دوکتۆرە ناوی (زاوربروخ)ە، ئایا ئەو دوکتۆرە خزمی تۆیە..؟

لە خۆشیاندا فرمێسك بەچاوەکانمدا هاتە خوارەوە.. پێم وت"ئەوە کوڕی منە.. ئایا ئەو نەمردووە؟ لە ژیاندا ماوە..؟

ئەفسەرەکە، وتی"بەڵێ.. ماوە.."

پاشان وتی"تۆ چاکت کردمەوە و ژیانت پێ بەخشیمەوە، منیش لە پاداشتی ئەو چاکەیەدا کوڕەکەتت بۆ دێنمەوە، پاش دووهەفتە، ئەفسەرە رووسییەکە بە ئۆتۆمبێل هاتەوە بۆلام و لەگەڵ خۆشیدا فریدریکی کوڕم و هەندێ پەنیر و خواردنیشی بۆ هێنام.

# پشیلە فرۆش

لەویادەوەرییانەی هەرگیز بیرم ناچێتەوە، ئەوەیە ڕۆژێکیان تا سەعات سێی پاش نیوەڕۆ کارم دەکرد، لەو کاتەی خەریکبووم ژووری نەشتەرگەری بەجێبهێڵم و بچمە دەرەوە، زۆر برسی و هیلاکبووم.. یاریدەدەرەکانم پێیان وتم..

-"پیاوێکی پیر لە بەیانی زووەوە لەبەردەم دەرگای ژوورەکەدا دانیشتووە چاوەڕوانی تۆ دەکات.. بەهیچ جۆرێکیش بەکەس ناڵێت تۆی بۆ چییە..؟ ناچێتە دەرەوە هەتا تۆ نەبینێت، کاتێك چووم بۆ لای پیاوێکی پیری سەرسپی زەعیف و لاتم بینی بە ماتییەوە سەری شۆڕکردبۆوە، لەبەر دەرگاکەدا دانیشتبوو.. سڵاوم لێکرد و لێم پرسی چیت دەوێ..؟

ئەویش لە منی پرسی.. تۆ دوکتۆر (زاوربروخ)ی کەلەوە دڵنیابوو من..

ئەوم..

وتی"من پشیلە پەروەردە و بەخێودەکەم.. بە دووروودرێژی باسی گرنگی ئەو پەروەردە و بەخێوکردنەی بۆ کردم.. ئیتر لەوە گەیشتم من ئێستا لەبەردەم کەسێکی شێتی لەسەرخۆدام و هیچ خەتەرییەکی نییە.

دەنا پەیوەندی من بە پشیلەو پەروەردەکردنییەوە چییە..؟!!، بەڵام پیاوە پیرەمێردەکە، شیرازەی بیری تێکدام.. وتی"تەنها تۆ دەتوانیت من لە هەژاری و لە برسا مردن رزگار بکەیت". دڵگەرمی کابرا لە پەروەردەکردنی پشیلە و جوانی پشیلەی(سیامی) وایلێکردم گوێ بۆ قسەکانی شل بکەم و گوێی لێبگرم، وتی"من پشیلەیەکی جوان و دانسقەی شازم هەیە.. ئەو پشیلەیە، بەچکە پشیلەی زۆرجوان و دانسقەم بۆ بەرهەم دێنێت ئەو پشیلانەش سەرچاوەی ژیان و بژێویی منن، چاوەکانیشی پڕ لە فرمێسك ببوون".

پاشان وتی"بەڵام ئەو پشیلەیە کتوپڕ تووشی دەردێك بووە جووڵەو پرزەی لێبڕیوە.. پێیان وتووم ئەو دەردە دەیکوژێت و دەمرێت، ئەمەش بێشك دەبێتە ماڵ وێرانی و تیاچوونم.. گەورەم.. لە نەشتەرەکەی تۆ زیاتر هیچ ئومێدێکی ترم نەماوە.. هەرئەو نەشتەرە دەتوانێت ژیانی من و ئەویش رزگار بکات..!! بەپیرەمێردەکەم وت"باشە سبەینێ بیهێنە بۆ لام.." وتی"سبەینێ..؟" هەرچرکەیەك کە بەسەرمدا تێپەڕ دەبێت حاڵەتەکەم بەرەو خراپتر و شپرزەتر دەبات".

پاشان دانەوییەوە، لە ژێر ئەو کورسییەی لەسەری دانیشتبوو سەبەتەیەکی بچووکی دەرهێنا.. پشیلەیەکی یەکجار جوانی تێدابوو، بەڕاستی پشیلەکە هەر زۆرجوان و دەگمەن بوو.. لێموەرگرت و خستمە سەر ئەژنۆم و فەحسم کرد، بینیم پشیلەکە تووشی فیتقێکی یەکجار گران ببوو.. تێگەیشتم کابرا هێندە پەلەی بوو بۆ نەشتەرگەری کردنی پشیلەکەی و جەختکردنەوە لەسەری.. ناحەقی نەبوو.. لەسەر حەق بوو.. دەستمکێشا بە پشتیداو پێمووت

-"پشیلەکەت بخەرەوە ناو سەبەتەکەوەو وەرە لەگەڵمدا بۆ ژووری نەشتەرگەری..

" من لە پێش کابرای پیرەمێردەوە دەڕۆیشتم.. بە پەرستیارە شارەزاکەم وت"نەشتەرگەرییەکی کتوپڕیم هەیە، هەر ئێستا ئەو نەشتەرگەرییەدەکەم.."

پێش ئەوەی قسەکانم تەواو بکەم دەستم نا بەوزەنگەدا کە تایبەت بوو بۆ حاڵەتی کتوپڕی، چەند دەقیقەیەکی نەخایاند هەر هەموو پزیشکەکان و پەرستیاران هەرهەموویان لەدەورم کۆبوونەوە.. کاتێك بینییان پشیلەیەکم لەسەر مێزی عەمەلیاتکردن داناو بەنجم کرد هەرهەموویان حەپەسان و دەمیان داپچڕاند و زمانیان لە قسەکردن کەوت.. نەشتەرگەرییەکە زۆرگران نەبوو.. لەماوەیەکی کەمدا بەسەرکەوتوویی نەشتەر گەرییەکەم ئەنجامداو لێبوومەوە.

کاتێك لێبوومەوە کابرای پیرەمێرد لێی پرسیم..."بۆ ئەو نەشتەرگەرییە چەند پارەت دەوێت بتدەمێ..؟!!"

وتم"کرێی من ئەوەیە ببینم پشیلەکەت چاك بۆتەوە.." پاش دووهەفتە پیاوەکە هاتەوە بۆ لام، پشیلەکەی پێ بوو چاك ببۆوە.. بە زۆر دووڕۆژ لای من داینا..



# ونستۆن چەرچڵ ژیان و تێکۆشانی

(ونستون چەرچڵ ژیان و تێکۆشانی)

بەپێنووسی شارلزمۆرنی-و- جۆن داتینبورت

# هاندانی جیهان

جەنگی ئەڵمانیا کۆتاییهات: پاش ئەوەی ونستون چەرچڵ دنیای لێهاندان، ئەم کابرا ئینگلیزییە، لە ئەوروپای باشووردا چاوی هەڵهێنا و لە پێش چاوی خەڵکیدا بوو بە قارەمانێکی گەورەو نەمری خۆراگری جیهانی.. هیچ کەسێك لە هاودەمانی ئەو لەو تێگەیشتووتر نەبوون، کەسیش لەو ڕوانبێژترو خۆراگرترنەبوو، لە بەرگریکردنی: (کۆمەڵگای ژیرو لێبوردەو بەبەزەیی و نەرم و نیان و بیروراو ئارەزووی جۆراوجۆردا.. ئەو کۆمەڵگایەی پێی دەڵێن"دەوڵەتی ئازاد") چەرچڵ ئەوکەسەیە، کە خاوەنی ئەو وتەیەیە کەدەڵێت"ئەوانەی توانای وەدەست هێنانی سەرکەوتنیان هەیە، لە توانایاندا نییە بتوانن ئاشتی ڕێکبخەن، و ئەوانەشی توانای ڕێکخستنی ئاشتییان هەیە.. لە توانایاندا نییە و ناتوانن هەرگیز سەرکەوتن بەدەست بهێنن..".

ئەم وەزیـرە بە تواناو گەورەیەی جەنگ.. پاش ئەوەی بە تـەواوی لە

هەڵبژاردندا نائومێدبوو.. ڕایگەیاند، کە لە ئەنجومەنی گشتیدا دەبێتە یەکێك لەبەرهەڵستکاران. ئەی بۆچی دەیەوێت لە خەبات و تێکۆشاندا بەردەوام بێت؟ زۆربەی زۆری سەرکردەکان کە لە کارەکانیاندا خۆماندوودەکەن لە پێناوی پاشەڕۆژدایە، بەڵام چەرچڵ خەڵکی هاندەدا ڕابوردوو لە بیربکەن و بیری خۆیان بەرنەوە، چەرچڵ خۆی یەکێك بوو لە پارتی پارێزگاران(موحافیزین)، هەر ئەویشبوو(فریدج)ی ئیشتراکی خوازی هێنایە ناو حکومەتەوە. یەکێکیش بوو لەو کەسانەی بانگەشەی ئیستعماری دەکرد. هەر ئەویشبوو هاوڵاتیانی بۆ ئەو سەروەرییە گەورەیە هۆشیار کردەوە، کە ئیمپراتۆریەت لە یاسای یەکگرتووی گەلانی سەربەستدا وەدەستی دێنێت.. هەر ئەویش بوو وەك هاوڵاتییەکانی خۆی بەزۆری(مەی)ی دەخواردەوە، بەڵام ئەو خۆراگری و خەباتە سەخت و گرانە زۆرەی ئەودەیکرد و بەردەوامبوون و ماندونەبوونەی لەسەر کارەکانی دەیکرد، وای لەو کەسانە کرد کە لەو بچووکتربوون لێی بترسن و لێی بسڵەمێنەوە، هەر ئەو پیاوەبوو ئینگلتەرە لە گۆرەپانی سیاسەتدا دووری خستەوەو تەریکی کرد.. چونکە کەسێکی ڕۆشنبیربوو، بەڵام جێگای متمانە و باوەڕپێکردن نەبوو.

بەڵام هەر ئەم دوورخستنەوە و لادانەبوو، وا لەو پیاوە بکات خەڵکی هەڵنێ و هانیان بدات بۆ چونە ناو ڕیزەکانی سەربازی و ئەنجام گەیاندنی ئەرکی سەرشانیان، پێی وتن"چەکەکانتان ئامادەبکەن و هەڵیگرن، کەسانی نەترس و بوێر و ئازابن..".

بەڵێ.. چەرچڵ.. تەنها یەك پیاونەبوو، بەڵکو خۆی لە خۆیدا کۆمەڵە پیاوێك بوو، ئەو ڕۆژنامەگەر و مێژوونووس و وەرگێری پەرتووك و سەرباز و وێنەساز و بەنناو فرۆکەوان و کەسایەتییەکی سیاسیش بوو سنوور بۆ ژیانی ئەو نەبوو.. بە هەموو جۆرێك ژیانی بردبووەسەر، ژیانی لە کۆشکی(بلنهیم)ەوە دەست پێ کرد، ئەو کۆشکەش لە گەورەترین کۆشکەکانی لادێکانی ئینگلتەرەبوو.

چەرچڵ کوڕی خانمێکی ئەمریکی جوان و شۆخ و شەنگی بەناوبانگبوو، ئەویش خاتوو(جینی جیروم)بوو، باوکیشی لۆرد(ڕاندولف چەرچڵ)بوو.

ئەو لاوە گورج و گۆڵ و وریا و شارەزاو قۆزوجوانە بوو، کەبەو بەرهەڵستکارییەی

دەیکرد، توانی بگاتە دووەم پلەوپایەی گرنگ و ترسناکترین سەروەری ئەویش پلەوپایەی وەزیری دارایی بوو, لەبەرئەوەی باوکی لەوە دەترسا چەرچڵ بۆ پارێزەری شیاونەبێت، لە تەمەنی دوانزەساڵیدا چەرچڵی خستە خوێندنگای(هارۆ)وە بۆ ئەوەی ئامادەی بکات و بیخاتە ناو سوپاوە.

ونستون چەرچڵ لە خوێندنگای هارۆوە چوو بۆ خوێندنگای(ساندهرست) ئەو قوتابخانەیەی چینە گەورەو پێشکەوتووەکانی لە ئینگلتەرەدا ڕادێنێت تا بیانخاتە ناو سوپاوە. کەسوکاروخزمانی چەرچڵ لە هونەری ڕاهێنان و مەشقی سەربازی و خۆسازداندا هەموو کاتێك دیارو باڵادەستبوون، ئەم زانیارییانەش لەو خوێندنگایەدا بە گەورەترین پلە دەژمێردرا.

کاتێك چەرچڵ تەمەنی گەیشتە بیست ساڵان پلەی ئەفسەری دووەمیان پێبەخشی و خستیانە تیپی چوارەمی سوارچاکانی(الهوسار)وە، ئەم تیپەش تیپێکی تایبەت بوو بەخاوەن شکۆ شاژنە مەلیکەوە، ئاوەها بەم شێوەیە چەرچڵ لە ژیانێکی سەربازی پڕ دڵگەرمی پەرۆشدا ژیانی بردەسەر، کە هیچ کەسێك وەك ئەو بەو شێوەیە پەرۆش و دڵگەرمتر نەبوو.

زۆرترین کاتی مەشقکردنی سەربازی و جەنگی لە(هیند و سۆدان و جەنگی بوێر)دا بەسەربردبوو.. چەرچڵ لە یەککاتدا سەربازیش بووەو نوێنەری ڕۆژنامەش بوو...

چەرچڵی لاو هەموو کاروکردەوەیەکی هەر لە پێناو ڕۆژنامەگەریدا نەبوو.. گەرچی لە ڕۆژنامەوانیدا گەیشتبووە گەورەترین پلەو جێگا. کاتێك تەمەنی گەیشتە بیست و چوار ساڵان لەگەڵ کۆمەڵێك گەنجانی تردا لە شەرگەی(أم درمان)دا هێرشێکی جوان و ڕێکوپێکیان بۆ سەر دەروێشەکانی(ئوم درمان)کرد، چەرچڵ لەگەڵ ڕم بەدەستەکاندا شان بەشان هێرشی کردو بەدەمانچەکەی دەستی تەقەی دەکرد و لایەنی کەم پێنج کەسی لە دوژمنانی کوشت و لەناوی بردن.

لە هیندا هەروەك دوژمنەکانی دەیانووت.. ڕۆژەکانی بەڕاووڕابواردن و یاریی بۆڵۆوە بەسەر ئەبرد، بەڵکو ئەم ئەفسەرە بچووکە چاوچنۆك و تەماعکارە، هاوڕێکانی لە شاری(بەنجالور) جێدەهێشت کە لە ترسی ئەو گەرما زۆرەدا

سەرخەوبشکێنن و بنوون، خۆشی بە تەنها دادەنیشت سەرقاڵی خوێندن دەبوو.
مێشکە گەورەکەی پردەکرد لەو ئەدەبە جوان و بەسوودەی لە خوێندنگاکانی قوتابخانەی(هارۆ) و(ساندهرست)دا نەیتوانی بوو بیخوێنێت و تەواوی بکات، ئەفلاتۆن و ئەرەستۆو داروین و ماکولی، هەر هەموو خوێندەوە و خۆی بەلێکۆڵیەوەو خوێندنەوەی پەرتووکەکەی مێژوونووسی ئینگلیزی(جیبون) دەربارەی(تیاچوون و رمانی ئیمپراتۆری رۆمانی)یەوە خەریککرد، بێشك چەرچڵ هەر لەسەر رێبازی(جیبون) و شێوازە ئاشکراکەی ئەو دەرۆیشت.
کاتێك چەرچڵ مۆڵەتی پێدراو بە مۆڵەت گەرایەوە زێدی خۆی کتوپر بریاریدا واز لە سەربازی و لەشکرکێشی بهێنێت، چونکە ئەو لەوە بێزاربوو، ئارەزووی لەسەر زۆرشتی تربوو. ئەو شتانەش پارەی زۆری دەویست، نەئەو مووچەی ئەفسەری و نە ئەو برە پارەیەشی کە دایکی بۆی دەنارد کە بریتیی بوو لە بری(٥٠٠) جونەیه لە ساڵێکدا بەشی نەدەکرد.
ئەو رەخنە زۆرانەشی کە لە هەندێ فەرماندەکانی گۆرەپانی جەنگی بەریتانی دەگرت، وای لەو فەرماندانە کردبوو بەو رەخنانە دڵگران و زویربن. ئا لەبەرئەمانە بریاریدا لەسەر رێچکەی باوکی بروات و خۆی بەسیاسەتەوە خەریککرد.

## لە ئەنجومەنی گشتیدا

ساڵێك تێپەری و چەرچڵ لە جەنگی خوارووی ئەفریقا گەرابۆوە، پاش ئەوەی لەبەندکردنی(بوێر)ەکان هەڵات و دەربازبوو، ئەم هەڵاتن و دەربازبوونەی بووبە داستان و لە پێش چاوی کرێکارانی(ئولدهام)دا بوو بە گەورەترین قارەمانی ئینگلتەرە. کرێکاران لە دەوری کۆبوونەوەو لە ئەنجومەنی گشتیدا بە نوێنەری خۆیان هەڵیانبژارد.
لە تەمەنی بیست و شەش ساڵیدا ئەم کورە لاوە هاوبەشی سێ جەنگی کردو

سێ پەڕتووکی نووسی، بۆ کاتی پێویست و تەنگانەی پەنجا هەزار ڕیاڵی لەو کتێب و کۆبونەوانەوە دەستکەوت.

پاشان کتوپڕ ڕێگایەکی نوێ تری گرت، ئەویش ئەوەبوو دوای ئەوەی لە بیروباوەڕی(موحافیزین) بێزاربوو، لە ساڵی(١٩٠٣)دا کارێکی کرد کە لە هەموو ژیانیدا بە جوانترین کاردەژمێردرا.

چووە ناو هۆڵی ئەنجومەنەوە، بەڕێزو گەورەییەوە لەسەرخۆ وەك نەریت و باوبوو، لەبەردەم سەرۆکی ئەنجومەندا کە قژێکی بارۆکەی لەسەردابوو، خۆی چەماندەوە، پاشان بۆدواوە وەرگەڕایەوە، بەرەو کورسییەکانی ئەنجومەنی پارێزەران و(ئەرسەر بلفورد)ی سەرۆکیان نەڕۆیشت.. بەڵکو بەرەو کورسییەکی بەرهەڵستکاران ملی ناو لە تەنیشت، یەکێك لە نوێنەرانی وڵاتی(الغال)ەوە دانیشت کە ئەویش(وافید لوید جۆرج)ی لاوی سیاسی تازە پێگەیشتووی توندڕەوبوو.

لە ساڵی(١٩٠٦)دا پارتی ڕزگاری خوازان لە هەڵبژاردنەکاندا بەزۆرینەی دەنگ هەڵبژێران، ئەمە ڕێگای دەرکەوتنی بۆ چەرچڵ خۆشکرد لەگەڵ ئەو هەموو بەرهەڵستکارییەی پارتی پارێزەراندا چەرچڵ داوای دانان و داڕشتن و ڕوونووسی کۆمەڵێك یاسای چاکسازی کرد.

لەو یاسایانە، چاککردنی باری کارکردن لە کارگەو کانەکاندا و پێدانی مووچە بە پیرو پەککەوتوان و کردنەوەی نووسینگەیەك بۆ دابین کردنی کار بۆ کرێکارە بێکارەکان و لەسەر ڕزگارخوازەکان باجی سەرمایەی لەسەر زیادکردن و دەستەڵاتی ئەنجومەنی لۆردانیان نەهێشت، بەڵام دڵی چەرچڵ هەر پڕبوو لە خۆشەویستی و دڵی بۆ بیروباوەڕی پارێزەران لێدەدراو لەو دڵەوە خۆشی دەویستن و جارێکی تر گەڕایەوە بۆ ناو پارتی ڕاست و لە ساڵی(١٩١١)دا مستەر(ئەسکویت) پۆستی وەزیری دەریاوانی پێبەخشی و کردی بەوەزیر.

ئیتر وازی لە کێشەی بێکاری و بژێوی کرێکاران هێنا، ئەو کێشەیەش کێشەیەکی ئاڵۆز و پڕ لە ناکۆکی بوو.

ڕوویکردە چارەسەری کارێکی تر وەك قەبارە و گوللە تۆپی کەشتیە گەورەکانی ناودەریاو دەست بەسەرداگرتنی دەریاو ڕووبارەکان، ئەو کاتەش ئەڵمانیا بەوپەڕی

تواناوه هەوڵی بنیاتنانی کەشتیگەلە گەورەکەی دەدا بۆ ئەوەی بەسەر گەورەیی و دەستەڵاتی بەریتانیادا زاڵ بێت، لە نێوانیاندا پێشبڕکێی دەریاوانی دەستی پێکرد. ئەنجامەکەشی لەسەر پاشەڕۆژی ئینگلتەرەدا بەندبوو، ئەو ڕۆژانە ناووناوبانگی چەرچڵ دەرکەوت و بڵاوبۆوە، ئەگەر ئەو نەبوایە لە ساڵی(١٩١٤)دا کەشتیگەلی بەریتانی بە خراپترین شێوە تێکدەشکا.

چەرچڵ هات هەرچی ئەمیرە دەریاوانە پیروپەککەوتووەکان بوو هەر هەموویانی گۆڕی بە دەریاوانی گەنج و لاو گەورەترین پێگەی سەرکردایەتی کەشتیگەلی پێبەخشین و موچەی دەریاوانانی زیادکرد و چەکی هێزی فڕۆکەوانی دەریایی داناو برەوی پێدا، وسووتەمەنی خەڵووزی کەشتیگەلەکانیشی گۆڕی بە بەنزین بەهۆی ئەو دووربینییە زۆرەی بۆ داهاتەکانی پاشەڕۆژ هەیبوو، دەستەبەری کرینی بیرە نەوتەکانی ئێرانی کرد. ئەم هەموو گورجوگۆڵی و خۆئامادەکردنی کەشتیگەلییەی بەریتانیایەو ئامادەباشییەی بۆ شەڕکردن. لەو کاتەدا بۆ ئەوەبوو کە ئەڵمانیا خاکی وڵاتی بەلجیکای داگیرکردبوو، بەڵام ئەستێرەی بەختی چەرچڵ کە لە ساڵی(١٩١٥)دا دەدرەوشایەوە ڕۆشنایی نەماو کەوتە تاریکی، ئەویش لە کاتێکدابوو کە هێرشێکی گەورەی سازکرد و ئەو هێرشە لەسەرتاشە بەردەکانی(گالیبولی)دا تووشی تێکشکان و لەناوچوون بۆوە.

زۆربەی زۆری هاونیشتمانیانی بڕوایان بە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوە وردەنەبوو کە دەربارەی ئەو هێرشەکرا.. چەرچڵی لە لۆمەکردن و سەرزەنشت کردن دوورنەخستەوە، بەڵام کاتێك ئەنجومەنی وەزیران پێکهێنرایەوە، چەرچڵیان لە وەزیری خست و لایان برد، بە دەریادا وەك ئەفسەرێکی جەنگاوەر بەرەو فەرەنسا بەڕێکەوت و لەسەنگەرەکانی جەنگدا ماوەی حەوت مانگ جەنگا، پاشان(لوید جورج) سەرۆکایەتی حکومەتی گرتە دەست، چەرچڵی بۆ لەندەن بانگهێشت کرد، بۆ ئەوەی وەزیری وەزارەتی زەخیرە و چەکەمەنی بگرێتە سەرشان و وردەکارییەکانی بەرهەمی جەنگی جێبەجێکرد و لە هونەری جەنگدا زانیاری خۆی دەرخست، بەوشێوەیە ئەو جەنگاوەرە، تواناو شارەزایی زانیاری خۆی تەواوکرد.

# بەرلە دەستپێکردنی جەنگ

دوای هەموو جەنگێک سستی و وەستان ڕوودەدات.

ئینگلتەرەش دوای جەنگ بۆ ماوەیەك كەوتە ناو ئەوسستییەوە كەمتر سوودی لەو كەڵە پیاوەبینی، چەرچڵیش لە ساڵی(١٩٢٠)ەوە تا ساڵی(١٩٣٠) لە ڕۆژنامەو گۆڤارەكاندا خۆی بەنووسین و دارشتنەوە خەریككرد. لە مۆنتكارلۆ و بازاڕی دراوەكاندا خۆی بە قومارەوە خەریككرد ... ئەو تابلۆیانەی ئەو كاتانە وێنەی دەكێشا، ئەوەیان دەگەیاند ئەم كابرایە بێ سەروشوێن و بێڕێنمایی بە هەموو لایەكی سەرزەویدا بە ئارەزووی خۆی دەگەڕێت.

تابلۆكانیشی بریتی بوون لەو دیمەنە سروشتیانەی لێوارەكانی ڕیڤیراو بەندەرە ئاوییەكانی هۆڵەندەو دوورگەكانی نەرویج.

ئەو ساڵانە لە ژیانی چەرچڵ دا بە وشكە ساڵەكانی ژیانی ئەو دەژمێردرێت، بەلام لەگەڵ ئەو ڕووتێكردن و لاربوونەوەیەیدا بۆ ئەو كارانە... ململانێی لەگەڵ زۆرێكی زۆری ئەو كەڵە پیاوانەدا دەكرد كە لە لوتكەی پێشكەوتنی ژیانیاندا بوون.

ئینگلتەرە جگەلە(برنادشۆ) نووسەرێكی تری وەك چەرچڵی بەخۆوە نەبینیبوو، لە ساڵێكدا داهاتی گەیشتە پەنجا هەزار دۆلار، هەر لەو كاتەدا لەسەر ژیانی(مالبرۆ) كتێبێكی چوار بەرگی نووسی، زۆربەی كاتەكانی شەوی بە نوسینەوە خەریك دەكرد، ئەم خووەش لەوكاتەوە فێرببوو كە.. بەرپرسیارێتی وەزارەتی دەریایی لەسەر شانبوو.

ئەم ڕۆحییەتەی لەسەر ڕێچكەی ژیانی باپیرەی گەشەی سەندبوو.. دیاربوو هەر لە ڕۆحی ئەویشەوە وەریگرتبوو هەتاوای لێكرد ئەو خاوەن ماڵەی ئومێد بڕاوكرد، كاتێك بانگهێشتی كرد بۆ میوانداری، بەڵێ هێشتا هیوای تۆزێك

تروسکایی قسە خۆشەکانی مابوو، کە لە هەزارەها بۆنەو میوانداریدا ناوبانگی تیادا دەرکردبوو، بەڵام ئێستا زۆربەی کاتەکانی بە بێدەنگی و مرومۆچییەوە بەسەردەبرد.لە لاشەیەکی مردوو، یا لە چرایەك دەچوو کە کوژابێتەوە، بەڵام کاتێك کاتی ڕاپەڕین هاتەپێشەوە.. بە گورجی لە شوێنی خۆی ڕاپەڕی و ڕاست بۆوە خۆی هەڵقورتاندە ئەو قسەو چەنەحانێیەی لە نێوان پارتی ڕاست و پارتی چەپدا گەرمبوو، هەر هەموو سیاسەتمەدار و ڕۆشنبیرانی سەرسام و حەپەساوکرد و سەرکەوتنێکی گەورەو بەرچاوی وەدەست هێنا.

لە ساڵی(١٩٣٢)ەوە پێش ئەوەی هیتلەر سەرۆکایەتی وەزارەت لە ئەڵمانیادا بگرێتە دەست.

چەرچڵ حکومەتەکەی لەوە ئاگادارکردەوە، بەو هاواروهاشەو هوشەیەی ئەڵمانیا هەڵنەخەڵەتێن و بروای پێنەکەن کە داوای مافی یەکسانی دەکات لە ئەوروپادا، نووسی و وتی"ئەو گەنجە بەهێز و بەتوانایانەی لە بنەڕەتدا دەچنەوەسەر(تیوتونی)یەکان و بە کوچەوجادەکانی ئەڵمانیادا بڵاوبوونەتەوە و دەگەڕێن و دەسوڕێنەوە، لە چاوەکانیاندا تیشکی تەماعیان تێدا دەبریسکێتەوە، یەکسانیان ناوێت و داوای یەکسانی ناکەن.. بەڵکو داوای چەك هەڵگرتن دەکەن..".

لەوە دەچوو ئینگلتەرە بێ ئاگابووبێت و گوێی پێنەدا، خوێندکارانی ئوکسفۆرد بڕیاری شەڕ نەکردنیاندا. کرێکاران گاڵتەیان بەو هاواروبانگەوازەیان دەکرد کە بۆ جەنگ بانگهێشتی دەکردن.. چونکە زەمانی جەنگ ڕابوردووە، بەڵام ئەو پارتەی چەرچڵ سەربەوبوو، هیچ پەیڕەو و پرۆگرامێکی نەبوو، لە هێورکردنەوە زیاتر، لە یەکێك لەو کۆبوونەوانەی کە چەرچڵ زۆرکەم هاوبەشی تێدا دەکرد و ئامادەی کۆبوونەوەیەکی حیزب بوو.

وتارێکی توندوتیژی دا، سەرکوتی ئەو سیاسەتەی کرد کە ملکەچی بۆ هیتلەر تێدادەستەبەر دەکرد و وتارەکەی بەوەکۆتاپێهێنا وتی"ئالە بەر ئەوە واز لەو داب و نەریتە کۆنە دێنن وەلاوەی دەنێن، کە باوپاپیرانمان لە مێژەوە بۆ ئێمەیان جێهشتووە و ئێستا ئەو گەورەییەو سەروەرییەمان لەسەر بنیات ناوە".

دوای ئەوە هۆڵەکەی جێهێشت و هاتەدەرەوە(هارولدنیکلسن)یە دوایدا هاتەدەرەوە، پیرۆزبایی لێکرد، چونکە نیکلسن خۆی نووسەربوو.. لەو ڕستەو دەربڕینەی دوایی پرسیاری لێکرد، ئایا ئەو دەربڕینە سەرپێی و یەکسەربوو..؟

چەرچڵ قیژاندی، وتی"بەڵام لە قسەی سەرپێیدا و خوالەناوی بەرێت من لە حەمام دابیرم لەو دەربڕین و قسەیە کردۆتەوە، ئاواتەخوازم قسەکانم لە گوێی ئەوگەنجانەدا جێی خۆی کردبێتەوە و بە هەدەرنەچووبێت".

# مەهێڵن.. ڕێگەی لێبگرن

مەبەستی ئەو تەنها قسەی زل نەبوو.. بەڵکو هەوڵیدا تاتوانی بەڵگەی خۆپڕچەککردنی لەشکرەکەی ئەڵمانیا بسەلمێنێت. لەبەهاریساڵی(١٩٣٦)دا وتی...

-"مەهێڵن.. مەهێڵن.. ئێستا مەهێڵن".

هەستا داوای پێکهێنانی هاوپەیمانییەکی گەورەی نێودەوڵەتی کرد کە ناوەڕۆکەکەی کۆمەڵی نێودەوڵەتان بێت و ڕووسیاش بخرێتە ناو ئەو کۆمەڵەیەوە.

پاشان کۆبوونەوەی(میونیخ) سازکرا..(نیفل تشمبرلن) لە فرۆکەخانەی(کرویدن) دابەزی و پارچە کاغەزێکی بەدەستەوەبوو، چەرچڵ لە ئەنجومەنی پەرلەماندا وتارێکی خوێندەوە، تیایدا وتی...

-"وتەکانم بە قسەیەك دەست پێدەکەم، بە گوێتــان خۆش نییەو بەدڵتان نییە، دەڵێم تێکشکاین، تێکشکانێکی گورچکبڕ"، ساڵێك بەسەردا تێپەری ئینجا بەریتانیا بڕیاری جەنگی ئاشکراکرد، هیچ بۆ تشبرلن نەمایەوە لەوە زیاتر بەناچاری ئەو پیاوە بگەڕێنێتەوە بیخاتەوە ناو وەزارەتەوە.

ئەو پیاوەی تشمبرلن دەربارەی دەیوت...

"هاریکاری کردن لەگەڵیدا کارێکی مەحاڵە". ونستون چەرچڵ پۆستی وەزیری دەریایی گرتەدەست لە هەموولایەکی جیهانەوە ئەفسەرانی ئوستولەکان کە بە هەموو ناوچەیەکی جەنگدا بڵاوببوونەوە، خۆشحاڵی و شادی خۆیان دەربڕی، چەرچڵ هەر هەموویانی هەژاند، چۆن هەژانێك، ئەو چرایەی لەمەوپێش کوژابۆوە، سەرلەنوێ داگیرسایەوە، بەڵام ئەو پۆستی وەزارییە دەریاییەی بە دەستی بوو، زۆری نەخایان و بەردەوام نەبوو، تەنها ماوەیەکی کەمی تێدامایەوە. ئەویش بەهۆی ئەو جێ پێلێژبوونەی(تشمبرلن)و کتوپڕییەی ئەڵمانییەکانەوەبوو کە بەلجیکاو هۆڵەندەیان داگیرکرد، تشمبرلن هیچ چارێکی بۆ نەما تەنها ئەوەنەبێت وەزارەتێکی ئیئتیلافی پێکبهێنێت لە نێوان حیزبی پارێزەران و حیزبی کرێکاراندا، بەڵام پارتی کرێکاران نەیانویست لەژێر پۆست و سەرۆکایەتی یەکێك لە پارتی پارێزەراندا کاربکەن، جگە لە لۆرد (هالیفاکس)ی وەزیری پێشووی دەرەوەدا نەبێت یاخود چەرچڵ.

هالیفاکس وای بەچاك زانی خۆی لەو پۆستە دوورخاتەوە، لەبەرئەوە وتی"بۆ ئەم پۆستە پێویست بە کەسایەتییەکی میللی دەکات نەك کەسایەتییەکی ناو لۆردەکان.."

پاش شەڕی دانکرك کارو ئەرکەکانی چەرچڵ دیار و ئاشکرابوو.. ئەوروپا تیاچوو.. ڕووسیا چووە پاڵ ئەڵمانیاوە.. ئەمریکییەکانیش هەر لە گفتوگۆ و چەنەحانێی ناوخۆیاندابوون.. لایەن نەگرتنیان پێباشتربوو.

چەرچڵ بە وەزیرەکانی وت"بـەڕێـزان ئێمە ئێستا بە تەنهاین و هیچ لایەنگیرێکمان نییە.. بۆ ئەم کارە مـن دڵم زۆر خۆشە" هەلیفاکس دەیگێڕێتەوە دەڵێت"ڕۆژێکیان چووم بۆلای چەرچڵ لە نوسینگەکەیدا.. بینیم ئەو قسانەی دەوت کە پاش هەفتەیەك لەوە، بە هەموو لایەکی جیهاندا بڵاوبۆوە، ئەویش ئەوەبوو دەیوت..!"لە لێواری دەریاکاندا دەجەنگین و شەڕدەکەین، لە دۆڵەکاندا شەڕدەکەین"، پاشان بە هێواشی دەنگی نزمکردەوەو وتی...

"خۆ ئەگەر توانییان بێنە ناو لەندەنیشەوە.. من لە دوای ئەو دیوارەی کەوتۆتە

کۆتایی ڕێگاکەوە دەیکەم بەسەنگەر و شەری تێدادەکەم، ئێوە خۆتان باش دەزانن من نیشانە شکێنێکی باش و شارەزام.."، بەڵام دیوارە پتەوەکانی ئینگلتەرە نەیان پاراست، بەڵکو چەکی فرۆکەوانی بەریتانیاییەکان توانییان بیپارێزن و رزگاری بکەن، چەرچل خۆی شارەزاییەکی تەواوی لە فرۆکەوانیدا هەبوو، بۆ ئەو کارە هیچ یەکێك لە گەورەو شارەزاکان نەیاندەتوانی شان لە شانی بدەن و کەسی پێنەدەگەیشت.

هەموو بەیانییەك لەگەڵ نان خواردنی بەیانیدا نوسراوی ئەو ژمارە زۆرانەی کونکردن و وێرانکارییەی پێدەگەیشت کە لەرێرەوەکانی فرۆکەخانەی هەرێمی(کسنت)دا رووی دەدا و چاکیش نەدەکرانەوە. زووزوو سەردانی ئەو ژێر زەمینەی دەکرد کە(سێرهیوداودنغ) تیایدا سەرپەرشتکاری پۆلە فرۆکەکانی چەکی ئاسمانی دەکرد.

چەرچل لە رۆژی(١٥ی ئەیلولی) بەناوبانگدا خۆی لەو ژێرزەمینەدابوو کە لە فەرەنساوە گەورەترین هێرشی پۆلە فرۆکەکانی ئەڵمانی هاتن و ناڵەوگرمەیان هات و رێگایان بری بۆ دەوروبەری لەندەن، بەڵام ئەوەندەی نەخایاند بەشکاوی گەرانەوە دواوە، پاش ئەوەی(١٨٥) فرۆکەیان لێخرایە خوارەوە.

ئەو جەنگ و پێکدادانەی لەو ساڵەدا کرا یەکلایی کەرەوەبوو، بەڵکو لە مێژوودا بەگەورەترین جەنگی یەکلایی کردنەوە دادەنرێت، دوای ئەوە ئیتر هێرشی شەوانە ئەنجام دەدرا. دووجار ئەڵمانەکان نزیکبوون چەرچل بپێکن و لەناوی بەرن، جارێکیان بۆمبێکی گەورە لە نزیك خانەی سەرۆکایەتیدا کەوتە خوارەوە، لەوکاتەدا چەرچل لەگەڵ هەندێ لە میوانانیدا لەوێدا نانی دەخوارد، هەرچی شووشەو پەنجەرەی خانووەکەبوو پارچە پارچەبوو بە هەموو لایەکدا هارەی کردو بڵاوبۆوە، بەڵام چەرچل وەزعەکەی هێورکردەوە، هەروەك فەرمانددەیەکی کۆری جەنگ فەرمانیدا بە خزمەتکار و ئیشکەران، بچنە ژێر زەمینەکەوە، خۆی و میوانەکانیشی بەدوایاندا چوونە ژوورەوە قاپ و پێکەکانیشیان بەدەستەوەبوو لە ژێرزەمینەکەدا لەسەر سنووقی داروتەختەکان دانیشتن و نانی ئێوارەیان لەوێدا خواردو تەواویان کرد.

لەو ماوەیەدا چەرچڵ بەردەوام وتاری کاریگەری دەدا، ئەو وتارانە وەك زەنگێکی وریا کەرەوەی گەورە دەنگی دەدایەوە، لە هەموو لایەکی جیهانەوە خەڵکی لە هەموو جۆرو بیروباوەرو حیزبێك گوێ بیستی وتارەکانی چەرچڵ بوون و گوێیان بۆ شل دەکرد.

چەرچڵی وتاربێژ لە وتارەکانیدا هەڵوێستی(تاك و تەنهایی) ئینگلتەرە بەباشترین شێوە ئیستغلال دەکرد و هەڵیدەسووراند، لەگەڵ ئەوەی سیاسەتی ئینگلتەرە هەر لە کۆنەوە بە میراتی ئەوەیان بۆ مابۆوە کە لەکاتی جەنگدا هاوپەیمانی لەگەڵدا بێت و جەنگ لە پێناوی کێشەیەکدا بکات، هاوپەیمانان بۆلای خۆی رابکێشێت.

ئەم کارەش خەڵکی لێ بێ ئاگابوون، ئەو هاوپەیمانانەی چەرچڵ حەزی دەکرد هاوپەیمانی لەگەڵدا بکات، رووسیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکابوون.

## داگیرکردنی رووسیا

داگیرکردنی رووسیا لەلایەن ئەڵمانەکانەوە خێروبەرەکەتێکی خوایی بوو، گەرچی دەمێك بوو چەرچڵ پێشبینی ئەوەی دەکرد، بەڵام راکێشانی ئەمریکا بەلای ئینگلتەرەدا کێشەیەکی زۆر ئاڵۆز و گران بوو، پاشان وردە وردە مەیلی خەڵکی ئەمریکا بەلای ئینگلتەرەدا شکایەوە.

چەرچڵیش هەموو هەوڵێکی خستەگەر بۆ ئەوەی سوود لەوەببینێت، چەرچڵ پیاوێکی خۆویست و بەخیل نەبوو کە داوای هاوپەیمانێتی دەکرد، ئەو رۆژەی لە نێوان ئەمریکاو ئینگلتەرەدا دانووسان دەربارەی(مودەمیرە) و یاسای دەریاییەوە دەکرا.

چەرچڵ وازی لە بەرموداو نیوفوندلاند هێناو تەنازولی بۆ کردن، داوای چەك و تەقەمەنی زیاتری لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاکرد، بەدەست بڵاوییەکی

زۆرەوە دەستیکرد بەسەرفکردنی ئەو ئاڵتوونانەی لەگەنجینەکاندا بوون.

خێرو بەرەکەتێکی تریش رووی تێکرد، ئەویش ئەوەبوو هێرش کرایە سەر(بێرل هاربوور)، گورج ونستون چەرچڵ ئاشکرای کرد وەزارەتەکەی بەخێرایی بانگەوازی ئاشکراکردنی جەنگ دەدات. پاشان پەیوەندی بە کۆشکی سپی ئەمریکییەوە کرد و جەختی لەسەر ئەوەکرد، بەریتانیا پێویستی سەرشانی خۆی بەجێ دێنێت. چەرچڵ بۆ ئەو کارە وای بەباشزانی، واپێویست دەکات خۆی و هەرهەموو گەورە فەرماندەکانی وشکانی و دەریایی بچن بۆ کۆشکی سپی و جەژنی سەریساڵی لە دایکبوون لەوێدا بکەن، ئەم کارەشی بۆیە وازووکرد، چونکە لە دووشت دەترسا، یەکەمەیان ئەوەبوو، لەکاتی ترس و تۆقیندا نەکا ئەمریکا هێزەکانی بەرەو ئۆقیانووسی هێمن بکێشێتەوە.

دووەمیان، ئەمریکا هەموو هەوڵێکی لە جەنگی یاباندا قەتیس بکات، ئەوە نەهێڵێت ئەو پەیوەندییەی لە نێوانیاندا هەیە بە بەردەوامی بمێنێتەوە.

خۆ ئەگەر بناغەیەکیش بۆ ئەو ترسە هەبێت، ئەوا ئەو کۆبوونەوەیەی لە واشنتۆن دەکرا بە تەواوەتی دەیرەوێنێتەوە چەرچڵ لەسەر مێزی نان خواردن لەسەر قسەخۆشی و سەرنج راکێشەکانی بەردەوامبوو، هەر بە تەنها خۆی قسەی نەدەکرد، بەڵکو ئەو چەرچڵەی لە خۆی زیاتر نەیدەهێشت لە ئەنجومەنی گشتیدا کەسی تر قسە بکات، گوێی لەو نوکتەو قسە خۆشانەی رۆزفلت دەگرت کە دەیگێرایەوە.

(هاری هوبکنس) یەکەم کەسێك بوو دەرگای ئەو نوکتەو قسەخۆشانەی والاکرد، وتی"کاتێك دەریاوانە بەریتانیاییەکانم لە دەرەوەی کۆشکی سپیداو لە شوێنی پاسەوانانەدا بینی، هاوارم کرد وتم"ئەی هاوار ماڵی وێرانم ئەمانە چۆن و لە کوێوەهاتوون و گەیشتوونەتە ئێرە؟.. خۆ ئەمانە دواجارکە هاتن ئاگریان لە کۆشکی سپی بەردا.."-(ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو رووداو بەسەرهاتەی جەنگی نێوان ئینگلیزو ئەمریکییەکان لە ساڵی١٨١٢دا).

کاتێك رۆزفلت دەچوو بۆ نووستن، چەرچڵ لە ژوورەکەیدا لە نووسینگەکەی(لنکولن)دا بەزۆری لەگەڵ(هاری هوبکنز)دا دادەنیشت و باسی

کێشەی ناردنی یارمەتی دەکرد..

(هوبکنز) زۆر سەری لەو گورج و گۆڵی و توانایەی چەرچڵ سورمابوو کاتێك لە خەو هەڵدەسا، بەمێشك سافییەوە بەو بەیانییە زووە خۆی دەکرد بە ژوورەکەیداو دەیوت"هاری... دەربارەی ئەوەی دوێنێ شەو قسەمان لەسەر کرد چیت کرد..؟.." لەو بریارانەی یەکەمجار ئینگلتەرە و ئەمریکا پێکەوە دەریان کرد ئەوەبوو.. سەربازەکانی ئەمریکا بۆ رۆخەکانی دەریاکانی ئەوروپا نەچن.

بەڵکو بەرەو باکووری ئەفریقا بکشێن و لەوێدا جەنگ بکەن، ئەم بریارەش وای پێویست دەکرد، چەرچڵ خۆی بەوکارە هەڵسێت، ئەم کارەش ناخۆشترین و قورسترین کارو خەتەرناکترین کاربوو لە سەر دڵوسەرشانی چەرچڵ، هەروەك لەگەڵ روزفلتدا لەسەری رێککەوتن دەبوا چەرچڵ خۆی هۆیەکانی ئەم جەنگ و پێکدادانەو ئامانجەکانی بۆ رووسە بێزار و ئومێددابراوەکان، کە ئەو کاتە بەرەو ستالینگراد پاشەکشەیان دەکرد.. روون بکاتەوە.

## شاعیرە کۆنەکانی دەربار

چەرچڵ دەیویست خۆی وەك یەکێك لەو شاعیرە کۆنە گەرۆکانە بشوبهێنێت کە لە شانشینێکەوە بۆ شانشینێکی تر دەرۆیشت و شیعر و گۆرانییان بەسەر کاربەدەستاندا هەڵدەدا، بەڵام جیاوازی زۆر هەبوو لە نێوان ئەو شاعیرە قسەخۆش و گەنجانەداو لە نێوان ئەمێکی رووگرژی قەڵەو کە لە فرۆکە جەنگییەکەدا ساڵی(١٩٤٢) لە مۆسکۆ دابەزی بۆ ئەوەی هاوبەشی یەکەم فیستیڤاڵی بەناوبانگی فیستیڤاڵەکانی مۆسکۆدا بکات.

یەکێك لە گەورە دەستەڵاتدارانی ئینگلیز ئەو کۆبوونەوەیەی بە کۆبوونەوەیەکی شەرو توندوتیژی وەسف کرد.

چونکە ستالین قسەو رەوانبێژییەکەی چەرچڵ کاری تێنەکرد و نەیجووڵاند،

بیرۆکەی دابەزاندنی لەشکری لە باکوری ئەفریقادا بەلاوەنا، چونکە وەك ئەوبۆی دەچوو کارێك نەبوو ئەو قورساییە زۆرەی کەوتبووەسەر رووسیا لەلایەن لەشکری ئەڵمانەوە سووك بکات، لە ڕۆژی سێیەمی کۆنگرەکەدا چەرچڵ کەوتبووە ناوگێژاوی خەم و خەفەت و ڕووگرژییەکی زۆرەوە.

چەرچڵ لە سەرەتای ژیانی سیاسی خۆیدا شیوعییەت گەورەترین دوژمن و خەم و پەژارەی بوو. ئەوتووڕە بوونە پەنگ خواردوەی تەقییەوە و سەری کرد، ئەوانەی لەگەڵیدابوون ویستیان هێورو بێدەنگی بکەن ئاماژەیان بۆ دیوارەکان بۆ دەکرد، ژوورەکە مایك و وایەری نەهێنی و شاراوەی زۆری تێدایەو دەنگەکان دەگوێزێتە دەرەوە، بەڵام نەیانتوانی سەرۆك وەزیران هێورکەنەوەو بێدەنگی بکەن، بەڵکو ئاگادارکردنەوەکەیان وایلێکرد لە دیوارێکەوە بۆ دیوارێکی تر بڕوات و جامی غەزەب و تووڕەیی خۆی هەڵدەڕشت، بەڵکو لە یەکێك لەو دیوارانەدا مایکی نەهێنی و شاراوە هەبێت و قسەکانی بگوێزێتەوە پاشان ڕووی تێکردن و بەزەردەخەنەیەکی ساردو گرژییەوە وتی"خۆ هەر نەبێت خەڵکی کە بەو شتەیان زانی یان خوێندیانەوە شادوو دڵخۆش دەبن.."

لە دوای نیوەڕۆدا ستالین بانگهێشتی چەرچڵی کرد بۆ کرملین لەودانیشتنەدا هەردوولا گەیشتنە ڕێکەوتنێك کە هەردوولایان پێیرازی بوون، ئا بەو شێوەیە نەوەی(مالبرۆ) لە هەنگاوەکانی یەکەمدا سەرکەوت و توانی بەراستیی ئەوەی ئەمریکا و ئینگلتەرە کردبووی کوری کابرای پێڵاودروو ڕازی بکات.

لە کانونی یەکەمی ساڵی١٩٤٣دا لە (تاران)دا بەسێ قۆڵی چەرچڵ و ڕۆزفڵت و ستالین کۆبوونەوەیەکیان سازکرد،.

لەو کۆبوونەوەیەدا رووسەکان پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت بە گەرمی جەختیان لەسەر ئەوەدەکردەوە کە پێویستە لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواوە لەیەککاتدا هێرش بکرێتە سەر لەشکری ئەڵمانی چەرچڵیش بەدورودرێژی ئەو خەتەری و ترسەی بۆ باسکردن کە لەشکر تووشی دوژمنێك بێتەوە، وای لێ بکات بۆ ماوەیەکی دورودرێژ لە شوێنەکەی خۆیدا ڕابگرێت و بیهێڵێتەوە، هەروەها بەدرێژی ئەوەی بۆ ڕوونکردنەوە، ئەگەر ئەوەنەکەن چی ڕوودەدات، ئاخری لەسەر ئەوە ڕێککەوتن ١٣٣

لەشکرکێشییەکی گەورە بکەن بۆ سەر(نورمندی).

لەسەر ئەو هێرشە بریار لەسەر پاشەڕۆژی ئەڵمانیا دەدرێت. لە ڕۆژی هێرش و داگیرکردنەکەدا چەرچڵ لەگەڵ ئەیزنهاوەردا پێکەوەبوون لەو شەمەندەفەرە تایبەتییەی لە باشووری ئینگلتەرەدا بوو. چەرچڵ دەیویست لەگەڵ سەربازەکانیدا بە دەریای (مانش)دا تێپەڕێ، ئەیزنهاوەر نەیهێشت بچێت، نۆ مانگ تێنەپەڕی بوو، لەو ڕۆژەی هاوپەیمانەکان بە ڕووباری(الراین)دا ڕەتدەبوون، چەرچڵ دەبینرا لەسەر زرێ پۆشێکدا ڕاوەستابوو، لە وشکانی و ناو دەریادا بانگەوازی سەربازەکانی دەکرد و هاواری دەکرد"یالآ با بەرەو پێشەوە برۆین، ئێمە ئێستا لەشکرێکی تێکشکاو ڕاودەنێین بەرەو زەلکاوی زوڵم و خراپەکاری بۆ (بەرلین) دەیانگەڕێنینەوە".

چەرچڵ ئەوەندە ژیا هەتا بەچاوی خۆی مەرگی گەورەترین و بەهێزترین و ترسناکترین دوژمنی ئینگلتەرەی بینی، چەرچڵ ئومێدی دەکرد مەرگ مەودا بدات و ببێتە پیاوی ئاشتی جەنگ و وێرانکاری وای لە ئەوروپا کردبوو لە هەمولایەکەوە دیمەنی هەژاری وێرانکاری و کارەساتی ناخۆشی ببینێت.

ماوەی پێنج ساڵ ئەم جەنگاوەرە شۆڕشگێرە، بەڵێنیدا"ڕۆژێك دێت زەنگی خۆشی و شادی لەسەرانسەری هەموو لایەکی ئەمریکا و ئەوروپادا لێ بدرێت و کاتی ئەوەبێت ماڵێکی گەورەو بڵند لەسەر بنەمای یەکسانی و سەربەستی دابمەزرێت و بەشی هەموولایەك بکات".

گەلی بەریتانی بڕیاریاندا، خۆیان بۆ دروستکردنی ئەو ماڵە ئامادەبکەن و دروستی بکەنەوە، نەشیانهێشت مستەر چەرچڵ بەردێك لەسەر بەردێکی دابنێت چونکە کەس نەبوو بتوانێت نکۆڵی لەوە بکات کە ونستوون چەرچڵ بوو ئەو دەرگای ئومێدەی بۆ کردینەوە و ئەو ماڵە لە ژێرسایەی ئاشتیدا بنیات بنرێتەوە و بۆ هەتاهەتایی بمێنێــەوە.

# لە نەهێنییەکان جەنگ

چەند ساڵێك لەمەوبەر(ونستون چەرچڵ) پشتی کردە جیهان و لە تەمەنی نەوەد ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، لە دوا خۆی نەهێنی زۆری دەربارەی جەنگی دووەمی جیهانی جێهێشت چاوەڕوانی ئەوەبوو یەکێك ئەو نەهێنییانە ئاشکرا بکات. ڕەنگە گەورەترین و سەرسورهێنرترین ئەو نەهێنییانە ئەو نەهێنییە بێت کە دائیرە سیاسییەکانی بەریتانیا لەم دواییەدا ئاشکرایان کرد، ئەویش پەیوەندی بەو شوێنەوەبوو کە مستەر چەرچڵ لەو ژێر زەمینەدا کاری بەڕێوەبردنی ئەو جەنگ و پێکدادانەی لە هەموو لایەکی جیهاندا بەڕێوەدەبرد.

هەر لەو ژێر زەمینەدا دەنوست و لەگەڵ وەزیرەکانیدا خەتەرترین بڕیاری دەردەکرد و هەر لەوێشدا لەگەڵ گەلی بەریتانی و هەموو جیهاندا قسەی دەکرد.

هەر لەو ژێرزەمینەدابوو وتە بەناوبانگەکەی لە (ئازاری ١٩٤٠)دا بڵاوکردەوە.. وتی"ئەگەر ئەڵمانیا ئینگلتەرەی داگیرکرد من هەر لێرەدا دەمێنمەوە..".

پاشان ئاماژەی بۆ ئەو کورسییە کرد کە لەسەرومێزە گەورەکەوە دانرابوو لە کاتی کۆبوونەوەیدا لەگەڵ وەزیرەکانیدا لەسەری دادەنیشت وتی"هەر لەوێدا دادەنیشم هەتا ئەڵمانییەکان لە ئینگلتەرەدا دەردەکرێن و ڕاوەدوودەنرێن، یان دێن بۆ گرتنی من و بەمردوویی دەمبەن" هەتا ئەم کاتە چەند کەسێکی کەم نەبێت ئەو شوێنە کەس نەیدیوە.. گەرچی حکومەتی بەریتانیا تاکو ئێستا لەبەر گرنگی مێژوویی چەند ژوورێکی ئەو ژێر زەمینەی هەروەك خۆی هێشتۆتەوە.

وەك چۆن چەرچڵ دوای کۆتاهێنانی جەنگ جێی هێشتو بۆ کارکردن گەڕایەوە سەرزەوی.

ئەو ژوورە زۆرانە هەندێ جار نزیکەی سێ سەد کەس لە وەزیر و ئەفسەر و ئەندازیارانی دەگرت، ئەو ژوورانە لەسەدوپەنجا ژوور کەمتر نەبوون، بە

قوولایی(١٥) پێ لە ژێرزەمیندا هەڵکەندرابوون.

هەموو پێداویستییەکی حەوانەوەو کارکردن و هۆی گواستنەوەی تەلەفۆن و بێتەل و ئامێری ڕووناککردنەوەی تێدابوو، ئەو ژوورانە بە نەهێنی لە ژێر تەلارێکی حوکومیدا دروستکرابوو، فرۆکە جەنگییەکانی ئەڵمانیا لە کاتی هێرش کردنیاندا بۆ سەر بەریتانیا ئەو تەلارەیان وێران کردبوو.

نەهێنی ئەو ژوورانە کەس پێینەدەزانی تا بیانگەیەننە دەرەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو پلانێکی خوێناوی جەنگ لەو ژێر زەمینەدا دادەڕێژراو بڕیاری لەسەر دەدراو هەموو جموجۆڵێکی ئوستوڵە جەنگێکانی هاوپەیمانان لەو ژوورانەدا تۆماردەکرا.

هەر کە یەکێك لەو کەشتییە جەنگییانە لە شوێنێکدا بجوولایە لەسەر نەخشەی سەر دیوارەکە دەرزییەکانیان دەجوولاندو شوێنی کەشتییەکە دەستنیشان دەکرا، هەروەها ئەو نەخشانە شوێنی ژێر دەریا گەرۆکان و جموجوولی کەشتییەکانی ئەڵمانییەکانیان دەستنیشان دەکرد، ئەگەر شەڕو پێکدادانێك یان هێرشێکی دەریایی بکرایە.. شارەزایانی سەربازی دەرزێکانیان دەگواستەوە.

هەر لەم ژێر زەمینە نەهێنییەدابوو، توانرا بەسەر(ڕۆمل)ی ڕێوی بیاباندا سەرکەون، ئەو سەرکەوتنە ڕێرەوی جەنگی لە باکووری ئەفریقادا گۆڕی، ئەو ڕۆژانەی(ڕۆمل) بەسەر لەشکری ئینگلیزدا سەردەکەوت و ڕۆژانی سەرکەوتنی بوو لەو ڕۆژانەدا چەرچڵ سەردانی قاهیرەی دەکرد، لەوێوە داوای لە وەزیرەکانی کرد ئەو فەرماندە بەریتانیاییە لە باکوری ئەفریقادایە، بگۆڕن بە فەرماندەیەکی تر.

ناوی فەرماندەکەشی بۆ دەستنیشان کردن، بەڵام ئەو فەرماندەیەی ئەو دەست نیشانی کردبوو(ئەیزنهاوەر) خستبوویە ناو فەرمانداریيەتەکەی خۆیەوە، لەم حاڵەدا دەبوو وەزیرەکان خۆیان بە تەنها بۆ ئەوە دەست بەکاربن و فەرماندەیەکی تر هەڵبژێرن.

بۆ ئەو کارە جەنەراڵ(مۆنتۆگومری) یان هەڵبژاردو ناردیان بۆ باکوری ئەفریقا و توانی گەورەترین سەرکەوتن بەسەر لە شکری ئەڵمانیادا وەدەست بێنێت و

تێکیان بشکێنێت.

هەر لەو شوێنەوە یەکێك لە گەورە بەرپرسانی ئینگلیز پاش ئەوەی کاتێکی زۆری لەوژێرزەمینەدا بەسەربرد لەو ماوەیەدا کەللەیی ببوو، وتی"خەڵکی دەڵێن ئەم جەنگەجەنگی هیتلەرە.. لە ڕاستیدا هەرگیز وانییە، ڕاستە هیتلەر بڵێسەی ئاگرەکەی داگیرساند، بەڵام لە دوای(١٠ مانگی ئازاری ساڵی ١٩٤٠)ەوە جەنگەکە بوو بەجەنگی چەرچڵ.. هەر خۆی سەرکردایەتی ئەو جەنگەی دەکرد و بەرگری و هێرشکردنی لە هەموو شەڕوپێکدادانەکاندا خستبووە سەرشانی خۆی و خۆی دەیکرد..".

کاتێك شەڕوپێکدادانی(بسمارك) کۆتاییهات و ئەو زریێ پۆشە ئەڵمانییە چەندەها ڕۆژ کەشتیگەلەکانی ئینگلیز ڕاوەدوویان نا.. و لە کۆتاییدا توانییان نوقمی دەریای بکەن و کۆتاییان پێهێنا.

یەکێك لە ئەفسەرەکان دوای ئەوەی لە ژووری نەخشەکانی ژێر زەمینەکە هاتە دەرەوە ویستی بەسەر زەویدا بەپێ بۆ ماڵەوە بڕوات، کاتێك گەیشتە سەر شەقامەکە بینی قاچەکانی بەهۆی ئەو هەوڵ و ماندووبوون و زۆرمانەوەی لە ژێر زەمینەکەدا و ئەو بەردەوامی و گۆڕانکارییە سەرنج ڕاکێشەی لەسەر نەخشە گەورەکاندا کردبووی، قاچەکانی بەیەکدا دەهاتن و زۆربەتوندی کەوتبوونە لەرزین.

ڕۆژێکیان لە کاتێکدا چەرچڵ تەماشای ئەو نەخشە گەورەیەی دەکرد و وێنەی ئەو کاروانە دەریاییەیان دەگرت کە خواردمەتی و چەکیان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە هەڵگرتبوو، دەیانگواستەوە بۆ ئینگلتەرە و پیشانی چەرچڵیان دەدا، کەشتییەکی بازرگانی گەورە سەرنجی ڕاکێشا بە هێواشی بەناو دەریادا ڕەتدەبوو سەرنجی جووڵەی کەشتیەکەیدا کاتێك دەربارەی ئەو کەشتیە پرسیاری کرد پێیان وت"ئەو کەشتییە شەش هەزار تەن هێلکەی بارکردووە، پاشان وەرگەرایەوە بەلای ئوستاز(لیترمان)دا کە ئەویش زانایەکی گەورەبوو، چەرچڵ گوێی لە بیروبۆچوونەکانی دەگرت و ناوی نابوو(دائره المعارف)(بانکی زانیاری).. لێیپرسی شەش هەزار تەن هێلکە ژمارەی هێلکەکان دەکاتە چەند..؟

ئوستاز(لیترمان) پاش کەمێك بیرکردنەوە پێی وت"دەکاتە سەدوحەوت١٠٧ ملیۆن هێلکە".

چەرچڵ زەردەخەنەیەکی بۆ کرد، پاشان وتی"واتە بڕی دووهێلکە بۆ هەر یەکێك لە بەریتانییەك".

هەروەها زۆرێکی نەهێنی تریش هەبوو.. ئەوەی تێیدابوو بریتی بوو لە مێزێك و کورسییەکی دانیشتن و تەلەفۆنێك، بەڵام ئەو تەلەفۆنە لە کاتی جەنگدا کارێکی گەورەو ترسناکی هەبوو، ئەو تەلەفۆنە تەنها هۆی پەیوەندی نێوان چەرچڵ و ڕۆزفلت بوو.

کاتێك دەرگای ئەو ژوورە دادەخرا، گڵۆپێکی سوور لەسەر دەرگاکە دادەگیرسا و لە ڕاڕەوەکەدا هیچ کارمەندێك دەرنەدەکەوت و نەدەڕۆیشتن، ئەوەی سەیربوو لە کاتی ئەو تەلەفۆن کردنانەدا هیچ یەك لەو دوو سەرۆکانە حەزی نەدەکرد بۆ چرکەیەکیش بێت لەسەر تەلەفۆن چاوەڕوانی برادەرەکەی بکات. کاتێك شا جۆرجی پێنجەم لە ناخۆشترین کاتی جەنگدا و لە بێ ئومێدترین کات و ناخۆشترین دڵەڕاوکێدا سەردانی ئەو شوێنە نەهێنییەی کرد.خەنجەرێکی لەسەر مێزەکەی چەرچڵ بینی...

پرسیاری هۆی بوونی ئەو خەنجەرەی لەسەر ئەو مێزەکرد.

یەکێك لە کارمەندان وەڵامیدایەوە"گەورەم ئەو خەنجەرە هی مستەر چەرچڵە.. بۆ ئەوکاتەی داناوە کە هیتلەر بۆ ئێرە دێنن بۆ لای و بەکاری بهێنێت".

چەرچڵ گوێی لە تەعلیقەکەبوو.. خۆی لێبێدەنگ کردبوو، هەرهەموو وەزیرەکان لەو ژێر زەمینەدا و لە شوێنی نەهێنیدا دەنووستن، هەروەها هەر هەمووکارمەندانیش لەوێدا دەنوستن و ئاگایان لە حاڵەتی کەشوهەوای سەرزەوی نەبوو..

یەکێك لە کارمەندەکان بڕیاریدا زانیاری پێویستیان بداتێ هات کارتۆنێکی گەورەی بە دیوارەکەدا هەڵواسی.. دەربارەی گۆڕانی کەشوهەواو بەپێی گۆڕانی لەسەر کارتۆنەکە دەینووسی.. بارانە.. بەفرە.. هەتاوە..

ڕۆژێکیان هەندێ لە وەزیرەکان تەماشای کارتۆنی سەردیوارەکەیان دەکرد

بۆ ئەوەی حاڵەتی کەش و هەوا بزانن، بینیان لەسەر کارتۆنەکە نوسراوە.. ئەمرۆ(جن)مان نییە(جن)یش مەشروبێکی خواردنەوەی ناسراوبوو.. ئەو بڕگەیەش یەکێك لە کارمەندان لەسەری نووسیبوو بۆ ئەوەی بەرپرسان ئاگادار بکاتەوە، بۆ پەیداکردن و پێویستی ئەو مەشروبە..

ئەو جەنگە لەو ژێر زەمینە نەهێنییەدا بە هێواشی و لەسەرخۆ کۆتایی پێهات، هەروەك بەهێواشی و لەسەرخۆ ئاشکراکراو دەستی پێ کرد.

لە ڕۆژی (١٦ ئابی ١٩٤٥)دا زەنگی تەلەفۆنەکە لە لێدانکەوت، یەك لەدوای یەك کارمەندو بەرپرسانیش ژێر زەمینە نهێنییەکەیان جێهێشت.



بیرەوەرییەکانی ژەنەڕاڵ زۆکۆف
(منداڵی و گەنجی)

# بەشی دووەم
# (بیرەوەرییەکانی ژەنەڕاڵ زۆکۆف)

## بەشی یەکەم

(منداڵی و گەنجی)
سوارچاکی و ڕۆمانتیکیەت- لەشکری قەیسەری
جەنگ و پێکدادانی یەکەم- یاخیبوون و شۆڕش

لە کۆتایی و ئاوابوونی تەمەندا زۆرگرانە مرۆڤ بتوانێت هەرچی لە ژیاندا بەسەرهاتووە هەمووی بیربێتەوە. ساڵان و سەرقاڵی ئیشوکار و بەسەرهات، زۆرێکی زۆر لەو بیرەوەرییانەی لە مێشکدا سڕیوەتەوە و تووشی داخۆرانی کردووە.

بەتایبەت ئەوانەی پەیوەندی بە منداڵی و لاوێتییەوە هەیە و هیچی تیا نەهێشتۆتەوە لەوە زیاتر کە هەرگیز بیرناچێتەوە.

زوکۆف لە ڕۆژی(١٩ی تشرینی دووەمی ساڵی١٨٩٦)دا لە خانوویەکی کۆنی گوندی(ستریلکوڤکا)ی سەربە پارێزگای(کالوجا)دا لە دایکبووە.

زۆکۆف هیچ شتێك دەربارەی بنەماڵەکەی خۆی نازانێت و نازانێت بنەچەی کێیە، تەنها ئەوەندە نەبێت..! "ئەو خانووەی ئەوی تیالە دایکبووە،ماڵی بێوەژنێك بووە ناوی(ئەنوشککازوکوفا) بووە و منداڵی نەبووە، لەبەرئەوە

ئەنوشککا بۆ ئەوەی تەنهایی خۆی ڕۆشنکات، لە خەڵوەتگەی منداڵاندا منداڵێکی هەڵگرتۆتەوە لە تەمەنی دوو ساڵاندا بووەو کردوویەتی بە کوڕی خۆی ئەوە دایکی من بوو، ئەی کێ دایك و باوکی ڕاستەقینەی بووە..؟ ئەوە وەڵامێکە کەس نایزانێت، تەنها ئەوەندە دەزانرێت، ژنێکی نەناس منداڵەکەی خۆی لە تەمەنی سێ مانگیدا لەبەر دەرگای خەڵوەتگای منداڵانی هەتیواندا جێهێشتووە و پارچە کاغەزێکیش لەگەڵ منداڵەکەیدا جێهێشتووە و لەسەری نووسیوە"کوڕەکەم بەناوی قوستەنتین(قسگنگین)ەوە بانگ بکەن.." (واتە ناوی بنێن قوستەنتین).

چ شتێك بووە وای لەو ژنە داماوە هەژارە کردووە، بێت منداڵەکەی خۆی فڕێبداتەبەر ئەو خەڵوەتگایەوە..؟

ئەمە شتێکە کەس ناتوانێت دەرکی پێ بکات و وەڵامی بداتەوە.. دوورنییە ئەو ژنە لەبەر هەستی دایکایەتی و هەژاری نەبووبێت و زیاتر لەوە دەچێت ئەم ژنە بۆیە ئەوەی کردووە، هیچ ڕێگا چارەیەکی بۆ نەماوە تاخۆی لەو تەنگەشەی نەبوونی و دەست کورتییە تاڵوناخۆشە قوتار بکات.

هێشتا زۆکۆف تەمەنی نەگەیشتبووە هەشت ساڵان.. کاتێك ئەو ژنە چاکەخوازەی ئەوی کردبووە کوڕی خۆی کۆچی دوایی کرد و مرد، ئەو پیاوە هیچ چارێکی نەما لەوەزیاتر بچێتە لای پێڵاودروویەك و لەوێدا ببێتە شاگرد و کاربکات، بەڵام لە ڕاستیدا ئیشەکەی تەنها ئاژەڵ لەوەڕاندن و خزمەتکاری ماڵەکەبوو، پاش سێ ساڵ وازی لەو کارەهێنا، بەپێ بەرەو مۆسکۆ بەدوای کارێکی تردا کەوتەڕێ.

لەوێدا لە کارگەیەکی پێڵاو دروستکردندا دەست بەکاربوو، هەتا ئەو ڕۆژەی لەسەرکار دەرکرا بەهۆی ئەو هاوکارییەی لە مانگرتنی شۆڕشی ساڵی ١٩٠٥دا هاوکاری کرد و لە مۆسکۆ دووریان خستەوەو دەریانکرد.

ئیتر لەو ڕۆژەوە لە دێیەکەدا مایەوەو ماوەیەك بە پێڵاودروون و ماوەیەکیش بە کشتوکاڵ کردنەوە خۆی خەریککرد.. تا لە ساڵی ١٩٢١دا کۆچی دوایی کرد.

دایکی زۆکۆف[1] لەدێیەکی نزیکدا کە پێیان دەووت"تشرنیا جربان" کە بەڕووسی مانای(چەپەڵی ڕەش) دەگەیەنێت لە دایك بووە..

کاتێك دایك[٢] و باوکی هاوسەرییان کرد.. باوکی تەمەنی پەنجا ساڵان بوو، دایکیشی تەمەنی سی و پێنج ساڵان بوو، دایکی شوویەکی تری کردبوو.. باوکیشی ژنێکی تری هێنابوو.

ئەم هاوسەرییەیان دووەم هاوسەرییان بوو.. چونکە هەریەکەیان زۆربەزوویی لە شووکردنی یەکەم و ژن هێنانی یەکەم. بێوەژن و بێوە پیاوکەوتن.

لەبەرئەوەی باوکی زۆر هەژاربوو، دایکی بەناچاری شانیدایە بەر قورسترین کار لە پێناوی کرێیەکی کەمدا کە بە کولەمەرگی بژێوی ژیانیانی دابین دەکردن.

مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت هەر دایکم بە تەنها لەو نەهامەتی و هەژارییەدا نەدەژیا، ئەو هەژاری و نەبوونییە زۆرە وای لە زۆربەی پیاوان دەکرد، گوندەکانیان جێ بهێڵن و رووبکەنە شارەکان، بەدوای کارێکدا بگەڕێن، ژن و منداڵەکان و پیروپەککەوتووەکانیان جێدەهێشت و بەر پرسیاری کارکردنی ناو کێڵگەکانیان بۆ ئەوان جێدەهێشت.

زۆکۆف باسی دەوڵەمەندو ئاغاو دەرەبەگەکانی لادێ دەکات و پاشان دەڵێت..(بەڵام ئێمەی منداڵانی هەژارەکان.. هەستمان بەو کارو ئەرکەگرانەی سەرشان و ژیانی دایکمان دەکرد و بەخەم و پەژارەیەکی زۆرەوە دەمانڕوانییە ئەو فرمێسکانەی لە چاوەکانیانەوە سەری دەکرد و دەرژایە خوارەوە.

ئای چەند دڵخۆش و شادومان دەبووین کاتێك لە شار دەگەڕانەوەو لەگەڵ خۆیاندا هەندێ نان یاخود نانەرەقەو شۆربایان دەهێنایەوە، ڕێدەکەوت هەندێ جار پارەیەکی کەمیان پێش جەژنی لە دایکبوون یاخود جەژنی قوربان پاشەکەوت دەکرد بۆ ئەو جەژنانە.

خۆشی و شادییەکی بێ پایان دایدەگرتین و خۆشی دەکەوتە دڵمانەوە کاتێك من لە تەمەنی پێنج ساڵیدا بووم و خوشکەکەم لە تەمەنی حەوت ساڵیدابوو، دایکم کوڕێکی بوو.. ناویاننا(ئەلکس). ئەو کوڕە زۆر لاوازبوو هەموو کاتێکیش نەخۆشبوو، جارێکیان دایکم وتی"هێزو توانای بەچی هەبێت..؟ بەنان و ئاوی ڕووتی..؟!!.

دایکم لەبەر برسێتی و نەبوونی و بەدوای پەیداکردنی نان و بژێویدا ناچاربوو

رووبكاتە شار، دراوسێكانمان هەر چەند هەوڵیان لەگەڵدادا پەشیمانی بكەنەوە، بۆسەرپەرشتی و بەخێوكردنی منداڵە نەخۆشەكە لە گوندەكەدا بمێنێتەوەو نەروات بێ سوودبوو، لە ترسی ئەوەی منداڵەكانی تری هەموو لە برساندا بمرن، غەمەكەی لەوە زیاتربوو كە نەخۆشی... منداڵە ناتەواو نەخۆشەكەی بكوژێت.

پاش ئەوەی دایكم ڕۆیشت بەماوەیەكی زۆركەم كورە بچكۆلەكەمان كۆچیدوایی كرد، ئێمەش كردمان بەژێرگڵەوە، من و خوشكەكەم و دایكم و باوكم بۆی زۆر خەمبار و دڵگران بووین، زووزوودەچووین سەردانی گۆڕەكەیمان دەكرد.

هەر لەو ساڵەدا بوو خانووەكەمان ڕماو وێران بوو، بەناچاری ماڵەكەمان چۆڵكردوو چووینە ناو تەویلەیەكەوە، هەتا باوكم توانی خانووەكەمان چاك بكاتەوە.

لەزستانی ساڵی(١٩٠٢)دا زۆكۆف پێینایە ناو تەمەنی حەوت ساڵییەوە، ئەو ساڵە زستانێكی زۆر سەخت و ساردوسەرما بوو، بەروبووم زۆر كەمبوو ئەو زەخیرەیەی هەمانبوو تا نیوەی كانونی یەكەم زیاتر بەشی نەكردین.

ئەو پارەیەش دایكم و باوكم لە بریتی ئیشكردنەكەیان وەریاندەگرت دەیاندا بەنان و خوێ و هەندێ قەرزیشیان پێدەدایەوە، بەشی هیچی نەدەكرد، سوپاس بۆ دراوسێكانمان هەندێ جار كەمێك شۆربا، یا ژەمە خواردنێكیان بۆ دەناردین و لە برسێتی ڕزگاریان دەكردین، ئەم یارمەتی و دەسگرۆییە لەناو دێیەكەماندا شتێكی شاز و ناعادەتی نەبوو. بەڵكودابونەریت و دەستگرۆیی كردن و دۆستایەتییەك بوو، بەخۆشی و ئارەزوو لەناو هەموو خێزانێكی ڕووسیدا هەبوو. برسێتی و نەبوونی و هەژاری پێكییەوە دەبەستن، لەوەرزی بەهاردا وردە وردە حاڵمان باشبوو خەڵكی دەیتوانی لە چەم و زۆنگاوەكاندا ڕاوە ماسی بكات.

كاتێك وەرزی دروێنە هاتەپێشەوە.. دایكم پێیووتم.."كوڕی خۆم ئێستا كاتی ئەوەت هاتووە فێری دروێنە ببیت لە شار داسێكی تازەم بۆ كڕیویت، سبەینێ بەیانی پێكەوە دەچین(جویدەر) دەدروینەوە..(جویدەر.. نەباتێك بوو لە جۆ دەچوو.. خەڵكی هەژارو نەدارا نانیان لێدروست دەكرد.." زۆر حەز و ئارەزووم لەسەر دروێنەكردنەكەبوو، خۆم بە ئازاو شارەزا دادەنا و شانازیم پێوەدەكرد،

بەخێرایی درویێنەم دەکرد.
بەدەمی داسەکە پەنجە تووتەی دەستی چەپم بڕی.. خۆم و دایکم زۆرترساین و هاوارمان لێهەڵسا پوورە(براسکوفیا)ی دراوسێمان بەهانامانەوە هات و لەسەر زەوییەکە پارچە گەڵایەکی هەڵگرت و لەسەر براوێکەی داناو بەپارچە پەڕۆیەك توند پێچای، لەوکات و ساڵانەوە تاکو ئێستا شوێن برینەکەی پەنجەی چەپم هەردیارە، کە تەماشای دەکەم ئەو ڕۆژەم بیر دەکەوێتەوە کە یەکەمجارم بوو لەو ئیشی کشتوکاڵی یەدا سەرکەوتوو نەبووم.

---

لەگەڵ هاتنی پایزی ساڵی (١٩٠٣)دا وەرچەرخانێکی گەورە لە ژیانمدا ڕوویدا.. هاوتەمەنەکانی خۆم بۆ چوونە قوتابخانەو خوێندن خۆیان ئامادەکرد، منیش لەگەڵ ئەواندا خۆم بۆچوونە قوتابخانەو خوێندن ئامادەکرد.
هەندێ لەو منالانەی لەگەڵمدابوون خۆیان هەڵدەکێشاو شانازییان بەوجانتا تازەیەوە دەکرد کە بۆیان کڕیبوون، منیش زۆر قاییل بووم بەو توورەکە پەڕۆیەی دایکم بۆی دروبووم لە شانم دەکرد و دەفتەر و کتێبەکانم تێکردبوو.
چوومە ئەو قوتابخانەیەوە کە سەر بەکەنیسەبوو.. قوتابخانەکە دووکیلۆمەتر لە گوندەکەمانەوە دووربوو، مامۆستای پۆلەکەمان مامۆستایەکی شارەزاو لێهاتووبوو.. مرۆڤێکی زۆرباشبوو، بەبێ هۆو لە خۆوە لە هیچ قوتابییەکی نەدەداو سەرکوتی نەدەکرد، سەرزەنشت و هەڕەشەی لە هیچ منداڵێك نەدەکرد و نەیدەترساندن.
لەبەرئەوە هەرهەموو قوتابییەکان خۆشیان دەویست و ڕێزیان دەگرت و لە قسەی دەرنەچوون.
مامۆستاکەمان بێدین بوو، بەڵام لەبەرحەیاوحورمەتی خۆی بۆ سەرپەرشتیکردنی ئەو قوتابییانەی هاوبەشی کۆرسی کەنیسەیان دەکرد، دەچوو بۆ کەنیسە. زۆکۆفیش یەکێکبوو لەو قوتابییانەی لە کۆرسی کەنیسەدا هاوبەشی

دەکرد، چونکە زۆکۆف لە منداڵیدا دەنگێکی خۆش و زوڵاڵی لە گۆرانی وتندا هەبوو.

دانیشتوانی لادێکەمان زۆر ڕێزی باوکمیان دەگرت و گوێیان لە قسەوبیروڕاکانیان دەگرت.

ئاسایی لە کۆڕوکۆمەڵەکان و ناکۆکییەکانیاندا قسەی ڕەدنەدەکرایەوە و بڕیارەکانی ئەو بڕیارێکی یەکجاری و کۆتایی بوو. من باوکم زۆر خۆشدەویست، ئەویش زۆر دڵنەوایی منی دەکرد و خۆشی دەویستم، بەڵام ئەو خۆشەویستییە نەبووە هۆی ئەوەی هەندێجار لەبەرهەندێ هەڵەو ناهەمواری لێم نەدات، بەڵکو قایشە ئەستوورە پانەکەی پشتی دەکردەوە بە توندی دەکەوتە لێدانم، ئەوەندەی لێیدەدام شلوکوتی دەکردم هەتا داوای لێبوردن و تۆبەم نەکردایە وازی لێنەدەهێنام، بەڵام من زۆر کەللەڕەق و ڕق ئەستووربووم هەر چەندی لێدەدام داوای لێبوردن و تۆبەم نەدەکرد.

زۆکۆف لە نەوجەوانیدا لەگەڵ خاڵیدا دەچوو بۆ ڕاو، خاڵی ناوی(بروخور)بوو، ڕاوچییەکی شارەزابوو نێچیری بە فێرۆنەدەدا، مارشاڵ لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت"لەو ڕۆژەوە من حەزم لە ڕاوکردنە، بێشك بروخور لەو تەمەنی لاویەتیەمدا ئەو ئارەزووەی لە دڵمدا ڕواند".

مارشاڵ ئەم گفتوگۆیەی نێوان دایك و باوکیمان بۆ دەگێڕێتەوە کاتێك باوکی بڕیاردەدات، دوای پشوویەکی کەم بگەڕێتەوە بۆ مۆسکۆ، چونکە ئەوکاتە کرێکارانی (مۆسکۆ و بتروسبورگ) لەبەر بێکاری و چەوساندنەوە هەڵسابوون بە خۆپیشاندان و مانگرتن.

دایکی پێیدەڵێت" پێویستە تۆ خۆت هەڵنەقورتێنیتە ناو کارێکەوە پەیوەندی بە تۆوەنەبێت، با تۆش بۆ شوێنێك دوورنەخەنەوە، وەك(ماکسار)ی هاروهاج و سەرسەختت لێبەسەربێت"ئەمە پەندێکی ڕووسیە واتە نەفیتکەن بۆ شوێنێکی دووروچۆڵەوانی کەس نەزانێت لە کوێی و ژیان نەبینیتەوە" باوکیشی وەڵامیدایەوە...

-"ئەوەی پەیوەندی بە کرێکارەوەیە، پەیوەندی بەمنیشەوە هەیە، لە هەرکوێیەکبن، دەبێت منیش لەو شوێنەبم..!!" دوای سەفەرەکەی باوکم بۆ مۆسکۆ،

ماوەیەکی زۆر هەواڵیمان نەزانی و ترس و خەم و پەژارە باڵی بەسەرداکێشاین، هەر دوای ئەوە خێرا بیستمان پۆلیس و هێزەکانی(قەیسەر) لە بەتروسبورگدا لە (٩ی کانوونی دووەمی ساڵی١٩٠٥)دا تەقەیان لە خۆپیشاندانێکی ئاشتییانەی کرێکاران کردووە، کە داوایان لە شا قەیسەر کردبوو، باری بژێوی ژیانیان بۆ بگۆڕێت و چاکی بکات، ئیتر لەو ڕۆژەوە کۆمەڵە کەسانێکی نەناسراو ڕوویانکردە لادێکان و خەڵکیان هەڵدەنا بۆ خەباتکردن دژی دەرەبەگان و ڕژێمی قەیسەری، جوتیارەکان هەواڵی ئەشکەنجەو نەفیکردنی سەرکردەکانی کرێکارانیان دەبیست، دەنگوباسی(لینین) یان دەبیست کە بۆ بەرژەوەندی جوتیار و کرێکاران هەوڵدەدات.

ئەو هەواڵ و خەباتەی سەرۆکی بەلشەفێکان دەیکات لە پێناوی ڕزگارکردنی چەوساوەکاندا لە ژێر زوڵم و زۆرو زنجیری دەرەبەگان و سەرمایەداران و زۆرداری قەیسەردا"

---

لە تەمەنی پانزە ساڵیدا باوك و دایکی بڕیاریاندا زۆکۆف هەڵنێن و پاڵی پێوەبنێن پشت بە خۆی ببەستێت و بچێت کارێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە... زۆکۆفی لاو ئارەزووی لەوەبوو خۆی بە فێرکردنی ئامێری چاپکردنەوە خەریك بکات، بەڵام باوکی کەسی نەدەناسی لەو بوارەدا کاربکەن لەبەرئەوە دایکی بڕیاریدا بیخاتە بەردەستی برایەکییەوەو لای ئەو برایەی کاربکات.

ئەو برایەی وەختی خۆی هیچی نەبووە لات بوو، بەڵام براکەی بەهۆی هەوڵو ئیشکردنییەوە ئێستا خاوەنی زیاد لە پەنجا هەزار ڕۆبڵی زێڕینە و کارگەیەکی پێستە خۆشکردنی هەیە، هەشت کرێکار و چوار کوڕی نەوجەوان لەو کارگەیەدا کاردەکەن.

زۆکۆف باسی ئەو چاوپێکەوتنەی ئەو خاڵە پیسکەو لە خۆبایی و دڵڕەقەیمان بۆ دەکات دەڵێت"کاتێك باوکی بردی بۆلای خاڵی و ئامۆژگاری کرد بەڕێزو ئەدەبەوە لەبەردەمیدا خۆی بچەمێنێتەوەو پێیبڵێ: ماندونەبیت.. میخائیل

ئەرتیمینیتس"، بەڵام زۆکۆف بەقسەی باوکی نەکردو سڵاوی لێکرد و پێی وت"ماندونەبیت... خاڵە میشا.."

باوکی لێی توورە دەبێت و پێی دەڵێت"ئەوە بە تەواوی لە مێشکتی دەرکە کە ئەو خاڵتە.. ئەو لە ئێستاوە گەورەو خاوەن ئیشەکەتە، خاوەن ئیش حەز ناکەن خزمی هەژارولاتیان هەبێت. پێویستە ئەمە چاك بزانی و لە دڵی خۆتدا لەبەریکەیت و بزانیت".

خاڵەکەشی زۆر بەساردی و هیچ و پووچییەوە و بەسووکی و رووگرژییەوە تەماشا و پێشوازی کردن!! کاتێك هاتنەوە بۆماڵەوە و ئەوەیان بۆ دایکی گێڕایەوە

ـ دایکی وتی"پیاڵە چایەکیشی نەدانێ..؟!!"

ـ باوکم وتی"هەتا وەڵامی سڵاوەکەشی نەداینەوە و نەشی هێشت دابنیشین تۆزێك بحەسێینەوە".

ـ بۆچی ئێمە ئیحتیاجی چای ئەوین..؟

خزم و کورەکەم دەچین بۆ چایخانەو بە عەرەقی نێوچاوانی خۆم دوو چا دەخۆینەوە، ئاوا بەم شێوەیە زۆکۆف ملی رێگا دەگرێت و بەرەو مۆسکۆ دەکەوێتە رێ..

زۆکۆف ئەو ماوەی ژیانەی کە لە مۆسکۆدا بەسەربرد بەم شێوەیە باسی دەکات"ساڵێك بەسەردا تێپەڕی، لەو ماوەیەدا بەباشی هەنگاو ورێگاکانی پیشەی موتابچێتی[3] فێربووم.

گەرچی ئەمە هەروا بە ئاسانی نەبوو، چونکە ئەگەر یەك تۆز هەڵەمان بکردایە خاوەن پیشەکە بەدەستە قورسەکانی بەر زللەو مستەکۆڵەی دەداین، ئای کە دەستی قورس بوو، هەروەها وەستاکان و ژنەکانیش لێیان دەداین خۆ وەستا ژن، ژنی خاوەن پیشەکە لەوان کەمتری لێنەدەداین، ئەویش بەبێ بەزەیی دایدەپلۆستین و لێیدەداین، کاتێکیش خاوەن پیشەکە دڵی ناخۆش و توورەبوایە.. نەدەبوو لەبەرچاو و دەستیدا بووینایە، خۆ ئەگەر لەبەردەستیدا بووینایە بگرە بەو دەستە قورس و زلانەی بەر زللەی دەداین و دەیکوشتین بە درێژایی رۆژ شەقەی زللەکانی لە گوێماندا دەزرنگایەوە.

لەگەڵ ئەو ژیانە ناخۆش و کوێرەوەرییەدا زۆکۆفی لاو ئارەزووی لەسەر خوێندنەوەش بووە، ئەمەکاری نەکردۆتە سەری بۆ ئەوەی واز لە خوێندن و خوێندنەوە بێنێت.

کورە خاڵەکەشی کە لە تەمەنی خۆیدابوو.. ناوی(ئەلکسەندەر)بوو لەوبارەیەوە زۆر یارمەتی دەدا، لەوماوەیەدا، هەندێ ڕۆمانی سەرسورهێنەری شارلوك هۆلمزی خوێندەوە، بەڵام ئەمانە ئارەزووی بۆ زانیاری زیاتر، کەم نەکردەوە، کاتێك ئەو ئارەزووی خوێندن و فێربوونەم بە(ئەلکسەندەر) ڕاگەیاند ئەویش بۆ ئەو مەبەستە هانیدام و پێکەوە دەستمان کرد بە خوێندنی زمانی ڕووسی و بیرکاری و جوگرافیاو پەرتووکە زانیارییە ئاسانەکانی تر، هەر چەند هەموو هەوڵێکی خۆمان خستەگەڕ و فێڵ و پێچ و پەنامان کرد بۆ ئەوەی خاوەن ئیشەکەمان بەم کارەمان نەزانێت. لە کۆتاییدا پێیزانی و دەستەکەمان کەوتەڕوو، من وامدەزانی زۆر بەتوندی تووڕەدەبێت و بەتوندی لێمان دەدات و ئازارمان دەدات و لەسەر کارەکەمان دەرمان دەکات، بەڵام بە پێچەوانەوە، ئافەرینی خۆمان و کارە جوانەکەمانی لێکردین، پاش چوار ساڵ لە ئیشکردن و زوکۆف شارەزاییەکی تەواوی لە کارەکەیدا پەیداکرد. وایلێهات دووکەس لە ژێردەستیدا کاریان دەکرد، خاوەن ئیشەکەش زۆر دەوڵەمەند و چاوچنۆك و ڕژدبوو، وایلێهات بەروبوومی پێستەکانی بۆ شارە گەورەکان دەنارد. ئەمە هەلی بۆ زۆکۆف ڕەخساند بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا چاوی بە ڕووباری(فولگا) بکەوێت، زۆکۆف لەو بارەیەوە دەڵێت"کاتێك چاوم بە گەورەیی و جوانی ڕووباری فۆلگاکەوت، هەرحەپەسام و سەرسامبووم، من تا ئەوکاتە ڕووبارێکم بەو گەورەیی و فراوانییەوە نەدیبوو لە ڕووباری برۆتۆفا(یاخود ڕووباری مۆسکۆ) زیاتر". (ڕووباری مۆسکۆ زۆر تەسکە.. پانییەکەی لە بیست مەتر زیاتر نییە) ئەوە لە بەیانییەکی زوودابوو.. ڕووباری فۆلگا لە ژێر تیشکی خۆرەکەدا دەدرەوشایەوە. منیش لە خۆشیاندا چاوم لێنەدەتروکاند و چاوم تێبڕی بوو، چاوم لەسەر هەڵنەدەبڕی، ئەوەم بیرکەوتەوە و ئێستا تێگەیشتم گۆرانی بێژەکان بۆچی گۆرانی بەسەردا هەڵدەدەن و فۆڵگا دەبەنە ڕیزبەندی دایکانەوە.

لە ساڵی(١٩١١)دا پلەی شاگردی کۆتاییهات و زۆکۆف بووبە(خەلفە) ( ئەو

کاته تەمەنی شانزە ساڵان بوو.. لە مانگێکدا دە ڕۆبڵی مووچە وەردەگرت، ئەو مووچەیەش هەموو کەسێك دەستی نەدەکەوت.

کابرای مووتابچی، خاوەن ئیشەکە زۆرپشتی پێدەبەستم و بروای پێم بوو.. لەدەست پاکیشم دڵنیابوو، لەبەرئەوە زۆرجار دەیناردم بۆ بانك بۆ ئەوەی پارەی بۆ بخەمە بانکەوە، یاخود پارەی بۆ دەربێنم لەو سامانەی لە بانکدا هەیبوو.

هەروەها دەیبردم بۆ نوسینگەی خۆی و لەگەڵ ئیشکردنەکەی خۆم کە پێستە خۆش کردنبوو، داوای لێدەکردم بەروبوومەکە کۆبکەمەوەو ئامادەی بکەم و بەسەر کریارەکاندا دابەشی بکەم، زۆرم پێ خۆشبوو لە نووسینگەکەدا کاربکەم، وەك لەوەی لە کارگەکەدا کاربکەم، چونکە لە وەرشەی کارکردنەکەدا لە جوێن و قسەی ناشیرینی کرێکارەکان زیاتر هیچی ترت نەدەبیست، بەڵام لە نووسینگەکەدا زیاتر تێکەڵاوی کەسانی خوێندەوار و ڕۆشنبیر و تێگەیشتوو دەبووم و زۆر گرنگیان بە بەسەرهات و ڕووداوەکانی سەردەم دەدا.

لە وەرشەی کارکردنەکەدا جگەلە تەنها کەسێ نەبێت کە ڕۆژنامەی دەخوێندەوەو جگەلەویش زیاتر کەسی تر لە سیاسەت نەدەگەیشت، وابزانم حاڵ لە هەموو وەرشەی موتابچیەکاندا هەر بەوجۆرەبوو چونکە ئەم پیشەیە نەقابەی نەبوو.. نەشیان دەهێشت لەو سنووری تێپەڕکەن و بیر لە کۆکردنەوەی برە پارەیەك بکەنەوە بەهەر شێوەیەك بێت بتوانن بۆ سوود و بەرژەوەندی خۆیان لە کارێکدا بەکاری بهێنن.

لەبەر ئەوە کرێکارانی پیشەی پێستە خۆشکەر و فەرۆ و بەرگدرووەکان و کرێکارانی کارگە دەستییە بچووکەکان زۆر جیاوازبوون لە کرێکارانی کارگە گەورەکانی تر لە ڕووی ئەیدیۆلۆجی و لایەنی یەکێتی و یەکگرتنی توندوتۆڵ و بەهێزیان لە ناودانەبوو.

وەك لەناو برولیتاریا ڕاستەقینەکاندا هەبوو، ئالەبەرئەوە ڕێکەوت نەبوو کە بەلشەفی ڕەگ و ڕیشەی خۆی لەناو پرۆلیتاریایەکاندا چەقاند و مەنشەفییەتیش لەناو کرێکارە پیشەییەکاندا بڵاوبۆوە.

ئەو کاتانە هەستی سیاسی هێشتا کەم و دواکەوتووبوو، بەڵام من دەمتوانی ڕۆژنامە شۆڕشگێڕەکانی وەك(ئەستێرە) و(براڤدا) جیابکەمەوە، لەو ڕۆژنامانەی

بۆ بەرژەوەندی سەرمایەدارەکان و گەورە و دەستەڵاتدارەکانی ڕژێمی(قەیسەر)ی دەیانووسی، وەك (وتەی ڕووسیا) و (هەواڵەکانی مۆسکۆ).

کاتێکیش دەڕۆیشتمەوە بۆ گوندەکەی خۆمان و سەردانم دەکردن شتم پێ بوو بۆیان باسبکەم و بۆیان بگێڕمەوە.

## سەرەتای جەنگی جیهانی

سەرەتای دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی جیهانی لە مێشکی مندا هاوکات بوو بەو وێرانکاری و تاڵانکردنەی لە کۆگا بیانییەکانی مۆسکۆدا کرا.

لەژێر ئەو پروپاگەندە زۆرەدا زۆرێکی زۆر لە گەنج و لاوەکان خۆیان بەختکرد و ناونووسی خۆیان بۆ جەنگ نووسی بەتایبەت گەنجە دەوڵەمەندەکان.

لەناو ئەو گەنجانەدا هاوڕێ و کورەخاڵەکەم(ئەلکسەندەر) بوو. منیشی بۆ ناونووسین و چوونە ناوریزی سەربازییەوە بانگهێشت کرد، سەرەتا بیرۆکەیم پێخۆشبوو، بەڵام لە دڵی خۆمدا بریارمدا پرس و ڕا بە(فیودور ئیفانوفێش) بکەم و ڕای وەربگرم، چونکە فیودور گەورەترین ڕێزو کاریگەری لەسەر من هەبوو، پاش ئەوەی ئەو پیاوە گوێی لە قسەکانم گرت، وتی

-"من دەزانم مەبەست و هەڵپەی(ئەلکسەندەر) بۆ چییە..؟

باوکی ئەو دەوڵەمەندە و شایانی ئەوەیە جەنگی لە پێناودا بۆ بکات، ئەی تۆ گێلی بێ مێشك تۆ چیت هەیە تا لە پێناویدا جەنگی لەسەر بکەیت..؟

ڕەنگە تۆ لە پێناو باوکتدا شەربکەیت کە لە مۆسکۆدا بەزۆر دەریان کرد..؟.. یان ڕەنگە لە پێناو ئەو دایکەدا بێت کە ئێستا لە برساندا دەناڵێنێت و خەریکە بمرێت..؟ کاتێك بە پەککەوتەیی و کەم ئەندامی دەگەڕێیتەوە، ئەو کاتە کەس تۆی ناوێت و پێویستی بە تۆ نابێت."، وتەکانی کاری تێکردم و لە ناونووسین بۆ جەنگ پەشیمانی کردمەوە ئەلکسەندەر لەبەرئەوەی هەڵوێستی خۆمم گۆڕی.. دەستیکرد بەجنێوپێدانم، پاشان خۆی چوو بۆ بەرەکانی جەنگ.. پاش

دوومانگ بەبرینداریيەکی سەختەوە گەڕایەوە. ئەوکاتە من هێشتا لە وەرشەکەدا کارمدەکرد، بەکرێ لە ماڵی بێوەژنێکدابووم ناوی(مالیشفا)بوو.

ماڵەکە بەرامبەر ئوتێل(مۆسکۆ)ی ئەوسابوو، لەبری ئەو جێگایەی بۆ منی ئامادەکردبوو، مانگی سێ ڕۆبڵم دەدایە، لە ماڵەکەدا لەگەڵ کچی بێوەژنەکەدا ڕێککەوتین و حەزمان لە یەکتر کرد، کچەکە ناوی(ماریا)بوو، پێکەوە لەسەر هاوسەری لەگەڵ یەکدا پێکهاتین، بەڵام جەنگ کە هەردەم نەریتی بووە، هەموو هیواو ئامانج و پلانێکی پاشەڕۆژمانی تێکدا، لەگەڵ ئەو هەموو زەرەر و زیانەی لە کۆڕی جەنگدا تووشی هاتین، لە ساڵی(١٩١٥)دا لە دایکبوانی ساڵی(١٨٩٥) بۆ سەربازی بانگهێشتکران، ئەو گەنجانەشی هێشتا تەمەنییان نەگەیشتبووە بیست ساڵی ئەوانیشیان بەرەو مەیدانی جەنگ و کوشتار ڕاپێچ کرد، نۆبەی منیش هات، من بەشێوەیەکی تایبەت هەستی گەرم و کەیفم بۆ جەنگ نەبوو، من بڕوام وابوو ئەگەر بچم بۆ سەربازی دەبێت بە شەرەف و دڵسۆزییەوە لە پێناوی ڕووسیادا شەڕ بکەم..!!

---

## بەشی دووەم

خزمەتی سەربازی – خێزان و هەژاری – خوێندنگاو سەرکەوتن – وێژەوشۆڕش – گەنجی و کارکردن – سەرهەڵدانی شیوعیەت – جەنگ و خۆشەویستی

"لە ٧ی ئابی ساڵی ١٩١٥دا بۆ خزمەتی سەربازی بانگهێشتکرام، جەنگی یەکەمی جیهانیش لەوپەڕی گەرمیدابوو.. منیان خستە ناو هێزی سوارەوە، من بەو هاوبەشیەم زۆر دڵخۆش و لەوپەڕی شادیدابووم. چونکە من هەمووکات حەزم لەم جۆرە هێزە ڕۆمانتیکییە بوو.

هەرهەموو هاوڕێکانی ترم بەسەر تیپی پیادەدا دابەشکران، گشتیان بۆ ئەو بەختە باشەم ئیرەییان پێدەبردم.."

لە(مالویار و سلافیتش)ەوە بەشەمەندەفەری بارهەڵگر بەرەو شاری (کالوجا) ڕایان گواستینەوە، لەو سەفەرەدا یەکەم جارمبوو وابە زۆری هەست بە تەنهایی و بێتاقەتی بکەم.

لەو کەسانەی لەو ڕاگواستنەوەیدا لەگەڵمدابوو، هەیانبوو گۆرانی دەووت و هەندێکیشیان بەوەرەقەی قومار، یاری دەکرد، و یەکێکی تر لەو لاوەدەگریا و خەم و کێشەی خۆی بۆ هاوڕێکانی دەردەبڕی و یەکێکی تر بێدەنگ دانیشتبوو ددانی خۆی دەکرۆشت و یەکێکی تر چاوی بڕیبووە شتێك و کەوتبووە خەیاڵەوە

بە قوولّی وەك سەربازێك بیری لە پاشەڕۆژی خۆی دەکردەوە.



منیش دانیشتبووم لە دڵی خۆمدا ئەم پرسیارەم لە خۆم دەکـرد.."ئـایـا تۆ ئامادەی بچیتە ژێر باری ئەم سەربازییە قورس و گرانەوە؟ ئایا ئەگەر شـەڕوپـێـکـدادان ڕوویـــدا و گەرمبوو دەچیتە ناو ئەو شەڕو کوشتارەوە؟"

من ژیانی پێشوترم قاڵی کردبووم و لەسەر ناخۆشی ڕاهاتبووم، لەبەر ئەوە من بڕوام وابوو لە داهاتوودا پێویستی سەرشانم وەك سەربازێك بەو پەڕی شەرەفەوە جێبەجێ بکەم.

لە ناو یەکەم ڕیزی تابوری سەربازەکاندا یەکێك لە سەربازەکان پرسی..: "بۆ کوێمان دەبەن؟" سەربازە عەریفەکەمان مرۆڤێکی زۆر باشبوو.. وەڵامیدایەوە.. وتی

-"کوڕینە من ئامۆژگارییەکتان دەکەم.. ئەم ئامۆژگارییەم لێوەربگرن، ئەم جۆرە پرسیارانە لە سەرکردایەتی مەکەن سەرباز دەبێت گوێرایەڵ بێت چ فەرمانێکی بەسەردا بدرێت بێ چەندوچوون دەبێت جێبەجێی بکات، چونکە سەرکردایەتی خۆی دەزانێت سەرباز بۆ کوێ دەنێرێت، لەم کاتەدا دەنگی

سەرکردەکەمان بەرزبۆوە.. وتی..
-"قسەکردن بە هەموو شێوەیەك قەدەغەیە.."
هاورێ نوێیەکەم(سیفتیسوف) لە تەنیشتمەوە سیخورمەیەکی تێوەژەندم بەچرپە.. وتی"وائێستا خزمەتی سەربازی دەستی پێکرد..!! لەو کاتەدا زابت سەف و سەرکردەی تیپە سەربازییەکەمان خۆی پێناساندین .. وتی
-"من سەرکردەی تیپەکەی ئێوەم.. ناوم مساعد مالیافکۆیە. هیوادارم ئەوەی سەرکردەی یەکەکەی ئێمە بۆی باسکردن بەباشی تێگەیشتبێتن.
لەبەرئەوە دەبێت لە دوارۆژدا بۆ خزمەتکردنی قەیسەر و نیشتمان دڵسۆز و گوێڕایەڵ بن.
من ناتوانم لە پەیڕەوکردنی یاساو ڕێساو زەبت و ڕەبت دەربچم".
"ڕۆژی یەکەم لەسەر دڵودەروونمدا زۆر ناخۆش و گرانبوو، ڕۆژلـەدوا ڕۆژبەوشێوەیە ناخۆش و بێزاری بوو، هاتنەناو ڕیزی سەربازییەوە شتێکی قورس و گرانبوو، بەڵام ئەو ژیانە ناخۆشەی لەمەوپێش ئێمەی تێدابووین وایلێکردین لە ماوەی دووهەفتەدا زۆربەی زۆرمان لەگەڵ ئەو ژیانەدا ڕابێین".
لە (ئەیلولی ساڵی ١٩١٥)دا ڕایانگواستینەوە بۆ (ئۆکرانیا) بۆ ئەوەی بچینە ناو تیپی پێنجەمی سـوارەی یەدەکییەوە کە سەربازگەکەیان لە پارێزگای(خارکۆف)بوو.
خزمەتکردن لە ڕیزی سوارەدا زۆرخۆشتربوو وەك لەوەی لە ڕیزی پیادەدا خزمەت بکەیت، بەڵام زۆر قورس و گرانبوو، بەپێچەوانەی ئەو فێربوونە گشتییەی دەکرا، دەبوو مەشقیش لەسەر سوارچاکی بکرایە و زۆر بەباشی فێری بەکارهێنانی چەکی شەڕی دەستەویەخە ببین واتە بەکارهێنانی قەمەو خەنجەر و زۆرشتی تر، پیادەکان لە سەعات شەشدا لە خەو هەڵدەسان، بەڵام ئێمە دەبوایە لە کاتژمێری پێنجدا لە خەو هەڵبساینایە و خۆمان ئامادەبکردایە. دەشبوو لەگەڵ ئەوانیشدا لە هەمانکاتدا کە دەنووستن ئێمەش وەك ئەوان لەو کاتەدا بنووستیناینە، سواربوونی ئەسپیش گرانترین مەشق و ڕاهێنان بوو، زۆرێکی زۆر لە سەربازەکانمان لەو پێناوەدا بریندارەبوون و خوێنیان دەڕژا نەشدەبوو بێزاری

و نارەزایی دەربڕن، تەنها ئەوەندەیان پێدەوتین"قۆزاقێکان خۆڕاگرین و سەبرتان هەبێت".

زۆرێکی زۆر خۆیان ڕاگرت و سەبریان کرد تا وڵاخەکانیان ڕاهاتن و ملیان بۆ دان، سەرکردەی تیپەکەمان.. یاریدەدەر دوراکۆف بوو، لەگەڵ ئەو نازناوەی هەیبوو(دوراکۆف) لە زمانی ڕووسیدا وشەی، گێل دەگەیەنێت.."

مرۆڤێکی زیرەك و باشبوو، سەرکردەیەکی توندوتوورەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەهیچ جۆرێك سووکایەتی بە سەربازەکان نەدەکرد، بەڵام یاریدەدەرەکەی بە پێچەوانەی ئەمەوەبوو، ئینسانێکی تووڕەوترۆ و بێ ئوسووڵ بوو.

سەربازە کۆنەکان، ئەوانەی پێش ئێمەڵەوێ بوون، دەیانگێڕایەوە دەیانوت، ئەم کابرایە ئەوەندەی لەسەربازەکان دەدا، ددانی زۆرێکی زۆری سەربازەکانی شکاندبوو.

جارێکیان کەمینمان[٤] بۆدانا تا لە سووچێکی چۆڵدا خستمانە داوەوە، خێمەکەیمان بە سەردا ڕماند و دامانپۆشی تاکەسمان نەبینێ بەلەقەو کۆڵە مستە کەوتینە وێزەی تاتوانیمان لێماندا و شلوکوتمان کرد، دوای ئەوە ئێمە چاوەڕوانی ئەوەبوین هەر هەمووومان بە کۆمەڵ بدرێین بە دادگای سەربازی و دادگایی بکرێین، بەڵام کاتێك دوراکۆف هاتەوە بۆ بنکەی سەرکردایەتی یەکەی و بەمەسەلەکەی زانی.

کارەکەی چارەسەرکرد و یاریدەدەرەکەی بۆ شوێنێکی تر دوورخستەوە. لەبەهاری ساڵی(١٩١٦)دا ئێمە مەشقی سەربازی خۆمان تەواوکرد پێیانراگەیاندین کە تیپێکی سوارەی شەرکەرمان لێپێکدێنن و دەمانێرن بۆ کۆری جەنگ.

لە شوێنی ئێمە سەربازی نوێی لە دایکبووی ساڵی(١٨٩٧) یان دانا، لەناو ئەو هەمووو سەربازە شارەزاو مەشق پێکراوانەدا(٣٠)سی کەسیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی بیانکەن بەزابت سەف(نائب زابت) من یەکێك بووم لەو ٣٠ کەسە..".

من حەزم نەدەکرد بچمە ناو ئەو کۆمەڵە فێرکەرەوە، بەڵام لەسەر ویست و ئارەزووی سەرکردەی تیپەکەمان ڕازی بووم، چونکە من لە ئاستیدا هەستم بەڕێزو ژیری و ئەخلاق پاکی و خۆشەویستی بۆ سەربازەکان دەکرد.

-خۆشەویستم زۆکۆف تۆ هێشتا لە پێشتدا ماوەت زۆرماوە تا بچیت بۆ کۆڕی جەنگ، پێویستە تۆ لە پێشدا زانیاری سەربازی زیاتر بە شێوەی قوڵتر فێر ببیت، لە پاشەڕۆژدا سوود لەوەدەبینیت، من لەوباوەڕەدام و دڵنیام تۆ دەبیتە نائب زابتێکی باش و سەرکەوتوو، پاشان تۆزێك ڕاماو وتی...

-"بۆ نموونە من هیچ پەلەم نییە بچم بۆ کۆڕی جەنگ".

ماوەی ساڵێك من لە هێڵەکانی پێشەوەی جەنگدابووم، چاك بارودۆخەکە گەیشتم و زۆرشت فێربووم، بەداخەوە زۆر بەداخەوە میللەتەکەی ئێمە بەو شێوەیە بمرێت، من ئێستا لەوە دەپرسم.. لە پێناوی چیدا میللەت بمرێت و لەناوبچێت..؟ لە کاتی مەشقکردن و فێرکردنی تیپەکەدا ئەو نائب زابتەی مەشقی سەربازی پێدەکردین، کەسێك بوو لەوپەڕی خراپی و تووڕەیی و هیچ و پووچیدابوو.

لەبەر ئەو خراپی و هیچ و پووچییەی سەربازەکان ناویان نابوو(چوارپێ و نیو..)، بەتایبەت منی خۆشنەدەویست و زۆر ئازاری دەدام و دەیچەوساندمەوە، بەهەرحاڵ نەیدەوێرا لە ئاستمدا دەستم بۆ بەرز بکاتەوەو لێم بدات، من دەمزانی ئەو چەوساندنەوەو خراپەکارییەی بەرامبەر منی دەکرد، نیشانەی بەغیلی و دواکەوتن و بێ مێشکی و دەروونێکی پیس و چەپەڵ و بەدڕەوشتی بوو، بەڵام من خۆم بە شارەزاو بەختیارو سەربەرزدەزانی، چونکە نەیدەتوانی لەکاتی وانە خوێندندا ڕووبەڕووم بوەستێت و بەرەنگاریم بکات.

کاتێك تێگەیشت ناتوانێت بە توندوتیژی بەسەرمدا زاڵ بێت، وسەرکەوتوو نەبوو، لەئاستمدا تەکنیکی خۆی گۆڕی.. ڕۆژێکی یەکشەممە بانگی کردمە ناو خێمەکەی خۆیەوە و پێی وتم...

-"من دەزانم تۆ گەنجێکی خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز و بەتوانا و ڕۆشنبیری و توانای فێربوونی زانیاری چاکت هەیە، بەڵام تۆ کەسێکی مۆسکۆیی و کرێکاریت، چ پێویست دەکات خۆت بە فێرکردنی وانەی سەربازییەوە خەریك بکەیت، من تۆ دێنمەلای خۆم دەتکەم بە نووسەری تایبەتی خۆم، تەقریریی مەشقکردن و ڕەوشتی سەربازەکانم بۆ بنووسە". وەڵاممدایەوە"من بۆ ئەوە نەهاتوومەتە

ناوتیپی زانست و زانیاری سەربازییەوە تاکوببم بەنووسەر، بەڵکو بۆیە هاتووم تاکو وانەی زانستی سەربازی بەدووورودرێژی فێرببم و ببم بەنایب زابت (چوار پێ و نیو) قینی هەستاو توورەبوو، بە هەرەشەکردنەوە، وتی...

-"باشە ڕۆژانمان لە پێشەوەیە، دەبینیت چۆن هەموو هەوڵێکی خۆم دەخەمە گەڕ تاکو نەهێڵم ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێت بە نایب زابت کاتێ تاقیکردنەوە(ئەزموون) نزیك بۆوە." هەر هەموو برادەرانی دەورەکەم گومانیان لەوەنەبوو من یەکەمی دەورەکەدەبم و لە پاداشتی ئەوەی یەکەمی دەورەکەم پلەی زابت سەفم پێدەدرێت و دەبم بە زابت". دەرچووەکانی تریش پلەی نائب زابتیان دەدرێتێ، بەڵام بۆچوون و گومانی هەموان ناراست و بێ ئومێددەرچوو.

کاکی(چوار پێ و نیو) بەڵینەکەی خۆی بردەسەر، پێش دووهەفتە لە تاقیکردنەوە لەبەردەم تیپەکەدا.. لەبەر بەدرەوشتیم و ڕێزنەگرتنی ڕاستەوخۆم لەسەرکردایەتی، بڕیاری دەرکردنی منی لە تیپەکەدا بڵاوی کردەوە، بەڵام(ڕێکەوت) تەنها ڕێکەوت دەستی کێشا و وەزعەکەی چارەسەرکرد و ڕاستی کردەوە.

لە ناو تیپەکەماندا سەربازێکی خۆبەخشی تێدابوو، مەسەلەکەی گەیاندە لای ئەفسەری سەرکردەی قوتابخانەکەمان و کێشەکەی بۆ ڕوونکردەوە، بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان بانگی کردم و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردم، حەقیدا بە من و بڕیاری دەرکردنەکەمی هەڵوەشاندەوە وتی.. بڕۆرەوە بۆ ناو ڕێزی پۆلەکەت و خۆت بۆ تاقیکردنەوە ئامادەبکە، بەڵام یەکەمی نەبوو بە نسیبی من بەڵکو بوو بەنسیبی ئەو سەربازەی کارەکەی بۆ کردم، منیش بەپلەی نایب زابت وەك سەربازەکانی تر دەرچووم.

من ئێستا ئەو تیپە فێرخوازییەی لەو لەشکرەکۆنەدا بۆ نایب زابتی دەستنیشان کرا، هەڵدەسەنگێنم و دەڵێم..! ئاستی فێرکردن بەشێوەیەکی گشتی لە بارێکی زۆرباش و پێشکەوتوودابوو، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بە پێکهاتەوەبوو. چونکە هەر هەموو دەرچوان زۆر بە چاکی سوارچاکی دەزانی و بە چاکی دەیانتوانی چەك بەکاربهێنن و شێوازی ڕاهێنان و ئامادەکردنی جەنگاوەری باشیان هەبوو.

ئەوە کارێکی ڕێکەوت نەبوو کە زۆربەی زۆری ئەو نایب زابتە کۆنانە لە شۆڕشی

تشرینی یەکەمدا بوون بە باشترین و چاکترین سەرکردەی لەشکری سوور.

دەربارەی پەروەردە و فێرکردن توندوتیژی بناغەیە، ئەو فێرخوازانەی لە تیپی نایب زابتیدا مەشقیان دەکرد لەگەڵ سەربازەکاندا لەسەر هەڵسوکەوتی مرۆڤایەتی ڕانەهێنرابوون و لەسەرچوونە ناوناخی سەربازێتییەوە فێرنەکرابوون. بەڵکو یەکەم ئامانجیان پێگەیاندن و گوێڕایەڵبوونی سەربازەکان بوو بۆ جێبەجێ کردنی فەرمان و کارەکانیان بە شێوەیەکی کوێرانە، زەبت و ڕەبتی سەربازی لەسەر توندوتیژی دامەزراوە. گەرچی لە بەندەکانی سەربازیدا سزای جەستەیی قەدەغەیە و حەڵاڵ نەکراوە و ئازاردانی تێدا نییە، بەڵام ئەم جۆرە سزایانە بە شێوەیەکی بەرفراوان لە ناو سەربازاندا هەبوو..!!

---

زۆرشت لەسەر لەشکری ڕووسی نوسراوە، بەڵام من دەمەوێت لێرەدا تەنها لەسەر چەند خاڵێکی گرنگ هەڵوێستە بکەم، ئەو دیاردانە چی بوون کە لەناو لەشکری(قەیسەر)ی کۆندا هەبوون و جیایان دەکردنەوە..؟

یەکەم شت ئەوەبوو یەکێتی یاخود یەکگرتن لە نێوان جەماوەری سەربازان و لە نێوان گەورە ئەفسەراندا نەبوو، لەسەر ئەوەشەوە نەزانی لە ڕووی تەکتیك و بەڕێوەبردنی عەمەلیاتی سەربازی لەناو جەنەراڵ و گەورە ئەفسەراندا بڵاوببۆوە، چەند حاڵەتێکی تاکەکەسی نەبێت، ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئەو سەرکردانە لەناو سەربازەکاندا بێزراو ڕێزو گەورەییان نەمێنێت، بەڵام ئەو ئەفسەرانەی پلەیان ناوەندی بوو زۆربەی زۆریان، بە تایبەت پێش کۆتایی هێنانی جەنگ بەڕۆح و دڵ و دەروون و ئارەزوویانەوە لەسەربازەکانەوە نزیکبوون.

سەربازەکانیش بەرامبەر ئەوسەرکردانەیان هەستی خۆشەویستی و باوەڕکردن و دڵگەرمی و گوێڕایەڵییان بۆ فەرمانەکانیان هەبوو، لە فەرمانیان دەرنەدەچوون، هەردەم ئامادەبوون بە فەرمانی ئەوان خۆیان فڕێدەنە ناو ئاووئاگرەوە.

پێویستە ئەوە بڵێم ئەفسەری یەکە سەربازییەکان هەرهەموویان بە تەواوی

بۆ فێرکردن و پەروەردەکردنی سەربازەکانیان پشتیان بەو زابت سەفانە بەستبوو، بێگومان ئەم بڕواپێکردنەبوو بە هۆی پێگەیاندنی ڕۆحی سەربەستی و بەرپرسیارێتی خستنەسەر شانیان. بەپێی ئەزموونی ئەو چەند ساڵە دووردرێژەی هەمە ئەوەیە هەر کاتێك بڕوات بەسەرکردە بچووکەکان نەمێنێت و بەردەوام لەلایەن ئەفسەرە گەورەکانەوە ئامۆژگاری و سەرکوت بکرێن ناتوانرێت بە هیچ شێوەیەك لە ئاستێکی بچووکیشدا سەرکردایەتییەکی ڕاستەقینە پێکبهێنرێت، لەسەر ئەوەشەوە ناتوانرێت بە هیچ جۆرێك ناتوانرێت بەهیچ جۆرێك پێکهاتەیەکی باش و دروست پێکبهێنرێت لەسەرەتای مانگی ئابدا لەسەرکردایەتی لیواوە فەرمان هات بەدابەشکردنی دەرچوانی تیپەکە بەسەر سرییەکاندا، بۆ پانزە(١٥) کەسمان فەرمان دەرچوو یەکسەر بەرەو کۆڕی جەنگ بڕۆن و پەیوەندی بەتیپی سوارەی دەیەمەوە بکەن، لەناو ئەو جەنگاوەرانەدا من دووەم کەسبووم.

ئەوەم لاسەیرنەبوو، چونکە دەمزانی(چوارپێ ونیو) لەم کارەدا دەستی هەیە، بەرێزێکی درێژکەوتینەرێ، لە بەیانیدا فڕۆکەیەکی کەشفکردنی دوژمن شوێنەکەمانی بۆمباباران کرد، خێرا بە ئاماژەی ئاگادارکردنەوە لەو هێرشە ئاسمانییە ئاگادار کراینەوە، ئێمەش چۆنمان بۆ ڕێکەوت هەریەکەمان لە شوێنێکدا خۆمان شاردەوە، فڕۆکەکەی دوژمن بەسەرماندا خولی خوارد و پاشان بەرەوباشوور ملی ناو هەندێ بۆمبی بچووکی بەسەردا داباراین، لەئەنجامی ئەو هێرشەدا سەربازێکمان بەقورس بەرکەوت و پێنج ولاغیش بەرکەوتن، ئەمە بۆ ئێمە یەکەم دەرسی شەڕکردن بوو.

لە (تشرینی یەکەمی ساڵی١٩١٦)دا لە کاتێکدا لەگەڵ دووهاوڕێمدا لە گەڕان و پشکنینداببووین، کەوتین بەسەر مینێکدا و مینەکە تەقییەوە، دووبرادەرەکەم بەرکەوتن و منیش لەسەر پشتی ئەسپەکەم بەردایەوە، پاش یەك ڕۆژی تەواو ئینجا لە خەستەخانە هاتمەوە هۆش خۆم، پاشان بۆ چاکبوونەوە ڕەوانەی شاری(خارکۆف)یان کردم، لەوێدا سەرانسەر مانگی تشرینی یەکەم مامەوە.

لە سرییەکەوە وەك سەربازێکی لاو و لێهاتوو گوێزرامەوە بۆ تیپی فێرکردن، دوای ئەوە بەزابتی و ئەزموونێکی مەیدانی و بەمەدالییایەکی سەلیبی

جیورجییەوە گەڕامەوە، چونکە توانیم لە کاتی شەڕو کوشتاردا ئەفسەرێکی ئەڵمانی دەسگیربکەم و لەکاتی شەڕدا بریندارببم.

لەکاتی گفتوگۆ و قسەکردنمدا لەگەڵ سەربازەکاندا تێگەیشتم ئەو سەربازانە مەیلیان بەشەڕکردن و بۆنکردنی بارود نییە. لەگەڵ ئەوەی من ئەفسەریش بووم، سەربازەکان بڕوایان پێم بوو لە زۆر کاردا بەگەرمی گفتوگۆ و چەنەحانێیان لەگەڵدا دەکردم، بێگومان ئەوکاتانە من لە ڕووی تێگەیشتنی کێشەی سیاسییەوە تێگەیشتن و ئەزموونم کەم بوو.

بەهەرحاڵ من لەوە دڵنیابووم، تەنها بەلشەفێکان و لەوان زیاتر کەسانی ترناتوانن ئاشتی و خاك و سەربەستی بۆ گەلی ڕووس دەستەبەر بکەن، من تەنها بەپێی توانا توانیم ئەوەندە لەناو سەربازەکانمدا بڵاوبکەمەوە سەربازەکانیشم پاداشیاندامەوە ئەویش بەوەی، نەمانزانی بۆچی و لەبەرچی لە بەیانییەکی زوودا حاڵەتی نائاسایی کتوپڕ لەناو سرییەکەدا بڵاوکرایەوە.

مولازم(کییفسکی) سەرکردەی تیپەکەم بینی.. لێم پرسی:

ـ بەڕێز بۆچی کۆماندەکەنەوە..؟

ئەویش پرسیارەکەی منی بە پرسیارێك وەڵامدایەوە.

ـ ئەی تۆ.. چۆن تێدەگەیت..؟

ـ وتم"دەبێت سەربازەکان بزانن بۆکوێ ڕاپێچیان دەکەن بە تایبەتیش کە چەك و فیشەکیان بەسەردا دابەشکراوە".

ـ قەیناکە سوود لەو چەك و زەخیرەیە وەردەگرین، بە هاتنی سەرکردەی هێزەکەمان(بارون فون دیرجولتس) قسەکەمان بڕی، سەرکردەی هێزەکەمان زۆرێکی زۆری مەدالیا و ویسامی لێهاتوویی و شارەزایی سەربازی پێبەخشرابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەناو سەربازەکاندا دەبوغزێنراو خۆشەویست نەبوو.

سەرکردەی کەتیبەکەمان فەرمانیدا سێ سێ ڕیزبین و بەرەو شاری(بلاکل) کە بارەگای سەرکردایەتی لیوای سوارەی پێنجەمی یەدەکی لێبوو، بکەوینەڕێ.

کاتێك گەیشتینە ئەوێ بینیمان پێش ئێمە هێزی سەربازی تری گەیشتووبوویە. خێرا(بارون فون دیر جولتس) خۆی کرد بەناو بینای سەرکردایەتیدا، هەردوای ئەو

بە گورجی سەرکردەی کەتیبەکانی تر خۆیان کرد بەژووردا.
کەس نەیدەزانی مەسەلە چییە و بۆچییە؟!!
بەڵام گورج بە زوویی هەموو شتێك ئاشکرابوو...
خۆپیشاندان دەرکەوت، ئاڵای سووریان بەرزکردبۆوە، لە بینای سەرکردایەتی سەربازییەوە، کەسێکی باڵابەرز هاتەدەرەوە، بە دەنگێکی بەرزو ئاشکرا، هاواری کرد.
ـ چینی کرێکاران و سەربازان و جوتیارانی وڵاتەکەمان، لە مرۆبەدواوە ددان نانێین بە(قەیسەر نیکولای دووەم) بە پاشای وڵات و بەسەرمایەدارەکان و دەرەبەگەکاندا.. گەلی رووسی جەنگی خوێناوی ئیستیعماری ناوێت و شەڕناکات گەل پێویستی بە ئاشتی و ئازادی و خاك هەیە.
قسەکەری سەربازییەکە وتارەکەی بە چەند دروشمێك کۆتایی پێهێنا..
ـ برۆخێ قەیسەرییەت.. بروخێ جەنگ.. بژی ئاشتی لە ناو گەلاندا، بژی سۆڤیاتی نوێنەری کرێکاران و سەربازان.
(وشەی(سۆڤیت) بە زمانی ڕووسی مانای(ئەنجومەنی شۆڕشگێڕان) دەگەیەنێت..).
بەبێ ئەوەی هیچ فەرمانێك بدرێت بەسەربازەکان، بەوهەستە شۆڕشگێڕییەی هەیانبوو، هەستیانکرد دەبێت ئەوانیش هاوکاربن و تێکەڵاوی خۆپیشاندەران بوون، دەستیان کرد بە هوتاف کێشان.
پاشان دەستیان کرد بە پێکهێنانی(سوڤیتاتی سەربازی) لەناو تیپەکاندا، منیشیان بە سەرۆکی(سوڤیتی سرییەکە) هەڵبژارد، بارون فون دیرجولتس و هەندێ لەسەرکردەکانی تر ئەوانەی خەتەرییان بۆ شۆڕش هەبوو دەسگیرکرد.
من و مولازم کیفسکی یان بۆ ئەندامی سوڤیتی کەتیبەکە بەرزکردەوە و تێیدا بووین بە ئەندام.
دوای ئەوە فەرمانم دەرکرد بە تەسریح کردنی سەربازەکان، دوای ئەوەی چەك و زەخیرەی سەربازیم بەسەردا دابەشکردن خۆشم ماوەیەك لە(بلاکل) خۆم حەشارداو خۆم دەرنەخست.

---

له مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٧دا گەرامەوە بۆ گوندەکەی خۆمان، لە مانگی ئابی ساڵی١٩١٨دا توانیم ئەو ئارەزووەی هەمبوو بە چوونەناو ریزەکانی لەشکری سوورەوە، بهێنمەدی خۆم لە لیوای سوارەی چوارەمی سەربازیدا کەسەر بە سوارچاکانی یەکەمی مۆسکۆبوو، ناونووسکرد و خۆم خۆبەخش کرد.

سەرەتا لەشکری سوور تەنها لە خۆبەخشەکان پێکدەهێنرا، پاشان حوکومەتی سۆڤێتی بریاری دەرکرد، مەشق بە هەموو کرێکارێك کە تەمەنیان لە(١٨) ساڵ تا (٤٠)ساڵ بکرێت و لە ژێر داواکاری و ئامادەباشی دابن.

کاتێك من چوومە ناو لەشکری سوورەوە، ژمارەیان ئەوکاتە گەیشتبووە نیو ملیۆن سەرباز.

ساڵی(١٩١٨)ساڵێکی یەکلاییکەرەوە بوو لە مێژووی شۆرشدا حیزبی بەلشەفی بەو پەلهاویشتن و بریارە سەربازییە زۆرانەو بەو هەوڵ وتێکۆشانە کردەوەییە بەر فراوان و گەورەیەی کردی هێزی چەکداری سۆڤێتی پێکهێنا.

---

# بەشی سێیەم

## (هاوکاریکردن لە جەنگی ناوخۆییدا)
## دژایەتی شۆڕش- جەنگی ناوخۆ- دوژمنایەتی چەکداری-حیزب و میللەت و سوپا- سەرکەوتنی شۆڕش

حکومەتی قەیسەری وڵاتی بەرەو نابوودی و وێرانکارییەکی. تەواوبردبوو. پاشان بارودۆخەکە زۆرلەوە خراپتربوو. بەدەست تێوەردان و دەست بەسەردا گرتنی هێزە داگیرکەرە بیانییەکان و پاسدارانی هەڵگەڕاوەی سپییەکان بەسەر ناوچە ئابوورییە گرنگەکاندا.

لە ناوەڕاستی ساڵەکانی(١٩١٨)دا هێزەکانی پاسەوانە سپی و داگیرکەرە بیانییەکان ژمارەیان گەیشتبووە نزیکەی ملیۆنێك سەرباز و ئەفسەر، لەبارەی مەشق و پڕچەکییەوە لە ئاستێکی پێشکەوتوو هاوچەرخدا بوون.

بۆ ئەوەی ئێمە تێبگەین چۆن لەشکری سووری سۆڤێتی توانی شکست بەو دوژمنە بێنێت کە لە رووی مەشق و پڕچەکییەوە زۆر سەرکەوتوترو پڕچەکتربوو.

دەبێت ئەو ڕۆحییەتە نیشتمانییە هەڵچووەو سیفەتە ناوازە مەعنەوی و سیاسییە رەچاوبکەین کە لە ناو هێزەکانی کرێکاران و جوتیاراندا هەبوو. ئەوانەی بەرگرییان لەسەربەستی و ئازادی وڵاتە ئیشتراکییە نوێیەکەیان دەکرد.

له بەهاری ساڵی(١٩١٩)دا داگیرکەرە ئیستعمارییەکان هەموو پێکەوە هەڵمەتێکیان سازکرد، دژی دەستەڵاتدارانی سۆڤێتی. لەوهەڵمەتەدا، هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو فەرەنساو بەریتانیا و یابان و ئیتاڵیا و چیکۆسلۆفاکیا و ژمارەیەکی زۆری دەوڵەتانی تری تێدابوو.

لەو کاتەدا هێزەکانی لەشکری سووری سۆڤێتی ژمارەیان دوومليۆن و هەشت سەد هەزار سەربازبوو.

لەبەرنەبوونی پێداویستی و هێزی کارکەر-کرێکار- زۆربەی زۆری کارگەو فابریقەکان لە کارکەوتبوون.

لەبەرئەوە کێشەی ناردن و فریاکەوتنی چەك و زەخیرە بۆ لەشکری سوور کێشەیەك بوو لەوپەڕی گرانی و نەهامەتیدابوو.

زۆرجار نەدەتوانرا پێداویستی و زەخیرە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر بنێرێت. کە لەو ناوچەیەدا درا ڕۆژی وڵات و دەستنیشان دەکرا"لەیەکی مانگی ئازاری ١٩١٩دا لە حیزبی شیوعی ڕووسیدا بەلشەفی بە ئەندام وەرگیرام، لەو بەرواره بەدواوەشتم بیرچۆتەوە و لە بیرمدا نەماوە، بەڵام ئەو ڕۆژەی تێیدابووم بە ئەندامی حیزب و بە ئەندام حیزب وەرگیرام، بەدرێژایی تەمەنم بیرم ناچێتەوەو لەمێشکمدا ماوەتەوە، ئیتر لەوکاتەوە هەموو هەوڵ و بیرو ئاوات و کارەکانم بۆ کارەکانی حیزب تەرخانکرد.

کاتێکیش کارگەیشتە ئەوەی دژ بە دوژمنانی نیشتمان بچێتە کۆڕی جەنگەوە. من گشت کات ئەو داواکارییەی حیزبم بیردەکەوتەوە کەداوای لە ئەندامەکانی دەکرد ببنە پێشرەو لە پێناوی میللەتدا خۆمان بەخت بکەین".

زۆکۆف لە زۆر کۆڕی شەڕوپێکدادانەدا هاوبەشی کردووە، هەتا جارێك لە شەڕێکدا بە پارچە بۆمبێکی دەستی پەراسووی چەپ و قاچی چەپی بریندار دەبێت، لەبەرئەو برینداریيە دەیگوێزنەوە بۆ خەستەخانەو پاش چاکبوونەوە، دوای مانگێك پشوو، دەگەڕێتەوە بۆ سەرکردایەتیەکەی خۆی و داوادەکات گورج بینێرنەوە بۆ ناو کۆڕی جەنگ، بەڵام فەرمانی بۆ دەردەچێت بە شێوەیەکی کاتی پەیوەندی بەهێزی یەدەکییەوە بکات، هەتا ئەوکاتەی لە (کانونی دووەمی

ساڵی ١٩٢٠)دا لە خوێندنگای(سەرکردەی سوور)ی پارێزگای(دیزانسك) خوێندن دەستپێکرد.

لەو خوێندنگایەدا ئاستی فێرکردن بۆ فێرخوازەکان لە ئاستێکی باشدانەبوو، چونکە لەو خوێندنگایەدا بە زۆری خوێندکار لەو کرێکار و جوتیارانە هەڵدەبژێردرا کە پێش شۆرش ئاستی خوێندەوارییان زۆر نزمبوو، بەڵام من پێویستە شاهیدی ئەوەیان بۆ بدەم، خوێندکاران لە خوێندندا زۆر دڵگەرم و پەرۆشبوون بۆ خوێندنەکەیان.

هەستیان بەکەمی ماوەی خوێندن و زۆری بەرنامەکە دەکرد، و هەستیان بەو بەرپرسیارێتییە گەورەو ترسناکە دەکرد کە وەك سەرکردەیەکی سوور دەکەوتە سەر شانیان.

ماوەی دەورەی خوێندنەکە لە مۆسکۆدا کۆتایی پێهێنراو منیش زۆرێکی زۆر هاورێ و برادەرم هەبوو، ئارەزووم دەکرد پێش ئەوەی بچم بۆ مەیدانی جەنگ بیانبینم.

بەتایبەتی جەختم لەسەرئەوەبوو حەزم دەکرد ئەو کچە ببینم کە دڵە ناسك و لاوەکەم لە پێناویدا زۆر ناخۆش و ئازاری چەشت و پەرۆشی بینینی بووم، بەڵام بەداخەوە نەمتوانی سەردانی کەس بکەم.

چونکە زۆرجار سەرکردەکان ناچاردەبوون لە پێناو جێبەجێکردنی کاروفەرمانی گرنگدا نەتوانن کەس ببینن و سەردانی خزم و برادەربکەن، منیش چونکە بەرێوەبەرو سەرۆکی دەورەکەبووم، داویان لێکردم کاری سەرکردەیی بگرمە ئەستۆ.

لەبەرئەوە ناچاربووم تەنها نامەم بۆ دۆست و برادەرانم ڕەوانەکرد. ئیتر نازانم ئەم هۆیەبوو یا هۆیەکی تربوو، بوو بەهۆی لەیەکدابرانمان و دەسگیرانیمان هەڵبوەشێتەوە. پاشان زانیم(ماریا) شووی کردووەو ئیتر لەوکاتەوە بەهیچ جۆرێك چاومان بەیەکتر نەکەوتەوە.

بیرمە کۆمیساری کەتیبەکەمان سەردانی سرییەکەمانی کرد پێشنیازی بۆ کردین چەند ڕۆژێك بچین ئەو خانووە ڕووخاوانەی هی جوتیارە هەژار و خێزانەکانی سەربازانی لەشکری سوورن چاك بکەینەوە و بۆیان نۆژەن بکەینەوە، ئێمەش

پێشنیازەکەیمان پێخۆشبوو بە پیر پێشنیازەکەیەوە چووین.

کۆمیسارەکە خۆی قورسترین کاری خستە سەرشانی خۆی، ئەویش ئەوەبوو هەستا بە پاککردنەوەی بیرە گشتییەکەی گوندەکە، کە کۆمەڵێ پاسدارانی سپی بەپیسی و خاشاك پڕیانکردبۆوە.

کاتێك کۆمیسارەکە چووە ناو بیرەکەوە، بیرەکە ئەوەندە قووڵبوو ئەگەر سەربازەکان فریای نەکەوتنایە لەناو بیرەکەدا دەخنکا.

کاتێك هێنایانە دەرەوە هەناسە بڕکێی پێکەوتبوو، پاش تۆزێك فەرمانیدا دایبکێشتەوە ناو بیرەکە، هەمدیسان بە هانایەوەچوون و ئەمجارەش دەریانهێنایەوە، کۆڵینەدا بەو شێوەیە وازینەهێنا هەتا بە تەواوی لەکۆتاییدا بیرەکەی خاوێن کردەوە. شەوێ هەرچی لە دێیەکەدابوو باسی ئازایی و لە خۆبوردوویی و پیاوەتی کۆمیسارەکەیان دەکرد.

ئەو کارەمان لە کاری سەیرو پێکەنیناوی بەدەرنەبوو، کۆمەڵێ لە هاوڕێیان داوایان لێکرا بچن تەویلەی بێوەژنێکی هەژار پاك بکەنەوە، برادەران دوای چاککردنەوەی تەویلەکە گەڕانەوە بۆ لامان، دوایی زانیمان لە جیاتی ئەوەی تەویلەی بێوەژنە هەژارەکە چاك بکەنەوە، چووبوون تەویلەی خێزانێکی دەوڵەمەندیان چاك کردبۆوە.

ئەو خێزانە هەمان ناوی بێوەژنە هەژارەکەیان هەبوو، لە کۆتایی ئەم بەشەی پڕە لەو یادەوەرییە شەڕانەی زۆکۆف هاوکاری تێدا کردبوو دژی داگیرکەرە بیانییەکان و هێزەکانی پاسدارانی سپی و شەقاوەکانی دەربەگ و ئاغاکان. مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت...

"ساڵانێکی زۆر تێپەڕی و زۆرێکی زۆری لاپەڕەکانی ئەو ناخۆشیانەی تووشی گەلەکەمان بوو لە ماوەی ئەو شەڕی ناوخۆییەدا بیر چوونەوە، بەڵام تاکەشتێك کە نابێت بیر بچێتەوە ئەوەیە، هەر هەموو جەنگاوەران باوەڕێکی قووڵ و داڕێژراوی بە دادپەروەری و ڕاستی ئەو بیرە هەبوو کە حیزبەکەی لینین لە کاتی شۆڕشی تشرینی یەکەمدا بانگەشەی بۆ دەکرد.

---

لەو کاتانەدا جەنەراڵ(نوکس)ی بەریتانی نوسراوێکی بۆ حکومەتەکەی نووسی، لەو نوسراوەدا وتی"ئێمە دەتوانین بەسەر ملیۆنێك جەنگاوەری سوپای بەلشفەکاندا سەرکەوین و تێکیان بشکێنین، بەڵام ئەگەر تەنها سەدوپەنجا سەربازی رووسی سوور بمێنێت و سپییەکانی نەوێت، هیچ مانایەکی نییە ئێمە یارمەتی سپییەکان بدەین و هاوکارییان لەگەڵدا بکەین.

لەبەر چەند هۆیەکی گرنگ بوو، نەدەبوو لەشکری سوور بەهیچ جۆرێك خۆی بەو شێواز و شارەزاییەی پێشووەوە ببەستێتەوە گەرچی لە جەنگی یەکەمی جیهانیشدابوو، لە خەبات و تێکۆشانیدا دژی دوژمنانی سۆڤێتی تازە پێگەیشتوو، دەبوا رێکخستن و ئامادەباشییەکی تایبەتی بکردایە. ئەو خەبات و تێکۆشانە شێوازی جیاو تێروانینێکی نوێ تر لە ناوەرۆك و شێوازی خەباتکردن بگرێتەخۆ، هەروەك (فلادیمیر ئیلیتش لینین) دەیگوت"هەر شۆرشێك نەتوانێت بەرگری لە خۆی بکات و نەتوانێت خۆی بپارێزێت، ئەوە پێینالێن شۆرش.."

حیزب و لیژنەی مەرکەزی و لینین دەورێکی کاریگەرییان بینی لە رێکخستندا بۆ بەرگری کردن لە نیشتمان و یەك ریزی و هاوئاهەنگی هەموو ریزەکانی بەرەی جەنگ و دوای بەرەی جەنگداو سازدانی جەماوەری کرێکار و جوتیار و لەشکری سوور بۆ خەبات و تێکۆشان دژی داگیرکەران و شۆرشی دژایەتی لە ساڵەکانی شەری ناوخۆدا، هەر ئەوەشبوو هۆی ئەوەی شیوعیەت بتوانێت سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا بەدەست بهێنێت.

لەگەڵ ئەوەشدا (لینین) و لیژنەی مەرکەزی، نەچوونە شوێن سەرکردایەتی باڵاو لیژنە شۆرشگێرەکانەوە، بۆ سەرکردایەتیکردن کە لەبەرەکانی جەنگ و لەشکرو یەکە سەربازییەکاندابوون.

لیژنە شۆرشگێرە سەربازییەکانی کۆماری و هەروەها ئەو ئەنجومەنە سەربازییانەی بەرەکانی جەنگ و سوپا، هەر هەموویان لە کارەکانیاندا بەپێی رێنمایی و بریارەکانی لیژنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی رووسی(بەلشەفی دەچوون بەرێوەو کاریان دەکرد. هەروەها بەپێی بریاری لیژنەی مەرکەزی سەرکردەو کۆمیسار لە ناوەندە سەرەکییەکاندا دادەنراو یارمەتی و بەهێزکردنی توانای

بەرگری کۆماری هەر بەپێی بڕیاری لیژنەی مەرکەزی بوو.

دەوری شیوعییەکان لەناو لەشکرا هەروەك چیمەنتۆ بۆ خانوو وابوو، لیژنەی مەرکەزی جارەهای جار هەستاوە بە کۆکردنەوەی ئەندامانی حیزب و ناردنیان بۆ بەرەکانی جەنگ بۆ بەهێزکردنی شوێنە ستراتیژی و گرنگەکانی بەرەی جەنگی شیوعیەکان.

لە مانگی(تشرینی یەکەمی ساڵی١٩١٨)دا ژمارەی ئەندامانی حیزب لە لەشکری سووردا گەیشتە (٢٥) هەزارکەس دوای یەك ساڵ لەو بەرواره ژمارەی ئەندامانی گەیشتە (١٢٠) هەزار، لە(ئابی ساڵی ١٩٢٠)دا ژمارەیان گەیشتە (٣٠٠) هەزار سەرباز، واتە لەو کاتەدا نزیکەی نیوەی هەموو ئەندامانی حیزب.

ئەو هەوڵ و گورج و گۆڵییە نیشتمانییەو توانا سەربازییەی سەربازەکان و توانا شەڕکردنەی شیوعییەکان و کۆمیسارەکان و بەرپرسە سیاسییەکان و شانە حیزبییەکان، هەر هەموویان دەورێکی سەرەکییان هەبوو لە بەرزکردنەوەی ئاستی مەعنەوی و هەستی سیاسیدا لەناو لەشکری سووردا.

(میخائیل فرۆنزی) لە هەڵسەنگاندنی دەوری لایەنە حیزبییە سیاسییەکاندا لەناو سوپادا لە ساڵەکانی شەڕی ناوخۆییدا دەڵێت"کێبوون ئەوانە پرۆگرامی زەبت و ڕەبتی خستەناو ڕیزەکانی سوپای سووری تازە پێگەیشتووەوە لە کاتی ئەو بۆمباباراانە چڕوپڕەی تۆپەکانی دوژمن دەیانکرد..؟ کێبوون ئەوانەی لە کاتی تێکشکاندن و سەرنەکەوتندا ورەو خۆڕاگری جەنگاوەرانی بەرزدەکردەوە و هێزو تواناو وریەکی گەورەتر و نوێتری پێدەبەخشینەوە؟

کێبوون ئەوانە کاروباری بەرەی ناوخۆیی گرتبووە ئەستۆو پشتگیری و یارمەتی حوکمی سۆڤێتی دەدا بۆ دەستەبەرکردنی سەلامەتی و سەرکەوتنی جموجووڵی سەربازی بۆ پێشەوەی بەرەکانی جەنگ؟

کێبوون ئەوانە توانییان بەکاری بەردەوام و خۆڕاگری ڕیزەکانی دوژمن هەڵتەکێنن و بڵاوەیان پێ بکەن و هێڵەکانی پشتەوەی دوژمنان تێکبدەن بەو کارەیان بارودۆخێك بخوڵقێنن بۆ سەرکەوتنی یەکجارەکی..؟

ڕێکخراوە سیاسییەکانی لەشکربوون توانییان ئەو کارانە بکەن و سەرکەوتن بەدەست بهێنن.

پێویستە ئەوەبڵێین ئەوان بەباشترین شێوە کارەکانیان هەڵسووڕاند و ئەو فەزڵە گەورەو ڕادەبەدەرە ڕابووردووەی ئەوان بەهیچ جۆرێك فەرامۆش ناکرێت و لەبیرناچێتەوە.

---

مارشاڵ زۆکۆف لەسەر ئەو قسانە دەڵێت...

"من هیچم لە توانادا نییە تەنها ئەوەندە نەبێت هەزارجار ئەو وتەجوان و ڕازاوانە پەسەند بکەم و گەواهی تەواوی و ڕاستی ئەو وتانە بدەم."

تەنها گەل و حیزب بەسەر دوژمنانی شەڕی ناوخۆدا سەرنەکەوتن بەڵکو لەو خەبات و تێکۆشانەدا بناغەی لەشکرێکی میللییان لە سەر بنەمای خزمەتی سەربازی تەوزیمی بۆ چەوساوەکان دارشت. ڕێکخراوی سەرکردایەتی سەربازی مەرکەزی و ناوخۆییان پێکهێناو بۆ یەکەمجار یاسایان داناو کۆمەڵ و یەکێتی جەنگاوەرانیان یەکخست.

لە کۆتایی ساڵی(١٩٢٠)دا ژمارەی سەربازانی سوپا گەیشتە(٥,٥) ملیۆن، لەگەڵ ئەوەشدا نزیکەی(٨٠٠) هەزار کوژراو و بریندار ونبوو هەبوو، (٤٠٠) هەزار شەهید هەبوو لەوانەی نەخۆشی و کەم خۆراکی ونەبوونیدا دەرمان و پۆشاك و نەبوونی چاودێری تەندروستی لەناوی بردن و تیاچوون. لەسەر ئەو ئەزموونە سەربازییە زۆرودرێژە و ئەو تیۆرییانەی پەیوەندی بەکات و زەمانی شەڕی ناوخۆییەوەبوو، لەسەر ئەو ڕێبازەی هێزی چەکدارانی سۆڤێتی لەسەر دامەزرا، دەمەوێت لەسەر ئەم خاڵانە هەڵویستەیەك بکەم..!

یەکەم: یەکێتی و یەك ڕیزی سوپاو میللەت، ئەم یەکێتییە هێزێکی بە توانای پێکهێنا کە زۆر لە هێزی چەك بەهێزتربوو، لینین سەرچاوەی سەرەکی ئەو هێزەی ڕەچاوکرد. ئەویش ئەوەبوو لە مێژوودا بۆ یەکەمجاربوو سوپایەك هەبێت بزانێت

بۆچی و لە پێناوچیدا دەجەنگێ و لە مێژوودا کرێکار و جوتیار لە ناخۆشترین و مەینەترین کاتەکانی ژیاندا چەك هەڵگرن و هەست بەوەبکەن ئەوان بەرگری لە کۆماری سۆڤێتی ئیشتراکی و لە دەستەلاٌتداریٌتی کرێکارو جوتیاران دەکەن.

دووەم: دەوری سەرکردایەتی حیزب لە کێشەی ڕاستەوخۆی سەربازییدا، هەروەها بەهۆی ئەو کاریگەرییەی شانە سیاسییەکانی حیزب هەیانبوو لە ناو سووپادا، لە ڕووی سەربازییەوە سەرکردایەتی حیزبی شیوعی گرنگییەکی مەزنی هەبوو بەرەچاوکردنی ئەوەی حیزبی دەسەلاٌتدار دەستەلاٌتدارە لە دەوڵەتدا و بۆ بەرهەم هێنانی هۆیەکانی بەرهەم لەسەر خاوەنێتی گشتی دەروات، بەهۆی ئەوەوە دەیتوانی هەموو هێزەکان و سەرچاوە ئابوورییە نیشتمانییەکان و ڕێبازە سەربازییەکان تا ئەوپەری توانا کۆبکاتەوە.

لەسەر ئەو بارودۆخە توانایەکی دیاری نەکراوی هەبوو بۆ بەکارهێنانی سەرچاوە مادییەکان و بەشەرییەکان و جێبەجێکردنی سیاسەتێکی سەربازی یەکگرتوو، وەخستنە ژێرباری هەموان و هەریەکە بەجیاش بۆ بەرێوەچوونی داواکارییەکانی سەربازی. وە دەربارەی کاری سیاسی حیزبی، بەهۆی فەزڵ و گەورەیی ئەوەوە توانرا هەموو پێکهاتە شۆرشگێرە شارەزاو وریاکان لەناو سوپاو کەشتیگەلەکاندا مەبەست و ئامانجی سەرەکییان بۆ ڕوون و ئاشکرابوو ئەم پێکهاتە نەترس و ئازایانە، ژمارەیان زیادی کرد و بنکەیەکی بەرفراوانی قارەمانێتی بە کۆمەڵیان پێکهێنا.

هەروەك لینین دەڵێت"ئەو موعجیزەیەی هاتەدی بەهیچ شێوەیەك نەدەهاتە دی ئەگەر حیزب لەوپەری وریایی و زەبت و ڕەبتدا نەبوایەو ئەگەر حیزب نەیتوانیایە هاوئاهەنگی لە نێوان هەموو دامەزراوەکان و ڕێکخراوە سەربازییەکاندا بکات و ئەگەر لیژنەی مەرکەزی نەیتوانیایە ئەو دروشمەی کە دەڵێت"هەرهەموو وەك تەنها کەسێك" جێبەجێ نەکردایە" لە ڕاستیدا دەیەهاو سەدەها و هەزارەها و ملیۆنەها کەس وەك تاکە کەسێك یەك دەست و یەك گیان ڕاپەڕین و قوربانییەکی بێ وێنەیان بەخشی. ئەگەر ئەوەنەبوایە لەگەڵ ئەو هەموو هێرشە یەك لەدوایەکانەی دەوڵەتە ئیمپریالیتە هاوپەیمانانەی کردیانە سەرمان ئەو سەرکەوتنەمان وەدەست

نەدەهێنا".

سێیەم: من لێرەدا دەمەوێت باسی یەك بیروباوەڕیی پێكهاتەی هێزە چەكدارەكانمان بكەم، ئەویش بیروباوەڕی مەركەزییەتی ڕەهایی و تاكێتی سەركردایەتی و دەستی پۆلایی و زەبت و ڕەبتە، بەتایبەت بەرهەڵستكاران بەهەموو جۆرو پێكهاتەیەكیانەوە جارلەدوای جار ڕەخنەیان لەو بیروباوەرە دەگرت.

لینین دەڵێت"یەك نەخستنی سەركردایەتی لە بواری سەربازیدا بێگومان لە هەموو شوێنێكدا دەبێتە كارەسات و ئاژاوە و ترس و لەرز و زۆری دەستەلات و تێكشكان."

لەبەرئەو بارودۆخە مێژووییەی لەسەرەتای ساڵەكانی شۆڕشدابوو كارێكی گرانبوو بیروڕای(یەك سەركردایەتی) جێبەجێ بكرێت، بەڵام ئەو بیروباوەڕەی لینینە لە دوایدا بڵاوبۆوەبوو بە یەكێك لەو بناغە سەرەكییانە كە پێكهێنانی هێزە سەربازییەكانی سۆڤێتی لەسەر دابمەزرێت پێ بەپێی و لەگەڵ ئەو گرنگی و زیادبوونەی ڕێكخراوە حیزبی و سیاسیەكاندا.

لەگەڵ ئەو زەبت و ڕەبتە پۆڵاینییەی لەسەر بناغەی تێگەیشتن و هەستكردنە قووڵەی لەلایەن سەربازانەوە هەیانبوو بۆ جێبەجێكردنی پێویستی سەرشانیان و بەرگری كردن لە نیشتمان و(یەك سەركردایەتی)بوو بەكارێكی پێویست و زیندو بۆ پێكهێنانی یەكێتی و یەكگرتن و ویست و نەخشەو پلاندانانی هێزی چەكداری لە گشت قۆناغەكانی مێژوودا كە نیشتمان پێیدا تێدەپەڕێ، دروستكردنی هێزە چەكدارەكان شێوازێكی نوێتری بەخۆوە دەبینی و هێزو تواناو ئامادەباشی زیاتری پەیدادەكرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و بەرهەڵستیكردنی داگیركەرو دوژمنانی، ئەو تاقیكردنەوەو بیروباوەڕی سەربازییەی لە هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی ناوخۆیدا بەسەریدا هات، لەسییەكان و چلەكاندا تاڵی كرد و پێشكەوتوتری كرد و بوو بە بەشێكی هێزو توانای ئەو سوپایە و لە جەنگی نیشتمانی گەورەدا(جەنگی دووەمی جیهانی) توانی بەسەر فاشیستەكاندا زاڵ بێت و تێكیان بهاڕێت.

---

# (بەشی چوارەم)

(سەرکردایەتیکردنی کەتیبەیەکی سەربازی پاشان سەرکردایەتیکردنی لیوایەک)
-پێکهێنانەوەی هێزە چەکدارەکان- کاری سیاسی لەناو یەکە سەربازییەکاندا-سەرکردایەتی سەربازی لە نێوان وەستان و پێشکەوتندا- لە دایکبوونی سەرکردەیەکی نوێ-

مارشاڵ زۆکۆف باسی بارودۆخی ڕووسیا دەکات پاش ئەو شەڕە ناوخۆییەو حاڵەتی وێرانکاری و دارمانی ژێرخانی ئابوری و پەککەوتنی هۆیەکانی هاتوچۆ... هتد.

ئەوەی بووە هۆی پێویست کە هەر هەموو توانایەکی وڵات بۆ پێکهێنان و دروستکردنەوەی ئابوری ژێرخانی وڵات لە بەرەیەکدا کۆبکرێتەوەو بخرێتەگەڕ.

لەگەڵ ئەوەش پێداویستی وا پێویستی دەکرد ژمارەی هێزە سەربازییەکان و پشت پێ بەستەکانی کەمبکرێتەوە، پێویستیش وابوو هێزی بەرگری میللی بەهێزترو بەتوانا بکرێت.

بۆ گەواهی ئەوەش قسەیەکی (لینین) دەکاتە گەواهی و دەڵێت"ئێستا ئێمە بەسەر چەند دەوڵەتێکی گەورەو زەبەلاحدا خۆمان سەپاندووە دژ بەئێمە

شەڕنەکەن وازلە شەرکردن بهێنن، بەڵام ئەم بارودۆخە تاکەی بەردەوام دەبێت ئەوەئێمە ناتوانین بڕیاری یەکجارەکی بدەین."

لە کۆتایی ساڵی(١٩٢٤)دا ژمارەی هێزە چەکدارەکان لە(٥,٥) ملیۆن وە کەمکرایەوە بۆ (٥٦٢) هەزار سەرباز. ئەم وازلێهێنان و تەسریح کردنەی ئەو هەموو سەربازانە، وەلامدانەوەیەك بوو، دەگونجا لەگەڵ بەرژەوەندی ملوێنەها سەربازدا، کە دەمێك بوو ئارەزووی گەڕانەوەی ناوکێڵگەو ئامێرو سۆزوخۆشەویستی گەڕانەوەی ناو خێزانەکانیان دەکرد.

کارێکی قورس و گران بوو بتوانرێت ئەو سەربازە شارەزایانە بە ئاسانی لەناو سوپادا بهێڵرێنەوە، لە ڕاستیدا لە ناو ڕیزەکانی سوپادا تەنها ئەوانە مانەوە کە تواناو ئارەزووی خۆیان وایلێکردبوون ژیانی خۆیان بۆ سەربازی تەرخان بکەن، لەمانگی(حوزەیرانی ساڵی١٩٢٢)وە تا مانگی(ئازاری ساڵی١٩٢٣) من سەرکردایەتی سرییەکی کەتیبەیەکی سوارەی سی و هەشت بووم، پاشان بووم بەیاریدەدەری سەرۆکی کەتیبەی سوارەی چل کە سەر بە فیرقەی سوارەی پێشووبوو لە شاری(سمارسك)دا.

لەسەرکردایەتیکردنی ئەو دووکەتیبەیەدا، سەرکردەی شارەزاو لێهاتوویان هەبوو، من لەوانەوە زۆرشت فێربووم و سوودم لێبینین.

هەروەها لە نێوان سەرکردایەتی و کارمەندانی سیاسی و ڕێکخراوە جەنگی و سەربازییەکاندا هاریکاری و دۆستایەتییەکی تەواویان لە نێواندا هەبوو، ئێمە لە شوێنانی جیاجیادا لەناو جوتیارەکاندا و لە گوندەکانی دەوروبەرماندا کاتمان بەسەردەبرد و لەگەڵیاندا دەژیاین.

چێشتخانەکانمان گەرۆك و لە گۆڕەپانەکاندا ئامادە دەکراو چێشتمان لێدەنا یانە (نادی) و شوێنی لەو جۆرانەمان نەبوو کاتی تێدابەسەربەرین، بەڵام ئەو کاتانەو لە ژێرسایەی ئەو بارودۆخە ناهەموار و گرانەدا کە باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو، ئەو کات و ساتانەمان لا ئاسایی بوو..

زۆربەی سەرکردەکان گەنجی لەش ساغ و بەهێز و بەتوانابوون، و دڵگەرمی و تواناو خۆڕاگرییەکی چاکیان هەبوو، لەسەرئەوەشەوە زۆربەی زۆرمان ژنمان

نەهێنابوو بێ ژن بووین و بێجگە لە کاروخزمەتەکردنەکانماوە هیچ خەم و سەرقاڵییەکی ترمان نەبوو.

بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانمان کاتمان بەفیڕۆ نەدەدا، ئێمە لە ڕۆژێکدا بەرێژەی (١٥) کاتژمێر تا(١٦) کاتژمێر کارمان دەکرد، لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵو خۆماندوو کردنانەماندا هێشتا کاتی تەواومان بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئەرکەکانی سەرشانمان نەبوو.

لە بەهاری ساڵی(١٩٢٣)دا بانگکرام بۆ بارەگای سەرکردایەتی فیرقەکەم نایشارمەوە ئەوکاتانە زۆر هەستم بە پەشۆکاوی و تێکچوون کرد، دەترسام لەوەی من هەڵەیەکم کردبێت و پێمنەزانی بێت، بەڵام سەرکردەی فیرقەکە بەڕوویەکی خۆشەوە پێشوازی لێکردم و چای پێشکەش کردم، پاشان پرسیاری بواری ئامادەباشی تەکتیك و باری شەڕکردنی تیپەکەمانی لێپرسیم.

کتوپڕ پرسیی...

"بەبۆچوونی تۆ هێز و تواناو ئامادەیی هێزەکانی سوارچاکانی خۆمان لە جەنگی داهاتوودا لە چ ئاستێکدا دەبینی..؟

بە بۆچوونی تۆ شەڕی ئایندەمان چۆن چۆنی دەبێت..؟!!

پرسیارەکە دەربارەی من گران بوو، ڕووم سوورهەڵگەڕا.. یەکسەر بەوکتوپڕییە نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە...سەرۆك هەستی بەشڵەژان و تێکچوونم کرد، ماوەیەکی دامێ هەتا توانیم بیرە پەشۆکاوەکەم کۆبکەمەوە، وتم...

-"ئێمەی سەرکردە ئەوەندە زانست و شارەزایی ئەوتۆو تەواومان نییە تا بتوانین هێزەکانمان بەشێوازێکی هاوچەرخی مۆدێرن فێربکەین، ئێمە ژێر دەستەکانی خۆمان بەو شێوەیە فێردەکەین کە سەرکردەکانمان کاتی خۆی لە سوپای کۆن و پێشوودا فێریان کردووین، بۆ ئەوەی بتوانین هێزەکانمان چاك بکەین و پێشیان بخەین، دەبێت لە هەموو بوارێکدا بەشێوەیەکی چاك مەشقیان پێ بکەین و ئامادەیان بکەین، هەروەها دەبێت سەرکردەکان خۆیان بەتێگەیشتنی هونەری سەربازییەوە پڕچەك بکەن.

ـ ئەوە زۆر ڕاستە، بۆ ئەوەی کات و هەلی گونجاو بۆ ئەوە بڕەخسێ

پێویستە سەرکردەکان گرنگی تەواو بەفێرکردن و ڕۆشنبیری خۆیان بدەن، لەو چاوپێکەوتنەدا سەرۆك فیرقە بڕیاری دانانمی بە سەرۆك کەتیبەی سوارەی سی و نۆی پێڕاگەیاندم.

لە کاتی خواحافیزیم لەگەڵ سەرۆکدا هەستم بە گەورەیی و بەرپرسیارێتی کرد. چونکە سەرکردایەتیکردنی کەتیبە بە گرنگترین قۆناغ دەژمێرێت لە فێربوون و شارەزایی هونەری سەربازیدا.

کەتیبە.. یەکەیەکی سەرەکی شەڕکردنە. چونکە هەندێ جار شەڕکردن پێویست دەکات هەم ئاهەنگی و هاریکاری هاوبەشی دەوێت لەگەڵ هەموو هێزەکانی وشکانی و بگرە لەگەڵ گشت هێزەکانی تریشدا.

بەبیروڕای من ئەو سەرکردەیەی بتوانێت هێزەکەی هەردەم لە ئامادەباشی دابێت و بەو شێوەیە بیهێڵێتەوە بۆ کاتی شەڕکردن و سەرکەوتوو شارەزا بێت لە سەرکردایەتی کەتیبەکەیدا لە ئایندەدا لە کاتی جەنگ و ئاشتیدا بێ جیاوازی دەبێت بە سەرکردەیەکی پێشڕەو لە هەموو قۆناغەکانی سەرکردایەتی باڵادا.

---

کاتێك بیر لە ڕابوردوو دەکەمەوە، هەمووشتێك لە پێش چاومدا ئاساییە، بەڵام ئەو کارانە لە کاتی خۆیدا جۆرێکی تربوو، وەك ئەوەی لە تەمەنی بیست و شەش ساڵیمدابووم بە سەرکردەی کەتیبەیەك و هەر منیش بووم قوتابخانەی زوبات سەفم لە سوپای قەیسەریدا تەواوکرد، هەرمنیش بووم لە سوپای سووردا کۆتاییم بە پێگەیاندنی فیرقەیەکی سەرکردەکانی سوور هێنا، ئەمە لەو کاتانەدا هەموو شتێك بوو.

لە ڕاستیدا من لە کۆتایی جەنگی ناوخۆدا بەوپەڕی گەرمی و تین و توانامەوە دەستم کرد بە خوێندنەوەو هەرچی پەڕتووکێکی سەربازی بکەوتایە دەستم بە تایبەت ئەوانەی پەیوەندی بە تەکتیکەوە هەبوو دەمخوێندەوە، من لەلایەنی کردەییەوە هەستم دەکرد شارەزاییم تیادا خراپ نییە، بەڵام دەربارەی لایەنی

تیۆری هەستم بە خۆم دەکرد ئەو ڕادەیەی کە پێویستە و شایانی سەرکردەی کەتیبەیەك بێت باش نییەو هەستم بەدواکەوتوویی خۆم دەکرد.

کاتێك لەو بارودۆخە تێفکریم و تێگەیشتم، بیرم کردەوە نابێت لەمە زیاتر کاتی خۆم بەفیڕۆبدەم، بەڵکو پێویستە دەبێ زانیاری و ڕۆشنبیری سەربازی خۆم پەرەپێبدەم.

لەگەڵ ئەوەشدا لەوکاتەدا من بەڕێژەی(١٢) سەعات لە ڕۆژێکدا کارم دەکرد بۆ سەرپەرشتی و چاودێری کردنی ئەو هێزەی لەژێر دەست و سەرکردایەتی مندابوو. ئیتر لەوکاتەوە لەبەرنامەی ژیانمدا(٣ تا ٤) سەعاتم بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوە تەرخانکرد و خستمە ناو بەرنامەی ژیانمەوە، دەمووت کاتی حەسانەوەو ماندوو نەبوون لە دوایدا دەست پێدەکات.

(مارشاڵ زۆکۆف) زۆرێکی زۆری ئەو چاوپێکەوتن و بەیەکگەیشتنانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە کاتی خۆی لە کاتی مناوەرات و مەشقکردندا لەگەڵ سەرکردە ناودار و دەرکەوتووەکان و ئەو قارەمانانەی لە جەنگی ناوخۆدا ئەو کاتانە کردوویەتی و دەستی باڵایان هەبووە، وەك (حای وتوخاتشفسکی، بلوخیر، ئودجینکیزی، وفرونزی، یودیونی، بجروف)، هەرهەموو ئەوانە گەواهی بەتوانایی یەکە سەربازی و دڵسۆزی سەربازەکان وسەرکردەکانی بۆ دەدەن و هەمووکات ئاماژە بەو گرنگییە زۆرە دەدەن کە سەرکردەکان لە پێناوی خواردنی چاك و نیشتەجێ بوون و زیادکردنی زانیاری سەربازەکانیاندا دەیاندا.

هەروەها ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە چۆن سەرۆك فیرقەکەی پێیڕاگەیاندووە بۆ خوێندن لە قوتابخانەی سوارچاکی باڵا لە لینینگراددا هەڵیبژاردووە و چۆن لەو قوتابخانەیەدا ئیمتیحانی داوە و لەو کۆمەڵەیەی ئەودا برادەران(ڕاکساسوفسکی و باجرامیان و بریمنکو) و چەند سەرکردەیەکی ناوداری کەتیبەکانی تری تێدابوو.

ئەو سەرکردانەی لەدوایدا لە جەنگی دووەمی جیهانیدابوون بە دیارترین و ناودارترینی سەرکردەکانی یەکێتی سۆڤێتی (ئەوسا)

"منیش وەك برادەرەکانم کە لەو بەشەدابوون یەکەمجارم بوو شاری لینینگراد

ببینم، زۆر بە خۆشی و پەرۆشەوە تەماشای جوانی و ڕازاوەیی و پێشکەوتنی شارەکەمان دەکرد. بەو ناوچانەدا دەگەڕاین کە بەسەرهاتەکانی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٧ یان تیادا بەخۆوەبینی.

ئایا دەشیا لەوکاتەدا بەبیرمدا هاتبێت دوای حەڤدە ساڵی تر ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ئایندەدا من سەرکردایەتی ئەو بەرەیەی لینینگراد دەکەم کە بەرگری لە شاری لینین دەکرد، دژ بە هێزەکانی فاشییەکان؟!!".

---

لە (پایزی ساڵی ١٩٢٥)دا خوێندمان تەواوکرد، هەرسێ سەرکردەی کەتیبەکان (زۆکۆف و سافیلیوف و ریبالکین) لەسەر ئەوە پێکهاتین هەرسێکمان سەر کێشیەکی سەرنج ڕاکێش پێکەوە بکەین. لەو کاتەدا لەناو یەکێتی سۆڤێت و دەوروبەریدا شتی وانەکرابێت.

ئەویش ئەوەبوو پێکەوە بە کۆمەڵ بەسواری ئەسپ پێشبڕکێیەك بکەین لە نێوان شاری لینینگرادەوە بۆ بارەگای سەرکردایەتی سێ سوارچاکە لاوەکە کە لە شاری(مینك)دابوو، ماوەی نێوان دوو شارەکە دەگەیشتە(٩٦٣) کیلۆمەتر، بەهیوای ئەوەی ژمارەیەکی قیاسی دووەلی تۆماربکەین.

ئەو نێوانەیان بەماوەی حەوت ڕۆژ بە سواری بڕی، لەگەڵ ئەوەشی ئەسپەکەی زۆکۆف تووشی پێکان بوو.

سێ سوارەکە شادو خۆشحاڵبوون کاتێك گەیشتنە شاری مینك و بینییان هەرهەموو خەڵکی شارو سەربازان و سەرۆکی ئەنجومەنی شارو سەرکردەی سەربازی ناوچەکە بەئالآی سوورەوە بۆ پێشوازی کردنیان بە پیریانەوەهاتوون و بە دڵگەرمییەوە هوتاف دەکێشن، چونکە هەواڵی ئەو هاتنە سەرنج ڕاکێشەیان لە سەرکردایەتی قوتابخانەی سوارچاکانی بالآوە لە شاری لینینگرادەوە پێگەیشتبوو.

لە(زستانی ساڵی١٩٢٦)دا زۆکۆف بانکرا بۆ بارەگای سەرکردایەتی فەیلەقی سوارچاکانی سێ. لەوێدا پێیانڕاگەیاند کە هەڵبژێرراوە بە کۆمیساری سیاسی

کەتیبەکە، لەگەڵ ئەو بەر پرسیارێتییەی سەرۆك فیرقەیەش کە هەیەتی، ئەم کارەش یەکەم کارێك بوو لەو جۆرانەی لە تیپی سوارەی حەوتدا کرابێت.

منیش بۆ ڕێکخستنی کاروباری ئەیدۆلۆجی پشتم بە سکرتێری لیژنەی حیزب و یاریدەدەری کاروباری سیاسی بەستبوو.

لە ڕاستیدا ئەوان لایان شەرم نەبوو ڕەخنەی حیزبی لە کاروهەڵسوکەوتم بگرن و ئامۆژگاری پێویستم بکەن، منیش چونکە لەو ئەرکەدا تازەبووم و زۆر شارەزاییم تیادا نەبوو، زۆرجار دەکەوتمە هەڵەوە، ئالێرەدا ڕەخنەکانیان سوودی بۆ بەرژەوەندی گشتی هەبوو.

بۆ ئەوەی سەرکردە گەورەکان بتوانن پەروەردەیەکی سیاسی بە ژێر دەستەکانیان ڕابگەیەنن، دەبێت خۆیان ڕۆشنبیریەکی سیاسی زۆر زیاتر و بەرزیان لە ژێر دەستەکانیان هەبێت، لەو ساڵە مێژووییانەدا ئێمەی سەرکردەی سەربازی لەبارەی بیری سەربازییەوە خێراتر و زووتر خۆمان پێدەگەیاند وەك لە پێگەیاندن و ڕۆشنبیری کردنی سیاسیمان و فێربوون بنەمای تیۆری مارکس و لینین.

لە مانگی (ئایاری ساڵی ١٩٣٠)دا بووم بەسەرکردەی لیوای سوارەی دووی سەر بە فیرقەی حەوت، کەساڵێك لەمەوپێش ڕامگەیاند کە(قستنتین ڕاکاسوفسکی) لە خوێندنگای سوارچاکان باڵای لینینگرادا لە ساڵەکانی(١٩٢٤-١٩٢٥)دا برادەرم بوو.

ئەو کاتە زۆر بەهێمنی و دڵسۆزییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردم، منیش لەلایەن خۆمەوە ئەو شارەزایی و زانیارییە بەرزو گەورەو زۆرەی هەیبوو لەسەرپەرشتی و ئامادەکاری و پلاندانانی شەڕو پەروەردەیی بۆ هێزەکانی بەرز دەنرخاند.

ماوەی حەوت ساڵ لە سەرکردایەتی کەتیبەی کەتیبەی سی و نۆدا مامەوە، ئەوێ بۆ من خوێندنگایەکی باش و بەسوودبوو، لەو ماوەیەدا دەربارەی تەکتیك و کاری سەربازی و ڕۆشنبیری تیۆری زۆرێکی زۆرفێربووم.

گەرچی من لەیەککاتدا سەرکردەیەکی سەربازی و کۆمیسارێکی سیاسیش بووم، لەو کاتەدا بە قووڵی دەوری سەرکردایەتی ڕێکخستنی حیزبی لە

پێکهێنانەوەی هێزە چەکدارەکانمان لە ژیانی ڕۆژانەی ناویەکە سەربازییەکاندا تێگەیشتم و هەستم پێکرد، بێشك من هەڵەم هەبوو، بەڵام کێ هەیە هەڵەنەکات و لە هەڵەبەدووربێت؟.

جگەلەوانە نەبێت کە بەبێ ڕێنمایی لە خۆیان گەورەتر کارناکەن، بەبیروڕای من کێشە لە هەڵەدانییە بەڵکو کێشە لەوەدایە بەخێرایی و زووترین کات هەست بە هەڵەکە بکەیت و چاکی بکەیت هەندێ کەس لەسەر ئەو ڕاستی و ڕاشکاوییە زۆرەی هەمبوو، ڕەخنەیان لێدەگرتم و لۆمەیان دەکردم، من ئەو ڕاشکاوییەم بە سیفەتێك دادەنا کە دەبوو هەموو سەرکردەیەکی بەلشەفی دەبوو بیانبوایە، کاتێك ئاوڕ بۆدواوە دەدەمەوە، دەبینم بە ڕاستی من لە هەندێ حاڵەت و کاتدا لەوپەڕی دڵڕەقیدابووم، هیچکات لەسەرخۆ و خۆڕاگر نەبووم دەربارەی هەڵەی سەرکردەکانم چاوم لێنەدەپۆشین. من بەرامبەر ئەو هەڵانەی سەرکردەکان دەیانکرد لە ڕووی نەبوونی ویژدانییەوە و لە کاروباری سەربازییان و ئەو هەڵسوکەوتە کەسایەتییە نابەجێیانەی دەیانکرد، خۆم پێڕانەدەگیرا. لەوەدەچوو هەندێ کەس لەوە نەگەیشتبێتن کە من توانای ئەوەم نییە لە هەڵەو لاوازییەکانیان چاو بخەفێنم. بێشك ئەو هەڵانەیان بۆ من ئێستا زۆرروون و ئاشکراترن، چونکە ئەزموونی ژیان زۆرشتت فێردەکات، بەڵام من تاکو ئێستا لەو بڕوایەدام کەس مافی ئەوەی نییە لەسەرحسابی کەسێکی تر پێشکەوێ و بەخۆشی بژی...

بەتایبەت لەسەر، سەر گەورە سەربازییەکان پێویستە ئەم ڕاستییە چاك بزانن و پێویستە لەسەریان خۆیان لەپێش هەموو کەسێکدا لە کۆڕەکانی جەنگ و پێکداداندا بچنە پێشەوەی بەرەکانی جەنگەوە بۆ بەرگری کردن لە نیشتمان بێئەوەی لە ژیانی خۆیان بترسن و گوێ بە ژیانی خۆیان بدەن.

ئەو لیوایەی زۆکۆف سەرکردایەتی دەکرد لە دووکەتیبە پێکهاتبوو یەکێکیان ئەوکەتیبەیە بوو پێش ئەوەی پلەی بەرزبێتەوە وازی لەسەرکردایەتی هێنابوو. لەبەرئەوە دەیووت کە جەختی لەسەرئەوەبوو بەهیچ جۆرێك نابێت هیچ حەساسیەتێك لە نێوان یەکەکانی کەتیبەکانی تردا بووروژێنێت، ئەو بەراشکاوی هەستی بە چاکەو خاڵی لاوازی هەموو کەتیبەکانی تر دەکرد، هەردەم هەوڵی

دەدا بارودۆخێکی گونجاو برەخسێنێت کە شارەزایی و قاڵبوونی هەردوو کەتیبەکە لەگەڵ یەکتردا ئاڵوگۆڕ پێ بکات.

لە کۆتایی ساڵی(١٩٢٩)دا لە سەرکردایەتی باڵاوە فەرمان بۆ وەزارەتی بەرگری دەرچوو بۆ خوێندن لە مۆسکۆدا بەزۆکۆف رابگەێنرێت، پەیوەندی بەسەرکردایەتی باڵاوە بکات.

زۆکۆف لە بیرەوەرییەکانیدا ئاماژە بۆ میخائیل نرۆنزی دەکات بۆ ئەو دەوری بینی لە چەسپاندنی پێکهاتەی خوێندنگای سەربازی سۆڤێتیدا و(دەستنیشانکردنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و چەك و برەوپێدان و پێشخستنی هەموو جۆرە چەکێك و هاوئاهەنگی نێوان بەکارهێنانیان و دەستنیشان کردنی پەیوەندی لە نێوان بەرەکانی شەرو بەرەکانی ناوخۆدا و شێوازی مەشقکردنی هێزەکان و سوود وەرگرتن لەو وانانەی لە ئەزموونی جەنگی یەکەمی جیهانی و شەرەکانی ناوخۆوە فێری ببوو)، هەروەها ئاماژە بەو زانیارییە ناوازەیەو بەوبۆچوون و بیرو پێشبینییانەی (میخائیل توخاتشفسکییە) دەدات لە شێوازی جەنگی داهاتوودا(توخاتشفسکی) بناغەی تیۆرییەکی نوێ و تەکتیك و ستراتیژی و کاروپلانی جەنگی نوێی بۆ پاشە رۆژ دارشت.

هەروەها ئەو پەیوەندییە پێبەستەیەی نێوان تیۆرییەکان و جێبەجێکردنی پێکهێنانی سەربازی و نێوان پێکهێنانی کۆمەڵایەتی و بنکەی وەبەرهێنانی دەوڵەتەوە روون و ئاشکرا کرد.

---

هەروەها زۆکۆف ناوی چەند پەرتووکێکی مێژوویی گەورە ناودارانی سەرکردەکانی سۆڤێت دەبات. ئەو ناودارانەی کە لە پێشترین رۆشنبیرانی سەربازی بوون، نەك بەتەنها لە رووسیادا، بەڵکو لە جیهانی هاوچەرخیشدا. هەروەها باسی پێشخستن و چاکسازی چەك دەکات لە رووسیای سۆڤێتیدا و ئەو گرنگییەی حیزب دەیدا بۆ پێکهێنان و دروستکردنی پیشەسازی جەنگی و هاندانی ئەو داهێنان و

هێنانەکایەی ئەو چاکسازییە کردەوەییانەی لە بواری سەربازیدا دەکرا.

لە کۆتایی بیستەکاندا هێزە چەکدارەکانی سۆڤێتی تەنها(٧) هەزار تۆپی مەیدانییان هەبوو کەزۆربەی زۆریان لە جۆری تۆپی سووك بوون، بەهیچ جۆرێك نە تۆپی دەبابەیان هەبوو، نە تۆپی دژ بە دەبابەشیان هەبوو، تۆپی دژە فڕۆکەشیان نەبوو.

لە ساڵی(١٩٢٨)دا ژمارەی فڕۆکە جەنگییەکان تەنها(١٠٠٠) فڕۆکە بوو، ژمارەی دەبابە و ئۆتۆمبیلی زرێپۆش دووسەد دەبابەو ئۆتۆمبیلی زرێپۆش بوو.

لەشکر لە ڕووی ئالیاتەوە زۆر لاوازو هەژاربوو، ڕەنگە پێکەنینتان بێت کە بڵێم سووپای سووری سۆڤێتی (٣٥٠)ئۆتۆمبیلی گواستنەوەی زیاتر نەبوو. (٧٠٠) ئۆتۆمبیلی سواربوون و شەست و حەوت تەراکتۆری زنجیرداری هەبوو.

نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت پێش ساڵی(١٩٢٨) لە هەموو وڵاتەکەماندا کارگەیەکی پیشەسازی دروستکردنی ئۆتۆمبیل و تەراکتۆری بەهیچ جۆرێك تیادانەبوو.

لەو کاتانەدا دەوڵەتە ئیمپریالیە گەورەکان، هێزە چەکدارەکانیان لە زیادبوون و پێشکەوتندابوو. بەریتانیا لە حاڵەتی بەرپابوونی جەنگدا ئەوکاتە لە مانگێکدا دەیتوانی(٢٥٠٠)دەبابە دروست بکات. فەرەنسا دەیتوانی لە ماوەی مانگێکدا(١٥٠٠) دەبابە بەرهەم بهێنێت، هێزە چەکدارەکانی ئیمپریالییەکان دەیەها هەزار فڕۆکەیان هەبوو، کارە میکانیکییە سەربازییەکانیان بەرێژەیەکی زۆر خێرا کاریان دەکرد، بەواتایەکی تر دوژمنانی پێشوومان ئەوانەش کە دەشیا ببن بە دوژمنمان، بەشێوەیەکی گەورەو لە بەرچاو لە بواری چەکسازی و خۆپڕچەك کردندا زۆر لە ئێمە لە پێشتربوون، ئەگەر بەراوردیان بکەین بە حاڵەتی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە.

بە بەراوردکردنی ئەم ژمارانە ئینسان هیچی بۆ نەدەمایەوە لەوە زیاتر هەردەم بیرلەوە بکاتەوە زروفی مێژوویی چ پێگەیەکی بۆ ئێمە ڕەخساندووە تاکو لەوێوە پێشبڕکێیەکی تاڵوتیژ لەگەڵ جیهانی سەرمایەداریدا بکەین؟ لە ساڵی(١٩٢٥)دا ١٨٣

(میخائیل فرۆنزی) لە نوسراوێکیدا دەربارەی بارودۆخی سەربازی لەبەردەم لیژنەی مەرکەزیدا وتی

"زۆرینەی برادەرانمان، وابزانم زۆرینەی ئەوانەی هاوبەشیان کردووە لە بەرەکانی شەری ناوخۆدا، ئێستا لەوە دەچێت لە حاڵەتێکی دەروونی ناخۆشدا بژین. کەکاتی خۆی شەری ناخۆیی بۆی خولقاندون ئەو شەرەش کە لەمەودوا تووشمان دەبێت و یەخەمان دەگرێت لە شەرەکانی ناوخۆ ناچێت لە رووی پرچەکی و شێوازی شەرکردنەوە، پاشەرۆژ بەرەنگاری سووپایەکی کارامەی پرچەك دەبین بە تازەترین چەك و هۆکاری تەکنیکی پێشکەوتووەوە.

ئەگەر سوپاکەی ئێمەش وەك ئەوان ئەوتوانایەی ئەوانی نەبێت ئەوا ئەنجامێکی زۆرخراپ و خراپتریش دەبێت.

ئەگەر ئەمە بخەینە پێشچاو پێشبینی بۆ بکەین، دەبێت ئێمە ئەو خۆئامادەباشییەی پێویستە بیگرینەبەر بۆ بەرگری کردنمان لە پێناوی خاك و نیشتمانماندا."

لە بەهاری ساڵی(١٩٣٠)دا خوێندکاران لە مۆسکۆوە گەرانەوە بۆ ناو یەکە سەربازییەکانی خۆیانەوە. لە سەرکردایەتی لیوادا زۆر نەمامەوە، چونکە بۆکارکردن هەڵبژێرام بەیاریدەدەری سەرپەرشتیاری گشتی لە سیلاحی سوارچاکانی سۆڤێتیدا ئابەو شێوەیە زۆکۆف لەگەڵ قارەمانی ئەفسانەیی شەری ناوخۆدا(مارشاڵی رووسیای سۆڤێتی، سیمون یودیونی)دا دەست بەکاربوو، کاتی خۆ ئامادەکردنم بۆ رۆیشتن کاتێکی زۆر کەم بوو. هێندەی نەخایاند، هەر تەنها ئەوەندەم پێکرا جلە سەربازییەکانم لەبەر بکەم، هەر هەموو شتومەکی سەر جێگاکەم بخەمە ناوجانتایەکەوە ئێمە لەو کاتانەدا لەوە زیاتر هیچمان شك نەدەبرد، ئەمەش دیاردەیەکی زۆر ئاسایی بوو.

پاش چاوپێکەوتن و خواحافیزییەکی گەرم و ناسکترین و خۆشترین مەدح و سەنای دۆستانە لەگەڵ سەرکردەو سەربازانی فیرقەی حەوتدا، خۆم و ژنەکەم و کچەکەم(ئسیرا) کە ئەوکاتە تەمەنی دووساڵان بوو، سواری شەمەندەفەربووین و کەوتینەرێ.

# کاری نوێ



کارە نوێیەکەی زۆکۆف دەسەڵاتی بێسنووری بۆ زۆکۆف رەخساند، کە پەیوەندی بە سەرکردایەتییە باڵاکانی سەربازییەوە بکات و هاوکاری بکات بۆ پێکهێنانەوەی هێزە سەربازییەکانی سۆڤێتی لەسەر بنەمایەکی هاوچەرخ و پێکهێنانی هێزی تۆپخانەو فرۆکەوانی و دەریاوانی و گۆرینی شێواز و پرچەك کردنی هێزی چەکداری سوارەو گفتوگۆکردنی کێشەی سەربازی باڵا لە ژێر رۆشنایی ئەو پێشکەوتنە جیهانی و ناوخۆییەدا بەتایبەت ئەو کات وساتانە کاتێك بوو نازییەکان حوکمی ئەڵمانیایان دەکرد و رۆحی دوژمنایەتی سەربازی لە یابان و ئیتاڵیادا لەسەر

هەڵدان و نەشونمادابوو.

دەوڵەتە ئیمپریالییەکانیش لەناوخۆیاندا لە ململانێ و پێشبڕکێیەکی توندوتیژدابوون بۆ دابەشکردنی جیهان بەسەر چەند ناوچەیەکدا بۆ دەسەڵاتی خۆیان و دەست بەسەرداگرتنیان.

ژۆکۆف بەوردی و دوورودرێژی ڕاستەوخۆ هەڵوێستە لەسەر(توخاتشفسکی) دەکات کە زۆر لە زووەوە ئاگاداریی کردبونەوە کە دوژمنی سەرەکی پاشەڕۆژی شوورەوی لە ئەڵمانیای نازیدا خۆی دەنوێنێ، ژۆکۆف ئەو سەرکردە گەورەیە-تۆخاتشفسکی- بەو جۆرە وەسف دەکات کە(سەرکردەیەکی گەورە و بەتوانایە لە بیری سەربازیدا و ڕۆشنبیرترین ئەستێرەیە لەناو هەموو سەرکردە سەربازییەکانی وڵاتەکەماندا).

ڕۆژێ لە ڕۆژان ژۆکۆف بانگکرا بۆ چاوپێکەوتنی یاریدەدەری یەکەمی سەرپەرشتیاری گشتی لە چەکدارێتی سوارەدا. ئەویش پێیراگەیاند بۆ سەرۆکی فیرقەی سوارەی چوار، هەڵبژێراوە ئەو فیرقەیەش بەناوی-فورشیلوف- قارەمانی سۆڤێتی وەزیری بەرگری ئەوساوەبوو.

فورشیلوف کاتی خۆی لە کاتی شەڕی ناوخۆییدا لە ڕیزەکانی ئەو فیرقەیەدا دەجەنگی و سەرکردایەتی سەربازەکانی دەکرد و لە ژێر دەستی ئەودا زۆرێکی زۆر قارەمانێتی و سەرکەوتنیان بەدەستهێنا کە بەو هۆیەوە وەك قارەمانێکی ناوداستان سەیر دەکرا، بەڵام بارودۆخی فیرقەکە وەك خۆی نەمایەوەو تێکچوو بەرەو دارمان و وێرانبوون ڕۆیشت.

کاتێك فۆرشیلوفیان لەو بارودۆخە ئاگادار کردەوە، زۆری پێناخۆشبوو داوای لە-بودیونی- کرد سەرکردەیەکی تر بۆ ئەو فیرقەیە دەستنیشان بکات. بودیونیش ژۆکۆفی بۆ ئەو سەرکردایەتییە پەسند کرد.

کاتێك ژۆکۆف بۆ وەرگرتنی دەستەڵاتە نوێیەکەی ئامادەی ڕۆیشتن بوو، بودیونی لەکاتی خواحافیزی لێکردنیدا وتی...

"فیرقەی چوار لە سوپای سووردا باشترین هێزی سوارەبوو، دەبێت لە پاشەڕۆژدا وەکو خۆی لێبێتەوە و ببێتەوە بە باشترین فیرقە" ژۆکۆف لە گێڕانەوەی

بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت...

"مێژوو هیواو داوکارییەکانی مارشاڵ (بودیونی) هێنایە دی، چونکە زۆکۆف بەو کاروخۆماندوو بوونەی توانی یەکە سەربازییەکانی فیرقەکەو ڕۆحی مەعنەوی و شێوازی شەڕکردنێکی گەورەو بەتوانا لەناو فیرقەکەدا پێکبهێنێتەوەو خۆی سەرپەرشتی پڕچەك کردنی فیرقەکەی کردو بە جۆرەها چەکی نوێ توانی فیرقەکە پڕچەك بکاتەوە. هەروەها سەرپەرشتی پەروەردەکردنی کادرە سەرکردایەتێکانی کرد. کەلە جەنگی دووەمی جیهانیدا لەبەرەکانی جەنگدا تواناو خۆڕاگری و نەترسییەکی بێ وێنەو بەرچاویان نواند."

مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت: "هەمووکات پلانی ڕووبەڕووبوونەوەو مەشقکردنم بە نەهێنییەکی زۆرەوە دەپاراست، خۆی جێگای مەشقکردن و کۆبوونەوەی بۆ سەرکردەکانی یەکە سەربازییەکان دەستنیشان دەکرد. بەجۆرێك دەبوا کەتیبەکان بەڕێگای ناهەموار و ناخۆش و بەربەستی سروشتیدا بڕۆیشتنایە بێئەوەی یەکە ئەندازیارییەکان هاوکاری و پشتیوانیان بکەن، ئەمەش بۆ ئەوەبوو هێزەکان ڕابێن لەسەرئەوەی پشت بە خۆیان ببەستن لەکاتی بەرەنگاربوونەوەی ناخۆش و کاری گران و ناهەمواردا. بەرۆحێکی بەرهەڵستی و خۆڕاگرییەوە نەخشە دابنێن بۆ گەیشتنە مەبەست."

ئەو جۆرە مەشقکردن و ڕاهێنانە لە ڕووی جەستەییەوە لەوپەڕی گرانی و قورس و ناخۆشیدابوو.

سەربازەکان هەندێجار لەبەرماندوبوون و شەکەتییان دەکەوتن و دەبوورانەوە، زۆرجار هەندێك لە سەربازان چەند ڕۆژێکی بەردەوام خەویان لێدەزرا و خواردنیان پێنەدەخورا، بەڵام سەربازو ئەفسەرەکان چەند شادو خۆشحاڵ دەبوون کاتێك دەیانتوانی بەسەر ئەو کێشە ناهەموار و قورسانەدا زاڵ بن کە لەڕێگادا تووشیان دەبوو، بۆ جێبەجێکردن و گەیشتنە مەبەستی ئەو ئامانجەی یەکە سەربازییەکانیان بۆی دەستنیشان کردبوون. زۆکۆف باسی ئەو(شەودانیشتنانەی برادەران) دەکات کە شەوانە دادەنیشتن و کۆڕیان دەبەست بۆ گفتوگۆکردن و بیروڕا گۆڕینەوە و ڕەخنەگرتن و هەڵسەنگاندنی ئەو مەشق و ڕاهێنانانەی

دەورێکی ڕاستەوخۆ و دەنگدانەوەیەکی گەورە و ناوازەی هەبوو لە ڕۆشنبیری کردنی سەربازەکان و بەرزکردنەوەی ورەیان و نواندنی تۆوی نەترس و دڵێری لە دەروونی سەربازەکاندا.

---

لە ساڵی(١٩٣٥)دا هەوڵ و تێکۆشانی فیرقەکە بووە جێگای سەرنج و سووپاسکردن و پێزانینێکی گەورەو بەرچاو. بەو بۆنەوەیەوە مەدالیای لینینیان پێبەخشین کە ئەوە گەورەترین مەدالییای سۆڤێتی بوو، ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەو سەربازەکانی فیرقەکە مەدالیایان وەرگرت.

منیش مەدەلییای لینین یان پێبەخشیم، ئەمانە هەمووی لەناخی دەروونمەوە هەژاندمی و شادی و خۆشی پێ بەخشیم، وایلێکردم بە وردی بیربکەمەوە چۆن بتوانین زیاتر کاربکەین بۆ بەرزکردنەوە و ئامادەباشی ئاستی شەڕکردن و بارودۆخی گشتی فیرقەکە.

ساڵی(١٩٣٥) لە ژیانی ئێمەی سەربازاندا ساڵێکی مێژوویی بوو، چونکە حیزب بۆ بەرزکردنەوە و دەستەڵاتی سەرکردەکان پرۆگرامی پلەی کەسێتی خستە ناو ژیانی سەربازییەوە، لەسەر ئەو بناغەیە(بلوخیر و تۆخاتشفسکی و بودیونی و فورشیلوف و بجوروف) بوون بە یەکەم مارشاڵی یەکێتی سۆڤێتی، بە تایبەت باسی ئەو مەشقکردنە دەکەم کە لە ساڵی(١٩٣٨)دا کرا، بەتایبەت پەڕینەوە لە ڕووباری(بۆیوزینا).

ئەمەش ئەو ڕووبارەبوو کە تێکشکانی هێزەکانی سوپای ناپلیۆنی بە خۆوە بینی لەکاتی گەڕانەوەیاندا لە ڕووسیا ساڵی(١٨١٢)، مەشق و ڕاهێنانەکە بە ئامادەبوون و لەبەرچاوی مارشاڵ فورشیلۆڤی وەزیری بەرگری ئەوسابوو.

بەتایبەت گرنگی و توانای ئەو فیرقەیەی بەناوی خۆیەوەبوو لە ژێر چاودێری کردنی خۆیدابوو.

فورشیلوف لەوکاتەدا چاوی بەزۆرێکی ئەوا نەکەوت کە کاتی خۆی لە شەڕی

ناوخۆدا لەسەرپشتی ولاخ پێکەوە شەڕیان کردبوو، ئێستا لە چاو ڕۆژەکانی ئەوسای ئەو شەڕە ناوخۆییەدا چەند بارودۆخی چەکی سوارە گۆڕابوو.

بەبرادەرە دێرینەکانی دەوت، برادەری دێرینم ئێستا بیروڕات بەرامبەر دەبابە بۆ شەڕکردن چۆنە؟

ئایا لەو باوەڕەدای نا ئومێدمان بکات؟ پێمبڵێ بیروڕای تۆچۆنە؟ فیودور کوشنکۆ، وەلامییدایەوە.

ـ هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە ئەسپ و شیرو ڕمەکانمان بخەینە مۆزەخانە و شوێنە دێرینەکانەوە، ئەوانەش سوودی بۆ نیشتمان هەیە، بەلام پێویستە گرنگییەکی تایبەت بەدەبابە بدرێت، چونکە ئەوە چەکێکی نوێیە کە بجووڵێ و هاتوچۆی پێبکرێت ئەو مەشق و ڕاهێنانە قورسە بە شێوازێکی سەرکەوتوانەی باش کۆتایی پێهێنرا و سەرکردە گەورەکان و سەرۆك و سەربازانی یەکە جەنگاوەرەکانی شاد و دڵخۆش کرد.

پاش چوار ساڵ لە سەرکردایەتی فیرقەی چوار، ژۆکۆف پلەی بەرزکرایەوە بۆ سەرکردایەتی فەیلەقی سوارەی قۆقازی سێ، لەوکاتەوە تاکو ئێستا زیاد لە(٣٠) ساڵ "ئەو کاتە سی ساڵ بوو ئێستا زۆر زۆر زیاترە لەو کاتە" بەسەردا تێپەڕیوە، هەتاکو ئەمڕۆ ئەو بیرەوەرییە خۆش و باشانەم هەر لە بیرماوە، دەربارەی سەربازان و سەرکردەکان و لێپرساوانی سیاسی، ئەوانەی لە ڕیزی فیرقەی چواری قۆقازیدا کاریان لەگەڵ کردبووم.

---

# بەشی پێنجەم

## سەرکردایەتی فەیلەقی سی و شەش- دوای بیست ساڵ لە شۆڕش- گرتن و بڕینی نایاسایی لە ناوسووپادا- لێکۆڵینەوەی ئیشتراکییەت و مارکسییەت-

لەساڵی (١٩٣٧)دا سەرکردایەتی فەیلەقی سوارەی سێی قۆقازیم گرتەدەست. بیست ساڵ بەسەر تەمەنی دەستەڵاتی سۆڤێتیدا تێپەڕ ببوو. بیست ساڵ لە خەبات و تێکۆشانی سەخت و سەرکەوتنی نەمرانە لە بواری ئابوری و رۆشنبیری و هەموو بەشەکانی پێکهاتەی ئیشتراکی و لەو بابەتانەی گەورەترین شاهیدبوون بۆ گەورەیی بیری شۆڕشی تشرینی یەکەم.

"دەوڵەتە ئیمپریالییە زلهێزەکان سوپایەکی گەورە و بێ شوماریان کۆکردبۆوە. بەردەوام سەرمایەی زۆر و زیاتریان تەرخان کرد بۆ خۆ ئامادەکردنی جەنگی نوێ.

لە نێوان ساڵانی (١٩٣٤ – ١٩٣٨)دا ڕێژەی تەرخانکراوی سەربازی لە بودجەی گشتی یاباندا لە (٤٣٪)وە بەرز بۆوە بۆ (٧١٪) لە ئیتاڵیادا لە (٢٠٪)ەوە بەرزبۆوە بۆ (٥٢٪). لە ئەڵمانیادا لە (٢١٪)ەوە بەرز بۆوە بۆ (٦١٪)".

لە ساڵی (١٩٣٥)دا ئیتاڵیا حەبەشەی داگیرکرد. لە ساڵی (١٩٣٦)دا ئەڵمانیا

و ئیتاڵیا پێکەوە، دەستدرێژیان کردە سەر کۆماری ئیسپانیا و شەڕوپێکدادان دەستی پێکرد، نەك هەروا بەسادەیی لە نێوان دەوڵەتێك و دەوڵەتێکی تردا.

بەڵکو گەرمبوونی شەڕوپێکدادان بەگەرمی لە نێوان هێزی کۆنەپەرست و فاشێتیدا و لە نێوان هێزی دیموکراتی و ئیشتراکیدا، بەوپەڕی گەرمییەوە دەست پێکرد.

لە ساڵی(١٩٣٧)دا سوپای سۆڤیاتی بوو بە سوپایەکی بەهێز و هاوچەرخ لەلایەن پڕچەکی و مەشق و ڕێکوپێکی و زانست و خوێندەوارییەوە. نەخوێندەواری بەتەواوی لەناو ڕیزەکانی سەربازاندا بنبڕکراو نەما.

لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنیکی هێزە چەکدارەکاندا ئاستی پیشەیی و خۆئامادەباشی جەنگاوەرانی سۆڤێتی پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆوەبینی، ئاستی فیکری و بیرکردنەوەییان بەرزبۆوە. بۆ نموونە لەسەر ئەوە.. بودجەی ساڵانەی تەرخانکراو بۆ پەروەردە و خوێندن لەناو ڕیزەکانی هێزە چەکدارەکاندا گەیشتە(٢٠٠) ملیۆن ڕۆبڵ، کتێبخانەی یەکە سەربازییەکانی جەنگاوەران نزیکەی(٢٥) ملیۆن پەرتووکیان تێدابوو.

سوپا بەگەرمییەوە هاوبەشی لە ژیانی سیاسی وڵاتدا دەکرد، بەڵام ئەو سەربازە کۆن و دێرینانەی ڕۆژانە ئیسپاتی دڵسۆزییانی کردبوو لە ڕیزەکانی سوپادا نەمابوون، ئەوانە نەبێت کە ژیان ئیسپاتی دڵسۆزییانی کردبوو بۆ دەسەڵاتی سۆڤیاتی ".

سەرکردایەتی نوێ لە کرێکار و جوتیاران پێکهاتبوو، ئەوانەی لە قوتابخانەی شەڕی ناوخۆدا قاڵبوون و دەرچووبوون. یاخود ئەوانەی سیاسییانە لە خوێندنگاکانی هێزە چەکدارەکاندا فێری تەکنیك و پەروەردە ببوون، یاخود ئەوانەی سیاسیانە لە خوێندنگاکانی هێزە چەکدارەکاندا فێری تەکنیك و پەروەردەببوون.

کرێکار و جوتیاران لـە(٧٠٪)ی کادیری سەرکردایەتییان پێکدەهێنا و لە(٥٠٪)ی سەرکردەکانیش سەربە حیزبی شیوعی کە لێپرسراوبوون، لەبەرئەوە ئەو هەڵمەتی گرتن و ڕاونانە لە ڕیزی هێزە چەکدارەکاندا کرا.کارێکی نائاسایی و دیاردەیەکی سروشتی نەبوو، نەدەگونجا لەگەڵ ناوەڕۆك و بنەماکانی ڕژێمدا، بۆ ئەو کات و ساڵی(١٩٣٧)دا کە بەسەر وڵاتدا تێدەپەڕی هیچ پاساوێکی بۆ

نەبوو.

ئەوەی گیرا.. گیرا.. لەناوگیراوەکاندا ناودار و دیاریترین سەرکردەی سەربازییان گرت. ئەم کارەش بەهیچ جۆرێك نەدەشیا بکرایە، چونکە ئەو کارە کاردانەوەیەکی خراپی کردە سەر پێشکەوتنی هێزە چەکدارەکانمان.

من ماوەی حەوت مانگ بەسەرکردەی فەیلەقی سێ مامەوە، هەتا پێشنیارییان بۆ کردم بە گوێزانەوەم بۆ سەرکردایەتی فەیلەقی سوارەی شەشی قۆقازی، بەو بیرۆکەیە زۆر خۆشحاڵ بووم. ئەویش لەبەرچەند هۆیەك لە هەموویان گرنگتر ئەوەبوو ئەو فەیلەقە نوێیە، فیرقەی چواری تێدابوو کە من کاتی خۆی لەمەوپێش ماوەی چوار ساڵ سەرکردەیان بووم، بێگومان دەربارەی ئەو فیرقەیە هەست و پەیوەندییەکی تایبەتم هەبوو.

هەر کە بووم بە سەرکردەی فەیلەقی شەشەم زۆر بە گەرم و بەجدی هەوڵمدا هەرچی مەسەلەیەکی ستراتیژی هەیە وەربگرم، گەرچی من ئەوەم هەست پێدەکرد من هێشتا نەگەیشتوومە ئاستی پێویست، من زۆر بە ئاشکرا دەمخستە پێشچاوی خۆم پێویستە قائید فەیلەق لە ئاستێکی زانیاری زۆر بەرز و فراواندا بێت.

ئالێرەدا هەوڵ و خۆماندوبوونێکی زۆرمدا، بۆ ئەوەی بتوانم ئاستی زانست و زانیاری سەربازی زیاتر بەدەست بێنم و فێرببم، زۆرخۆشحاڵ و شادومان دەبووم کاتێك دەمبینی کۆروکۆبوونەوەکانم یاخود وانەو فێرکردنەکانم بۆ ئەو کۆمەڵە ئەفسەرو ئەرکانی جەنگییانە ئەنجامێکی باش و لەبەرچاوی هەیە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندکارەکانم، من ئەوەم بۆ هەوڵەکانی خۆم بە گەورەترین پاداشت دادەنا.

خۆ ئەگەر فێرخوازان شتێکی نوێ فێرنەبوونایە و سوودیان نەبینایەو شتێك لە شارەزایی سەرکردەکەیانەوە فێر نەبوونایە، بەبۆچوونی من ئەو وانانە خەنجەرێکی کوشندەو ڕاستەوخۆبوو بۆ ویژدانی ئەو سەرکردەیەو نیشانەی نەشارەزایی و بێتوانایی ئەو سەرکردەیەبوو.

ڕاستییەکی ناخۆشیش هەبوو، ئەوەش ئەوەبوو ئێمە ژمارەیەکی کەممان نەبوو.. لەو سەرکردانە زانیارییەکی ئەوتۆیان نەبوو، زانیارییەکەیان لە زانیاری

ژێر دەستەکانیان زۆر کەمترو زیاتر نەبوو.

من مەسەلە سەربازییەکانم بەشێوەیەکی دوورودرێژ و دایمی و بەگەورەیی هەنگاو بە هەنگاو بەشێوەی تیۆری و کردەوەیی تاووتوێ دەکرد، تیۆرییەکانی مارکس و لینین، باس لەدوای باس فێربووم و شارەزایان بووم، بێ ئەوەی هیچ پلانێکیان بۆ دابنێم.

لە کۆتایی ساڵی(١٩٣٨)دا زۆکۆف هەڵبژێردرا بۆ پلەوپێگەی یاریدەدەری سەرکردەی هێزەکانی ناوچەی بیلورووسیای سەربازی بەپێی ئەو پلە نوێیەم دەبوا من لەکاتی ئاشتیدا سەرکردایەتی ژمارەیەك لە جەنگاوەری یەکەکانی سوارچاکان بکەم.

لەکاتی جەنگیشدا دەبوا من سەرکردایەتی کۆمەڵانی سوارەکانی میکانیکی بکەم کە ژمارەیان(٤) فیرقە تا (٥) فیرقەی سوارەبوو. هەروەها (٣ تا٤تا٥) فیرقەو چەند یەکەیەکی سەربازی تر یارمەتییان بدەم. من زۆر پەرۆش نەبووم ئەو فەیلەقەی لەگەڵیاندا ڕاهاتبووم بەجێ بهێڵم، بەڵام پاشەڕۆژی کارم لەگەڵ ئەو پێکهاتە مەیدانیە گەورەیەدا کارێك بوو لە ئاستیدا خۆڕاگری بۆ نەدەکرا. لەبەرئەوە بەو هەڵبژاردنە قایلبووم، پاش ئەوەی خواحافیزیم کرد لەو یەکە سەربازییانەی لە ژێر دەستمدابوو.

سەفەرم کرد بۆ(سمولینسك) کە بارەگای سەرکردایەتی ناوچەی بیلورووسیای سەربازی بوو.

لەوێ زۆر بە گەرمی(کافالوف) سەرکردەی ناوچەکە پێشوازی لێکردم، لە کاری سەرکردایەتی کردنم لە هەر دووفەیلەقی سێ و شەشەمدا بە شارەزایی و زانیارییەکی گەورەو بێ وێنەوە هاتمەدەرێ، هەموو کاتێك هەستی چاکە و باشییەکی زۆرم دەکرد بەرامبەر ئەوانەی لە کارەکانمدا یارمەتییان داوم، بەرامبەر ئەوانەی بەشەرەفەوە لە پێناوی پێشکەوتن و بەرزکردنەوەی ئاستی بەرگری کردنی نەتەوایەتیدا کاریان دەکرد.

# بەشی شەشەم

(جەنگی چاوەڕواننەکراو لەناو ڕووباردا)
یابان مەنگۆلیا داگیردەکات-زۆکۆف سەرکردایەتی دەگرێتەدەست- یابانییەکان لەشەڕدا خۆڕاگری دەنوێنن- یەکەم دیدار لەگەڵ ستالیندا- خەتەری نازییەکان-

لە کۆتایی مانگی (ئایاری١٩٣٩)دا زۆکۆف فەرمانێکی پێگەیشت گورج بۆ چاوپێکەوتن بچێتەلای وەزیری بەرگری سۆڤیاتی مارشاڵ فۆرشیلوف.

زۆکۆفیش بۆ مۆسکۆ سواری شەمەندەفەردەبێت و لە بەیانی ڕۆژی(٢ی حوزەیراندا) دەگاتەجێ.

پاش ڕێزو سڵاو لە یەکترکردن فۆرشیلۆف، وتی

- "هێزەکانی یابان هێرشێکی کتوپڕیان کردۆتە سەر کۆماری مەنگۆلیای میللی، بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیەی نێوان یەکێتی سۆڤێتی لە ڕۆژی(١٢ی ئازاری ساڵی١٩٣٦)دا لەگەڵ مەنگۆلیادا لەسەری ڕێکەوتوون.

رووسیا بریاریداوە بۆ هەر دەستدرێژییەکی دەرەکی بۆ سەر مەنگۆلیا، بەرگری لێ بکات. ئەمەش نەخشەی ناوچەی ڕووداوەکەیە لە(٣٠ ئایار)دا"، پاش باسکردن و ڕوونکردنەوەی هەڵوێستەکە، فۆرشیلۆف، وتی

"ئایا تۆ ئامادەی خێراسواری فڕۆکە بیت و گورج بگەیتە ئەوێ بۆ شوێنی ڕووداوەکە؟، ئەگەر بارودۆخ پێویستکات کاری سەرکردایەتی بگریتە ئەستۆ؟

زۆکۆف بە کورتی وەڵامیدایەوە.

-هەر ئێستا و لەم خولەکەدا ئامادەم بڕۆم سواری فڕۆکەببم..!! زۆکۆف گەیشتە مەنگۆلیاو و گفتوگۆ و ڕاوێژی لەگەڵ سەرکردەکانی هێزەکانی مەنگۆلیاو سەرکردەکانی هێزە تایبەتەکانی سۆڤیاتیدا ئەنجامدا، پاش تاووتوێ کردنی هەڵوێستەکە لە هەموو بارێکەوە.

زۆکۆف بۆی ڕوون بۆوەو تێگەیشت ئەو هێزانەی لە مەنگۆلیادان ناتوانن و توانای ئەوەیان نییە سەرکەون بەسەر ئەو کێشەو دەستدرێژکردنەی هێزە سەربازییەکانی یاباندا، بەتایبەتیش ئەگەر یابانییەکان بەردەوام بێت و درێژەبە هێرشەکانی بدات بۆ ناوچەکانی ترو بەرەو ئاراستە جوگرافیا نوێیەکان، زۆکۆف تەلگرافێکی کتوپڕی بۆ وەزیری بەرگری نارد و لەو تەلگرافەدا پلانێکی هەڵمەتی سەربازی هێزەکانی سۆڤیاتی و مەنگۆلی بۆ وەزیر تیادا پێشنیارکرد.

بۆ ڕۆژی دوایی زۆکۆف تەلگرافێکی پێگەیشت، لەو تەلگرافەدا مارشاڵ فوشیلوف ڕەزامەندی تەواوی و بەرزنرخاندنی خۆی بۆ پلانەکەی زۆکۆف دەربڕی.

ئەو کاتە زۆکۆف داوای یارمەتی و ناردنی هێزی تۆپ و دەبابە و فڕۆکەکرد، پلانەکەی زۆکۆف سەرکەوتوانە توانی لەگەڵ ئەو هەموو پرچەکی و توانا زۆر و گەورەیەی دوژمنەکەیدا کە هەیبوو، بەسەر ئەو هێزە دەستدرێژکەرو داگیرکەرانەی یاباندا زاڵ بێت کە لە ڕووباری(خالجیین جول)ەوە پەڕیبوونەوە و لە شاخی(بابن تساجان)دا جێگیرببوون، تەنها وەرەقەی جۆکەرێك کە بە دەستمانەوەبوو، کەتیبەی سوارەی میکانیکی بوو، لەبەر ئەوە بڕیارماندا بێدواکەوتن و بێ هیچ سستییەك هێرشێکی کتوپڕی فڕۆکە بکەینە سەر ئەو هێزانەی یابانییەکان کە هێشتا باش دانەمەزرابون و نەیانتوانیبوو سەنگەر و بەربەستی بەرگری دژە دەبابەیان دانەمەزراندبوو.

هەربەراستی دوژمن چاودێری چالاکی و جوڵەی دەبابەکانمانی دەکرد و لە کەمیندابوو، بەڵێشاو ئاگری گوللە تۆپەکانی بەسەردا داباراند و بەگەرمی تۆپ بارانی دەبابەکانمانیان دەکرد. دوژمنان نەیانتوانی خۆیان حەشاربدەن، چونکە

سەدەها کیلۆمەتری دەشتەکان دیارو ئاشکرابوون، هەتا گیاشی پێوەنەبوو، هێزەکانمان لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیان دابوون.

شەڕوپێکدادان بە درێژایی ڕۆژوشەوی(٤ی تەمموز) بەردەوامبوو. لە سەعات سێی بەیانی(٥ی تەممووزدا) بە تەواوی بەرگری دوژمن کۆتایی پێهات. ئەو شەڕوکوشتارە هەزارەها کوشتاری لێکەوتەوەو گردۆلکەی ئەسپی کوژراو و پاشماوەی ژمارەیەکی گەورەو بێ شوماری تۆپی هەمە جۆرەو ئۆتۆمبیلی دوای خۆی جێهێشت. لەشەڕی ئاسمانیشدا دوژمن(٤٥) فڕۆکەی لە دەستداو تێکشکێنران. بۆ ماوەیەك دوژمن هەر بەدەورییەی هەواڵگری چاودێری دەکرد. پاشان لە(١٢ی ئابدا) بەکەتیبەیەکی پیادە و بەپشتیوانی تۆپ و ئۆتۆمبیلی زرێ پۆش و دەبابەو هێزێکی ئاسمانی کە بریتی بوو لە(٢٥) بۆمب هاوێژ، دەستی بە هێرش کرد. لەو هێرشەدا دوژمن توانی شاخی(گلە گەورە) داگیر بکەن و دەست بەسەریدا بگرێت، هێزەکانیان خۆیان تیادا حەشاردا و خۆیان قایم کرد.

هێزە هاوبەشەکانی سۆڤێتی و مەنگۆلییەکانیش خۆیان ئامادە کرد بۆ هێرش کردنێکی بەربلاو بەمەبەستی ئەوەی ئەو هێزانەی یابانییەکان کە هاتبوونە ناو خاکی مەنگۆلیاوە بە تەواوی لێیان پاك بکەنەوەو لە ناویان بەرن.

لەسەر ئەو بناغەیە سەرکردایەتی داوای لە مۆسکۆ کرد یارمەتی و پشتیوانی نوێ و زیاتریان بۆ بنێرێت. لە(٢٠ی ئابی **١٩٣٩**)دا هێرشە بەربلاوەکە دەستی پێکرد بۆ گەمارۆی دوژمن و لەناوبردنیان.

شەڕوپێکدادانێکی گەرم و گران بە درێژایی ڕۆژانی(٢٠ و ٢١ و٢٢) دەستی پێکرد.

لەو ماوەیەدا دوژمن بەرگرییەکی ئازایانە و خۆڕاگرییەکی بێ وێنەیان نواند، بەتایبەت لە شاخی(گلە گەورە)دا بەرگری بە شێوەیەکی ئەوەندە بەهێزبوو، ئێمە چاوەڕوانی شتی وامان نەدەکرد.

بەناچاری لێوای زرێ پۆشی یەدەکیمان بەپشتیوانی تۆپەکانەوە بۆ یارمەتیدانی هێزەکانمان نارد.

لە بەیانی ڕۆژی(٢٦ی ئابدا) هێزەکانمان هەردوو باڵی هێزەکانی دوژمنیان

شکاند.

بەسەرکەوتوانە توانییان ڕیزی کۆمەڵانی لەشکری شەشەمی یابانی گەمارۆبدەن، شەڕوپێکداداان بە توندی بەردەوام بوو، بۆ ئەوەی یەکە سەربازییەکانی دوژمن یەك لە دوای یەك لێکهەڵبوەشێنن و بە تەواوی لە ناویان بەرن، یەکە سەربازییەکانی یابانییەکان تادوا سەربازیان شەڕیان کرد. لە کۆتاییدا سەربازەکان هەستیان بەو درۆیەکرد، کە دەیووت لەشکری ئیمپراتۆری ناشکێت، ئەوان بە چاوی خۆیان ئەوەیان بینی کە هێزەکانیان لەو ماوەی چوارمانگەدا نەیانتوانی سەرکەوتنێك لەو شەڕو پێکدانانەدا وەدەست بێنن.

# لەگەڵ ستالیندا

لە(٣٠ی ئابدا) بە تەواوی هێزەکانی سوپای شەشی یابانی لەناوبران، بەڵام زۆکۆف هێزەکانی هەر لە مەنگۆلیادا هێشتەوە، هەتاکو لە(١ ئایاری ساڵی١٩٤٠)دا بانگهێشتکرا بۆ مۆسکۆ، بۆ ئەوەی بچێت بۆ وەزارەتی بەرگری، تارێنمایی وەرگرێت بە دامەزراندنی بۆ پلەو پایەی نوێ.

"پاش چەند ڕۆژێك یوسف ستالین خۆی پێشوازی لێکردم پێش ئەوەی بچم بۆ بینینی لەو چوونەمدا زۆر دەترسام، چونکە من لەمەوپێش نەمبینی بوو".

لە نوسینگەکەیدا لەگەڵ ستالیندا -کالفین و مۆلۆتۆف-و چەند کەسێکی تری ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لەگەڵدابوو، ستالین سەبیلی دەکێشا، هەرکەچوومە ژوورەوە گورج لێیپرسیم..

ـ ها.. سوپای یابانی چۆن هەڵدەسەنگێنیت..؟

ـ "ئەو سەربازانەی لە خالجین جۆلدا شەڕمان لەگەڵداکردن سەربازانێك بوون زۆر بەباشی مەشقیان پێکرابوون، بەتایبەت لە شەڕی کەم خایەندا زەبت و ڕەبت و گوێڕایەڵ بوون، ئازاو نەترس و لەشەڕکردندا بێ وێنەبوون، بەتایبەت لە حاڵەتی بەرگریدا.

ئەفسەرە پلە نزمەکانیان بە شێوەیەکی بەرز و بەتوانا ڕاهێنرابوون، نەترس بوون، بە ئازاییەکی بێ وێنەوە دەجەنگان ترسیان لە هیچ نەبوو، بەڵام ئەفسەرە پلەمام ناوەندییەکانیان و ئەوانەشی پلەیان بەرزبوو، ڕاژەی ڕاهێنان و مەشق کردنیان کەمبوو ڕۆحی هەڵپەو دەستپێکردنی شەڕیان تێدانەبوو. هەروەك نەریتە کۆن و پێشووەکەیان زیاتر حەزیان بەسەرکردایەتی دەکرد، بەڵام دەربارەی ئاستی تەکنیکی لەشکری یابانی بەبۆچوونی من لە ئاستێکی نزم و دواکەوتوودابوون.

دەمەوێت ئاماژە بۆ ئەوەبکەم سەرەتا هێزی ئاسمانییان زۆر لە هێزی ئاسمانی هیزەکانی ئێمە بەهێزترو سەرکەوتووتربوون، هەتا فرۆکە جەنگییە نوێیەکانمان گەیشت لە جۆرەکانی(تشایکا) و(A١٦) کاتێك کۆمەڵێك فرۆکەوانی قارەمانی سۆڤیاتی بە سەرکردایەتی(سمرشکیفیتس) گەیشتن و دەستیان گرت بەسەر ئاسمانی ناوچەکەدا.

ئیتر ئەوکاتە دەسەلأت و ورەی ئێمە زۆر بـەرزوروون و ئاشکرا دیاربوو، شایانی باسە ئێمە لەوشەڕەدا ڕووبەڕووی باشترین و هەڵبژاردەترین سوپای یابانی بووینەوە، ئەو سوپایەی پێدەڵێن"یەکەکانی ئیمپراتۆری"، ستالین زۆرگرنگی بەوتەکانم دەدا، و بە وردی گوێی بۆ شلکردبوو، پاشان لێیپرسیم.

ـ ئەی هێزەکانی ئێمە چۆن شەڕیان دەکرد..؟

زۆکۆف بە دوورودرێژی باسی شەڕەکەی بۆ کرد و هەڵیسەنگاند، دەڵێت سەرنجمدا ستالین بەپەرۆشەوە گوێی بۆ قسەکانم گرتبوو..وتم:

ـ دەربارەی هەموو هێزە سەربازییەکانمان و سەرکردەکانی یەکە سەربازییەکانمان و دەربارەی خودی خۆم بەتایبەت ئەو شەڕەی لەسەر ڕووباری"خالجین جول)دا کرا قوتابخانەیەکی سەربازی بە تواناو چاکبوو، بۆ شارەزایی شەڕکردنی سەربازەکانمان، من لەو باوەڕەدام لایەنی یابانی سوود و ئەنجامێکی وردتر بەدی دێنێت و دەرس لە هێزو توانای لەشکری سوور دەبینێت، لە قسەو گفتوگۆکەماندا(کالیفین) خۆی تێهەڵقورتاندو دەربارەی مەبەستی حوکومەتی یابانی بۆ ئەو دوژمنکارییە لە زۆکۆفی پرسی، زۆکۆف وەڵامیدایەوە..

ـ بەبۆچوونی من مەبەستی ئەو هەڵمەتە "گرتنی ئەو زەوییانەی مەنگۆلان

که کەوتوونەتە پشت رووباری خالجین جۆڵەوە بۆ ئەوەی ئەو شوێنانە داگیر بکات و بیکاتە شوێن پێگەی نوێ بۆ دڵنیایی پاراستنی ئەو هێڵە ئاسنینە ستراتیژییەی یابان دەیەوێت رایبکێشێت لە سنوری یەکێتــی سۆڤیاتیدا کە کەوتۆتە دوای(بێکال)ەوە."

لەوکاتەدا ستالین وتی..

ـ ئێستا شارەزایی تەواوت لە شەڕوپێکدادانەدا هەیە، برۆ سەرکردایەتی دەڤەری سەربازی(کییف) بگرە دەست و شارەزایی خۆت لە ئامادەکردنی هێزەکانی ئەوێ بۆ شەڕوپێکدادان دەربخە، من چونکە ماوەیەك لە مەنگۆلیادابووم. نەمتوانی بە دوورودرێژی سەرنج و بەدواداچوونی ئەو شەڕانەبکەم کە لە نێوان ئەڵمانیا لەلایەکەوە و لە نێوان ئینگلتەرەو فەرەنسادا لەلایەکی ترەوە دەکرا، فرسەتم بینی و پرسیم..

ـ تێگەیشتنی ئێوە لەو تەبیعەتە سەلبییەی ئەو شەڕەی لە وڵاتە رۆژئاواییەکاندا دەکرێ چۆنە...؟

بۆچوونی ئێوە دەربارەی پەل هاویشتن و پێشکەوتنی کارە سەربازییەکانی پاشەرۆژچۆنە..؟

ستالین دەستی بە پێکەنین کرد و وەڵامییدایەوە..

ـ حکومەتی بەریتانیا بە سەرۆکایەتی(تشمبرلن)، نایانەوێت بەراستی لەگەڵ هیتلەردا بجەنگن.. ئەوان تاکو ئێستا بەهیوای ئەوەن هیتلەر هەڵنێن شەر دژ بەیەکێتی سۆڤیاتی بکات، ئەوان لەساڵی(١٩٣٩)دا نەیانویست لەگەڵ ئێمەدا پەیوەندییەکی دۆستانە دژ بە هیتلەرییەکان ببەستن، بەڵکو ئەوان ئومێدو ئارەزوویان لەوەبوو دەستی هیتلەر نەگرن لە دژایەتی کردنی بۆ سەر یەکێتی سۆڤێتی، بەڵام شتی وا هەرگیز روونادات و نایەتەدی... لەسەر ئەو سیاسەتە کورتبینی نییە یان، پاشەرۆژ نرخێکی گران لە سەریان دەکەوێت.."

پاشان هاتمەوە بۆ ئۆتێل مۆسکۆ، ماوەیەکی زۆر خەوم لێنەکەوت لەبەر ئەو کاریگەرییەی کە بە ئەندامانی لیژنەی مەکتەبی سیاسی گەیشتم.

رووکەشی دەرەکی ستالین کاری تێکردم و منی زۆر هەژاند.. بە دەنگە

سووکەکەی و سەرنجدانەکەی و بیرەقووڵەکەی و شارەزاییە زۆرەکەی لە مەسەلە سەربازییەکاندا و ئەو گرنگی و گوێ گرتنە زۆرەی کە بۆ وتەکانی من دەیدا.

---

# بەشی حەوتەم

## سەرکردایەتیکردنی هێزە تایبەتییەکان لە دەڤەری(کییف)ی سەربازیدا
## ـ هێتلەر ئەوروپا داگیر دەکات- ستالین بانگەشەی هاوپەیمانێتی دەکات لەگەڵ بەریتانیا و فەڕەنسادا دژی فاشیستەکان- بەریتانیاو فەڕەنسا هاوپەیمانێتی ناکەن-

"دامەزراندنم بە سەرکردەی گەورەترین دەڤەری سەربازی سەبارەت بە من شەرەفێکی گەورەبوو.

هەرچیم لە توانادابوو خستمەگەڕ بۆ ئەوەی بیسەلمێنم کە من لەلایەن لیژنەی مەرکەزی و حکومەتی سۆڤیاتییەوە شایانی ئەو پشت پێ بەستن و بڕوا گەورەیەم..."

زۆکۆف شادوخۆشحاڵ بوو بە گواستنەوەی بۆ شوێنە نوێیەکەی چونکە دەڤەری- کییف- لە نێوان پێوەندە سەربازییەکانی سۆڤێتیدا، دەربارەی ئاستی تەکنیکی و مەشقکردن، لە ئاستێکی بەرزدابوو. هەروەها ژمارەیەکی زۆری سەرکردەی بەتواناو بە ناوبانگی گەورەو بەرزی تێدابوو، لەوانە..

ـ یورکایف- باکوفلیڤ- موزیتشنکو- کوستنکو- روبتسیف- باجرامیان- بتوخیمد.



زۆرکۆف بە درێژاییساڵی(١٩٤٠) ئەو بەشانەی بەسەرکردەوە کە لە ژێر سەرکردایەتی ئەودابوون، هەرهەموو ئەوانەی ئەو سەردانی کردن گشتیان بەڕاستی پێشوازییەکی گەرمی ئەو هاتنەیان لێکرد.

هاوین و پایزی ساڵی(١٩٤٨) مەشقکردنێکی قورس و گران کرا لە ناوچەی(کییف)دا بۆ فێربوون و سوودوەرگرتن لەو دەرسانەی لەو دوو جەنگەوە کە لەشکری سوور دژی یابانییەکان و فنلەندییەکان کردیان، هەروەها لەوکار و چالاکییە سەربازییانەی لە ڕۆژئاوادا دەکرا، لەوماوەیەشدا جەنگی دووەمی جیهانی گڕوتاوی سەندبوو، ئەو جەنگە بەرەی(بەرلین-ڕۆما)ی دوژمنکاری دروستکردبوو، هەروەها بەرەی(هاوپەیمانی دژی کونترن)ی دروستکردبوو، لە نێوان ئەڵمانیاو یاباندا.

لەوشتە سەیروسەمەرانەی لەو ماوەیدابوو، مارشاڵ زۆکۆف ئەوە دەگێڕێتەوە، چۆن حکومەتی پۆڵندی ئەو دەستی یارمەتییەی لەشکری سووری ڕەتکردەوە،

دژی ئەو هەڕەشانەی کە نازییەکان بۆ سەر پۆڵندە دەیانکرد.
پۆڵندییەکان چۆن خۆقایم کردنی خۆیان دەنرخاندو هێزەکانی خۆیان لەسەر سنووری ڕۆژهەڵاتی خۆیاندا کۆکردبۆوە و لە ئامادەباشیدا بوون بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و شەڕکردن لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتی(ئەوسا)دا.
کەچی هێزە هیتلەرییەکان لە باکور و باشوور و ڕۆژئاواوە هێرشیان دەکاتە سەرو زۆربەخێرایی دەست بەسەر جبەخانەکانی چەکو زەخیرەیاندا دەگرێت و داگیریان دەکات.
ئەی لەم بارودۆخە ناهەموار و ئاڵۆزەدا حاڵی لەشکری سوور چۆن بوو؟
ستالین لە کۆنگرەی هەژدەهەمی حیزبدا، لەو ڕاپۆرتەی کە پێشکەشی بە حیزب کرد، خەتەری جەنگی نوێی ئیمپریالییەکانی خستەڕوو. وڵاتەکەی ئێمەش بەردەوام بێ ماندووبوون لە پێناوی پاراستنی ئاشتیدا کاردەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام کاری گەورە دەکات بۆ زیاتر خۆئامادەکردنی بواری جەنگی و پرچەککردنی لەشکری سوور و کەشتیگەلە جەنگییەکانمان، لە ڕاستیشدا ئەم کارانە هەر وان، لە کاتێکدا یەکێتی سۆڤێتی(جاران) تادوا هەناسە ڕاستبوو لە هەوڵەکانیدا بۆ پێکهێنانی پەیرەو و پرۆگرامێکی بەرگریکردن لە ئەوروپا لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسادا.
ڕاستی و دڵسۆزی سۆڤێتی گەیشتە ئاستێك کە لە بەردەمی ئەو دوو نێراوە سەربازییانەی فەرەنسا و بەریتانیادا بەڕاشکاوی زۆرێکی زۆری نەهێنی بەرگری نیشتمانی خستەڕوو، بەڵام ئەو دوو دەوڵەتە بۆ ئەو کۆبوونەوە سێ قۆڵییە سەربازییە تەنها دووکەسیان بە نوێنەرایەتی نارد.
ئەوانیش زۆر بە ڕاشکاوییەوە ڕایانگەیاند و ددانیان بەوەدانا، کەئێمە لە کەسایەتییە پلە دووەکانیین.
لە ڕێنماییە نهێنییەکاندا بۆ نوێنەرانی بەریتانی بەڕاشکاوی ئەوە ڕاگەێنرابوو کە:
ـ بەریتانیا نایەوێت هیچ بەرپرسیارێتییەکی دەست نیشانکراو بخاتە سەرشانی خۆی کە ببێتە هۆی ئەوەی دەست بەستراوی بکات، داوای لە نوێنەرانی کرد کە

دانووسان بەوپەڕی سستی و هێواشییەوە ئەنجام بدەن لەگەڵ ڕووسەکاندا بە ئاگادارییەوە بجووڵێنەوە دەربارەی ڕێکەوتننامەی سەربازیش پێویستە نوێنەران هەتا دەتوانن ڕازیبن بە شێوازی گشتی.

زۆکۆف لە بیروەرییەکانیدا ئەو دەقە فەرمییەی کۆبوونەوەکانی نوێنەرانی سەربازی سۆڤیاتی و بەریتانیی و فەرەنسی باس دەکات، لە(١٥ی ئابی ساڵی١٩٣٩)دا (شایوشنیکوف)ی سەرۆك ئەرکانی جەنگی هێزە چەکدارەکانی سۆڤێتی دەڵێت:

ـ لەشکری سوور لە بەشە ئەوروپیەکەی یەکێتی سۆڤیاتیدا بۆ بەرهەڵستی دوژمنکاری فاشی یەکان لە ئەوروپادا(١٢٠) فیرقەی پیادەو(١٦) فیرقەی زرێپۆش و(٥) هەزار یەکەی تۆپی مەیدانی قورس و(٩) هەزار تا(١٠) هەزار دەبابەو (٥٠٠٠)هەزار تا(٥٥٠٠) فڕۆکەی جەنگی بۆمب هاوێژ و شەڕکەر و جگە لەو هۆی گواستنەوە ئاسمانییانەی خستبووە ژێر دەستی بەرەی جەنگەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنکاری فاشیستەکان لە ئەوروپادا.

## هاوکاریکردنی ڕووسیا

سێ ئەگەری هاوکاریکردنی ڕووسیا هەیە بۆ جەنگ، ئەویش.

یەکەم: ئەگەر هاوپەیمانانی دوژمن دەستدرێژی بکەنەسەر بەریتانیاو فەرەنسا ئەوکاتە یەکێتی سۆڤێتی(ئەوسا) بەرێژەی لە(٧٠٪)ی هێزەکانی خۆی دەنێرێت بۆ یارمەتی و هاریکاری کردنی ئەو هێزانەی بەریتانیا و فەرەنسا کە ڕووبەڕووی دوژمنی سەرەکی ئەڵمانیا دەبنەوە.

هەروەها کەشتیگەلی سۆڤیاتی لە باکوردا هاوکاری لەگەڵ هەردوو کەشتیگەلی بەریتانی و فەرەنسیدا دەکات لەو چالاکییە سەربازییانەی لە ڕۆخەکانی فنلەندەو نەرویجدا دەکرێت لە دەرەوەی ئاوەکانی ئیقلیمی ئەو دوو

دەوڵەتەدا، هەروەها کەشتیگەلی سۆڤیاتی لەو کارە سەربازییانەی لە رووباری بەڵتیقدا دەکرێت هاوکاری دەکات و ژێر ئاو گەرەکانی(غواصە) سۆڤێتی رێگا لەناردنی ئەو مادە ئەوەلییانە دەگرێت کە بەشێوەی کۆمەك لە سویدەوە بۆ دوژمنی سەرەکی دەنێرێن.

دووەم: ئەگەر هێرش و دوژمنکاری بکرێتە سەر هەردوو دەوڵەتی پۆڵەندەو رۆمانیا، بەریتانیا و فەرەنسا لەگەڵ هــەردوو دەوڵەتی قوربانیانی ئەو دوژمنکارییەدا، رێکەوتبوو کە رێگابدات هێزەکانی سۆڤیاتی بەخاکەکەیاندا رەت ببێت، یەکێتی سۆڤیاتی ئامادەیە بەرێژەی(١٠٠٪) هێزە چەکدارەکانی یەکسەر بنێرێت لەو رێژەیەی کە بەریتانیا و فەرەنسا دەیانێرێت بۆ شەرکردن دژی ئەڵمانیا.

دەربارەی(مەجهودی حەربی) دەریایش کەشتیگەلی سۆڤیاتی لەگەڵ ئەو دووکارەی باسکرا لە ئەگەری یەکەمدا، بەر پرسیارێتی ئەوەدەخاتە سەرشانی خۆی کە نەهێڵێت کەشتیگەل یاخود ژێر ئاو گەرەکانی(غواصە) دوژمن دزەبکەنە ناو دەریای رەشەوە.

سێیەم: ئەگەر دوژمن لە رێگای زەوییەکانی (ئەستۆنیا و فنلەندە و لاتیفیا)وە هێرشیان کردەسەر یەکێتی سۆڤێتی، پێویستە بەخێرایی بەریتانیا و فەرەنسا بەگورجی بێنە ناو شەرەکەوە دژ بە دوژمن یاخود هاوپەیمانانی دوژمنکاران. هەروەها پێویستە پۆڵندە کە هاوپەیمانە لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسادا بێتە ناو جەنگەوە دژ بە ئەڵمانیا و رێگا بەهێزەکانی سۆڤیاتی بدات بەخاکی پۆڵەندەدا رەت ببێت.

وە بەریتانیا و فەرەنسا بەرێژەی(٧٠٪)ی هێزەکانی سۆڤیاتی کە لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد، هێزەکانی خۆیان لەبەشە سنوورەکانی ئەوروپایی یەکێتی سۆڤیاتیدا کۆبکەنەوە. هەروەها پێویستە هێزە دەریاییەکانی بەریتانیا و فەرەنسا هەستێت بەو(مەجهود حەربی)یەی لە ئەگەری یەکەمدا دەست نیشانکراوە.

لە(١٧ی ئابی ١٩٣٩)دا (لوکینتوف)ی سەرکردەی هێزەکانی سۆڤیاتی وتەیەکیدا باسی لە چۆنێتی هونەری سەرەکی فرۆکەکانی سۆڤێتی کرد و باسی

تواناو دروستکردنی فڕۆکەی کرد، و باسی ئامادەباشی بواری شەڕکردنی هێزەکانی کردو ئەو هاوئاهەنگی و یارمەتیدانەی کارە سەربازییانەی نێوان هێزەکانی وشکانی و دەریایی و ئاسمانی کرد.

باسی ئەوەشی کرد هێزە ئاسمانییەکانی سۆڤیاتی خەڵکانی بێگوناه و بێلایەن ناکاتە ئامانجی لێدان و کوشتنیان. مارشاڵ(بیرنیت)یش لەسەر وتەکانی(لوکیشنتوف) وتی...

-"دەمەوێت لە بریتی هەردوو نوێنەرانی بەریتانی و فەرەنسییەوە سوپاسی جەنەراڵ لوکیشنتوف بکەم بۆ ئەو وتە وردورێکوپێك و جوانانەی کە دەری بریبوو، من ئەو تواناو ڕێکوپێکییەی سۆڤێت کاری گەورەی کردۆتەسەرم کە یەکێتی سۆڤیاتی توانیویەتی بە هۆیانەوە ئەو بەرهەمە گەورەو دیارە بەدەست بێنێت لە بواری دروستکردنی هێزە ئاسمانییەکانیدا".

## چی ڕوویدەدا.. ئەگەر..؟

مێژوونووسان و نوسەرانی بیرەوەرییەکان ئەم پرسیارە تەقلیدییە کۆنە دووبارە دەکەنەوە.

"چی دەبوو... ئەگەر...؟

هەر بەڕاستی چی ڕووی دەدا ئەگەر بەریتانیا و فەرەنسا لەساڵی(١٩٣٩)دا ڕازی بوونایە بەو پێشنیارەی یەکێتی سۆڤیاتی(ئەوسا) بەیەکخستنی ئەو(مەجهود حەربی)یە دوژمنان و داگیرکەران؟!! بێشك پاشە ڕۆژی ئەوروپا بە بارێکی تردا دەگۆڕا، لە ناوەڕاستی مانگی نیساندا مەکتەبی سیاسی حیزب بانگەوازی کۆبوونەوەیەکی فراوانی کرد بۆ ئەنجومەنی(سەربازی باڵا) کە گەورە سەرکردەکانی

تێدا ئامادەبێت بۆ باسکردنی ئەو مەبدەئە سەرەکی و بناغەییانە بۆ ئامادەباشی و ڕاهێنانی هێزە چەکدارەکان لەسەر ڕۆشنایی بارودۆخی ئێستادا.

لیژنەی مەرکەزی بڕیاریدا لیژنەیەکی سەربازی تایبەت پێکبهێنێت بە سەرۆکایەتی(جرانوف و فوزنیسینسکی) بۆ سەرپەرشتی کردنی کارەکانی وەزارەتی بەرگری. لەسەر ڕێنمایی(لیژنەی مەرکەزی) و(ئەنجومەنی سەربازی بالا) وەزارەتی بەرگری بڕیارێکی دەرکرد کە...

-"خۆ ئامادەکردنێکی سەربازی و سیاسی بۆ هێزە چەکدارەکان لە ماوەی هاوینی ساڵی ١٩٤٠دا پێکبهێنێت."

ئەو بڕیارە ئەوەی دەگەیاند بە کردەوەیی سەر لە نوێ هێزە چەکدارەکان و کارە سیاسییەکان ڕێکبخرێنەوە، بۆ ئەوەی جەنگاوەران بەکردەوە هەردەم لە ئامادەباشیدابن و مەشقکردنیان بەرۆحێکی شەڕکردنی ڕاستییەوە بێت بە هەموو مانایەکی ئەگەری ڕوودانی جەنگ.

لە(٨ی مانگی ئایاری ساڵی١٩٤٠)دا تیموشنکو بە وەزیری بەرگری دانرا.

بەدانانی ئەو مەشقکردنی سەربازی چووە ئاست و دۆخێکی ڕاستەوە، بەو شێوەیەی لە پاشەرۆژی جەنگدا دەکرا، وامان لێهات سوودی تەواو باشمان لە بارودۆخی ژینگەو بەرگری و بۆ هێرشکردن پشتمان بە هەواڵگران بەست ئێمەش بەردەوام سووربووین و جەختمان لەسەر ئەوەبوو جەنگاوەران ڕابهێنین و بڕوایان پێپەیدابکەین کە یەکە سەربازییەکان نابن بەهێزێك کە دوژمن بترسێنێت، هەتا باری شەڕکردن و خۆئامادەکردنی هەر هەموو جەنگاوەرانی لە ئاستێکی بەرزو بەتوانادا نەبێت. لە کۆتایی مانگی (ئەیلولی١٩٤٠)دا بڕیاردرا کۆبوونەوەی گەورە سەرکردەکان لە مۆسکۆدا پێکبهێنرێت.

وەزیری بەرگری داوای لە من کرد، نوسراوێك ئامادەبکەم لەسەر -(شێوازی کردارەکانی هێرشکردنی نوێ) بنووسم، دەبوو من نوسراوەکەی خۆم لە یەکی تشرینی دووەمدا پێشکەش بە وەزیری بەرگری بکەم، ئەو کۆبوونەوەیە لە دەورەیەکی خوێندنی لێکۆڵینەوە دەچوو لەسەر ئاستێکی بەرزدا.

داوایــان لە گەورە سەرکردەکانی تریش کردبوو هەریەکەیان نوسراوێك

بنووسن دەربارەی گرنگترین باسی هونەری نوێی سەربازی، وەك(شێوازی کاری بەرگری نوێ)و (هێزە ئاسمانییەکان لە کاری هێرشکردن و خەباتیدا بۆ دەست بەسەرداگرتنی ئاسمانی شەرگەکە) و (شەرکردنی هێزی فیرقە زرێ پۆشەکان لە کاتی بەرگری و هێرشکردنیدا)، سەرۆك ئەرکانی جەنگی هێزە چەکدارەکانی سۆڤیاتی وتارێکی خوێندەوە، دەربارەی مەسەلە گشتییەکانی پەیوەست بە ژمارەی لەشکری سوورەوە لەچالاکی شەروپێکدادانداندا، لەو نوسراوەیدا بە تایبەت ئاماژەی بە ئاستی نزم و ئامادەباشی نەبوونی وەك پێویستی سەرکردەکانی ئەرکانی جەنگی کرد، ئەوەشی گەراندەوە بۆ بەرزکردنەوەی پلەی ژمارەیەك لە کادرە لاوەکان کە لەو ئاستەدا نین بۆ ئەوپلەو پایە سەرکردایەتییە باڵایە، دوای کۆبوونەوەکە وابریاربوو بۆ رۆژی دوایی(پێشبرکێ سەربازییە گەورەکە) بکرێت، بەڵام لە بریتیی ئەوە داوامان لێکرا لەگەڵ ستالیندا کۆببینەوە.

## کۆبوونەوە لەگەڵ ستالیندا

ستالین زۆر بە ساردییەوە پێشوازی لێکردین، بەسەرجووڵانێك سڵاوی لێکردین کە هەر هەستمان پێ نەکرد، پاشان داوای لێکردین بەدەوری مێزەکەدا دابنیشین، هەرکتوپڕ سەرکۆنەی وەزیری بەرگری کرد، چونکە بەبێ ئاگاداری و بیرورا وەرگرتنی ستالین، وەزیری بەرگری بە وتەکانی خۆی کە خوێندبوویەوە کۆبوونەوەکەی کۆتایی پێهێنابوو(تیموشنکۆ) وەڵامیدایەوە، کەوتەکەی ناردووە بۆ ستالین و ئەویش بە بۆچوونی خۆی وتەکەی خوێندۆتەوە وهیچ رێگری و نارەزاییەکی لەسەر نەبووە، ستالین پرسیاری لە ئامادەبوان کرد:

ـ کەی پێشبرکێ سەربازییەکە دەستپێ دەکات؟ تیموشنکوی وەزیری بەرگری وەڵامیدایەوە.

ـ سبەینێ بەیانی.

ستالین وتی.. باشە.. پێشبرکێکە بکەن، بەڵام دوای ئەوە سەرکردەی تر فێرمەکەن.

ـ کێ دەوری شین دەبینێت و کێ دەوری سوور دەبینێت..؟
ـ دەربارەی شینەکان(خۆرئاواییەکان) فەریقی یەکەم زۆکۆف دەور دەبینێت.
دەربارەی سوورەکان —(خۆرهەڵاتییەکان)-یش فەریق بافلۆف دەور دەبینێت.

بۆ رۆژی دوایی پێشبڕکێ سەربازییە گەورە ستراتیجییەکە دەستپێکرد، وەك بناغەیەك بۆ ئەو بارە ستراتیجییە, ئەو رووداوانە خرانە پێشچاو کە رەنگە لەکاتی هێرشکردنی ئەڵمانیا لەسەر سنوورەکانی رۆژئاوای سۆڤێتیدا رووبدات، سەرۆکایەتی پێشبڕکێکە وەزیری بەرگری تیموشنکۆ و سەرۆك ئەرکانی جەنگی میرتسکوف دەیانکرد.

دەستپێشخەری هێرشکردنەکە لەلایەن شینەکانەوە(ئەڵمانەکان)وەبوو سوورەکانیش (لەشکری سووری سۆڤێتی) لە حاڵەتی بەرگریدابوون، مەبەستی سەرەکی لەو پێشبڕکێ چالاکییە ستراتیجیانە جێبەجێکردنی واقیعی و سوودی هەڵوێستە بناغەییەکان بوو، بۆ پلانی داپۆشین و جووڵەی هێزەکان لە ماوەی سەرەتای جەنگدا.

لەبەرە ستراتیجییە خۆرئاواییەکەدا، بەرەی جەنگ لە برۆسیای خۆرهەڵاتەوە درێژببۆوە تادەگەیشتە بولسیا، پێکهاتەی هێزەکان بەم شێوەیەبوو.

ـ شین(خۆرئاواییەکان) ژمارەیان زیاد لە(٦٠) فیرقەبوو.
ـ سوورەکان(خۆرهەڵاتییەکان) ژمارەیان زیاد لە(٥٠) فیرقەبوو.

هێزە وشکانێکان بە هاوکاریکردنی هێزێکی زۆری ئاسمانی دەجووڵان. پێشبڕکێکە لەبەرەی سوورەکاندا(خۆرهەڵاتییەکاندا) هەڵوێستی تراجیدی زۆری تێدابوو، ئەم هەڵوێستانە زۆر لەو هەڵوێستانە دەچوو کە دوای ئەوەی هێرشی ئەڵمانیای فاشستی کرایە سەر یەکێتی سۆڤێتی لە(٢٢ی حوزەیرانی ساڵی١٩٤١)دا.

بە کۆتایی هێنانی پێشبڕکێکە وەزیری بەرگری فەرمانی دەکرد بۆ هەردوو سەرکردەی دوولایەنەکە، واتە من و بافلۆف کە شیکارییەك لەسەر ئەو رووداوانە بکەین و بیرو رای خۆمان لەسەرخاڵی هێزو لاوازی هەردوولا دەربڕین.

ستالین پێشنیاری کرد، شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەکە لە کرملیندا بکرێت،

بانگهێشتی کرد بۆ سەرکردایەتی وەزارەتی بەرگری و ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ و سەرکردەکانی ناوچە سەربازییەکان و سەرۆك ئەرکانە جەنگێکان کە بێن و ئامادەی ئەو کۆبوونەوەیە بن لەگەڵ ستالینیشدا مەکتەبی سیاسی حیزب ئامادەبوو.

فەریقی یەکەم(میرتسکۆف)ی سەرەك ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ باسی بەڕێوەچوونی پێشبڕکێکەی کرد، کاتێك گەیشتە سەرباسکردنی تای تەرازوی هێزەکان و سەرکەوتنی هێزی شینەکان لەسەرەتای پێشبڕکێکەدا بە تایبەت لە هەڵمەتی فرۆکەکاندا.

ستالین بەرامبەر تێکشانی سوورەکان خۆی پێنەگیرا و وتەکەی بە میرتسکۆف بڕی، وتی:

-بیرت نەچێت لە جەنگدا زۆری ژمارە گرنگ نییە، شارەزایی سەرکردەو هێزەکانی گرنگە و لە زۆرییە کەمترنییە، پاش ئەوەی ستالین هەندێ سەرنج و تێڕوانینی دەربڕی لە ئامادەبوانی پرسی.

ـ کەس هەیە تێبینی و قسەیەکی هەبێت..؟!

تیموشنکۆی وەزیری بەرگری قسەی کرد و تێگەیشتن و شارەزایی سەرکردەی ناوچەکان و سەرۆك ئەرکانەکانی لە چالاکییە تەکنیکییەکەدا بەرزنرخاند و جەختی لەسەر سوودی ئەو کۆبوونەوانەدا کردەوە کە لەدوای ئەو پێشبڕکێ ستراتیجییە سەربازییانەوە دەکرێت. پاشان فەریق بافلۆف قسەی کرد، هەرکە قسەکەی بەهەڵسەنگاندنی کۆبوونەوەکە دەستپێکرد.

ستالین وتەکەی پێبڕی، وتی:

ـ ئەو هۆنادیار و شارراوانە چیبوون کە بوونە هۆی سەرنەکەوتنی چالاکییەکانی هێزەکانی بەرەی سوور..؟!! بافلۆف ویستی خۆی لەو هەڵوێستە ناهەموارە ڕزگار بکات، بەپێکەنینەوە وتی:

ـ ئەمە لە هەموو پێشبڕکێیەکی سەربازیدا ڕوودەدات، ستالین ئەو پێکەنین و قسەیەی پێخۆش نەبوو، وەڵامیدایەوە.

ـ دەبێت سەرکردەی ناوچە سەربازییەکان لە هەموو کات و بارودۆخێکدا

شارەزایی هونەری سەربازی و توانای تەواو و ڕاستی چارەسەری سەربازی هەبێت، بەڵام لەلایەن تۆوە لەکاتی پێشبڕکێکەدا شتی لەو جۆرانە نەکرا، ئایا کەسی تر هەیە قسە بکات؟ من داوای قسەکردنم کرد، لە وتەکەمدا داوامکرد بەردەوام لەم جۆرە پێشبڕکێیانە بکرێت چونکە ئەو پێشبڕکێیانە زۆر گرنگە بۆ پێگەیاندن و نەشونما کردنی باری هەستیاری ستراتیجی لە چالاکییەکاندا، لەلایەن گەورە سەرکردەکانەوە بۆ ئەوەی باری ڕۆشنبیری سەربازی سەرکردە گەورەکان بەرزتربکرێتەوە دەبێت زنجیرەی لێکۆڵینەوە و تێڕوانینی مەیدانی زیاتر پێکبهێنرێت لە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆی وەزارەتی بەرگری و ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگیدا.

پاشان ڕەخنەم لەوەگرت کە هێڵی بەرگری یەکەم یەکسەر لە سەرسنوردابوو، بەو شێوەیەی لە بیلورووسیادا ڕەچاودەکرا، چونکە لە کاتی جەنگدا ئەو هێزانە ڕاستەوخۆ دەکەونە بەرفشارو شاڵاوی تۆپبارانی چڕوپڕ.

ئەمەش کاردەکاتە سەر هێڵەکانی دوای ئەوان و هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی جەنگدا تووشی شکستی و دارمانیان دەکات، بافلۆف ئەم ڕەخنەگرتنەی زۆکۆفی بەهێرشێکی شەخسی بۆسەرخۆی زانی.

بەهەوڵێکی سەرنەکەوتوانە وەڵامی ئەو هێرشەی زۆکۆفیدایەوە، فورشیلوف لە تاوانبارکردنی یەکتری ئەو دوانەدا کەوتە بەینەوە، ناچار زۆکۆف کۆتایی بە قسەکانی هێناو بێدەنگ بوو.

زۆکۆف دەڵێت سەیرترین شتێك کە لەو کۆبوونەوەیەدا بینیم ئەو وتارەبوو کە مارشاڵ-کۆلیك-ی یاریدەدەری وەزیری بەرگری بۆ کاروباری چەکداری، پێشکەشی کرد.

مارشاڵ کۆلیك لە وتارەکەیدا داوای زیاترکردنی ژمارەی فیرقەی تۆپ هاوێژەکانی کرد بۆ(١٦ تا ١٨) هەزار جەنگاوەر، داوای ئەوەشی کرد کە تۆپەکان بەهۆی ئەسپەوە ڕابکێشرێن.

لەگەڵ ئەوەی تاقیکرنەوەی ئیسپانیا دەریخست و جەخت لەسەرئەوەدەکات کە دەبێت دەبابە بناغەی کاروچالاکی بێت. وەك چەکێکی یاریدەدەر بۆ پیادەکان

لەسەر ئاستی یەکە سەربازییە بچووکەکاندا، بەڵام کۆلیك وتی"پێویستە فەیلەقی دەبابە و زرێ پۆشەکان نەهێڵرێن ولایان بەرن".

لێرەدا وەزیری بەرگری بە گاڵتەپێکردنییەوە، وتی"هەموو کادیرانی سەرکردایەتی سوپا هەستیان بەوەکردووە کە دەبێت بەزووترین کات خێرایی بکرێت لە پێکهێنانی فەیلەقی دەبابەو زرێ پۆشیدا، تەنها مارشاڵ کۆلیك نەبێت ئەو بە تەنها لەوکارەدا سەری لێ شێواوە."

ستالین چووە ناو گفتوگۆ و چەنەحانێکەوە و سەرکۆنەی هەڵوێستەکەی کۆلیکی کرد و بەبێ مێشك و دواکەوتوو گێلی ناوبرد، پاشان قسەکانی بەوە کۆتایی پێهێنا، وتی"داهاتوو سەرکەوتن بۆ ئەو هێزانە دەبێت کە دەبابەو یەکەی میکانیکی زۆرتریان هەبێت".

بۆ ڕۆژی دواتری پێشبڕکێکە بانگهێشتکرام بۆ چاوپێکەوتنی ستالین، پاش سلاوکردن لە یەکتری ستالین پێی وتم:

ـ مەکتەبی سیاسی حیزب(بڕیار)ی داوە(میرتسلوف)ی سەرۆك ئەرکانی جەنگ لەسەرکارەکەی لابرێت و تۆ بخرێیتە جێگاکەی ئەو، چاوەڕوانی هەمووشتێکی تربووم، ئەمە نەبێت، حەپەسام نەمتوانی وەڵام بدەمەوە بۆ ماوەیەك لە شوێنەکەی خۆمدا بێدەنگ بووم، پاشان وتم.

ـ "من لە ئەرکانی جەنگدا ڕۆژێ لە ڕۆژان کارم نەکردووە، من هەمووکات لە سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکاندا کارم کردووە، ناتوانم ببم بە سەرۆکی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ..!!"

ـ مەکتەبی سیاسیی بڕیاری دانانی تۆی داوە..!! ستالین بە شێوەیەکی تایبەتی فشاری دەخستەسەر پیتەکانی (بڕیاری داوە)...!!

ـ باشە، کەواتە ئەگەر من بۆ سەرۆکایەتی ئەرکان نەشیام تکایە ڕێم پێبدەن کە بگەڕێمەوە بۆ سەرکردایەتی هێزەکان.

ـ کەواتە ڕێکەوتین، سبەینێ بڕیاری لیژنەی مەرکەزیت بۆ دەردەچێت.

٢١١ دوای چارەکە سەعاتێك لەو چاوپێکەوتن و ڕێکەوتننامەیە گەیشتمە نووسینگەکەی وەزیری بەرگری و بەپێکەنینەوە پێشوازی لێکردم، وتم:

ـ ئاگادارم چۆن ئەو بڕیاردانانەت بەلاوە ناوەو ڕازی نەبوویت پێش چەند خولەکێك ستالین بەتەلەفۆن هەرچی لە نێوانتاندا ڕوویدابوو بۆی باسکردم، ئێستا بە خێرایی بچۆرەوە بۆ(کییف) و گورج بەزووترین کات وەرەوە بۆ مۆسکۆ، چاوەڕوانی ئەوە مەکە سەرکردەیەکی نوێ بێت و سەرکردایەتی دەڤەرەکەت لێوەربگرێت لە ڕۆژی یەکەمی مانگی (شوباتی١٩٤١)دا پێگەنوێیەکەم وەرگرت و بووم بەسەرۆك ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ.

- - -

# (بەشی هەشتەم)

(پێش جەنگی گەورەی نیشتمانی)
ـ دەرچوونی یاسای بەزۆرکردنی سەربازی– تیموشنکو توانا ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی نەبوو– فرۆکەوانی ئارەزوویەکی خودی ستالین بوو– ستالین بە مۆلۆتۆف دەڵێت لەسەرخۆبە– هەواڵگری ئەڵمانیا نەخشەی بەریتانیا بەسەر هێزە چەکدارەکانیدا بڵاودەکاتەوە– زۆکۆف دەڵێت–لەدواییدا باسی هەڵەکانی خۆم دەکەم–

**"بەدرێژایی مانگی شوبات من سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی ئەو مەسەلانە بووم کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگەوە هەبوو.**

**کاتی کارکردنی ڕۆژانەم بۆ(١٥ تا ١٦) سەعات درێژدەبۆوە، زۆرجار ناچاردەبووم لە نوسینگەکەی خۆمدا بمێنمەوە، ناتوانم ئەوە بڵێم من زۆر زوو شارەزای ئەو کارو ئەزموونەم بووم کە لق ولایەنی زۆری لێدەبۆوە، پاش ماوەیەك**

بەهۆی یاریدەو هاوکاری یاردەدەرە دڵسۆزەکانمەوە لە دواییدا توانیم شارەزا ببم..
حاڵی ئێمە پێش جەنگ چۆن بوو؟
ئایا وڵات و هێزە چەکدارەکانمان وەك پێویست ئامادەبوون لە ڕووی دوژمندا بووەستنەوە..؟"



مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت"وەڵامدانەوەیەکی ڕاست و مەوزوعییانەی سەرانسەری ئەو کارانە پەیوەندی بە زاناکان و مێژوونووسانەوە هەیە، بەڵام ئەو لەلایەن خۆیەوە ئامادەیە بیروڕای خۆی سەبارەت بەلایەنی سەربازییەوە بەپێی توانا دەربڕێت، پاشان وێنەیەکی گشتی ئەو بەسەرهاتە ناخۆشانە دەکێشێت کە لەماوەی ڕۆژمانگەکانی سەرەتای جەنگدا ڕوویدا، پاشان لەسەر هەندێ لەڕووداوانە بە دوورودرێژی هەڵوێستە دەکات و باسیان دەکات.

مارشاڵ زۆکۆف دەستدەکات بە هەڵسەنگاندنی ئەو بارودۆخەو بەبووژاندنەوەی باری ئابوری و پیشەسازی دەست پێدەکات کە ئەو کارانە بناغەی توانای بەرگرییە بۆ ولات و بە ژمارە بەسەر ئەو رێژەی بوژانەوانەدا لە پلانی بوژاندنەوەی یەکەم و دووەمدا بریاری خۆی دەدات.

هەروەها ژمارەی بەرهەمهێنان لە ساڵی چوارەمی پلانی پێنجەمیداو لە سێهەمیدا بەرێژەی(٨٦٪ تا٩٠٪) بوو کە بریاربوو ئەو رێژەیە لە ساڵی پێنجەم و لەپلانی سێیەمدا جێبەجێ بکرێت، واتە لە کۆتایی ساڵی(١٩٤٢)دا، بریاربوو رێژەی پێگەیاندن و نماکردنی پیشەسازی قورسی جەنگی بەتایبەت کە زۆر زۆر تربێت لەوپلانەی نەخشەی بۆکێشراوە لە کاتێکدا رێژەی گشتی لە بوژاندنەوەی پیشەسازیدا(١٣٪) بوو، رێژەی نماکردنی پیشەسازی جەنگی لە ساڵێکدا(٣٩٪)بوو.

لێرەدا بەتایبەت ئاماژە بۆ ئەو دەورە تایبەتە دەکات کە خودی ستالین بینی لەسەرپەرشتی کردنی پیشەسازی جەنگیدا. لە(ئەیلولی ساڵی١٩٣٩)دا ئەنجومەنی سۆڤیاتی باڵا یاسای بەزۆربوونی سەربازی دەرکرد، بەپێی ئەو یاسایە لە تەمەنی(١٩) ساڵییەوە خەڵکی بۆ سەربازی بانگهێشت دەکرا.

دەربارەی دەرچوانی خوێندنگا ناوەندییەکانیش لە تەمەنی(١٨) ساڵییەوە بوو، ماوەی سەربازییەکەش لە نێوان دووساڵ و پێنج ساڵدابوو، هەروەها رێوشوێنی ئەوەش خرایە پێش چاو کە رۆژانە لە ماوەی ئەو حەوت رۆژی هەفتەیەدا(٨) سەعات کاربکرێت، پرۆگرامێکی نوێش بۆ فێرکردنی کارویپشەکان دانرا. هەروەها رێوشوێنی سزای قورس و گران گیرایەبەر بۆ ئەوانەی لەکارەکانیاندا دەغەڵی و پشتگوێ خستن دەنوێنن، هەروەها ئەنجومەنی سۆڤێتی باڵا بریارێکی دەرکرد کە دابەشکردنی وەزارەتی بەرهەمهێنانی پێداویستی جەنگی کرد بە چوار وەزارەتی سەربەخۆ و جیاوازەوە بۆ فرۆکەوانی، و دەریایی و ئازووقەو، پرچەککردن.

وەزارەتی پیشەسازیشی کرد بەسێ وەزارەتەوە، وەزارەتی پیشەسازی قورس و ناوەند و سووك، هەروەها وەزارەتێکی نوێشی پێکهێنا کە پەیوەندی تەواوی

بە خزمەتگوزاری (مەجهودی حەربییەوە)هەبوو، ئەویش وەزارەتی هاتوچۆی وشکانی وەزارەتی پێکهێنان و پیشەسازی و چەند وەزارەتێکی تریش.

مەسەلە سەرەکی و بنەڕەتییە سەربازییەکان لە ئەنجومەنی سەربازی باڵای لەشکری سووردا گفتوگۆیان لەسەر دەکرا، ئەو مەسەلانەش کە گرنگی تایبەتی هەبوو، بە ئامادەبوونی ستالین و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی حیزب گفتوگۆی لەسەردەکرا پێش جەنگ دەستنیشان و دابەشکردنی شارەزایی لەناو گەورە لێپرسراوانی وەزارەتی بەرگریدا دابەشکرا.

ئێستا بابێین ڕاستەوخۆ ئەوە بخەینە پێش چاو باسی ئەوحاڵ و وەزعە بکەین کە هێزە چەکدارەکانی تێدابوو لە پێش جەنگدا.

## ـ ئەوەی پەیوەندی بە پیادەوە هەیە:ـ

من و مارشاڵ تیموشنکۆی وەزیری بەرگری لە ناوەڕاستی مانگی (ئازاری ١٩٤٠)دا، داوامان لە ستالین کرد ڕێگامان بدات کە هێزە یەدەکییەکانی تیمەکانی پیادە بۆ سەربازی بانگهێشت بکەینەوە بۆ ئەوەی ئامادەیان بکەین بۆ کاتی پێویستی ئەم بارودۆخە.

سەرەتا ستالین داواکارییەکەی ئێمەی قبووڵ نەکرد، پێیووتین( داواکردنی هێزی یەدەکی بەوشێوە فراوان و ئاشکرایە دەبێتە بەهانە بەدەست ئەڵمانییەکانەوە کە جەنگ بەرپابکەن)، بەڵام داوکارییەکەمان لە کۆتاییدا و لە کۆتایی مانگی (ئازار)دا هاتەدی و بە تەواوی(٥٠٠)هەزار سەرباز و زابت سەف و ئەفسەر بۆ سەربازی بانگهێشت کران و(١٦٠) فیرقەیان لێ پێکهێنان.

## ـ بەهێزکردنی چەک ـ دەربارەی تۆپ:ـ

لە نێوان ماوەی (١ کانوونی دووەمی ساڵی١٩٣٩) تا (٢٢ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١) پیشەسازی جەنگی لەشکری سوور(٢٩٦٣٧) تۆپی مەیدانی و(٥٣٤٠٧) هاوەن و ژمارەیەکی زۆری تۆپ پێشکەش کرد، لەو تۆپانە(٩٢٥٧٨) تۆپی دەبابەیان تێدابوو.

لە (بەهاری ساڵی ١٩٤١)دا ئێمە توانیمان(١٠)لیوای تۆپی دەبابە شکێن پێکبهێنین، بەڵام تا مانگی حوزەیران لەو کارە نەبووینەوە، مارشاڵ کۆلیك کە لەبەردەم ستالیندا بەرپرسیاربوو لەو مەسەلانەی پەیوەندی بە تۆپەوە هەبوو ستالینی بە باشی لەوە ئاگادار نەکردەوە کە ئەم جۆرەیان یا ئەو جۆرەیان باشترە بۆ پرچەککردنی هێزە تۆپ هاوێژەکان هەتا سەرەتای دەستپێکردنی جەنگ بەرێوەبەرانی چەکی بۆمب هاوێژ گرنگییەکی ئەوتۆی بە بۆمب هاوێژی(کاتوێشا) نەدابوو ـ تەنها لە مانگی حوزەیراندا لیژنەی بەرگری بریاری وەبەرهەمهێنانی ئەو بۆمب هاوێژەی بەشێوەیەکی بەرفراوان دەرکرد.

لێرەدا دەبێت ئاماژە بەو هەوڵ و تێکۆشانەی ئەو کرێکار و کارمەندانە بکەین کە لە پیشەسازی دروستکردنی ئەو بۆمب هاوێژەدا(کاتوێشا) کاریان دەکرد، کە بەو هەوڵوتێکۆشانە دڵسۆز و بەردەوامەیان توانییان لە ماوەی(١٠) رۆژ تا(١٥) رۆژدا لە سەرەتای دەستپێکردنی جەنگدا یەکەم بۆمب هاوێژی کاتوێشا پێشکەش بەهێزەی تۆپ هاوێژەکان بکات، ستالین خۆی دەیزانی تۆپ چەکێکی گرنگ و کاریگەر و بە توانای جەنگییە و زۆر گرنگی پێدەدا.

ستالین خۆی پەیوەندی و باوەری تەواوی بە وەزیری پرچەککردن(ئۆستینۆف) و وەزیری ئازووقە(نانیکۆف) و بەشارەزایانی دروستکردنی تۆپەکانەوە هەبوو.

لەسەرو ئەمانەشەوە بروای تەواوی بە توانا گەورە و ناوازەکانی هەردوو جەنەراڵ(ئیڤانۆڤ) و جەنەراڵ(جرابین) هەبوو، دەربارەی چەکی ئەندازیارێتی و ئیشارەت و رێگای پۆستەر.

# هێڵی ئاسنین و هاتووچۆوە

لە(١٨ی شوباتی ساڵی ١٩٤١)دا جەنەراڵ بافلۆفی سەرکردەی ناوچە سەربازییەکانی خۆرئاوا ڕاپۆرتێکی بۆ ستالین و مۆلۆتۆف و تیمۆشنکۆ نارد لەو ڕاپۆرتەدا وتبووی..:

ـ من وای بەباش دەزانم، پێویست دەکات شانۆی خۆرئاوا کارە جەنگییەکان لە ماوەی ساڵی(١٩٤١)دا گرنگی پێبدرێت و ئامادەبکرێت و نابێت بۆ ماوەی چەند ساڵێك دروستکردنی تۆڕی هاتوچۆو هێڵی ئاسنین دوابخرێت و خێرایی بکرێت لە جێبەجێکردنیاندا. هەروەها جەنەراڵ(جابتیش)ی سەرکردەی چەك لە ڕاپۆرتەکەیدا ئاماژەی بۆ کەمی هۆی پەیوەندی نوێ کردبوو. هەروەها ئاماژەشی بۆ نەبوونی یەدەکی هۆکاری پەیوەندی کردبوو. بەئاشکرا لە ڕاپۆرتەکەیدا دەربارەی پێدانی هێزەکان لە تۆڕی پەیوەندی بێتەلدا زۆرکەم و لە ئاستێکی نزمدابوون، ئەو تۆڕانە لە نێوان(٢٧٪) و نێوان(٥٢٪)دابوو، هەروەها هێزەکان لە بەکارهێنانیاندا بۆ کاتی جەنگ مەشقی تەواویان پێنەکراوە و شارەزای تەواونین.

بەهیچ جۆرێك هێڵی پەیوەندی لە ژێر زەوییدا نییە کە بۆ سەرکردەیی کردنی کاتی شەڕوپێکدادانی ستراتیجی بەکاربهێنرێت، بەڵام وەزیری بەرگری(تیمۆشنکۆ) نەیتوانی بارودۆخەکە ڕاست بکاتەوە، ئەمەش لەبەرکەمتەرخەمی ئەونەبوو، یاخود لەبەر ئەوە نەبوو حەزنەکات زیاتر هەوڵبدات بۆ چارەسەرکردنیان، بەڵکو بەڕاستی لە ساڵی(١٩٤١)دا هەوڵێکی زۆریدا بۆ چارەسەرکردنیان، بێ ئەوەی بتوانێت وەك پێویست و بەشێوەی تەواوکارەکان تەواوبکرێت.

وەزیری بەرگری لەوبارەیەوە، وتی:

ـ من لەگەڵ ئێوەدام لە هەڵسوراندنی ئەوکارو هەڵوێستانەدا، بەڵام من لەوباوەڕەدام وایلێهاتووە ئەو کارانە هەرگیز ناتوانرێت بگۆڕێت و ببێتە کارێکی جدی تاکو بتوانرێت هەرچی کەموکوڕی هەیە نەهێڵرێت و بنبڕبکرێت. من دوێنێ

لای ستالین بووم، ستالین نوسراوەکەی(بافلۆف)ی بەدەست گەیشتبوو، فەرمانیدا بەبافلۆف رابگەیەنن، لەگەڵ ئەوەی هەر هەموو داواکارییەکان راست و دروستن، بەڵام ئێستا ئێمە ئەو توانایەمان نییە بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارانە."

## دەربارەی هێزی ئاسمانی

لەمەوپێش من ئاماژەم بۆ ئەو گرنگییە گەورەیە کرد کە لەلایەن حیزب و حکومەتەوە دەدرا بۆ پێشکەوتن و پەرەپێدانی هێزی ئاسمانی و بوژانەوەی دروستکردنی فڕۆکەو هێنانەکایەی شێوازی نوێ کە زیاتر بە تواناو کاریگەرتربێت.

ئەوەندە بەسە ئاماژەبکەم لە مـــاوەی(١ی شوباتی ١٩٣٩) تا(٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤٤) هێزە ئاسمانییەکان لە پیشەسازی دروستکردنی فڕۆکەدا توانییان(١٧٧٥٤) فڕۆکەی جەنگی وەرگرن، لە نێوان ئەو فڕۆکانەدا(٣٧١٩) فڕۆکەی شێوازی نوێیان تێدابوو، ستالین گرنگی زۆری دەدا بە شێواز و جۆری فڕۆکە. بۆ ئەو مەبەستە کاتێکی زۆری خۆی تەرخانکردبوو، هەتا من دەتوانم ئەوە بڵێم کە فڕۆکەوانی و باڵەفڕێ تائاستێك یەکێك بوو لە ئارەزووە تایبەتییەکانی خودی ستالین.

لەگەڵ ئەوەشدا پیشەسازی فڕۆکە لە چاو ئەو شێوە پێشکەوتووە چوون یەکەی ئەڵمانیای فاشیستی هەیانبوو زۆر دواکەوتوو تربوو لە پێداویستی ئەو کاتانە.

دەتوانم بڵێم کە(٧٥-٨٠٪)ی فڕۆکەی هێزە ئاسمانییەکانی سۆڤێتی لە شێوە زۆر دواکەوتوو کۆنەکان بوو.

لە یەکەم رۆژی ساڵی(١٩٤١)دا بڕیاری گۆڕانکارییەکی گـەورەدرا، لە بەرهەمهێنانی فڕۆکەو رێکخستنی پێکهێنانی بەشی ئاسمانیدا، هەروەها ئەو پێشکەوتنە بەرفراوانە دەبینرا لە دروستکردنی فڕۆکەخانەو پێگەیاندن و راهێنانی

کادری فڕۆکەواندا، بەڵام پێش ئەوەی ئەم خزمەتگوزارییانە تەواوبکرێن.بڵێسەی ئاگری جەنگ هەڵگیرساو نەیهێشت تەواو بکرێن هەروەها فڕۆکەوانەکان وەك پێویست ڕانەهێنران و مەشقی تەواویان پێنەکرا لەسەر فڕۆکە نوێیەکان بە تایبەت لەسەر شێوازی شەرکردنی شەوانەدا.

پاش ساڵ و نیوێك لە جەنگ کردن ئینجا هێزە ئاسمانییەکانی سۆڤێتی لەناو گێژاوی ئەو خەبات و تێکۆشانەدا توانییان شێوازێکی بەهێزو نوێ بەخۆوە ببینێت.

## دەربارەی هێزەکانی بەرگری ئاسمانی

لەسەر ئەو پێشنیارەی خۆیان لیژنەی مەرکەزی و حکومەت بڕیاری یارمەتی بەهێزکردنی هێزەکانی بەرگری ئاسمانی دەرکرد بەیەکەکانی فڕۆکە شەڕکەرەکان بۆ بەهێزکردنی بەرگری و پاراستنی شاری مۆسکۆ و لینینگراد.

ئەم یەکە فڕۆکەوانیانە هەر وەك ئاشکرایە دەورێکی گەورەو کاریگەریان بینی لەبەرهەڵستیکردنی هێرشە ئاسمانییەکانی هێزەکانی فاشیستەکاندا، هەتا سەرەتای دەستپێکردنی جەنگ هێزەکانی بەرگری ئاسمانی هێشتا بە شێوەیەکی نوێ پڕچەك نەکرابوون، دەربارەی ژمارەو چۆنییەتییەوە، وەك پێویست نەگەیشتبوونە ئەو مەبەست و توانایەی کە پێویست بوو.

## دەربارەی هێزە دەریاییەکان

ژمارەی هەموو پاپۆڕە جەنگییەکان(٦٠٠) پاپۆڕ بوو، لە نێوانیاندا(٢١١) ژێر دەریایی و(٢٧٩) تۆربیدی تێدابوو، لەگەڵ زیاد لە(١٠٠٠) یەکەی ڕۆکێتی تۆپ هاوێژی ڕۆخەکانی دەریایی و زیاد لە(٢٥٠٠) فڕۆکە، وەك پێویست زۆرگرنگی

بەبەرگری ئاسمانی و بە تۆپەکانی ڕۆخەکانی دەریا نەدەدرا.

وەزارەتی دەریاوانی هەڵەیەکی گەورەی کرد کە هیچ گرنگی و پێنەزانینێکی بە گرنگی کەشتیگەلی باکور نەدا، کەتوانی دەورێکی گرنگ و ترسناك بنوێنێ. بەگشتی هێزە دەریاییەکان لە حاڵێکدابوون کە جێگای شانازی وپشت پێبەستن بوون و نەترسانەو بەشێوەیەکی شکۆمەندانە ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوەو بەرگرییان کرد.

لە دڵسۆزی و ڕاستیدا بۆ مێژوو من ئەوەدەڵێم ستالین لە گفتوگۆ و هاوکاریکردن لەسەر ئەو مەسەلانەی پەیوەندبوون بە هێزەکانی دەریاییەوە، ستالین هیچ بانگەوازێکی وەزیری بەرگری تیموشنکۆ و نە سەرۆکی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ- مارشاڵ زۆکۆف-ی نەدەکرد. لە نێوان ساڵەکانی(١٩٣٩) هەتا (١٩٤١) دەبینرا ژمارەی هێزە چەکدارەکان لە زیادبوون و نەشونما کردندابوون، وە لەلایەن حیزب و حکومەتەوە بەرێژەی(٢٨٠٪) گرنگییەکی گەورەو پشتگیری تەواو لە بەرگری میللی دەکرا.

مارشاڵ زۆکۆف ئاماژە بەوەدەکات بڵاوبوونەوەی ڕۆشنبیری سەربازی و ڕاهێنان لەسەر شێوازی شەرکردن بە تەواوی لە ناو هاوولاتیاندا بە تایبەت لاوان بڵاوبۆوە و لەکاتی جەنگدا دەورێکی مێژوویی بینی، پاشان دەڵێت"ئاستی خوێندن لە ئەکادیمیایی سەربازیدا کەڕاستەوخۆ لە ژێر چاودێری خۆیدابوو، لە ئاستێکی بەرز و پێویست و تایبەتمەندی جەنگی هاوچەرخی نوێدابوو، مامۆستاکان جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە جەنگی نوێ وایلێهاتووە بێئەوەی پێشەکی هیچ بانگەوازێکی بۆبکرێت هەڵگیرساوە، دوژمن دەیەوێت ڕێگای کتوپڕی پیادە بکات، لە سەرەتادا هێزە شەرکەرەکان دەیانەوێت بە تەکنیکی ئیستراتیجییەوە و بەهێزە سەرەکییەکانیانەوە بێنە ناو جەنگ و پێکدادانەوە".

جەنگ بەو تەبیعەت و حاڵەی ئێستای خۆی، بێشك دەبێت قورس و گران و توندو تیژبێت و درێژەبکێشێت، ئەمەش واپێویست دەکات هەرچی هێزی میللی هەیە لە ئامادەباشیدا بن و خەبات و تێکۆشانیان لەبەرەکانی جەنگدا لەگەڵ خەبات و تێکۆشانی بەرەی ناوخۆدا یەکخەن، بەگشتی تیوری سەربازی

لە ئاستی سەردەمدابوو، بەڵام لە جێبەجێکردندا لە ڕووی تیورییەوە بە ئاشکرا دواکەوتووبوو.

## سەرنج و تێڕوانینی لە بارودۆخی وڵات

پاش سەرنج و تێڕوانینم لە بارودۆخەکە لەلایەن تەکنیك و ئیستراتیجییەوە، من گەیشتمە ئەوەی دەربارەی وڵاتێکی گەورەو بەرفراوانی وەك وڵاتی ئێمە، مەسەلەی بەرگری و پاراستنی کارێکی گەورەوگرانە زۆربەش و لایەنی سەلبی گەورەی لێدەکەوێتەوە. یاریدەدەرەکانیشم هەرهەمان بیروڕایان هەبوو، کۆکردنەوەی ئەو هێزە گەورە و زۆرو بێشومارەی هێزەکانی فاشیستەکان لە پروسیای ڕۆژهەڵات و پۆڵندەو بەڵقاندا دڵەڕاوکێیەکی زۆری خستبووە دڵمانەوە.

سەرەڕای ئەوەی ئێمە لە ئامادەباشی و توانای شەڕکردنی هێزە چەکدارەکانمان لە ناوچە سەربازییەکانی خۆرئاوادا دڵنیانەبووین. هەروەها دواکەوتن و نەبوونی توانا پیشەسازییەکان لە جێبەجێکردنی پێداویستییەکانمان بۆ خۆئامادەکردنی جەنگ، تووشی دڵەڕاوکێ و بێزاری کردبووین، کاتێك لەوبارەیەوە لەگەڵ وەزیری بەرگری قسەم کرد، پێی وتم...

-"سەرکردایەتی ئەوە باش دەزانێت، بەڵام دەوڵەت توانای دابینکردنی لەوە زیاتر نییە".

ڕۆژێکیان تیموشنکۆ بانگی کردم و پێی وتم"دوێنێ لای ستالین بووم و پێیڕاگەیاندوم، بچیتە لای و دەربارەی بارودۆخەکە هەرچی دەزانێت پێیڕابگەیەنێت، پێی وتم خۆت ئامادەبکە".

لێم پرسی دەربارەی چی خۆم ئامادەبکەم..؟

ـ وتی"دەربارەی هەمووشتێك خۆت ئامادەبکە، بەڵام بیرت نەچێت ئەو ڕێگای قسەی زۆرو دوورودرێژت نادات، ئەوەی ئێستا لە ماوەی سەعاتێکدا بەمنی دەڵێیت دەبێت لە ماوەی(١٠) دەقیقەدا بەو ڕابگەیەنیت و پێی بڵێیت".

ـ وتم"ئاخر لە ماوەی دە دەقیقەدا دەتوانم چی پێبڵێم..؟" هەموو کارەکان لەو پەڕی گرنگیدان و پێویست دەکات حکومەت بڕیاری پێویستیان لەسەربدات.

شەوی شەممەچووم بۆ بارەگا لادێکەی ستالین بۆ چاوپێکەوتنی بینیم مارشاڵ تیمۆشنکۆ و مارشاڵ کۆلیك و هەندێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لابوون. پاش سڵاوکردن ستالین ئەم پرسیارەی لێکردم.

ـ ئایا تۆ ئاگاداری بۆمبی مووشەکی جۆری کاتیوشا هەیت؟

ـ تەنها ناوەکەیم بیستووە، بەڵام هێشتا نەمدیوە.

ـ کەواتە لەم ڕۆژانەدا لەگەڵ تیمۆشنکۆ و کۆلێك و ئەبورینکۆف دا برۆ و چۆنێتی بەکارهێنان و تەقاندنی ببینە، ئێستا دەربارەی ئیش و کارەکانی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ قسەمان بۆبکە.

منیش هەروەك چۆن لەمەوپێش باسم بۆ وەزیری بەرگری کردبوو بەو شێوەیەش باسم کردو، وتم:

ـ لەبەر ترس و خەتەرناکی بارودۆخی سیاسی سەربازی من وای بە چاك دەزانم خێرایی بکرێت و چی پێویست دەکات بیگرینە بەرو جێبەجێی بکەین، بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا هیچ سەلبیات و سستییەك نەبێت لە سنوورەکانی ڕۆژئاوادا و هێزە چەکدارەکان تەیارو ئامادەبکرێن بۆ شەڕو پێکدادان.

مۆلۆتۆف قسەکەی پێبڕیم، بە تووڕەییەوە، وتی:

ـ مەبەستت چییە؟ بۆ تۆوادەزانیت ئێمە لە دژی ئەڵمانییەکان دەچینە شەڕەوە؟

ستالین، مۆلۆتۆفی بێدەنگ کرد و تووڕەیی و هەڵچوونەکەی خاوکردەوە، پێی وت:

ـ لەسەرخۆبە.. لەسەرخۆبە..

# نان خواردن لەسەرخوانی ستالیندا

دوای گوێبیستی ستالین لە قسەکانم، بانگهێشتی کردین بۆ نان خواردن، لەسەرنان خواردنەکە ناو بە ناو قسەش دەکرا، ستالین لێیپرسیم؟

هێزی ئاسمانی ئەڵمانیا چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟

ئەوەی لە بۆچوونی مندابوو، وتم:

ـ ئەڵمانییەکان هێزێکی ئاسمانی خراپیان نییە، فرۆکەوانەکانیان لە هاوکاریکردنیاندا لەگەڵ هێزە وشکانییەکاندا، مەشقێکی تەواوی شەرکەرانەی پێشکەوتوویان پێکراوە، دەربارەی مادیش فرۆکە شەرکەرە نوێیەکانی ئێمە لە چاو فرۆکەکانی ئەواندا هیچ خراپییەکیان نییە، هەروەها فرۆکە بۆمب هاوێژەکانمان هیچیان لە فرۆکە بۆمب هاوێژەکانی ئەڵمانیا کەمتر نییە، بەڵکو لەو باوەڕەدام کە لەوان زۆر باشترن، بەڵام ئەوەی جێی داخە ئەوەیە ژمارەی فرۆکەکانمان هێشتا زۆر کەمن.

تیمۆشنکۆ هاتە ناو قسەکانمانەوە، وتی:

ـ بەتایبەتی فرۆکە شەرکەرەکان زۆرکەمن.

بیرم نایەکێبوو هێرشی کردە سەر وەزیری بەرگری بەوەی، وتی"سوجی کونستنتینوفیتش(تیمۆشنکۆ) هەربیر لە باڵەفری بەرگری دەکاتەوە.

وەزیری بەرگری هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، وا بزانم ئاسایی لەوەدەچوو گوێی لە تەعلیقەکە نەبوو، چونکە تیمۆشنکۆ گوێی گران بوو، خواردنەکە زۆر سادەو ئاسایی بوو.

قاپی یەکەممان شۆربای(برویش)ی ئۆکرانی بوو..

قاپی دووەم(جریشکا) لەگەڵ گۆشتێکی زۆردابوو.

دواجار هەندێ میوەو پەرداخێك(کمبون)بوو.

ستالین لە حاڵەتێکی دەروونی باشدابوو، زۆر گاڵتەوگەپی دەکرد، بەدەم قسەو گاڵتەکردنیشەوە مەی دەخواردەوە کە تایبەت لە جورجیا دروستکرابوو.

جورجیا(زێدی ستالینە و لەسەرانسەری یەکێتی سۆڤێتیدا لە دروستکردنی هەموو جۆرە مەیەکدا بەناوبانگن.)

لە کۆتایی چاوپێکەوتنەکەدا ستالین، وتی:

ـ پێویستە لە ئامادەکردنی ئەو مەسەلەو داواکارییانەی پێشکەش حکومەتی دەکەن باش بیری لێبکەنەوە، بۆ ئەوەی حکومەت بڕیاریان لەسەربدات، لەگەڵ ئەو لە پێشیانەی کە دەخرێنە ژێرباس و لێکۆڵینەوەوە، بەڵام دەبێت بەپێی تواناو لە دەستەڵاتماندا بێت، بێئەوەی پەنابەرنە بەر خەیاڵ و شتی خەیاڵی بڵێن لەو شتانەی ئێمە توانای جێبەجێکردنمان نەبێت.

---

پێش جەنگ لە ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگدا ژمارەیەك جەنەراڵ و ئەفسەری شارەزاو بەتواناو پێکەوە گونجاو لەگەڵ یەکتردا هەبوون و لەگەڵ یەکتردا هاوکارییان دەکرد.

ئەنجومەنی ئەرکان لە بواری کاری ڕێکخستن و ئامادەباشیدا، ئیش و کارێکی یەکجار زۆر و گەورەو گرانی هەبوو.

لە کاتی ئاشتیدا ئەنجومەن ڕێکخراوێکی سەرەکی وەزارەتی بەرگری بوو، لەکاتی جەنگیشدا ئەنجومەن دەبوا ببوایە بە جیهازی سەرەکی بۆ سەرکردایەتی باڵا.

لە پێکهاتەی شوێن و جێگای سەرکردایەتیدا کە بگونجێت لەگەڵ بارودۆخی جەنگدا شیاوبێت کەموکوری تەواوهەبوو. ئەمە دەربارەی سەرکردایەتی باڵا. هەروەها دەربارەی وەزارەتی بەرگری و سەرکردایەتی ئەرکان و سەرکردەکانی هێزی چەك و بەڕێوەبەرەکان و ناوچەی هێزە چەکدارەکانیش، هەروەها ئەو گۆڕانکارییە یەك لە دوای یەکانەی لە پلەوپایەی سەرۆك ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگدا دەکرا،

لەماوەی(پێنج ساڵدا چوار سەرۆك لەوپلەو پایەیەدا گۆڕان.) ئەو کارانەکارێکی سەرەکی بوو کە نەدەتوانرا لێکۆڵینەوەیەکی قووڵی بۆ بکرێت لە بواری بەرگری و ئەو ئەگەرانەی ڕوویدەدا لەکاتی جەنگدا.

ئێستا هەندێ لە مێژوونووسان و نووسەرانی بیرەوەرییەکان، دەڵێن پێش جەنگ پلانی ئامادەکردن و کۆکردنەوەی هێزەکانی چەکداری و پلانی بڵاوبوونەوەی ئیستراتیجییە سەربازییە شەڕکەرەکان نەبوو، ئەم وتانەیان هیچ بناغەیەکی ڕاستی نییەو دوورن لە ڕاستییەوە.

هەڵەی ئیستراتیجی لەوەدابوو، سەرچاوەی سەرەکی ترس و مەترسیی لەبەرەی باشووری خۆرئاوادا دەستنیشان کرابوو، واتا لە ئۆکرانیادا نەك لە بیلوڕووسیادا، ئەمە لە کاتێکدابوو کە سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانییەکان گەورەترین ژمارەی هێزی وشکانی و ئاسمانییەکانی بەرەو بیلوڕووسیا کۆکردبۆوە، ئەم بۆچوونە هەڵەیە لە سەرەتای جەنگدا کارێکی خراپی کردە سەر بەسەرهات و ڕووداوەکان.

ئەو هێزانەی لەشکری نۆزدەو هەندێ یەکەی لەشکری شانزە کەرەوانەکران لە ئۆکرانیاوە ناچاربوون بەگەیشتنیان بۆ یارمەتی و پشتگیری ئەو هێزانەمان کە لە بیلوڕووسیادا جێگیرببوون، پێش ئەوەی شوێن، و جێگای شەڕکردنی خۆیان دەستنیشان بکەن یەکسەر بەگەیشتنیان بکەونە ناوشەڕو پێکدادانەوە.

بیروڕای وەزیری بەرگری و ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ و خودی منیش لەسەر ئەوەبووین کە دەبێت بنکەی هاریکاری و یارمەنی ناردن دەبێت نزیك شوێنی هێزەکان بێت، ئەمە خۆی لە خۆیدا ڕاستە، بەڵام واقیع سەلماندی کە ئەوە هەڵەیەکی گەورەبوو هەموو تێیکەوتین، چونکە دوژمن هەر لە سەرەتای جەنگدا دوای ماوەیەکی کەم توانی دەست بەسەر ئەو بنکانەدا بگرێت، ئەمەوایکرد کارێکی خراپ و ناهەمواری بۆ دروستکردین لە ناردنی یارمەتی و ئامادەکردنی کۆمەکی پێداویستیە یەدەکییەکان بۆ هێزەکانمان.

هەروەها لەو بۆچوونە هەڵانەمان ئەوەبوو، ئێمە واماندەزانی هێزە سەرەکییەکانی هەردوو دەوڵەتە گەورەکەی ئەڵمانیاو یەکێتی سۆڤیێتی ڕەنگە دوای چەند ڕۆژێکی تربتوانن لە ناوچەو سەر سنوورەکاندا بەیەکدابدەن و بکەونە ناو شەڕو جەنگەوە،

هەروەها ئێمە هەڵەمانکرد لە جوڵەپێکردنی هێزەکانمان لەکاتی پێویستدا خۆمان لەگەڵ هێزەکانی ئەڵمانیادا یەکسان خەملاند، ڕاستیش وای سەلماند ئێمە بە هیچ جۆرێك لە هێزو بارودۆخدا هەرگیز لەگەڵ ئەواندا یەکسان نەبووین.

پاشان مارشاڵ زۆکۆف دێتەسەر پێشاندان و نمایشی هێزی ئابوری و سەربازی گەورەی ئەڵمانیای فاشیستی بە تایبەت دوای تێپەڕبوونیان بە ئەوروپادا و دەست بەسەراگرتنی سەرچاوەی وزەو سووتەمەنی و مادە سەرەتاییەکان، بەپێی ئەو ڕاپۆرتەی سەرۆکی هەواڵگری سەربازی جەنەڕاڵ جولیکۆف لە بەرواری (ئایاری ١٩٤١)دا.

ژمارەی هێزە مۆڵدراوەکانی ئەڵمانیا کە دژی یەکێتی سۆڤێتی ڕاوەستابوون، دەگەیشتە(١٠٣) فیرقە و بۆ(١٠٧) فیرقە، ئێمە هەر زانیارییەك کە سەرۆکی بەڕێوەبردنی موخابەرات جەنەڕاڵ جولیکۆف دەیدا بە ئێمە گورج ئێمەش بە ستالینمان ڕادەگەیاند، من نازانم ئەو زانیارییانە چی بوون کە جەنەڕاڵ جولیکۆف یەکسەر دەیدا بەخودی ستالین خۆی.

# هەڵەی ڕووسەکان

لە(حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١)دا ژمارەی هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیا دەگەیشتە(٨,٥) ملیۆن و نیو، بەڵام ژمارەی هێزە سەربازییەکانی ئێمە بەوانەشی کە تازەهاتبوونە ڕیزی سەربازییەوە نزیکەی(٥) ملیۆن سەرباز بوو، هیتلەردەیووت کاتی ئەوەهاتووە هێرش بکرێتەسەر یەکێتی سۆڤێتی، زۆرجەختی لەسەرئەوە دەکردەوە کە بۆ ئەو هێرشە خێرایی بکەن. جەختکردنەوەکەشی بێبناغە نەبوو، تەنها لە نێوان (٢٥ی ئایار تا نیوەی مانگی حوزەیران) ئەڵمانیا چلوحەوت فیرقەی ڕەوانەی سەرسنووری سۆڤیاتی کرد، کە لەناو ئەو فیرقانەدا(٢٨) فیرقەی دەبابەو ئامێری جۆراوجۆری تێدابوو.

ئێمە ستالینمان لەوە ئاگادار کردەوە کە ئەو هێزانەمان کەوان لە دەڤەرەکانی

بەلتیق و کییف و ئۆدیساو ناوچە خۆرئاواییەکاندان، ئەوەنین بتوانن بەرهەڵستی هێرشی هێزەکانی ئەڵمانیا بکەنەوە.

لە(ئایاری ساڵی١٩٤١)دا ڕێنماییمان بۆ هەندێ لەو هێزانە دەرکرد کە لەناوخۆدا جێگیرببوون و دامەزرابوون، بەرەوناوچە سنوورییەکان بکشێن، هەر بەڕاستی(٢٨) فیرقە بەرەو ئەوێ جوڵان. ئێستا کاتی ئەوەهاتووە باسی ئەو هەڵە سەرەکییانە بکەین کە لەو کاتانەدا ڕوویدا.

ئەو هەڵانەی بەتەبیعەتی حاڵ هەڵەی گەورەتری زۆری لێکەوتەوە لە شکستخواردن وسەرنەکەوتنمان بۆ دەستنیشان کردنی کاتی هێرشکردنی نازییەکانی ئەڵمانیا، لە پلانی کاری سەربازی(١٩٤٠)دا کە لە(١٩٤١)دا کاری پێدەکرا پاش دەستکاری و گۆڕانکاری لەو پلانەدا، وابڕیاربوو کە لە کاتی جەنگدا پێویستە خێراو کتوپڕی:-

ـ هێزە چەکدارەکان بخرێنە ژێر ئامادەباشییەکی تەواوەوە.

ـ لەسەرانسەری هەموو وڵاتدا بانگەوازی کۆکردنەوەی هێزی سەربازی بکرێت.

ـ بەپێی ئەو پلانەی بانگەواز بۆکۆکردنەوەی هێزی سەربازی کرا، ژمارەی هێزەکان تەواوبکرێن.

ـ ئەو هێزانەی کۆکرابوونەوە بەرەو ناوچە سنورییەکانی خۆرئاوا ئاراستەو ڕەوانەبکرێن، بەپێی پلانی ناوچە سەربازییەکان و سەرکردایەتی سەربازی باڵا.

ئالێرەدا پرسیارێك دێتەکایەوە، بۆچی سەرکردایەتی بەسەرۆکایەتی ستالین لە پلانی کارە سەربازییەکاندا هەڵنەسا بەجێبەجێکردنی ئەو ڕێوشوێنانەی خۆی دایینابوو، بڕیاریشی لەسەردابوو؟! بەزۆری بۆ ئەو هەڵەوباش ڕەچاو نەکردنە ستالین تاوانبار دەکرا.

بێگومان ستالین هەڵەی زۆربوو، بەڵام ئێمە نابێت باسی هۆی ئەو هەڵانە بکەین دوور لە ڕووکەش و بارودۆخی خودی مەوزوعی مێژوویی و هۆکاری سیاسی و ئابوریی. پاش ئەوەی ئەنجامی ئەمانە ئاشکرابوو، ئەوکاتە بۆ تێگەیشتنی ئەم هەموو هۆکارانە دەتوانین هەموو جۆرە هەڵسەنگانێك ئەنجام

بدەین و هۆکارە یەك لە ناویەکەکانی و هێزە ناکۆکەکان و ئەو بیروباوەڕ و زانیاری و ڕووداوە دژبەیەکانە لەو ماوە مێژووییە دیاریکراوەدا کارێکی گران نابێت، بە بەراوردکردن و شیکردنەوەی هەموو ڕووداوەکان کە ستالین بە ئامادەبوونی من و ڕووبەڕووی نزیکانی خۆی، بیروباوەڕێکی چەسپاوی وام لادروستبوو کە هەر هەموو بیر و کار و ئارەزوویەکی لە پێناو ئەوەدابوو کە جەنگ هەڵنەگیرسێت و خۆی لەشەڕ دوورخاتەوە. چونکە باش دەیزانی و دڵنیابوو لەوەی پاشەڕۆژ بەسەر ئەودا دەشکێتەوە.

ستالین زۆرباش دەیزانی ئەوناخۆشی و ناهەموارانە چین کە تووشی گەلانی یەکێتی سۆڤیاتی دەبن، ئەگەر جەنگ لەگەڵ هێزێکی شارەزاو قاڵبووی وەك ئەڵمانیای فاشیستیدا بکات.

لەبەرئەوەبوو هەوڵیدەدا، وەك چۆن حیزبەکەمان هەوڵیدەدا لە جەنگ دوورکەوێتەوە و تووشی جەنگ نەبێت.

لەپێش چاوماندا و بەتایبەت لەو ئاگادارییانەی بە شێوەیەکی بەرفراوان پێمان دەگەیشت، بەڕاستی هەر هەموو ئەو ئاگادارییانە ئەوەیان ڕادەگەیاند کە هێزە فاشیستەکان هێزەکانیان لە سنوورەکانماندا کۆکردۆتەوە و ئەگەری ڕوودانی شەڕو دوژمنکاری بۆسەر یەکێتی سۆڤێتی هەیە، بەڵام ئەو بەڵگەنامانەی لەدوای تێکشکانی ئەڵمانیای فاشیستدا ئاشکرابوون، ئەوەبوو لەو ماوەیەدا لە نوسینگەکانی ستالیندا هەواڵی جۆراوجۆر و جیاواز دەگەیشتە دەست و بڵاودەکرانەوە.

فەرموون با ئەم نموونەیەتان بۆ باسبکەم..

بەپێی ئەو ڕینماییەی لە کۆبوونەوەی بەرواری (٣ی شوباتی ساڵی١٩٤١)دا هیتلەر ڕایگەیاندبوو...

ـ فیلد مارشاڵ(کیتل)ی سەرەك ئەرکانی باڵای جەنگ کە لە بەرواری(١٥ی شوباتی ساڵی١٩٤١)دا فەرمانێکی تایبەتی دەرکردبوو بە(چەواشە کردنی دوژمن) و شاردنەوەی چالاکی بارباروس، بەشی موخابەرات و سیخوڕی سەربە ئەنجومەنی ئەرکانی باڵا، هەستا بە(پلاندانان) و جێبەجێکردنی چەندەها کار کە

تاكە مەبەستیان بڵاوكردنەوەی پڕوپاگاندەو زانیاری درۆ و دەلەسەو چەواشەكاری بوو.

جوڵان و ڕووكردنی هێزەكان بەرەو خۆرهەڵات، گوایە بەرەو ئەوێ ڕەوانە دەكرێن"ئەوە لە مێژوودا گەورەترین فێڵ و چەواشەكاری بوو" مەبەست لەوە سەرنج ڕاكێشان بوو لەوەی ئاورنەدرێتەوە بۆ ئەو خۆئامادەكردنەی بۆ داگیركردنی بەریتانیا سازدەكرا لەوەش زیاتر بۆ چەواشە كردن و سەرلێشێوان. چاپەمەنییەكانی ئەڵمانیا بڵاوكردنەوەیان لەسەر تۆبۆگرافی بەریتانیا بڵاودەكردەوە و بەسەر هێزەكانیاندا دابەشیان دەكرد، ژمارەیەكی زۆر وەرگێڕیان بۆ سەر زمانی ئینگلیزی بڵاوكردەوە، پلانی داگیركردنی ئەو ناوچانەی لە دەربەندی مانشدابوو واژۆدەكرا و پلانی بۆ دادەڕێژرا.

زانیاری بڵاوبۆوە كە فەیلەقی پەڕەشوودەكان ئامادەن بۆ هێرش و داگیركردن. لە ڕۆخ دەریاو ڕووبارەكاندا هێزی موشەكی درۆینە و ناراستیان دامەزراندبوو، لەناو هێزە چەكدارەكاندا هەواڵ و دەنگوباسیان بڵاودەكردەوە كە ئەوان پێش ئەوەی بۆ سەر بەریتانیا دەست بە هێرشكردن بكەن بۆ ئیسراحەت و حەوانەوە بەرەو خۆرهەڵات دەچن.

لەسەرسنوریشدا، ئەوان هێزیان لەسەر سنووری سۆڤیاتیدا بڵاوكردبۆوە، بۆ ئەوەی ئامادەبن بەسەرسنوری یەكێتی سۆڤێتیدا بەرەو هیندستان ڕەتبن، وە بۆ جەختكردنەوە لەسەر ئەو بیرۆكەیە كردەوە پلانی تایبەتیان دارشتبوو، لەسەر ناوی نەهێنی وەك(ئەكولا) و(جاربون)دا پڕوپاگاندەی نازییەكان لەو كاتەدا لەسەر ئەوەبوو كە هێرش دەكەنە سەر بەریتانیا، بەڵام لە ڕاستیدا هێرشكردن بوو بۆ سەر یەكێتی سۆڤێتی لەم كارەشدا دیبلۆماسیەكانیش هاوكاربوون.

بەپێچەوانەی ئەم هەواڵ و زانیارییانەوە، لەسەر ئەوەی كە ئاستی خۆ ئامادەكردنی شەڕكردنی هێزە چەكدارەكانی سۆڤێتی لە ئاستێكی نزمدابوو، ئەمەوای لە ستالین كردبوو لە جێبەجێكردنی ئەو كارانەی پێویست بوو لە پلانی كۆكردنەوەو ئامادەكردنی هێزدا بۆ بەرگری هێرشی چاوەڕوانكراوی دوژمن لەو كارانە زۆر خۆی دەپاراست.

# ستالین و جەنگ

هەروەها ستالین هەستی بەوە کردبوو ئەو گۆڕانکارییانەی لەم دواییەدا لەناو ڕێکخستنەوەی هێزە چەکدارەکاندا کرا وایکرد ژمارەیەکی بێشوماری ئەوتۆی سەرکردەکان بخرێنە شوێنانێکەوە شارەزایی و زانیارییەکی شەڕکردنی ئەوتۆیان نەبێت کە بۆ ئەو شوێنانە نەشێن، هەموو هەوڵ و کارێك لە کۆتایی ساڵی(١٩٤١)دا بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو بارودۆخەبوو.

ستالین زۆر خۆڕاگرو ئارەزوومەند و جەختی لەسەر ئاشتی دەکردەوە و بەمەرج و بنەمای سەرەکی دادەنا لە پێکهێنانی ئیشتراکی لە یەکێتی سۆڤێتیدا، لەو باوەڕەدابوو حکومەتەکانی بەریتانیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و جگە لەمانیش دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکانی تریش حەزیان دەکرد لەو بارودۆخە سەربازییە قورس و گران و ناهەمواره دووركەونەوە و بێنەدەرەوە و خۆیان لەو کارەساتە قوتارکەن، هەموو هەوڵ و تێکۆشانێکیان خستبووە گەڕ پاڵ بە ئەڵمانیاوە بنێن جەنگ دژی یەکێتی سۆڤێتی بەرپا بکات.

جا لەبەر ئەوە ستالین بەچاوێکی ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە دەیڕوانییە ئەو دەنگوباس و هەواڵانەی حوکومەتەکانی خۆرئاوا لە خۆ ئامادەکردنی ئەڵمانیا بۆ جەنگ دژ بەیەکێتی سۆڤێتی بڵاویان دەکردەوە.

مارشاڵ زۆکۆف چەند نموونەیەك لەو مەسەلانە دەگێڕێتەوە کەوای لە ستالین کردبوو بەشك و گومانەوە بڕوانێتە ئەو ڕاستی زانیارییانەی لە حکومەتەکانی ڕۆژئاواوە پێیدەگەیشت.

(دەربارەی ئەو پەیماننامەی لە نێوان ئەڵمانیاو یەکێتی سۆڤێتیدا هەبوو، کە دەستدرێژی و دوژمنکاری لە نێوان یەکتردا نەکەن، ئەو قسەوباس و هەواڵانە

هیچ بنەماو ڕاستیەکی نەبوو گوایە ستالین بڕوای تەواوی بەو پەیماننامەیە هەبوو بێت.

چونکە کەوتبووە کات و ڕۆژێکەوە نەدەکرا یەکێتی سۆڤێتی خۆی بخاتە ناو گێژاوی هێرشی ئەڵمانیا لە لایەکەوەو لە هەمان کاتیشا خۆی بخاتە بەر هێرشی یابانییەکان. بەهەرحاڵ من خودی خۆم هەرگیز لە ستالینم نەبیستبوو کە دڵنیایی خۆی بەرامبەر ئەو پەیماننامەی دەستدرێژی کردن و شەرکردنە دەربڕێت.)

ستالین لە وتارێکیدا کە بەبۆنەی ئاهەنگی دەرچوانی کۆمەڵێکی نوێی ئەکادیمی سەربازییەوە لە(٥ی ئایاری ساڵی١٩٤١)دا وتی "ڕاستە ئەڵمانیا باشترین لەشکری سەربازی هەیە لە بواری تەکتیك و بواری ڕێکخستندا، بەڵام ئەڵمانییەکان لە هەڵەدان کەوا دەزانن لەشکرەکەیان لەشکرێکی نموونەیی ئەوتۆیە هەرگیز نابەزێت و تێکناشکێن هیچ لەشکرێك لە دنیادا نییە قابیلی تێکشکاندن نەبێت.

ئەڵمانیا بە هیچ جۆرێك لە ژێر دروشمی شەرو بە زۆر داگیرکردن و ئەتکردن و زەلیلکردنی میللەتان و ژێر دەستکردنی وڵاتان و حکومەتەکاندا هەرگیز سەرکەوتن بە دەست ناهێنێت.

ئێمەش دەبێت بە خۆماندا بچینەوە پروپاگاندەو میدیاکان و سیاسەتی پروپاگەندەی خۆمان ڕێکبخەینەوە. خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ بەباشی ئەوە ناگەیەنێت لەشکرێکی سەربازی هاوچەرخ پێکبهێنین، بەڵکو مانای ئەوەیە دەبێت یەکخستن و تەعبیەکردنی سیاسەتی سەرانسەری بکەین."

مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت"حیزب و میللەت وڵاتیان بۆکاتی بەرگری کردنێکی یەکلایی کەرەوە ئامادەکرد".

من ئەمە بۆیەکی ناڵێم هەڵاتن بێت لەو بەرپرسیارێتی و هەڵانەی لەو قۆناغەدا ڕویاندا، بەڵکو ئەوەی لای من گرنگە ئەوەیە یارمەتیدەربم لە کێشانی ئەو ڕاستییانەی لەوکاتانەدا ڕوویدا.

# هەواڵی نەهێنی

ئێستا ئەو قسەوباسە زۆرانە بڵاودەکەینەوە کە گوایە ئێمە بەتایبەت ئاگاداری ئەو پلانی هێرشکردن و سەرەتای دەست پێکردنی ئەو هێرشەبووین، من ناتوانم بڕیاری کۆتایی بدەم بەوەی ئایا ستالین بەوانە ئاگادار بووە یان نا.. و ئایا بە ڕاستی ڕۆژی هێرشکردنی دەزانی یان نا...؟!! ئەو ڕاستیە گرنگانەی ستالین بەخودی خۆی دەگەیشت بە منی نەدەگوت، بەڵام بەڕاستی جارێکیان پێی وتم..:

ـ کەسێك هەیە هەواڵی زۆر گرنگمان لەبارەی مەبەستی حکومەتی هیتلەرەوە پێڕا دەگەیەنێت، بەڵام ئێمەش هەندێ شك و گومانمان لەبارەی ئەو هەواڵ و باسانەوە هەیە.

ڕەنگە ستالین مەبەستی لەو کەسە، کەسی(ریخارد زورج) بووبێت، کەمن تەنها دوای جەنگ مەسەلەکەیم زانی، بەم بۆنەیەوە من دەمەوێت بڵێم، ئێمە زۆرجار بەڕاستی زانیاری زۆر گرنگمان پێدەگەیشت، بەڵام زۆرجار لەمەبەست و ئەنجامەکەی دەکەوتینە هەڵەو گومانەوە، بۆ نموونە: جەنەراڵ(جولیکۆف)ی بەڕێوەبەری موخابەرات ڕاپۆرتێکی گرنگی پێدابین، لەو ڕاپۆرتەدا ئەگەری هێرشی ئەڵمانییەکانی تێدابوو، کاتی هێرشکردنەکەی لە نێوان(١٥ی ئایار و١٥ی حوزەیران)دا بوو، هەر بەڕاستی هێرشەکە لە کات و ڕۆژی خۆیدا کە جەنەراڵ جولیکۆف دەستنیشانی کردبوو ئەنجامدرا، بەڵام جەنەراڵ جولیکۆف ئەوکاتە ڕاپۆرتەکەی بەوە کۆتایی هێنابوو، وتبووی"دەشێت ئەم زانیاری و بەڵگەنامانە بۆ سەر لێشێوان و چەواشەکردن بێت، کە لەلایەن موخابەراتی بەریتانیا و ڕەنگە لەلایەن موخابەراتی ئەڵمانی خۆشییەوە دەرکرابێت".

لە(٦ی ئایاری ساڵی١٩٤١)دا وەزیری دەریاوانی ئەدمیراڵ کوزنستۆف ڕاپۆرتێکی بۆ ستالین نارد بۆ هەمان مەبەستی پێشوو لە کۆتایی ڕاپۆرتەکەیدا ئەدمیراڵ وتبووی:-

"من لەو باوەڕەدام ئەم زانیارییانە درۆبن و دروستکراوبن بۆ مەبەستی ئەوەبێت بزانن کاردانەوەی یەکێتی سۆڤێتی چۆن بێت." لە (١٣ی حوزەیران)دا

تیموشنکو بە تەلەفۆن پەیوەندی بەستالینەوە کرد ئەوکاتە منیش لەوێ بووم، لە تەلەفۆنەکەدا داوای ئەوەی لێکرد ڕێگای پێبدا ئەو هێزانەی لەسەر سنوورن بۆ شەرکردن بخاتە ژێر ئامادەباشییەوە".ستالین وەڵامیدایەوە".... بابزانین پاشان بیر لەوەدەکەینەوە بۆ ڕۆژی دوایی من و تیموشنکو چووین بۆ لای ستالین پەژارەو دڵەڕاوکێیەکی زۆری خۆمان بۆ ناوچە سەربازییەکانی سەرسنوورمان دەربڕی و داوامان لێکرد ڕێگامان بدا بۆ ئاگاداری و هۆشیار کردنەوە بۆ حاڵەتی ئەو پەڕی ئامادەباشی" ستالین وەڵامیداینەوە:

ـ ئێوە دەتانەوێت حاڵەتی ئامادەباشی بڵاوبکەینەوەو بەزووترین کات هێزەکانمان بەرەو سنووربکشێن؟ ئەمە مانای جەنگە..!! ئایا ئێوە لەوەدەگەن یان..نا..؟ لەگەڵ ئەوەشدا ستالین لەوبارەیەوە لەگەڵماندا کەوتە قسەو گفتوگۆ کردن..

ـ ژمارەی ئەو فیرقانەی لەو ناوچانەدان چەندن..؟

ـ (١٤٩) فیرقەو لیوایەکی تۆپە سووکەکانە...

ـ ئایا ئەمەکەمە..؟ بەپێی ئەو زانیارییانەی بەدەستمان گەیشتووە، ئەڵمانییەکان هێندەی هێزی ئێمەیان نییە.

ـ ڕاپۆرتی موخابەرات دەڵێت"... ژمارەی فیرقەیەکی ئەڵمانی دووهێندەی ژمارەی فیرقەیەکی سۆڤیاتییە".

ـ هەمووکات نابێت باوەڕ بە موخابەرات بکرێت، لەم کاتەدا سکرتێرەکەی ستالین خۆی کرد بە ژووردا و پێی وت نیکیستا خرۆشۆف لە کییفەوە بە تەلەفۆن قسەت لەگەڵدا دەکات.

ستالین تەلەفۆنەکەی هەڵگرت، لەقسەکردن و وەڵام دانەوەکەدا تێگەیشتین قسەو گفتوگۆکەیان لەسەر کشتوکاڵ بوو.

ـ زۆرباشە.. ستالین قسەکانی بە دوو وشە کۆتایی پێهێنا، دیاربوو خرۆشۆف شێوەیەکی باشی بەرهەمی داهاتوویدا بەستالین.

لە کرملین بەحاڵەتێکی دەروونی خراپەوە هاتمەدەرێ لە باخچەی ئەلکسەندەردا منداڵان گەمەو یارییان دەکرد، منیش دوومنداڵەکەی خۆمم بیرکەوتەوە، هەستێکی

قورس و گران دایگرتم، لەو بەرپرسیارێتییە گەورەو گرانە کە دەکەوێتە سەرشانی هەموومان بەرامبەر منداڵان، دەربارەی پاشەڕۆژیان و پاشە ڕۆژی خاك و نیشتمان لە شەوی(٢١ی حوزەیراندا) سەرۆکی ئەرکانی دەڤەری کییف بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوەکردم و پێیڕاگەیاندم عەریفێکی ئەڵمانیا لەناو هێزەکەی خۆیەوە هەڵاتووە و خۆی تەسلیمی هێزەکانی سەر سنوورمان کردووە، ڕایگەیاندووە ئەڵمانییەکان بەیانی(٢٢ی حوزەیرانیان) دەستنیشانکردووە و خۆیان ئامادەکردووە لەو ڕۆژەدا نیازی هێرشکردنیان هەیە.

هەر خێرا وەزیری بەرگریم لەوە ئاگادار کردەوە، ستالین من و وەزیری بەرگری بانگهێشت کرد بۆ نوسینگەکەی خۆی لە کرملین.

لە ڕێگادا لەگەڵ وەزیرو جەنەراڵ(فاتۆتین)ی یاریدە دەریدا ڕێکەوتین بەهەر جۆرێك بێت دەبێت ڕەزامەندی ستالین وەرگرین کە حاڵەتی ئامادەباشی تەواو لەناوهێزە چەکدارەکانماندا بڵاوبکەینەوە، ستالین خۆی بە تەنها پێشوازی لێکردین، دیاربوو قەلەق و پەشۆکابوو، یەکسەر ستالین بەم پرسیارە پێشوازی کردین.

ـ باشە ناشێت جەنەراڵەکانی ئەڵمانیا خۆیان ئەو سەربازەیان نەناردبێت بۆ ئەوەی شەڕوپێکدادانی سەربازی لە نێوانماندا بخوڵقێنن..؟

تیموشنکۆ وەڵامیدایەوە..:

ـ نەخێر.. ئێمە وادەبینین کە ئەو سەربازە هەڵاتووە ڕاست دەکات.

لەم کاتەدا ئەندامانی مەکتەبی سیاسی هاتنە ژوورەوە ستالین ئەم پرسیارەی لێکردن.

-چی بکەین..؟

کەسیان وەڵامینەدایەوە، لێرەدا وەزیری بەرگری، وتی:

ـئێستا پێویستە بەزووترین کات هێزەکانی ناوچە سنوورییەکان ئاگاداربکرێنەوە بۆ شەڕکردن بچنە ژێر حاڵەتی ئامادەباشی تەواوەوە.

ستالین وتی"بریاری ڕاگەیاندنەکە بخوێنەرەوە"، زۆکۆف بریاری ڕاگەیاندنەکەی خوێندەوە، ستالین داوای لێکرد پــڕۆژە بڕیارەکە کورت کاتەوەو ئەوسا

بیخوێنێتەوە.

لە دەقیقەی(٣٠ بەیانی ٢٢ی حوزەیران)دا کۆتایی بەڕاگەیاندنی ناوچە سەربازییە تایبەتییەکان هێنرا. مارشاڵ زۆکۆف دوای ئەوچاوپێکەوتنە دواییەی ستالین پێش ئەوەی جەنگ هەڵگیرسێت هەستی خۆی بەوەباس دەکات کە"هەستێکی سەیر و نامۆ و دوولایەنەی هەبوو".

ئەو لەلایەکەوە هەستی بەجۆرە ڕازی بوونێك دەکرد کە توانیبووی هەرچی لە توانایدابوو خستبوویە کار بۆ ئەوەی پشگیری هێزی بەرگری نیشتمانی بکات، لە لایەکی تریشەوە هەستی بە دڵە ڕاوکێ و ترسێکی زۆر دەکرد کە پێش ئەوەی ڕێنماییەکە بگاتە بەرەی جەنگ هێرشی ئەڵمانییەکان دەست پێ بکات، هەروەها زۆرکار هەبوو دەبوو پێش ئەوەی جەنگ دەست پێ بکات دەبوابکرایە، بەڵام ئێستا ئەو کارانە ڕۆیشت و کاتی بەسەرچوو.

ماوەیەکی زۆربوو تاریکایی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو، ڕۆژی(٢١) خەریکبوو مێژوو لە دووتوێی لاپەڕەکانیدا بیپێچێتەوە من و وەزیری بەرگری بێدەنگ بەرەو بارەگای وەزارەتی بەرگری دەڕۆیشتین، بەڵام من دڵنیابووم ئەم بیرکردنەوەیە، بیری تیموشنکۆشی هیلاك و هەراسان کردبوو.

لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزین..

دوای ئەوەی لەسەر ئەوە ڕێککەوتین پاش دە دەقیقەی تر لە نووسینگەکەی وەزیری بەرگریدا بەیەك بگەینەوە.

---

# بەشی نۆیەم

## سەرەتای جەنگ

- ئێستا، جەنگ دەستی پێکرد-ستالین ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بانگهێشت دەکات- دوژمن بەهەموو هێزێکییەوە هێرش دەکات-سوپای هەشت دەکشێتەوە- بەدوایدا سوپای یانزە پاشەکشە دەکات.

**لە نیوە شەوی(٢١ی حوزەیران)دا سەرکردەی دەڤەری کییف پەیوەندی پێوەکردم کە سەربازێکی تری ئەڵمانی لە کەتیبەی (٢٢ی سەر بە فیرقەی پیادەی ٧٤)ی ئەڵمانی بەمەلە لە ڕووبارەکە پەڕیوەتەوەو بەرەو پاسەوانانی سنوور هەڵاتووەو خۆی داوەبەدەستەوە و پێیڕاگەیاندون هێزەکانی ئەڵمانیا لە سەعات چواری بەیانیدا هێرش دەکەن.**

**لە دوای مردنی ستالین هەواڵ بڵاوبۆوەکە ئەو هێرشە کتوپڕییە هەندێ سەرکردەی ئەرکانی لەخەوی غەفڵەت ڕاچڵەکاند لە کاتێکدا بێخەم نوستبوون،**

یاخود بێ ئاگا لەگەمەو بەزمدابوون، ئەمە بۆ ئەوەی لە ڕاستی دوورنەکەوینەوە، ئەو شەوی ئاشتی و خۆشییەی ئەم دواینە باسی دەکەن شەوێکی پڕ لە خەباتکردن و کارو هەوڵدانێکی قورس و گران و بێ وێنەبوو!!

لە سەعات سێ و حەڤدە دەقیقەی بەیانیدا سەرکردەی کەشتیگەلی دەریای ڕەش ئەدمیراڵ ئەکتیابرسکی پەیوەندی پێوەکردم و هەواڵی دامێ کە چەند فڕۆکەیەکی زۆر و نەناسراو بەرەو دەریا نزیك دەبنەوە. لە سەعات سێ و نیودا جەنەڕاڵ لیموفسکی سەرۆك ئەرکانی ناوچەی خۆرئاوا پەیوەندی پێوەکردم و پێیوتم فڕۆکەکانی ئەڵمانیا هێرشیان کردۆتەسەر شارەکانی بیلورووسیا و تۆپ بارانیان کردوون.

پاش دە دەقیقە جەنەڕاڵ(یۆرکایف)ی سەرۆك ئەرکانی دەڤەری کییف پێیڕاگەیاندم، ئەڵمانییەکان هێرشی ئاسمانییان کردۆتە سەر شارەکانی ئۆکرانیا، وەزیری بەرگری فەرمانی پێدام پەیوەندی بە ستالینەوە بکەم، ستالین نوستبوو، دوای سێ دەقیقە وەڵامی دامەوە، منیش بارودۆخەکەم تێگەیاند و داوام لێکرد کە ڕێبدات و فەرمانبدات بەوەی ئێمەش دژی ئەوان دەستبەکاربین، ستالین بێدەنگ بوو، قسەی نەدەکرد، بەڵام دەنگی هەناسەکەی دەگەیشتە گوێم.

ـ لێم تێدەگەیت..؟

جارێکی تریش هەر بێدەنگی، پاشان ستالین لێیپرسیم.

ـ ئەی وەزیر کوا..؟

ـ پەیوەندی بە کییفەوە دەکات.

ـ تۆوتیموشنکۆ وەرن بۆ کرملین و بەیوسکوبیبیشیف بڵێ خێرا ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بانگ بکات، هەمدیسان ئەدمیراڵ ئەکتیابرسکی پەیوەندی پێوە کردمەوە.

-هێرشی ئاسمانی دوژمنمان بەربەست کرد، لە لێدانی بەلەمەکاندا سەرکەوتونەبوون, بەڵام شارەکە تۆزێك وێران بووە، حەزدەکەم ئاماژە بەوەبکەم هێزەکانی کەشتیگەلی دەریای ڕەش لە پێشەوەی یەکە سەربازییەکانمانەوە بوون. لەبەرامبەر هێرشی دوژمندا بەرگرییەکی چاك و ڕێکوپێك و بێهاوتایان کرد.

لە کاتژمێری چوارونیودا من و تیموشنکۆ چووینە نووسینگەکەی ستالینەوە، ستالین لەلای مێزەکەوە دانیشتبوو، ڕەنگی زەردهەڵگەڕابوو، سەبیلەکەی دەکێشاو بەدەوریدا هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی دانیشتبوون.

# بەرگری ڕووس

ستالین وتی "هەرئێستا دەبێت پەیوەندی بە باڵیۆزی ئەڵمانیاوە بکەین". داوایان لە مۆلۆتۆڤ کرد پێشوازی لەسەفیر بکات، وتی"کە ئەڵمانیا بڕیاری جەنگی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتیدا داوە".

ستالین بە بێدەنگی لە شوێنەکەی خۆیدا بە ماتی دانیشتبوو کەوتبووە بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە، دانیشتنەکە بێدەنگییەکی قورس و گران باڵی بەسەردا کێشابوو، کەس ورتەی لێوەنەدەهات، هەتا من ئەو بێدەنگییەم ڕەواندەوە، وتم:

ـ پێویستە بەهەموو هێزو توانامانەوە بچینە ناو جەنگ و پێکدادانەوە و بەرهەڵستی دوژمن بکەین و بیان وەستێنین و نەهێڵین بێنە ناوخاکمانەوە.

وەزیری بەرگری قسەکەی بۆ ڕاستکردنەوە... وتی:

ـ نەك هەر وەستاندنیان، بەڵکو تێکدان و لەناوبردنیان. پاشان دەرکەوت دوژمن بە هاوکاری بەکرێ گیراوان و دزەکردن توانیویەتی هێڵی پەیوەندی سلکی و لاسلکی لەناوببات و نەیانهێڵێت، من وەختی خۆی ئاماژەم بۆ ئەوەکرد کە هۆکانی پەیوەندی لاسلکی لە هەموو هێزەکانی ناوچە سەرسنووریەکاندا زۆرنین و کەم و لاوازن پاش هەواڵ و زانیاری لە زۆر سەرچاوەی جۆراوجۆرەوە دەگەیشتە سەرکردایەتی ئەرکان، هەندێ لەو هەواڵانەش شێوازی وێرانکاری بوون، هەروەها سەرکردایەتی ئەرکان نەیدەتوانی لەناوچەکانەوە زانیاری ڕاست و دروستی دەستکەوێت.

ئەمەش وایکرد ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ و سەرکردایەتی باڵا، بخاتە ژێر هەڵوێستێکی ناهەموارەوە.

سەرکردایەتی باڵا بەمشێوەیە پێکهات بوو..

"تیموشنکۆ، سەرۆك، زۆکۆف، ستالین، مۆلۆتۆف، فورشیلوف، بودیونی، کوزنتسوف"، شایانی باسە ئەنجومەنی ئەرکان پێشنیازیکرد کە ستالین بکرێت بە سەرۆکی باڵا، بارودۆخە نوێیەکە دووروویییەکی دروستکردبوو، کە کاریگەرییەکی سەلبی هەبوو، بەوەی لە رووی یاساییەوە تیموشنکۆ سەرۆکی باڵابوو، بەڵام لە راستیدا هەر ستالین سەرۆکی باڵای فیعلی بوو، لە کاتژمێری سیانزەی رۆژی(٢٢ی حوزەیران)دا ستالین پەیوەندی پێوەکردم و پێی وتم، بڕوام نییە و پشت بە توانای سەرکردەکانی ناوچە سەربازییەکان نابەستم و لەو باوەڕەدا نیم لەم بارودۆخە قورس و ترسناك و ناهەموارەدا بتوانن بەباشی کارەکانیان جێبەجێ بکەن، لەبەرئەوە مەکتەبی سیاسی بڕیاریداوە، بتنێرن بۆ بەرەی باشووری خۆرئاوا وەك نوێنەری سەرکردایەتی باڵا. و هەردوو مارشاڵ شایرشنیکۆف و کولیك بنێرن بۆ بەرەی خۆرئاوا، داوای لە من کرد هەر ئێستا سەفەربکەم و بچم بۆ کییف و لەوێوە لەگەڵ خرۆشۆفدا بچم بۆ سەرکردایەتی ئەرکانی بەرەی ترنۆبول. بەپێی ئەوە داوام لە جەنەراڵ فاتوتین کرد لە دوای من کاروباری سەرکردایەتی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ بەڕێوەببات، لە بنکەی ئەنجومەنی سەربازی بەرە بەدوورودرێژی دەربارەی بارودۆخەکە قسەو گفتوگۆی لەسەرکرا.

مەبدەئی پێشنیارم بۆ سەرۆکی بەرە کرد، هەر ئێستا و بە گورجی فەرمانبدا بە کۆکردنەوەی فەیلەقەکانی میکانیکی بۆ مەبەستی دژەلێدانێك بۆ ئەو کۆمەڵە سەرەکییەی دوژمن لە لەشکری(باشوور) کە کۆبوونەتەوەو چوونەتە ناوچەی (سۆکۆل)ەوە، هێزەکانی ئاسمانی سەر بەبەرەی جەنگ یارمەتی و پشتگیریتان بکات لەگەڵ ئەوتۆپە دوورهاوێژانەی سەربە تۆپخانەی سەرکردایەتی باڵان. خێرا سەرکردایەتی بەرە هەستا بەدابەشکردنی پلانی ئەو کردارە مەبدەئییەو دابەشکردنی بەسەر سوپای بەرەی جەنگ و فەیلەقەکاندا، لێرەدا دەبێت ئاماژەبکەم بەو خۆراگرییەو ورە بەرزە دەروونییە و توانای رێکخستنە کە سەرکردایەتی بەرەی جەنگ هەیانبوو بە تایبەت هەردوو جەنەراڵ(م.أ. بورکایف و م.ب. کیربونوس).

ها ئەمەش ئەو بیرەوەریی رۆژانەیە کە سەرۆك ئەرکانی جەنگی هێزە

پیادەکانی سوپای ئەڵمانیا جەنەراڵ(جالور) لە ڕۆژی(٢٤ی مانگی حوزەیرانی ساڵی١٩٤١)دا نووسیویەتی:

"دوژمن بەردەوام هێزی زیاتری گورج و گۆڵی نوێ ڕەوانەی کۆرەکانی بەرەی جەنگ دەکات بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزی دەبابەکانمان، هەروەك ئێمە ڕەچاومان دەکرد دوژمن هێزێکی زۆری دەبابەی ڕەوانەکردووە بۆ ئەوەی هێرشێکی دژ بەباڵی باشووری کۆمەڵی دەبابەکانی یەکەممان بکەن.

لە هەموو شوێن و لایەکەوە جموجوڵیان دەبینین" ئابەو شێوەیە هێزەکانی بەرەی باشووری خۆرئاوا هەستان بە یەکەم دژە هێرش بۆ سەر دوژمن.

هێزەکانمان دەیانتوانی هێزەکانی دوژمن تێکبشکێنن و لەناویان بەرن ئەگەر لەژێر دەست و هەڵسوکەوتی بەرەدا هێزێکی ئاسمانی گەورەو زۆر و فەیلەقێك یان دوو فەیلەقی تۆپ هاوێژی سووك ببوایە. بەهەرحاڵ هێزەکانمان توانییان ئەو کارە سەرەکییە جێبەجێ بکەن کە خرابووە سەرشانیان، ئەویش وەستانی کشان و جووڵەی دوژمن بوو بەرەو شاری کییفی پایتەختی ئۆکرانیا.

لەو ماوەیەدا و لەو پەیوەندییانەی بە مۆسکۆوەم دەکرد، جەنەراڵ فاتوتین"ئەوەی کارەکانی زۆکۆفی جێبەجێ دەکرد" پێیراگەیاندم کە سەرۆك و سەرەك ئەرکانی هەردوو بەرەی خۆرئاواو باشوری خۆرئاوا هەتا ئێستا نەیانتوانیوە پەیوەندی بەسەرکردایەتی سوپاوە بکەنەوە. ئەمە وایکردووە فەیلەقەکان و تیپەکان شەڕو پێکدادانی پچرپچربکەن، بێئەوەی هیچ هەم ئاهەنگی و هاریکاری و یەکخستنی هەوڵەکانیان لەگەڵ هێزەکانی دەوروبەردا و نە لەگەڵ هێزە ئاسمانییەکانیشدا هەبێت.

لەوەوە تێگەیشتم بارودۆخ لە هەردوو بەرەدا لەوپەڕی خراپی و لە حاڵەتی خەتەرو ناهەمواردایە. فاتوتین ئاگاداری کردمەوە، ستالین زۆرتوورەیەو دەیەوێت هەرچی بەرپرسیارێتییەك هەیە بخاتە سەرشانی بەرەی خۆرئاوا و سەرکردایەتی ئەرکانەکەی و مارشاڵ کۆلیك بەکەمتەرخەم و تاوانباردەکات.

پاش ماوەیەکی کورت جەخت کرا، هێزەکانی ئەڵمانیا توانیویانە لە هەندێ ناوچەدا بەرگری هەردوو بەرەکانی جەنگ ببەزێنن و زۆرخێرایی بەرەو

ناو بیلۆڕووسیاو بەلتیك دەكشێن، ئاوەها مەینەتی گەلی سۆڤیاتی دەستی پێكرد..!!

## تاوانباركردن

لەم چەند ساڵانەی دواییدا لە ناوخەڵقیدا واباوبوو، تۆمەت دەخرایە سەر سەركردایەتی ئەنجومەنی باڵا لەدەغەڵی و خێرا نەكردنیاندا لە پاڵ پێوەنان و هەڵنانی هێزە جەنگاوەرە سەرەكییەكانی یەكێتی سۆڤیاتیدا لە ناوجەرگەی وڵاتەوە بۆ دەرەوەی وڵات لەو ناوچانەی لەسەر سنوردان بۆ شەڕكردن و بەیەكدادان و لێدانی دوژمن و ناچاركردنیان بەشكان و پاشەكشەپێكردنیان.

من بەخۆمدا ڕاناپەرمووم كە بڕیارێكی یەكلایی و كۆتایی بەوجۆرە بدەم بەوەی بارودۆخ باشتر و پێشكەوتووتردەبوو ئەگەر ئەو كارەبكرایە، یاخود بەرەو خراپتر دەڕۆیشت، بەڵام دەتوانم ئاماژە بەوەبدەم ڕەنگە هێزە سەرەكییەكانی سۆڤێتی بكەوتایەتە هەمان بارودۆخی ناخۆش و گرانەوە كە هێزەكانی ناوچە سنوورییەكان تێیكەوتبوون، چونكە سوپا هۆی بەرگریكردنی تەواوی دژە دەبابەو فڕۆكەیان نەبوو.

هەروەها توانای جموجۆڵی تەواویان نەبوو، وەك هێزەكانی دوژمن هەیانبوو، هەروەها ڕەنگە بە تەواوی نەیانتوانییایە خۆیان لەبەر ئەو لێدانە گورچك بڕانەی هێزی زرێپۆشەكانی دوژمندا ڕاگرن، لە كازیوەی بەیانی ڕۆژی(٢٦ی حوزەیراندا) (فاتۆتین) پێیڕاگەیاندنم بارودۆخ لە ناوچەی بەلتیك و بیلۆڕووسیادا زۆرخراپ و ناهەموارە سوپای هەشتی سەر بە بەرەی باكوری خۆرئاوا بەرەو(ڕینا) دەكشێنەوە و سوپای یانزەهەمیش بەرەو(بولوتسك) پاشەكشە دەكات و فەیلەقی بیست و یەكی میكانیكی لە مۆسكۆوە بۆ پشتیوانی بەرەی جەنگ دەچێت.

"بەشێوەیەكی گشتی ئەوەی ڕوویدا كتومت لەو بەسەرهات و ڕاستیانە دەچوو

که له ئایاری ئەو ساڵەدا و لەو پێشبڕکێ سەربازیانەی لەسەرکردایەتی ئەرکان و لە ژێر چاودێری مارشاڵ تیموشنکۆدا کرا..!!" لەمەوپێش باسی هەندێ بارودۆخم کرد کە لە سەرەتای دەستپێکردنی جەنگدابووە هۆی تێکشکانمان و بەرەو تێکشکاندنی بردین. پاشان بەدووروودرێژی باسی ئەو هۆکارانەی دەکەم، بەڵام ئێستا دەمەوێت ئاماژە بۆ ئەو هەلانەبکەم کە سەرکردایەتی باڵا تێیکەوتن، و سەرکردایەتی سەربازیش لە هەموو ئاستەکاندا لەبەرپرسیارێتی و خراپ هەڵسەنگاندن و رووبەروو بوونەوە بێبەش نین، هەموو سەرکردەیەکی سەربازی کە هەڵدەستێت بەکارێك و تیایدا سەرکەوتوو نابێت، مافی ئەوەی نییە خۆی لەوبەرپرسیارێتییە بدزێتەوە و تاوانەکەی بخاتە ملی سەرکردایەتی باڵا.

بەپێی بەندەکان هێزە چەکدارەکان و سەرکردەکانیان دەبێت بەردەوام لە ئامادەباشیدابن بۆ رووبەرووبوونەوەی جەنگ و پێکدادان، بەڵام پێش جەنگ و هەتا شەوی(٢٢ی حوزەیران) هەندێ سەرکردەی پێکهاتەکان و هەموو کۆمەڵانی ناوخۆ ئەوانەی لە چوارچێوەی بەرگری سنوورەکاندابوون هەتا دواخولەك چاوەروانی رێنمایی بوون کە لەسەرو خۆیانەوە پێیان بگات، بێئەوەی خۆیان هەڵوێستێکی شیاو وەربگرن و لە ئامادەباشیدابن و دەست بەکاربن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە دەنگی تەپەتەپی ماتۆرەکان و دەنگ و هەراوهوریای زرەی زنجیری دەبابەکانیان لەوبەری خۆیانەوە لەسەر هێڵی سنوردا دەبیست.

پێش جەنگ ستالین و تیموشنکۆ و سەرکردایەتی ئەرکان لەو باوەڕەدابوون بەپێی ئەو زانیاریانەی لە موخابەراتەوە دەگەیشتە دەستیان هێزەکانی ئەڵمانیا ئەگەر هێرش بکاتە سەریەکێتی سۆڤێتی، ئەوا ئەو کاتە ناچار دەبێت لە ئەوروپا و خۆرهەڵاتی ناوەراست و باقی وڵاتە داگیر کراوەکان، ناچارە لە(٥٠٪) کۆی هێزە ئەڵمانییەکان لەو شوێنانەدا بهێڵێتەوە.

لە ڕاستیدا ئەڵمانیا پێش ئەوەی هێرش بکاتە سەر یەکێتی سۆڤیاتی لەو شوێنانەی باسمان کرد تەنها کەمتر لەیەك لەسەرسێی(٣/١) هێزەکانی لەو شوێنانەدا هێشتبۆوە و لە دوایشدا ئەو رێژەیەشی کەمتر کردەوە، هێزە پیادە و ئاسمانییەکانی ئەڵمانیا لێدانی توندو تیژو جەرگبڕیان لەبەرە ستراتیجییەکانی

خۆرئاوامان دەدا، وەك تیر بەرەو مۆسكۆ دەكشان.

لە ناوچەی(برست)دا بارودۆخێكی خراپ و ناهەموارپێكهاتبوو، بەڵام دوژمن نەیتوانی ئەو بەرگرییە قارەمانیانەی گەمارۆ دراوەكانی قەڵای(بریست) سەركوت بكات و لە ناویان بەرێت، هێزەكانی ئەڵمانییەكان ناچاربوون بەدەوری شارە خۆراگرەكەدا بسوورێنەوە.

ئەو داستانە قارەمانیانەی ئەو شارە كردیان شتێكی كتوپڕی و چاوەڕوان نەكراوبوو، بۆ هێزە زرێ پۆشەكانی(جودریان) و سوپای چوارەمی ئەڵمانی. هێزەكانی جودریان بەرەو دەوروبەری(منیك) كشان و لەوێدا شەڕو پێكدادانێكی قارەمانانەی توندوتیژ ڕوویدا، دوژمن زۆر بەخەستی بە تەیارە بۆمب بارانی ناو شارەكەیان كرد و لە هەموو لایەكەوە ئاگریان تێبەردا و وێرانیان كرد و هەزارەها خەڵكی بێگوناه و بێتاوانیان كوشت و لەناوبرد، لەكاتی مردنیاندا هەزارەها هاوڵاتی نەفرەتی بێدەستەڵاتیان لە فڕۆكەوانەكانی ئەڵمانیای درندە دەكرد.

لە(٢٦)ی حوزەیراندا ستالین خۆی پەیوەندی پێوەكردم و خراپی و بارودۆخی بەرەی خۆرئاوای پێراگەیاندم و داوای لێكردم بگەڕێمەوە بۆ مۆسكۆ... و پێیوتم دەنگ و هەواڵی مارشاڵ كولیك نەماوە.بۆ مۆسكۆ سەفەرم كرد و لە فڕۆكەخانەوە، یەكسەرچووم بۆ لای ستالین خۆی و تیمۆشنكۆو یاریدەدەرەكەی یەكەمم فاتۆتین پێشوازییان لێكردم، ستالین بەسەرجووڵانێكی هێواش سڵاوی لێكردم، پاشان خێرا پێی وتم:-

ـ هەمووتان پێكەوە بیربكەنەوە بزانن لەم بارودۆخە ناهەموارەدا دەبێت چی بكەین؟ پاشان بیروڕای خۆتانم پێبڵێن، پێم وت، پێویستمان بە(٤٠) چل دەقیقە كات هەیە بۆ گفتوگۆكردن لەسەر هەڵوێست وەرگرتن.

ـ باوابێت...

پاش گفتوگۆكردن و ڕاوێژكردن هیچ چارەسەرو ڕێگاچارەیەكمان لەوەباشتر نەزانی كە بكشێینەوە و لە هێڵی بەرگری كە بە(بدافینی خۆرئاوا و بولوتك و دفتیبیك و ئوروشا و موجیلوف و موزیر)دا ڕەتدەبێت خۆمان دامەزرێنین و بچینە سەنگەرەوە، لە هەمان كاتیشدا هەڵوێست وەرگرین و چی پێویست

دەكات بۆ پێكهێنانی هێڵێكی بەرگری تر لە دەریاچەی سیلیجارۆفا و سمولینك و رۆسلافلدا، و لەو فیرقە یەدەگیانەی لە مۆسكۆدان سێ سوپای نوێ پێكبهێنین.

## زیان پێگەیاندنی هێزەكانی دوژمن

مەبەستی سەرەكی لە پێشنیارەكەمان زەرەرو زیانگەیاندن بوو بە هێزەكانی دوژمن و راگرتنی هێرشەكەیان بەرەو مۆسكۆ لە یەكێك لە هێڵەكانی بەرگریدا و پاشان رێكخستنی هێرشێكی دژایەتی دژ بەوان، بەپشت بەستن بە هێزەكانی خۆرهەڵاتی ناوەراست و پێكهێنانی هێزێكی نوێ.

كەی و لە كوێدا بتوانین هێرشی دوژمن بەرەو مۆسكۆ بووەستێنین؟ ئەو ناوچەیە كوێ بێت، بتوانین بیكەین بە بنكەی هێرش دژ بەدوژمن؟ ئەی ئەو هێزە چ هێزێكەكە دەمانەوێت بۆ مەبەستی ئەو هێرشە كۆی بكەینەوە؟ هێشتا ئەمانەمان نەدەزانی، ئەمە تەنها هیواو ئاواتمان بوو، لە(٢٧ی حوزەیران)دا رینمایمدا بەو هێزانەی مەبەستم بوو.

لەگەڵ ئەوهەموو قارەمانی و خۆراگرییە بە كۆمەڵەی سەرباز و سەركردە بچووكەكان نواندیان و ئەو خۆراگرییە قارەمانیانەو پێداگرتنانەی سەركردە گەورەكان نواندیان بۆ ئەوەی پرۆسەكە سەربگرێت و سەركەوتوبێت، لەگەڵ ئەوەشدا بارودۆخی بەرەی خۆرئاوا هەتا دەهات هەربەرەو خراپی دەرۆیشت.

هەتا كارگەیشتە ئـەوەی لــە(٢٨ی حـوزەیـران)دا هێزەكانمان ناچار لەشاری(مینسك) كشانەوە و دوژمن چووە ناو شارەكەوە و داگیری كرد، زۆربەدرندانە دەستیكرد بە كوشتن و لەناوبردنی دانیشتوانە هەژار و بێگوناهە مەدەنییەكان و بەئاگر و ئاسن ئاسەواری شارستانی و پێشكەوتنی شارەكەیان وێران كرد.

بەهەرەس هێنانی مینسكی پایتەختی بیلورووسیا كارێكی خراپ و پرێش و

ئازاری کردە سەر دەروونی سەرکردە باڵاکان و ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ.

لە(٣٠ حوزەیران)دا ستالین بەتەلەفۆن پەیوەندی پێوەکردم، فەرمانی پێدام سەرکردەی بەرەی خۆرئاوا جەنەڕاڵ(د. بافلۆف) بانگبکەم بێتەوە بۆ ڕۆژی دوایی بافلۆف گەیشتە مۆسکۆ، زۆربەگران توانیم بیناسمەوە لەو هەشت ڕۆژە جەنگەی ئەم دواییەدا یەکجار زۆر بە خراپی تێکچووبوو.

هەر لە هەمان ڕۆژدا لەسەرکردەیی بەرەی خۆرئاوا لابرا و درا بەدادگای سەربازی و بەپێی پێشنیاری ئەنجومەنی سەربازییەوە، سەرۆك ئەرکانی جەنگی بەرە جەنەڕاڵ کلیمسو تسکینج و سەرۆکی هێزەکانی ئیشارەت کردن جەنەڕاڵ جریجوریف و سەرکردەی هێزی تۆپەکان جەنەڕاڵ کلیتش و ژمارەیەکی تری جەنەڕاڵەکانی ئەرکانی جەنگی بەرە، دران بە دادگا.

بڕیاردرا مارشاڵ تیموشنکۆی وەزیری بەرگری بکرێت بە سەرکردەی بەرەی خۆرئاوا و جەنەڕاڵ(بریمنکۆ)ش بکرێت بە یاریدەدەری. وە بۆ پشتیوانی بەرەی خۆرئاوا لەشکری بەرەی یەدەکی چوونە پاڵیان. لەبەرەی باکوری خۆرئاوادا بارودۆخ بەردەوام بەرەوخراپی و دارمانی گەورەوگران دەچوو.

لەبەرخراپی ڕێکخستن و ڕێکوپێکی لەلایەن سەرکردەکانی بەرەکەوە، هێزەکانی لەشکری هەشتەم و یانزەهەم بەهۆی ئەو کشانەوە نارێکوپێکەی بە هەموولایەکدا دەکشانەوە، لەو هەولانەی دەیاندا نەکەونە ژێر گەمارۆوە زەرەرو زیانێکی یەکجار زۆر و گەورەیان لێکەوت.

لە(٣٠ی حوزەیران)دا ستالین پەیوەندی پێوەکردم، ئەو گۆڕانکارییە نوێیەی لە سەرکردایەتی سەربازیدا کرا پێیراگەیاندم، بەپێی ئەو گۆڕانە جەنەڕاڵ(فاتۆتین)ی یاریدەدەری یەکەمم کرا بەسەرۆکی ئەرکانی جەنگی بەرەی باکوری خۆرئاوا.

پاش (١٨) ڕۆژ لە دەستپێکردنی جەنگ بەرەی باکوری خۆرئاوا بە تەواوی لە کۆمارەکانی لاتفیاو لتوانیاو بەشێك لە کۆماری ڕووسیای یەکگرتوودا بە تەواوی کشانەوە.

بەو پێیە هێرشکردنی دوژمن بۆ سەر لینینگراد، کە ئەو ناوچەو ڕێگایانەی بەرەوئەوێ دەڕۆیشت هیچ جۆرە خۆ ئامادەکردن و خۆسازدانێکی هێزی سەربازی

پێویستی تێدانەبوو، ببووە کارێکی خەتەرناك.

لەوماوەیەشدا ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگی سەرکردایەتی باڵا هیچ نوسراو و ئاگادارییەکی باش و دووروودرێـژی لە ئەرکانی بەرەی باکوری خۆرئاواوە پێنە دەگەیشت کە بارودۆخی هێزەکانمان و باسی مۆڵگاو جێگیربوون و شوێنی کۆبوونەوەی ئامێرە میکانیکییەکانیانمان بۆ دەستنیشان و ڕوون و ئاشکرابکەن.

ئێمەش زۆرجار ناچاردەبووین هەربەبۆچوون، تەقدیری ئەو هەڵوێستە بکەین بۆ ئەگەری ڕووداوی تر. ئەم جۆرە کاروبۆچوونانەش وەك ئاشکرایە وەك پێویست نەبوو دەیخستینە ناو هەڵەوە.

لەبەرەی خۆر ئـاوادا لەسەرەتای ڕۆژەکانی تەمووزدا شەڕوپێکدادان لەبارودۆخێکدابوو هێزی دوژمن بـەزرێ پۆش و هێزی ئاسمانییەکانیان سەرکەوتنێکی گورچکبڕو بێهاوتایان بەسەر هێزەکانماندا هێنا، هێزەکانی ئێمەش ئەو جەنگ و پێکدادانە گورچکبڕە یەك لە دوای یەکانەی دوژمن هیلاك و شپرزەیان کردبوون بە ناچاری بەرەو خۆرهەڵات پاشەکشەیان دەکرد، بەڵام هەتا لەوبارودۆخە ناخۆش و ناهەموارەشدا زیانی گەورەو گورچکبڕیان بە دوژمن دەگەیاند، بەپێی توانا هەوڵیان دەدا پێشکەوتن و ڕێڕەوی دوژمن ڕاگرن و نەهێڵن بەرەو پێشتر برۆن و بێنە پێشەوە.

لەسەر ڕووباری(بریوزینا) (ئەو ڕووبارەی لەساڵی ١٨١٨دا تێکشکانی هێزەکانی ناپلیۆنی بینی) لەناوچەی شاری(بورسوف)دا لە نێوان هێزەکانی دوژمن و نێوان هێزەکانی مەدرەسەی دەبابەکانماندا شەڕوکوشتارێکی گەورەوگران ڕوویدا.

هەتا ئەو کاتەی هێزەکانی زریپۆشی یەکەمی فیرقەی مۆسکۆ بەسەرکردایەتی جەنەڕاڵ(کرێزر) گەیشت و بەهانایانەوە هات. ئەو فیرقە زرێپۆشەی مۆسکۆ بەپێی ئەو مواسەفاتەنەی کاتی جەنگ لە ڕووی ژمارەی کەسەکان و چەکدارییان پێکهاتبوون، دەبابەکانیان لە شێوازی (T٣٤)ی نوێدابوون.

جەنەراڵ کرێزر توانی جموجوڵی هێزەکانی فیرقەی هەژدەی دوژمن بۆماوەی دووڕۆژی تەواو ڕاگرێت کە بە هێزەکانی تریان هاوکاری دەکران، ئەمە لەوکاتەدا

گرنگییەکی یەکجار زۆری بۆ ئێمە هەبوو، جەنەڕاڵ کریزر لەو شەڕوپێکدانەدا تواناو شارەزاییەکی بێوێنەو مەزنی نواند.

لەبەری باشوورەوە لە خاکی ڕۆمانیاوە هێزە هاوپەیمانییەکانی ئەڵمانی و ڕۆمانی دەست وەشان و لێدانە سەرەکییەکەیان بەرەو(موجیلوف- بودوسکی- جمیرنیکا)بوو.

ئەمە کێشەو هەرەشەیەکی بۆ باڵی پاشەوەی لەشکری شەشەم و دوانزەو بیست و شەشی سەر بەبەرەی باشووری خۆرئاوا دروستکرد پاش شەش ڕۆژ لە شەڕوپێکدادنێکی توندوتیژ دوژمن توانی بەرەی باشوور ببڕێت و بەقوڵی(٦٠) کیلۆمەتر بێتە ناو قوڵایی خاکمانەوە.

بارودۆخی بەرەی باشوریش زۆر بەرەوخراپی و دارمان بۆوە بەوەی هێزەکانی ئەڵمانیا توانییان هێڵەکانی بەرگریمان لە دەڤەری(ڕۆڤنۆ- دۆبنۆ- کریمینتس) ببڕن و لەوێوە بەرەو ناوخۆی وڵات بکشێن و هەڵمەت بەرن، بەڵام هێرش و شاڵاوی دوژمن بەهۆی چەند کردارێکی سەربازییەوە کە بەرەی باشوری خۆرئاوا پێی هەستان توانییان ئەو هێرش و شاڵاوانە بووەستێنن.

ئەمە بووە هۆی ئەوەی بتوانرێت پشتگیری و بەرگری لە شاری کییف بکرێت و شکستی بەو هەوڵانەی هێزەکانی ئەڵمانیا بدرێت لە گەمارۆدانی هێزەکانی بەرەی باشوری خۆرئاوا. لەبەرەی باکوریشدا لە(٢٩ی حوزەیران)دا شەڕوپێکدادان ڕوویداو ئەمەش گرنگییەکی ناوخۆیی سنوردار و کاریگەری بۆ بارودۆخی ستراتیجی گشتی بۆ پەرەپێدانی بەسەرهاتەکان هەبوو، لەسەرەتای جەنگدا هێزە دەرياییەکانمان لەگەڵ هێزەکانی دوژمندا نەکەوتنە شەڕوپێکدادانێکی ئەوتۆوە کە گرنگی هەبێت، تەنها شەرو تێکۆشانیان بەرهەڵستی هێرشی ئاسمانی دوژمن بوو، بەڵام بارودۆخی کەشتیگەلی بەلتیك لەوپەڕی خراپی و ناهەمواریدا بوو، بەتایبەت بنکەی سەرەکی دەریایی کە گەورەترین مۆڵگەی دەریایی کەشتیگەلی دەریای بەلتیکی لێ بوو.

بنکەی(تالسین) و ئاسمانی شارەکە لە ڕووی بەرگری ئاسمانییەوە، لەبەرەی دەریاوە هیچ بەرگرییەکی بەهێز و توانای ئەوتۆی لێنەبوو بتوانێت بەرگری هێرشە

ئاسمانییەکان بکات، ئەمەش بەهۆی ئەوشەڕوپێکداداان و شکستانەی بوو کە هێزەکانی لەشکری هەشتەمی سەربە بەرەی باکوری خۆرئاوا تووشیان هات، هەرچی هێزەکانی کەشتیگەلی بەلتیك و کەتیبە چەکدارەکانی کرێکاران هەبوو بۆ بەرگری و پاراستنی پایتەختی کۆماری ئەستۆنیای سۆڤێتی پێکەوە ڕاپەڕین و کەوتنە بەرگری کردن، دوژمن ویستی بنکەی شاری(تالسین) بەکتوپڕی داگیر بکات و دەستی بەسەردابگرێت، بەڵام بەشێوازێکی قارەمانانە و خۆڕاگرییەوە لەلایەن تۆپەسووکەکانی دەهەمەوە کە سەر بەلەشکری هەشتەم و هێزەکانی پیادەی کەشتیگەل و تۆپە قورسەکانی کەشتیگەل و کۆمەڵانی چەکدارانی بەرگری میللی لە ڕوویاندا ڕاپەڕین و بەرگرییەکی قارەمانانەیان نواند.

## کشانەوەو بەرگری کردن

هەروەها هێزەکانی ئاسمانی کەشتیگەل دەورێکی گەورەو باڵایان گێڕا لەو بۆمبارانە چڕوپڕە ڕاستەوخۆیە ئاسمانییانەی کردیانە سەردوژمنی هێرشبەری داگیرکەر.

پێویستە ئاماژە بەو قارەمانی و نەترسییەی سەربازانی کەشتیگەلی بەلتیکی خۆڕاگربدەین بەو قارەمانی و لەخۆبوردنانەیان کە لە وشکانی وناو دەریادا وەك یەك نواندیان و لە ڕووی دوژمندا ڕاوەستان، لەو کاتانەشدا کەشتیگەلی باکور هەم ئاهەنگی هەوڵەکانی لەگەڵ هێزەکانی بەرەی باکوردا یەکخستبوو بە ژێر دەریا گەڕەکانیان چەند کارێکی سەرکەوتوانەیان دژ بە بەلەمە شت گواستنەوەکانی ئەڵمانی ئەنجامدا کە مادەی خامی نیکلسیان لە(بتسامۆ)ەوە دەگواستەوە.

هەروەها کەشتیگەلی دەریای ڕەشیش زەخیرەو سەربازی دەگواستەوە بۆ ئەو لەشکرە جەنگاوەرەی لە دەڤەرەکانی سنوری دەریادابوون.

هەروەها ئەو کەشتیگەلەی کە هەستا بە ڕێگرتنی هاتوچۆی دوژمن لە

دەریاو بەندەرەکانی ڕۆمانیاو بولگاریادا، بەهاوکاری لەگەڵ هێزەکانی ئاسمانی کەشتیگەلی دەریای ڕەشدا پێکەوە هەستان بەلێدانی بنکەی دەریایی ڕۆمانی لە کۆنستانتنادا، هەروەها هێزەکانی کەشتیگەلی ئاسمانی بەردەوام هێرشیان دەکردە سەر دامەزراوە پەترۆڵی و هێڵە ئاسنینەکانی ڕۆمانییەکان.

من درێژە نادەم بەباسی ئەو کاروکردەوە جەنگییانەی هێزەکانی دەریایی پێی هەڵدەسان، چونکە من لەو باوەڕەدام ئەدمیراڵەکان و سەرکردەکانی دەریاوانی لە من باشترو چاکترن بۆ تیشك خستنە سەرئەوکارولایەنە، بەڵام دەبێت ئەوە بڵێم ئەنجامی هاریکاری کردن لەنێوان هێزە دەریایی و هێزەکانی وشکانیدا، ئەوانەی لە ناوچەکانی ڕۆخەکانی دەریادا کاریان دەکرد، دەتوانرا باشترکاریگەرییان ببوایە ئەگەر ئێمە پێش جەنگ بمانتوانییایە چارەسەرێکی ڕاست و سەرکەوتوانە بۆ ئەو کێشەو بەرگریانەمان بدۆزیایەتەوە لە ڕۆخەکان و بنکە دەریاییەکاندا، بەڵام بەداخەوە ئەو گرنگییە زۆرەی سەرکردایەتی گشتی بۆ هێزە دەریاییەکان و وەزارەتی بەرگری و ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ زۆردرەنگ و لەکاتی پێویستی خۆیدانەبوو ماوەی سێ هەفتە بەسەر ئەو ڕێکەوتننامەیەی نێوان ئەڵمانیا و سۆڤێتیدا تێپەڕیبوو، کە ئەڵمانیای فاشستی ئەو ڕێکەوتننامە دەستدرێژنەکردنەی پێشێلکردو هێزە چەکدارەکانیان هێرشەکانیان دەستپێکرد.

هەتا ئەو کاتە زەرەرو زیانی هێزە هیتلەرییەکان گەیشتبووە نزیکەی(١٠٠) سەد هەزارکەس وزیاد لە(١٠٠٠) هەزار فڕۆکەو نزیکەی(١٥٠٠) دەبابەیان زەرەر لێکەوتبوو.

هێزە چەکدارەکانی سۆڤێتی بەتایبەت لەبەرەی خۆرئاوادا زیانی گەورەو زۆریان پێگەیشتبوو، ئەم زەرەرو زیانانە لەدواییدا کاری کردە سەر زیادکردن و پەرەپێدانی بەسەرهاتەکان و تای تەرازووی هێزی ئەڵمانی و سۆڤێـتی زیاتر بەلای بەرژەوەندی دوژمندا لاسەنگبوو، چونکە دوژمن سەرکەوتنی گەورەو یەکلایی کردنەوەی بەدەستهێناو بە قووڵایی(٥٠٠-٦٠٠) کیلۆمەتر هاتنە ناوخاکی سۆڤیاتییەوەو دەستی بەسەر ناوچە ئابوری و شوێنە ئیستراتیجییە زۆر گرنگەکاندا گرت و داگیریان کردن.

ئەمانە هەموو ڕووداوی زۆر گەورەو و کتوپڕی بوون بۆ گەلی سۆڤیێتی و هێزە چەکدارەکانمان، ئالەم ڕۆژە ناهەموار و تەنگانە ناخۆشانەدا ڕۆحی یەکێتی و سیاسی لەناو جەماوەری سۆڤیێتیدا بەهێزو توانایەکی بێ وێنەوە سەری هەڵدا.

## سیاسەتی بەرپەرچدانەوە



نە میللەت و نە حیزبیش لاسەنگی خۆیان لە دەست نەدا هەر لەسەرەتای یەکەمەوە حیزب ڕۆژ لە دوای ڕۆژتین و توانایەکی ڕێکخستن و سیاسەتێکی گەورەو بەتوانای گرتەبەر بۆ مەبەست و دەستەبەرکردنی یەك شت ئەویش"ئامادەکردن و پێگەیاندنی هێزی هەموو میللەت بوو بۆ بەرپەرچدانەوەی دوژمن."

لە(٢٣ی حوزەیران)ەوە پلانی خۆ ئامادەبوون و خۆسازدان ڕەچاوکرا بەتایبەت لە پێکهێنانی هێزی یەدەکیدا، وە وەزارەتە پەیوەندداەکان ڕێنماییان بۆچوو،

بۆ زیادکردنی بەرهەمهێنانی دەبابە و فڕۆکە و تۆپی جۆراوجۆر و هەموو پێداویستیەکی سەربازی.

لە پاش هەفتەیەك شەرکردن بەرنامەی وەبەرهێنانی جەنگی گۆڕاو بەرێژەی لەسەدا(٢٥٪) لە ماوەی سێ مانگی داهاتوودا بەرزبۆوە لە چاو ئەوەی لە ساڵی(١٩٤١)دا هەبوو.

وە بەپشت بەستن بەو سەرمایە یەدەکییەی حکومەت هەیبوو حکومەت بڕیاریدا گۆڕانکارییەکی گەورە و بنەڕەتی لە بەرنامەی پیشەسازی لە هەرێمەکانی سیبیریاو ئۆراڵ و کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاستدا بکات.

ئەو هەرێم و ناوچانە دەورێکی یەکلایی کردنەوەی باشیان بینی لە گۆڕینی بەرهەمهێناندا بۆ پیشەسازی جەنگ، هەروەها لیژنە حیزبییەکان دەورێکی گەورەیان هەبوو لە رێکخستنەوەی پیشەسازی نیشتمانی لە خۆرهەڵاتی ولاتدا.

پێویستە بە تایبەت ئاماژە بۆ ئەو هەوڵوتێکۆشانە جوانە بکەین بۆ گێڕانەوەی ئەو شارەزاییەی کە لیژنەی(تشلیا بنسك)ی حیزبی نواندیان. لەسەروشیانەوە هاوڕێ(باتالوتشیف).

دەستکرا بە پێکهێنان و رێکخستنەوەی پیشەسازی و رێگاوبان و دابەشکردنی هاوردەی ماددی و بەشەری و ئامادەکردنی بەروبوومی کشتوکاڵ بۆ خزمەتکردنی مەجهودی حەربی، هەروەها هەزارەها لەو کارگانەی تا دوێنێ بوو، پێداویستی ناوحۆییان وەبەردەهێنا، گۆڕان و دەستیان کرد بە بەرهەمهێنانی شتومەکی جەنگی.

هەروەها شێوازی ئەو کارگە پیشەسازی و ئەندازیاری و میکانیکییانە گۆڕان و کران بۆ ئەوەی بتوانن، دەبابە و فڕۆکە دروست بکەن و بەرهەم بهێنن.

داوا لە پیشەسازی ئاسن کرا پەرەبدات بە دروستکردنی شریتی زنجیری زریپۆش و پێداویستییەکانی پیشەسازی جەنگی و جۆرەها داڕێژراوی ئاسن و پۆڵایی باش، هەروەها بۆ پیشەسازییەکانی ئەلکترۆنی کاروپیشەی نوێیان بۆ دەستنیشان کردن و داوا لە کارگەکانی پالاوتنی نەوت کرا، زیاتر گرنگی بەبەرهەمهێنانی جۆرەها بەنزین و سوتەمەنی شیاو و پێویست بدا بۆ فڕۆکەکان

و دەبابەکان و زریێ پۆشەکان، وە بەرهەمی ئامێری تەقاندنەوە شوێنی کارگەی بەرهەمهێنانی سەعاتی گرتەوە، هەروەها پاشماوەی ئاسنی شەمەندەفەرە شکاو و پەککەوتەکانیان دەنارد بۆ وەرشەکانی هێڵی ئاسنینەکان بۆ ئەوەی سەرلەنوێ دروستیان بکەنەوە.

دوژمن زۆرێکی زۆری لەناوچە ئابورییەکان داگیرکردبوو، بەمەش جموجوڵی ئامادەکاری سەربازی لەو ناوچە سەربازییانەی کەوتبووە ژێردەستیانەوەو داگیریان کردبوو لە کارخستبوو، بەملیۆنەها هاونیشتمانی و بڕێکی زۆری سامان و بەرهەمی خۆڵاتی کەوتبوونە ژێردەستی دوژمنانی داگیرکەرەوە لەو خاك و زەوییانەی دوژمن لەماوەی سێ هەفتەدا داگیری کرد لەسەدا ٤٠٪ی هاوڵاتیان و لەسەدا ٣٠٪ی لە کۆی داهاتی نیشتمانی بوو، بەشێوەیەکی زۆرترسناك و لەبەرچاو بەرهەمی مەوادە ئیستراتیجییەکان وەك ئاسن و پۆڵا و سەرچاوەی وزەو ناوەندە پیشەسازییە نوێیەکانیش توشی خەتەرو زیان ببوونەوە.

لەبەرئەوە دەبوو بڕیاری جیاواز و کتوپڕی یەکلایی بدرێت بۆ ئەوەی کارگەی لە شوێنەکانی خۆیاندا لابرێت و بیانگوێزینەوە بۆ خۆرهەڵاتی وڵات، وبخرێنەپاڵ ئەو یەکە بەرهەمهێنەرانەی لەوێدابوون، هەتا بۆ ئەوەی لەو هەرێم و ناوچانەدا پشتیان پێبەستین لە خۆئامادەکردنماندا بۆ هەڵمەت بردنە سەر دوژمنان و هێرش و کشانەکەیان ڕابگرین و لەناویان بەرین، دەستکرا بەکارکردن، کارکردنێکی وەها مێژوو لەوبارەیەوە شتی وای بەخۆوە نەدیبوو.

هەر کە بڕیاری لیژنەی مەرکەزی حیزب و حکومەتی سۆڤێتــی لەو بارەیەوە دەرچوو"لیژنەی ڕاگواستنەوە" پێکهێنراو(شفیرتك)کرا بە سەرۆکی ئەو لیژنەیە و هەریەك لە(کوسفین) و(پیرفوخین) کران بە جێگری سەرۆك لە ماوەیەکی زەمەنی زۆرکەمدا و لە ماوەی مانگی حوزەیران تا(تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤١) توانرا کۆتایی بە(گواستنەوە)ی زیاد لە(١٥٠٠) ڕێکخراوی پیشەسازی گەورە کە زۆربەیان پەیوەندی داربوون بە بەرهەمی سەربازییەوە بگوێزرێنەوەو بخرێنەوە کار. لە هەمانکاتیشدا هێزەکانمان بەردەوام زیادی دەکرد و بەرەوخۆرئاوا و باشوری خۆرئاوا دەکشان بۆ ئەو شوێنانەی شەڕ و کوشتاریان تێدابوو.

ئەوهەموو گۆڕانکارییە گەورەو زەبەللاحانە لەوپەڕی دڵەڕاوکێ و لەژێر فشاری ئێش و ئازار و بەرهەڵستی کردن و مێشك ماندووبونێکی زۆردا دەکرا، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کار بەبێ وەستان و دواکەوتن لە ژێر چاودێری سەرکردەکان و ڕێکخراوە حیزبییەکاندا بەباشی بەڕێوەدەچوو.

"من ئێستا دەزانم نا هەقانە پەردەیەکی بیرچوونەوە دراون بەسەر ئەولایەنە قارەمانانەی ناو ژیانی گەل و حیزبدا، هەروەها ئەو کاروکردەوانەی لەو قۆناغە ناخۆش و ناهەموارەدا حیزب و میللەت لەبەرەی ئابوریدا پێیهەستان ئێستا ناخرێنە بەرچاو و باسیان ناکرێت و هیچ مەدح و شانازییەك کە شایانی ئەوانەبن بۆیان ناکرێت".

ئەو پەیرەو و پرۆگرامە ئیشتراکییەی لەسەربنەمای مۆڵکایەتی گشتی بۆ بەرهەمهێنان دامەزراوە، لەو بارودۆخ و کات و زروفە ترسناکە چاکترنیە گەر لە نێوانیاندا بەوپەڕی ئاشکراو ڕوونکردنەوە چاکە گەورەکانی دەربخرێت و ئاشکرابکرێن.

ئەو(کاری گەل کاری)یە و ئەو قارەمانییە گەورەیەی میللەت لە ساڵەکانی جەنگداکردی لە گواستنەوەو خستنەوەگەڕی کاری وزەی بەرهەمهێناندا و ئەوکارە ڕێکخستنانە گەورەیەی حیزب پێی هەستا لە ڕووی گرنگییەوە دەربارەی پاشەڕۆژی نیشتمانمان بەهیچ جۆرێك لەو شەڕوپێکدادانانە کەمتر نەبوو کە لە بەرەی جەنگی دووەمی جیهانیدا کرا.

وەك لە بیرمدا مابێت و بیرم نەچووبێتەوە، مەکتەبی سیاسی حیزب لە سەرەتای یەکەمی ڕۆژەکانی جەنگدا نزیکەی پەنجاکەس ئەندامانی لیژنەکانی لیژنەی مەرکەزی لە بنەڕەتی و یەدەکی و زیاد لەسەد سکرتێری لیژنەکانی حیزب لە شارەکان و هەرێمەکان و کۆمارە یەکگرتووەکان و گەورە پیاوانی دەوڵەت و شارەزاکان، یەکسەر ڕەوانەکرد بۆ بەرەکانی جەنگ تاکو ڕاستەوخۆ لە بەرەکانی جەنگدا کاربکەن، هەروەها حیزب هەستا بە چەند کارێکی تر کە تایبەت بوونە هۆی بەهێزکردنی هێزە چەکدارەکانمان.

هەر لەم بارودۆخەدا پێکهاتەی ڕێکخستنی لیژنەی مەرکەزی پێکهێنرایەوە

و بەپێی شارەزایی بەسەر ئەنداماندا دابەشکرا بۆ ئەوەی هەریەکە لەو ئەندامە سەرکردایەتییانە بەشێکی دەست نیشان کراویان هەبێت لە کاروباری سەربازی و ئابوری و سیاسیدا.

## سەربازگەی جەنگی

(حیزب بەتین و توانایەکی بێ وێنەوە توانی سەرانسەری هەموو وڵات بکات بەسەربازگەیەکی جەنگی)، میللەت باوەڕێکی پتەو و تەواوی بەوەهەبوو کە حیزب ڕێگا چارە دەدۆزێتەوە بۆ ئەو کێشە ناهەموارە و پاشان دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر هێزەکانی ئەڵمانیای فاشستدا، ئەمەش تەنها مەسەلەی کاتەو هیچی تر... لە(٣٠ی حوزەیرانی ١٩٤١)دا (لیژنەی بەرگری نیشتمانی) بە سەرۆکایەتی ستالین سکرتێری گشتی حیزب پێکهات، لیژنەکە دەستەڵات و توانای هەموو شتێکی بەدەست بوو، بۆ ئەمەش لەسەر هەموو ڕێکخراوە شارستانی و حیزبی و حکومییەکان پێویست بوو، فەرمان و ڕێنماییەکانی(لیژنەی بەرگری نیشتمانی) جێبەجێ بکات.

لیژنەش لە هەموو هەرێمەکان و شارەکان و وەزارەتەکان و ڕێکخراوەکان و کارگە گەورەکاندا نوێنەریان هەبوو، سەرپەرشتی تواناکانیان دەکردن. کۆبوونەوەکانی لیژنە لە هەموو کاتێکی شەووڕۆژدا دەکرا.

زۆرجار کۆبوونەوەکان لە کرملین یاخود لە(داتشا ستالین)دا دەکرا. (داتشا-ماڵی دێهاتی بوو... لە دەوروبەری شارە گەورەکاندا بوو... لە رووسیادا هەر لە کۆنەوە واباوبوو، کەسایەتییە گەورە و ناودارەکان لەم جۆرە خانوو ماڵانەیان لە دەرەوەی شاردا هەبوو لەبەر دەنگەدەنگ و ژاوەژاوی شار روویان دەکردە ئەو شوێن و جێگایانە) لەو کۆبوونەوانەدا مەسەلە گرنگەکان دەخرانە بەر گفتوگۆ و

لێکۆڵینەوە و لەبارەیانەوە بڕیاری پێویست و کۆتایی دەدرا، ئەم ماڵ و جێگایانە پلانی کردارە سەربازییەکانی بەخۆوە دەبینی، ئەندامانی لیژنەکانی بەرگری و لیژنەی مەرکەزی و ئەنجومەنی وەزیران هاوکارییان تێدادەکرد.

ئەمەش ئەگەر پێویست بوایە زامنی جێبەجێکردنی سیاسەتێکی سەربەخۆی دەکرد لە بواری سەرکردایەتی ستراتیجیدا، و هەم ئاهەنگی و هاریکاری لە نێوان کارە سەربازییەکان و هەر هەموو هەوڵ و خەباتێکی گشتی میللەتدا.

زۆرجار گفتوگۆ و چەنەحانێی گەرم و تایبەت لەناو لیژنەکاندا دەکرا، ئاسایی ستالین بەدەوری مێزەکەدا دەسوڕایەوە بەوردی و سەرنجدانەوە گوێی لە بیروڕای بەرهەڵستان دەگرت، ستالین خودی خۆی زۆر قسەی نەدەکرد و حەزیشی لە زۆر قسەکردنی بەرامبەرەکەی خۆی نەبوو، زۆرجار قسەی بە قسەکەرەکەی بەرامبەری دەبڕی و پێیدەوت، (قسەکەت کورت کەرەوە)(قسەکەت ڕوونکەرەوە) کۆبوونەوەکانی بەبێ پێشەکی یان وتەی دەستپێکردن و کردنەوە دەستپێدەکرد، خۆ ئەگەر قسەی بکردایە بە هێواشی و ڕەوانەوە یەکسەر دەچووە ناو کرۆك و ناو باسەکانەوە.

بیروڕاییەکانی خۆی زۆربەڕوون و ئاشکرا و بەکورتی دەردەبڕی، خۆ ئەگەر ئامادەبوان نەگەیشتنایەتە بیروڕایەکی یەکگرتووی بە کۆمەڵ، خێرا لە هەموو نوێنەرانی لایەنە بەرهەڵستکارەکان لیژنەیەکی پێکدەهێنا، داوای لە ئامادەبوانی دەکرد کە ئەو ڕاوپێشنیارانەی هەموان لەسەری ڕێکدەکەون و کۆکن لەسەری پێیڕابگەیەنن، کاروادەبوو ئەگەر ستالین بڕیاری کۆتایی نەدایە، بەڵام کاتێك ستالین بەبڕیارێکی دیاریکراوە وە بچوایەتە ناو کۆبوونەکەوە ئەوا ئەو کاتە بەهیچ جۆرێك گفتوگۆ و چەنەحانێ نەدەکرا. و لە کاتێکیشدا ستالین لایەنی یەکێك لەولایەنانەی بگرتایە، خێرا دادەمرکانەوە.

لە ماوەی جەنگدا لیژنەی بەرگری نزیکەی(١٠) هەزار بڕیاری جۆراوجۆری لە مەسەلە سەربازی و ئابورییەکاندا دا...

# ڕێکخراوە پێشمەرگەییەکان

ستالین کەسێکی خۆڕاگرو بەتوانابوو، بیرم نایە بە هیچ جۆرێك بە تێکشاوی و خەمبارییەوە بینیبێتم، جارێك نەبێت ئەویش ئەو بەیانییەی ڕۆژی(٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤١)بوو، کە بە تەواوی بۆی ڕوون و ئاشکرابوو کە توانای ڕێگرتنی هەڵگیرسانی جەنگی نییە.

لە(٢٢ی حوزەیرانی ساڵی١٩٤١)وە و بەدرێژایی هەموو جەنگ و بەهاوکاری لیژنەی مەرکەزی و حکومەتی سۆڤێتی، ستالین بە خۆڕاگری و تواناوە سەرکردایەتی وڵات و تێکۆشانی چەکداری و سیاسەتی نێودەوڵەتی و وڵاتەکەمانی کردووە.

لەگەڵ ئەو باروهەلومەرجە گرژ و ئاڵۆزەدا، ڕێکخراوە حیزبییەکان و ئەنجومەنە سۆڤێتییەکان لە ئۆکرانیاو بیلۆڕووسیا و بەلتیکدا بوون، تێدەکۆشان و خەباتیان دەکرد بۆ سازدان و کۆکردنەوەی جەماوەری میللەت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن. بۆ جێبەجێکردنی ئەومەبەستە لەو زەوی و خاکانەی لە ژێردەست و داگیرکردنی هەنووکەیی داگیرکەراندابوون. ڕێکخراوی حیزبی و(کەمسمول)ی نەهێنی یان پێکهێنا.

(کەمسمول- کورتکراوەی سێ وشەی ڕووسییە، بەمانای یەکێتــی لاوانی شیوعی، دەگەیەنێت)، کادرە سەرەکییەکانی کۆمەڵانی پێشمەرگەی بەرگری میللی پێکهێنرا و ئەوسەرکردە سەربازی و سیاسییانەی لە یەکە سەربازی و سیاسییەکاندا بوون و لەگەمارۆی دوژمن ڕزگاریان ببوو، چوونەپاڵیان.

هەرکە دوژمنانی داگیرکەر پێیان نایە ناوخاکمانەوە هەستیان بەو قین و ڕق لێبوونەوە کرد کە هاووڵاتیانی سۆڤێت بەرامبەر ئەو فاشییە ئەڵمانانە هەیانبوو.

بەدەستی ئەو پیاوە پێشمەرگانەی چوونە ناو ئەو کارە لە خۆبوردنە نەهێنانەوە زەرەرو زیانی گەورە و جەرگبڕیان پێگەیشت، لەو ڕۆژانەدا لەبەردەم سەرکردایەتی

باڵادا هیچی بەدەستەوە نەمابوو، تەنها ڕێگا چارەیەك نەبێت، ئەویش بەرگری کردن بوو بەدرێژایی بەرە ستراتیجییەکان.

هێزو توانا ئەوەندە نەبوو بتوانێت هەستێت بە هێرشی گەورەو بەرفراوان، تەنها دەبوو هێزی یەدەکی ستراتیجی گەورە پێکبهێنێت، وچەکداریان بکات و ببنە زامنی سەرکەوتن بەسەر دوژمندا و لە ئامادەباشی و دەست بەکاردابن و پاشان هەنگاو بنێت و بچنە کاری هێرش بردنەوە و دەست بکات بەڕاوەدوونان و دەرکردنی هێزە دوژمنکارەکان و لە خاکی سۆڤێتی دەریان بکات، ئەمانە هەمووکران، بەڵام بەخێرایی و کتوپڕی نا هێزە چەکدارەکانمان چوونە ناوبەرگری ستراتیجییەوە، ئەویش بەهۆی ئەو کشانەوە بەزۆرییە بوو کە فشاریان خرابووە سەر و لە ژێر سێبەری نەبوونی هێزو تواناى پێویست دا بوو بۆ پێکهێنانی بەرگرییەکی بەهێز و توانا، بەتایبەت نەبوونی دژە دەبابە، فەرزی کرد بەسەرماناو ناچاربووین بەرەو مەبەست بە کۆمەڵە تەکنیکێکی ترەوە بەرگری بکەین.

دەبێت ئەو بێهێزی و بێتواناییەی تۆپە تەیارە شکێنەکانی خۆمان بیرنەچێت لە بەرگری کردندا و نەبوونی بەربەستێکی بەتین و کاریگەری سەر وڵاتەکەمان لەو بوارەدا. لەسەرەتای دەستپێکردنی جەنگدا دوژمن بە تەواوی کۆنترۆڵی سەروەری ئاسمانی کردبوو.

ئەمەش بووە هۆی لاوازی و بێهێزکردنی هێزەکانی لەشکری ئێمە، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، لەگەڵ ئەو هەموو هەڵانەشدا لە نەبوونی بەرگرییەکی پێویست، لە هەندێ جاردا لەلایەن هێزە چەکدارەکانمانەوە، توانرا بەرگرییەکی ستراتیجی بە شێوەیەکی گشتی پێبکهێنین.

هەروەك دیارو ئاشکرایە کاتێك هێزەکانی ئەڵمانی دەستیانکرد بەدەورەی دووەم و سێیەمی جەنگ، هەستیان بە ناخۆشی و تێکشکان کرد بە درێژایی بەرەکانی جەنگی سۆڤێتی نەیانتوانی بەرگری تەواو لە خۆیان بکەن، وەك ئەو بەرگرییەی ئێمە لە خۆمانمان دەکرد. لەو کاتەدا مەبەستی بەرگییە ستراتیجییەکەی ئێمە بەمشێوەیەبوو.

ـ وەستان و ڕاگرتنی هێزە فاشیستەکان لەبەردەم هێڵەکانی بەرگریماندا بۆ

ئەوپەڕی کات، ئەمەش بۆ مەبەستی ئەوەی کاتمان دەستکەوێت، هەتا بتوانین هێزی زیاتر لە قووڵایی وڵاتەوە بهێنین، وهێزی یەدەکی زیاتر پێکبهێنین و کۆیان بکەینەوە و بەرەو شوێنە سەرەکییەکان ڕەوانەیان بکەین.

ـ چەند بتوانین گەورەترین و زۆرترین زەرەرو زیان بەدوژمن بگەیەنین و هیلاکیان بکەین و لەناویان بەرین و خوێنیان بڕێژین و بەمەش بتوانین تاسنورێك کە ئەو کەمکورتی و پارسەنگی تەرازوی هێزە چاك بکەین.

ـ دڵنیاکردنی ئەو کارو پێویستیانە کە حیزب و حکومەت پێی هەڵدەستێت بۆ گواستنەوەی هاووڵاتیان و کارگە پیشەسازییەکان بۆ ناو قووڵایی وڵات و بەدەست هێنانی کاتی پێویست بۆ بنیاتنانەوەی ڕێکخستنی پیشەسازی بە پێی پێویستی جەنگ.

ـ وەدەستهێنانی ئەوپەڕی هێزو توانا بۆ دژە هێرشکردن بۆسەر دوژمن بە مەبەستی پووچەڵکردنەوەی پلانە جەنگییەکانی هیتلەر بە شێوەیەکی گشتی.

ئێمە کە هەموو هەوڵ و خەباتێکمان کردبووە سەر بەرگری ستراتیجی مانای ئەوە نەبوو هێزەکانمان هەروا تەنها لە وشکانی و دەریاو ئاسماندا لە بەرامبەر دوژمندا دەستەو وستان دابنیشن و بەرگری بکات، بەڵکو هەر کە هەلیان بۆ برەخسایە دژە هێرشیان دەکردە سەر دوژمن، هێزە چەکدارەکانمان و هێزەکانی بەرگری میللی زەرەرو زیانی گەورەیان بە دوژمنان دەگەیاند.

لە ڕۆژی پێنجەمی جەنگدا بەپێی بڕیاری لیژنەی مەرکەزی دەستکرا بە ناونووسینێکی گەورە و بەرفراوانی ئەندامانی حیزب و کمسمول بۆ سەربازی و ناردنیان بۆ بەرەکانی جەنگ، وەك ئامۆژگارو ڕاوێژکاری سیاسی دەبوا ببوونایە سەرچاوەی ڕێکخستنە حیزبییە سەربازییەکان.

پێش دەستپێکردنی جەنگ ژمارەی شوعییەکان لە لەشکری سووردا و لەکەشتیگەلەکاندا دەگەیشتە(٦٥٠) هەزار ئەندام، لەماوەی شەش مانگی یەکەمی دەستپێکردنی جەنگدا زیاد لە ملیۆنێك و هەشسەد هەزار شویعی پەیوەندییان بە هێزی چەکدارانەوە کرد.

لە کتێب و نوسراوەکانی بیانیدا هەتا ئەمڕۆدەبینین شوعییەکان و ئەوانەی لە

ڕێکخراو و لایەنە حیزبیەکاندا کاریان دەکرد بە(پێشرەو و هەڵبژاردە) ناوزەدیان دەکەن، یاخود بە خاوەن ئیمتیاز لە کۆمەڵگای ئێمەدا ناویان دەبەن.

من وەك کەسێکی سەربازی ئومێدەوارم هەموو دەوڵەت و میللەتێك لەم شێوە گەنج و هەڵبژاردە(ناوازە)یەیان هەبێت و کەسانی وەك ئەمانە بە شێوەی قارەمان و وەفاوە لە پێناوی نیشتماندا بەرەو ڕووی مردن ببنەوە.

زۆرجار ڕوویدەدا بەو جەنگاوەرە سیاسییانە دەگەیشتم کە بەرەو بەرەکانی جەنگ و کوشتار دەڕۆیشتن، ئەو جۆرە پیاوە جەنگاوەرانە لەناو دڵودەروونیاندا بیرو باوەڕێکی پتەو و بڕوایەکی تەواویان بە سەرکەوتن هەبوو، هاواریان دەکردو دەیانووت(ئێمە خۆڕاگرین) و سەردەکەوین منیش لە ناخمەوە هەستمدەکرد ئەمە تەنها وشەو قسە نییە بەڵکو شێوازی بیرکردنەوەیە.

ئەوە نموونەیەکی ڕەسەنایەتی نیشتمان پەروەری سۆڤێتییە، بەو ڕۆحە پڕ لە هیواو ئومێدو بەرچاو فراوانییە گەورەیەیان تۆوی هیواو ئومێدێکی نوێ لە دڵودەروونی ئەوانەدا دەڕوێنن کە تازە چرۆ دەکەن.

---

## قوربانییەکانی کیژان و لاوان

لە(٣ حوزەیراندا) ستالین لە ڕادیۆوە بەناوی لیژنەی مەرکەزییەوە وتارێکی پێشکەش کرد...

لەو وتەیەیدا هەڵوێستی بەرەی جەنگی ڕوونکردەوە و داوای لە جەماوەری گەلی سۆڤێتی کرد لە ژێر ڕۆشنایی جەنگدا بەرامبەر دوژمنی بەهێزی خوێنرێژی دڕندەدا خۆیان سازدەن و ڕاپەڕن و ژیان و ئابوری وڵات ڕێکخەنەوەو بەرەو پێشەوە و ژیانەوەی بەرن.

داوای لە حیزب و جەماوەری میللەت کرد یەك دەست و یەك ڕیز لە پێناوی

خەباتی پیرۆزدا دژی دوژمن لەخەو و بێ ئاگاهی ڕاپەڕن و بۆ هەتاهەتاییە لە ناویان بەرن و بەسەریاندا زاڵبن، ئەو وتەمێژووییەی ستالین بۆ گەل وەك زەنگێکی خەتەر دەنگیدایەوە و لە دەنگەکەیدا ئەو هاوارە مێژووییە بە ناوبانگەی(لینین)ی تێدا دەزرنگایەوە(کۆمەڵگای ئیشتراکی لە مەترسیدایە..)، ڕوون و ئاشکرابوو ئەو زەنگە بەردەوام دەزرنگایەوە هەتا دواکەس داگیرکەری فاشی خاکی نیشتمانمانی چۆڵ کردو لە خاکمان چووە دەرەوە.

حیزب کە ئەو دروشمە مێژووییەی بڵاوکردەوە، "هەموو شتێك لە پێناوی بەرەی جەنگدا و هەمووشتێکیش لە پێناوی سەرکەوتنندا..)، هەرچی هاووڵاتییەك هەبوو ڕووبەڕووی ئەو مەترسیەی کردنەوە کە لە ئارادابوو.

لەبەرەکانی جەنگ و هێڵەکانی پشتەوە کیژو لاوەکانمان جوانترین و گەورەترین نیشانەی بوێری و لەخۆبووردن و نیشتمان پەروەری سۆڤێتییان نواند و ئامادەیی قوربانی بە ژیانی خۆیاندا لە پێناو نیشتماندا لە ڕۆژەکانی یەکەمی مانگی تەمموزدا کاتێك دوژمن شاری مینسکی داگیرکرد و هەوڵیدا بەرەو ڕووباری(بریوزینا) هەڵمەت بەرێ و بێتە پێشەوە. بڕیاردرا کۆمەڵێك قاچە دەزە پێبکرێت و بۆ هەواڵگری لە ناوچەی مینسکدا و لەپشت هێڵەکانی دوژمنەوە دایانبمەزرێنن، کۆمەڵەکەش بریتیبوو لە دوو کوڕی لاو و دووکچی ڕێکخراوی کمسمول، لەوانەی زمانی ئەڵمانییان دەزانی.

وابزانم دوو کچەکە لە قوتابییانی پەیمانگای زمانە بیانییەکان بوون لە کاتی قسەکردنم لەگەڵیاندا، بۆم دەرکەوت ئەو دوانە خەڵکی مۆسکۆبوون، کاتێك لێمپرسین ئایا ئێوە ناترسن لە هێڵەکانی پشت دوژمنەوەبن..؟

بەپێکەنینەوە تەماشای یەکتریان کرد...

ـ بێگومان ... دەترسین... بەتایبەت ئەوکاتە دەترسین کە بەپەڕەشووت خۆمان هەڵدەدەینە خوارەوە و دەسگیرمان بکەن، بەڵام ئەگەر لەوکاتەدا هیچ ڕوونەدات و نەکەوینە ژێر دەستی دوژمنەوە، ئیتر ئەوکاتە هەمووشتێك ئاسان دەبێت و بەدڵی خۆمان دەبێت.

(نیشتمان بانگەوازی کردن و بەدەنگ بانگەوازەکەیەوە هاتن!!) دوژمن پلانی

دادەنا بۆ ئەوەی بەهێزێکی گەورە و درندانەوە بەرەو خۆرئاوامان بڕوات و ئەو کۆمەڵە هێزە سەرەکییەی هێزەکانمان کە لە ناوچەی سمولینسك دابوون گەمارۆ بدات و بەمەش ڕێگا خۆشکات و بەرەو مۆسکۆ بکشێت و هێرش بەرێت.

چەند شەڕوپێکدادانێك لە نێواندا ڕوویداو یەکە سەربازی سەربازییەکانی لەشکری بیست و یەك بەسەرۆکایەتی جەنەراڵ (ف- کوزیستوف)، دەورێکی گەورەو باڵایان تێدابینی و لە (١٣ی تەمموز)دا لە ڕووباری(دنبیبر) پەڕینەوە و توانییان هەردووشاری ڕوجانشوف و جلوبین ئازادبکەن و بەرەو باکوری خۆرئاوابکشێن.

لەم شەڕوپێکدانانەدا جەنەراڵ بتروفسکی شەهید کرا، کە من دەمناسی و یەکێك بوو لە گەورەترین سەرکردەکانی سەربازی لە رووی ڕۆشنبیری و بەهرەی سەربازییەوە. خۆ ئەگەر وابەزوویی شەهید نەکرایە بێشك لە پاشەڕۆژدا دەبوو بەسەرکردەیەکی یەکجار گەورەو بەناوبانگ، بەڵام دوژمن توانی هێزێکی گەورەتر و زیاتر کۆبکاتەوەو لە ئاخریدا بچێتە ناوشاری سمرلینسك و داگیری بکات.

ئەمەش ناخۆشترین کاریگەری کردە سەرناخی ئەندامانی لیژنەی بەرگری و ستالین بە تایبەتی کارێکی وایکردە سەری توانای بەسەرخۆیدا نەما.

ئێمەی سەربازانیش هەستمان بەو ڕقوتوورەییەی ستالین کرد، بەڵام شەڕوپێکدان لە سمولینسکدا دانەمرکایەوە، بەڵکو سەرلەنوێ و لەوەپێشتر بەتین و گەرمتر شەڕ هەڵگیرسایەوە پاش ئەوەی سەرکردایەتی باڵا لە هێڵەکانی پشتەوەی بەرەی خۆرئاوادا بەرەیەکی نوێی لەو بەرەیەدا بڵاوکردەوە، بەڵام ئەو شەڕوپێکدادانانە لەگەڵ ئەو هەموو توندوتیژییەدا کە هێزەکانی ئێمە لەو شەڕانەدا نواندیان، بەشێوەیەکی گشتی لە بەرژەوەندی دوژمن کۆتایی پێهات و هێزەکانمان سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا لەچوونە پێشەوەیاندا بەرەو(کییف) لەم شەڕوپێکدادانە گەرم و وێرانکارییەدا هێزەکانی ئێمە بۆ یەکەمجار موشەکی(کاتیوێشا) یان بەکارهێنا.

لە کۆتایی مانگی تەممووزدا پێمراگەیندرا لەگەڵ تیموشنکۆی سەرکردەی بەرەی خۆرئاوای ئەوکاتەدا بچم بۆ چاوپێکەوتنی ستالین، ئێمە وامان دەزانی

ستالین دەیەوێت ڕاپرسیمان لەگەڵدا بکات بۆ دانان و پلانی کاری پاشەڕۆژ، بەڵام کە چووینە لای بۆمان دەرکەوت بانگکردنەکەمان بۆ مەبەستێکی ترە.

کاتێك چوینە نوسینگەکەی ستالینەوە بینیمان نزیکەی هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە دەوری مێزەکە دانیشتبوون، بەڵام ستالین لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بەپێوە ڕاوەستابوو، سەبیلەکەی بەدەستەوەبوو بێ ئەوەی داگیرسابێت، ئەمەش نیشانەیەکی بەڵگە نەویستە کە میزاج و تەبیعەتی باش نییە، ستالین وتی:

ـ مەکتەبی سیاسی باسی وەزع و شێوازی تیموشنکۆیان کردووە وەك سەرکردەیەکی بەرەی خۆرئاوا، بڕیاریان داوە لەو پلەو پایەیە بیهێننە خوارەوە و پێشنیارێکیش هەیە کە زۆکۆف لە شوێنی ئەودا دابنرێت.

ئێستا بیروڕای ئێوە لەم بارەیەوە چۆنە؟!

ڕووی پرسیارەکەی کردە، من و تیموشنکۆ..

(تیموشنکو) بێدەنگ بوو قسەی نەکرد، من وەڵاممدایەوە...

ـ هاوڕێ ستالین، زۆر گۆڕینی سەرکردەکان، کارێکی خراپ دەکاتە سەر گۆڕانکاری کارەکان، چونکە ئەوە وا لەو سەرکردەیە دەکات بەناچارییەوە بچێتەناو شەڕوپێکدادانێکی قورسەوە پێش ئەوەی لە کاروباری ئەو کارەبگات.

مارشاڵ تیموشنکۆ ماوەی سێ هەفتەیە سەرکردایەتی ئەو بەرەیەی گرتۆتە دەست و لەمیانەی شەڕوپێکدادانی شاری سمولینسکدا تواناو شارەزایی سەرکردەکانی بۆ دەرکەوتووەو لە توانای ڕاستەقینەیان گەیشتووەو شارەزابوو.

ئەویش ئەوەی کردووە کە هەر سەرکردەیەك لە شوێنی خۆیەوە چی بکات و ماوەی مانگێکە بەرەوپێشچوون و کشانی دوژمنانی ڕاگرتووە من لەو باوەڕەدام هەر سەرکردەیەکی تر لە شوێنی ئەودا بوایە لەوە زیاتری بۆ نەدەکرا، و هێزەکانیش برواو متمانەی تەواویان بە تیموشنکۆ هەیە، ئەمە گرنگترین شتەو من لەو باوەڕەدام لابردنی تیموشنکۆ لە سەرکردایەتی ئەو بەرەیەدا کارێکی ناڕاستەو ژیرانە نییە.

میخائیل کالینین لەسەر قسەکانی من وتی..

ـ بەڕاستی ئەمە قسەی ڕاستە.

ستالین بەهێواشی سەبیلەکەی داگیرساند و تەماشای ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کردوو، وتی..

ـ ئایا ئێوە لەسەر بیروڕای زۆکۆف ڕازین..؟

زۆربەیان پێکەوە وەڵامیاندایەوە...

ـ هاوڕێ ستالین تۆ لەسەرحەقیت.. تیموشنکۆ دەتوانێت هەڵوێستەکە ڕاپەڕێنێت و هەڵسوڕێنێت، چاوپێکەوتنەکە بەوە کۆتایی پێ هات، داوایان لە تیمۆشنکۆ کرد بگەڕێتەوە بۆ بەرەی جەنگ.

## دەست بەرسەرداگرتنی ئۆکرانیا

بێگومان ئەو تێبینیانە تیمۆشنکۆی زۆر دڵگران کرد، بەڵام جەنگ گوێ بەهیچ شتێك نادات. و هەموو کاتێکیش ناکرێت لەکاتی حەلکردنی مەسەلە گەورەکاندا هەست و سۆزی هەموو کەسێك ڕەچاوبکرێت و حسابی بۆ بکرێت، لە کاتی شەڕو پێکدادانی شاری سمولینسکدا کۆمەڵێك لە دوژمنان هەوڵیاندا لەڕێگای(لۆجا)ەوە بەرەو لینینگراد مل بنێن و هەڵمەت بەرن، بەڵام هەوڵەکەیان سەری نەگرت، هەمدیسان سەرلەنوێ هەوڵیاندایەوە و لەم هەوڵەیاندا توانییان سەرکەوتن بەدەست بێنن و هێڵەکانی بەرگریمان بشکێنن و بەرەوپێشەوە بڕۆن، بەڵام ئەم هەمدیسان هێرشەکەیان ڕاگرتنەوە، لەو کاتەدا لە ئۆکرانیا چی دەکرا..؟ لە کاتێکدا هێزەکانی بەرەی باشوری خۆرئاوا لە جەنگێکی بەرگری توندوتیژو گراندا بوو دەستبەسەرداگرتنی(کییف) بەنیسبەت هێزەکانی ئەڵمانییەوە مەبەستێکی گەورە و گرنگی هەبوو.

نازییەکان مەبەستیان بوو بە خێرایی و بەزووترین کات کۆماری ئۆکرانیا داگیربکەن، بۆ ئەوەی یەکێتی سۆڤێتی(ئەوسا) بێبەش بکەن لە بەکارهێنانی گەورەترین توانای بنکەی پیشەسازی و بۆ ئەوەی خۆیان بۆ مەجهود حەربی

سوود لەو بەرهەمە خاوانەی ئاسن وەرگرن لە(کرفوری دوج) و سوود لە کانەکانی خەڵووزی بەردین لە(دۆبشیك) و بەرهەمە خاوییەکانی مەنگەنیسی(نیکۆبیل) و بەرهەمی گەنم و جۆی زۆر و زەبەندەی ئۆکرانی وەرگرن.

دەستبەسەرداگرتنی ئۆکرانیا لە ڕووی ستراتیژییەوە ڕێگا خۆشکەربوو بۆ سەر مۆسکۆ.

لەیەکەم ڕۆژی جەنگەوە ئەو گۆڕانکاری و بەسەرهاتانەی ڕوویەدا هەر هەمووی دەبووە مایەی نائومێدی بۆچوونەکانی ئەڵمانییەکان و دەبووە نابوودبوونی پلانە جەنگییە کتوپڕییەکانیان.

هێزەکانی سۆڤێتی بەدرێژایی ئەو کشانەوە ناچارییەیان لەژێر فشاری چڕوپڕی هێرشەکانی ئەڵمانیادا توانییان بەرگرییەکی سەختیان لە بەرامبەردا بنوێنن، وە بەلێهاتوویی و خۆڕاگری و توانایەکی تەواوەوە لەشکری پێنجەم و شەشەم و بیست و حەوت بە سەرکردایەتی (جەنەراڵەکان بۆتایوف و کۆشنکۆە و مۆزینشنکۆ) شەڕێکی بەهێزو بەتوانایان گێڕا.

پێخۆشحاڵم لێرەدا ئاماژە بەو جەنەراڵە ئازایانە بدەم بە تایبەت کە هەرسێکیان لەمەوپێش سەرکردەبوون لە فیرقەی چواری قۆقازیدا لە ساڵەکانی(١٩٣٢ تا ١٩٣٦) لە ژێر سەرکردایەتی مندا کاریان دەکرد، بەڵام بەگەیشتنی دوژمن بۆ سەر ڕووباری(دنبر) و کشانیان بەرەو(زابوروجیا) و(وتیبیر) و(بتروشك) و(ئۆدیسا)، بەدرێژایی هێڵەکانی بەرەی باشووری خۆرئاوا هێزەکانی سۆڤێتییان خستە حاڵەتێکی زۆرخراپ و ناهەموارەوە، بەڵام هێزەکانی ئەڵمانیا بۆ ئەم سەرکەوتنانەیان زیانێکی یەکجار زۆریان لێکەوت و هێزەکانیان تووشی خەسارەتێکی قورس و گران بوونەوەو هێزی یەکجار زۆریان لە دەستداو تێداچوون، ئەو بەسەرهات و ڕووداوانەی باسم کردن پاش گەڕانەوەم لە بەرەی باشووری خۆرئاوا بۆ مۆسکۆ، خۆم بینیم و لە شوێن و جێگای سەرکردایەتی ئەرکانی جەنگی باڵادابووم و بەو سیفەتەوە کە هاوبەشیم تێداکردووە، بەهاوکاری هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی ئەو بەرپرسیارێتییەم خستبوە سەرشانی خۆم. بەو سەرکەوتنە گەورە و ناوازانەی هێزەکانمان هەستم بە خۆشی و حەسانەوە کرد.

لێرەدا وابزانم هەلی گونجاوە کە کەمەکێك بتوانم باسی سەرکردایەتی بالاو خودی ستالین بکەم. لە (١٠)ی تەمووزدا لیژنەی بەرگری نیشتمانی گۆڕانکارییەکی لە ڕێکخراوی سەرکردایەتی بالادا ئەنجامدا، بەشێوەیەك ئەندامانی لە:"ستالین(سەرۆك)، مۆلۆتۆف، تیمۆشنکۆ، بودیوفی، فورشیلۆف، شابوشنیکۆف و زۆکۆف) پێکهاتن.

لە(١٩ تەمووز)دا بڕیاردرا ستالین بە وەزیری بەرگری دابنرێت و لە(١٨ ئابدا) ستالین بوو بە سەرکردەی بالای هێزە چەکدارەکانی سۆڤێتی گەلی سۆڤێتی و جەنگاوەران بەخۆشی و ئومێدێکی گەورەوە پێشوازییان لەو هەواڵەکرد کە ستالینیان کرد بە سەرۆکی بالای هێزە چەکدارەکانی سۆڤێتی. چونکە ستالین لەناو میللەتدا کەسایەتییەکی گەورە و ڕێزێکی زۆری هەبوو، دوای ئەوە سەرکردایەتی بالا بڕیاریدا سێ سەرۆکایەتی گشتی لەبەرە سەرەکییەکانی جەنگدا بۆ بەڕێوەبردنی شەڕو پێکدادان دابمەزرێنێت، بەلام ئەمە مانای ئەوە نەبوو کە سەرکردایەتی بالا دەست نەکێشێتە کاروباری ڕاستەوخۆی ئەو بەرانەوە.

سەرۆکایەتی بالا خۆی لە کاروبارەکانیان هەڵدەقورتاند، چونکە ئەویش لەوکاتانەدا لە ژێر ڕێنمایی سەرۆکایەتی ڕاستەوخۆی هێزە یەدەکییەکانی وشکانی و ئاسمانییەکاندا بوون، بێگومان ئەمە سەربەخۆیی سەرکردایەتی گشتی هەر سێ بەرەکەی لاوازکردبوو.

## نووسینگەکەی ستالین

هەروەك ئاشکرایە بڕیارو ڕێنماییەکانی سەرکردایەتی بالا لە ڕێگای سەرۆکایەتی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگەوە جێبەجێ دەکرا.

ئامادەکردنی بڕیارەکان و نووسینیان ئاسایی لە کرملینداو لە ژووری نووسینگەکەی یوسف ستالینەوە بڕیاری لە سەردەدرا.

نووسینگەکەی هۆڵێکی گەورەو ڕووناکبوو، دیوارەکانی بە تەختەی

پانی داربەڕوو داپۆشرابوو. لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدا مێزێکی درێژدانرابوو، قوماشێکی سەوزی بەسەردا درابوو، لە ڕاست و چەپییەوە وێنەیەکی گەورەی هەریەك لە(مارکس و ئینگلس و لینین) هەڵواسرابوون، لەماوەی جەنگیشدا وێنەی (سۆفۆرۆف و کۆتۆزۆف)یش لە نوسینگەکەدا هەڵواسران"ئەم دووانە لە قارەمانە پێشینانەکانی جەنگی ڕووسی بوون و لەدڵ و دەروونی گەلی ڕووسیدا شوێنەوارێکی تایبەت و مەزنیان هەیە یەکەمیان لە جەنگدا تورکەکانی شکاند و دووەمیان ناپلیونی لە جەنگدا شکاند و لەو وتە نەمرانەی کە زۆکۆف لەم بیرەوەریانەی خۆیدا نووسیویەتی و هەتا ئەمرۆش بووەبە دروشمی سەربازانی سۆڤێتی، کۆتۆزۆف دەڵێت"لە پێناوی ڕزگارکردنی هاورێکەتدا خۆت بە کوشت بدە"، هەروەها پێویستییەکانی ناو هۆڵەکە سادەبوون و دووربوون لە کەشخەیی و ناوازەییەوە لە ژوورەکەی تەنیشتییەوە نموونەیەکی خڕی گەورەی گۆی زەوی و مێزێکی لە تەنیشتیەوە دانرابوو، لەسەر دیوارەکەشدا نەخشەیەکی جیهان هەڵواسرابوو، لەو سەری نووسینگەکەدا بە تەنیشت دیوارەکەوە کورسی و مێزەکەی ستالینی لێبوو، هەمووکات و بەردەوام کۆمەڵێ بەڵگەنامەو وتارو نەخشەو چەند تەلەفۆنێکی لەسەربوو.

هەروەها لەسەر مێزەکە قەڵەمدانێکی لەسەربوو، لەناو قەڵەمدانەکەدا کۆمەڵێك قەڵەمی ڕەنگاوڕەنگی تێدابوو، چونکە عادەتی ستالین وابوو بەڕەنگی شین تێبینی و نیشانەی بۆشت دادەنا.

ستالین زۆربەخێرایی و بەخەتی گەورە گەورە شتی دەنووسی، بەڵام نووسینەکانی ڕوون و ڕەوانبوون.

ئەوەی بچوایە بۆ لای ستالین دەبوو بەلای ژوورەکەی(یوسکریبشیف)ی سکرتێری ستالیندا و بەلای بارەگا بچووکەکەی سەرۆکی پاسەوانە تایبەتییەکانی سەرکردەی باڵادا تێپەڕینایە.

لە پشت ژووری نووسینگەکەیەوە دوو ژووری لێ بوو یەکێکیان بۆ حەوانەوەی تایبەت و ئەوی تریشیان بۆ پەیوەندییە تەلەفۆنی و بێتەلەکانی ستالین بوو. بەهۆی ئەو تەلەفۆن و بێتەلانەوە سکرتێرەکەی دەنگی ستالینی دەگەیاند بەسەرکردەکانی

بەرەکانەوە و بەکەسانی تریشەوە، لەسەر مێزە درێژەکە گەورە پیاوانی ئەرکانی جەنگ و سەرکردە باڵاکان سەرنج و تێڕوانینی خۆیان لە نەخشەکان دەداو نوسراوی خۆیان دەنووسی.

عادەت بوو سەرکردەکان بەپێوە رادەوەستان و راپۆرتەکانی خۆیان دەخوێندەوە، رەوشتی ستالینیش وابوو کە گوێی لە راپۆرتەکان دەگرت بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، هەندێجار لە مێزەکە نزیك دەبۆوەو بەگرنگییەوە سەرنجی نەخشەکانی دەدا بۆ ئەوەی لە هەڵوێستەکە بگات.

زۆر کەم دەچوو بەلای نوسینگەکەی خۆیەوە ئەویش بۆ ئەوەی لە کیسە تووتنەکەی سەبیلەکەی پرکات. کاری سەرەکی سەرکردایەتی باڵا بریتیبوو لە ئامادەکردنی کارە ستراتیژییەکان کە دەخرانە بەردەم بەرەکانی تایبەت بۆ جێبەجێ کردنیان و دابەشکردنی هێزو داهات بەسەر بەرەکانی جەنگدا و پلاندانان و دەستنیشان کردنی چالاکییەکانی هێزە چەکدارەکان بەشێوەیەکی گشتی.

مەسەلە بچووکەکانیش کە گرنگی ستراتیژی ببوایە، بەئامادەبوونی ئەندامانی لیژنەی بەرگری نیشتمانی و سەرکردەکانی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ و سەرکردەکانی دەزگای چەك و گەورە بەرپرسانی سەربازی گفتوگۆیان لەسەر دەکرا.

سەرکردەکانی بەرەکانی جەنگیش ئامادەی ئەو کۆبوونەوانە دەبوون، ئەگەر گفتوگۆ و موناقەشەکردنەکە لە چوارچێوەی شارەزایی ئەواندا بوایە، کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی باڵا لەکەش و هەوایەکی وادابوو رۆحی کارکردن و دڵسۆزییان پێوەدیاربوو، هەموو کەسێك دەیتوانی بەراشکاوی و ئازادانە بیروڕای خۆی دەربڕێت.

ستالین بەرێگایەکی یەکسانی بەجددی و فەرمییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەمواندا دەکرد، کاتێك راپۆرتێکی گرنگیان دەخوێندەوە بەوردی گوێی بۆ شل دەکرد، و گوێبیستی دەبوو.

بەم بۆنەیەوە بە درێژایی ساڵەکانی جەنگ بۆم دەرکەوت بەهیچ شێوەیەك ستالین ئەو کەسە نەبوو کە پرسیاری رەق و توندو تیژی لێنەکرێت و لە ئاستیدا

بەرهەڵستی نەکەیت، بەڵکو هەموو کەسێك دەیتوانی پێ لەسەر بیروڕای خۆی داگرێت و بەرهەڵستی بیروڕای ستالین بکات و لە روویدا ڕاوەستێتەوە، خۆ ئەگەر کەسێك هەبێت بڵێت ئەوە وانییە و ڕاست نییە، من بەڕاشکاوی دەڵێم کە قسەوباسەکانیان ناراستن و دوورن لە ڕاستییەوە، ستالین حەزی بە وەڵامی ناتەواو نەدەکرد، داوای لە بەرامبەرەکەی دەکرد، وەڵامی ڕوون و ئاشکراو وردی بداتەوە.

هەرگیز نەدەبوو یەکێك بچوایە بۆ لای و نەخشەیەکی پێبوایەو (پەڵەیەکی سپی) تێدابوایە و نەدەکرا هەرگیز لە بەرامبەریدا زانیارییەکی ئاڵۆز و سەرلێشێوانی بدایە و بیووتایە (تقریبا) ئەم شتەوایە، ستالین هەست و توانایەکی تایبەت و شازی هەبوو لە دەرخستنی خاڵی لاوازی ڕاپۆرت و بەڵگەنامەکاندا، گورج هەستی بەو لاوازییە دەکرد و لێپێچینەوەی لەگەڵ ئەو بەرپرسەدا دەکرد کە سەرنج و وردبینی لەوشتەدا نەنواندووە.

ستالین خاوەنی بیرێکی تیژبوو، هەرگیز ئەو شتانەی بیرنەدەچۆوە کە لەمەوپێش پێیوترابوو، سەرزەنشت و لۆمەی ئەوانەشی دەکرد کە شتیان بیردەچۆوە، لەبەرئەوە ئێمە بەپێی توانای خۆمان هەوڵمان دەدا چەند بتوانین ڕاپۆرتەکانی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ بەوپەڕی وردبینی و سەرنجدانەوە ئامادەبکەین و بیخەینە پێش چاوی.

---

## پێناسەی ستالین

مارشاڵ زۆکۆف ئاماژە بۆ ئەندامانی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ دەکات و بەوەباسیان دەکات کە توانایەکی بەرز و باڵایان هەبوو، دەڵێت بە درێژایی ماوەی جەنگ دۆستایەتی گەرم و گوڕو پەیوەندی و بڕوای تەواوم بە یاریدەدەرەکانم

هەبوو، لێیان دانەبڕابووم.
دەڵێت لە دوای ساڵی(١٩٤٠)دا هەلی نزیك ناسینی(یوسف ستالین)م بۆ ڕێکەوت، ئەویش ئەوکاتە بوو کە بە سەرۆکی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ هەڵبژێرام، بەتایبەتی لەماوەی جەنگدا کە یاریدەدەری سەرکردەی باڵابووم.
زۆر لەسەر ڕووکەشی دەرەوەی ستالینیان نووسیوە، باڵای زۆر بڵندنەبوو، لە یەکەم چاوپێکەوتنیدا سەرنج ڕاکێش نەبوو، بەڵام لە کارتێکردنە سەرخەڵکیدا زۆر بەهێز و توانابوو، زۆردووربوو لە خۆهەڵکێشان ولاسایی کردنەوە، لە هەڵسوکەوت کردندا لەگەڵ خەڵکیدا زۆر بەئاسایی دەیتوانی سەرنجی بەرامبەرەکەی بۆلای خۆی ڕابکێشێت، لە گفتوگۆکردندا توانایەکی تەواوی هەبوو، لە دەربڕینی بیروباوەڕیدا زۆر وردوکارامەبوو، عەقڵێکی شیکردنەوەو شارەزاییەکی گەورەی هەبوو، هەتا بڵێی کەسێکی بیرتیژ و بەتوانابوو، وای لە خەڵقی کردبوو، هەتا ئەو کەسایەتیە گەورەو گرنگ و شارەزاییانەشی کە دەیانویست بێن بۆ لای و قسەی لەگەڵدا بکەن پێش ئەوەی بێن بۆلای بەباشی خۆیان ئامادە بکەن و بیروهۆشی خۆیان جەم بکەن.
ستالین زۆر حەزی لە دانیشتن نەدەکرد، لە کاتی قسەو گفتوگۆکردندا بە زۆری بەپێوە دەوەستاو بەژوورەکەدا دەهات و دەچوو، ناوبەناو تۆزێك ڕادەوەستاو لە کەسە دانیشتوەکە نزیك دەبۆوە و یەکسەر سەرنجێکی وردی دەدا.
بە دەنگێکی هێواش قسەی دەکرد، لە نێوان قسەکردن و دەربڕینەکانیدا ناوبەناو بێدەنگی و هەڵوێستەیەکی دەکرد.
لەکاتی قسەکردنیدا هیچ لاکردنەوەیەکی نەدەکرد، بەزۆریش سەبیلەکەی بەدەستەوەبوو جا داگیرسایە یان نا، عادەتیش وابوو زۆرجار بەلایەکی سەبیلەکەی سمێڵی چاکدەکرد، قسەکردنەکەی شێوە جۆرجیەکی ئاشکرای پێوەدیاربوو، بەڵام زمانی ڕووسی زۆر بەباشی دەزانی لە قسەکردندا حەزی دەکرد جناس و لێکچوون و پەندو شێوەی ئەدەبی بەکاربهێنێت.
ستالین زۆرکەم پێدەکەنی خۆ ئەگەر پێبکەنیایە زۆر بەهێواشی و بە دەنگێکی نزم پێدەکەنی بەشێوەیەك لە خۆی زیاتر کەس گوێی لە دەنگی نەدەبوو، نوکتەو

قسەی خۆشی پێخۆشبوو، چاوی زۆرتیژبوو، بێئەوەی چاویلکە لەچاو بکات، دەیتوانی شەوبێت یا ڕۆژ هەمووشتێك بخوێنێتەوە، وەك خویەك خۆی بەدەستی خۆی شتی دەنووسیەوە زۆر پەرۆشی خوێندنەوەبوو، لە گشت بوار و لایەنێکدا شارەزایی تەواوی هەبوو.

نەتدەتوانی بڵێیت چ سیفەتێك زاڵە بەسەرکەسایەتیدا. کەسێکی هەمەلایەنەبوو، شارەزا و بەتواناو بەهێز و خۆڕاگربوو، ڕەوشتێکی هێمنانەو لەسەرخۆی هەبوو.

بیرکردنەوەکانی وررد و لەسەرخۆیانەبوو، ئەمە مانای ئەوەنەبوو هەمووکات هەر لە سەرخۆبێت. بەڵکو هەندێ جارتوورە دەبوو رقی هەڵدەسا، ئیتر ئەوکاتە دەگۆڕرا. ئەم گۆڕانەی بەشێوەیەك بوو، هەرکە تەماشات بکردایە بە چاودەتبینی. ڕنگوڕووی زەرد هەڵدەگەڕا و دەموچاوی دەدابەیەکدا و بەمڕومۆچییەوە تەماشای دەکرد.

زۆر کەم کەس هەبوو بتوانێت لەبەردەم ئەو قین و تووڕەییەی ستالیندا خۆی بۆ ڕاگیرێت.

ژیانی ڕۆژانەی ستالین ئاسایی نەبوو، لە ئێوارەو شەواندا کاری دەکرد، دەنوست تا کاتژمێری دوانزەی نیوەڕۆ لەخەو هەڵنەدەسا، کاتێکی زۆری بەکارکردنەوە بەسەر دەبرد لەشەو و ڕۆژێکدا(١٢-١٥) سەعات کاری دەکرد.

بەپێی ئەم بەرنامەیەی ژیانی ڕۆژانەی ستالین، لیژنەی مەرکەزی و ئەنجومەنی وەزیران و وەزارەتەکان و کارگێڕانی پلاندانان و دیوانەکانی حکومەت هەتا درەنگانێکی شەو کاریان دەکرد، ئەمە خەڵکی بەجارێ ماندووکردبوو!!

دەتوانم لێرەدا ئەوە دووپات بکەمەوە: کە ستالین بەردەوام بە زۆری لەمەسەلەی پڕ چەککردن و تەکنیکی حەربی دەکۆڵییەوە و پێداچوونەوەی بۆ دەکرد. زۆرجار گەورە شارەزایانی بواری دروستکردنی فڕۆکەو دەبابەکان و تۆپەکانی بانگدەکرد و بەدرێژی پرسیاری شێوازی لەو جۆرەچەکانە دەکرد و پرسیاری شێوەکانی لەو جۆرانەی بیانییەکانی لێدەکردن.

پێویستە حەقی خۆی پێبدەم کە لە جۆرو شێوەی چەکداریدا تێگەیشتنێکی

تارادەیەك باشی هەبوو، هەروەها بەبێ ڕەزامەندی ستالین هیچ جۆرە چەك و پێویستییەکی جەنگی تا ئەو ڕازی بوونی لەسەرنەدایە نەبەکاردەهێنراو نەلاشدەبرا، بێگومان ئەمەدەبووە ڕێگرو دەست بەستنەوەی هەوڵ و کارەکانی وەزیری بەرگری و یاریدەدەرەکانی کەسەرپەرشتی کاروباری پڕ چەککردنی لەشکری سووریان دەکرد.

پێش جەنگی نیشتمانی گەورە و بە تایبەت دوای جەنگیش ئاماژە بۆ ئەو دەورە گەورەیە دەکرێت که ستالین لە پێکهاتەی دروستبوونی هێزە چەکدارەکاندا بینی. هەروەها لە بناغەدانانی زانیاری سەربازی سۆڤێتی و ئەو بیروڕایە سەرەکی و بناغەییانەی بواری ستراتیژی و کردەوە سەربازییەکانیشدا؟

من وەك کەسێکی سەربازی بە دوورودرێژی ماوەی جەنگ سەرنج و لێکۆڵینەوەی ستالینم کردبوو. ئەویش بەو سیفەتەی کە خۆم لە هەموو جەنگەکاندا هاوبەشیم لەگەڵدا کردبوو.

ستالین ئەوپەڕی تواناو شارەزایی هەبوو لە مەسەلەی ڕێکخستنەکانی بەرەکاندا و لەو چالاکییە زۆرانەی کە لە زۆربەی بەرەکاندا هاوبەشی تێدادەکرد، ئەو چالاکییانەی بە ئەوپەڕی زانین و کارامەییەوە بەڕێوەدەبرد، لەگەڵ ئەو تێگەیشتنە باشانەی لە مەسەلە ستراتیژییە گەورەکاندا هەیبوو. شارەزایی و بەهرەی ستالین وەك سەرکردەی باڵا بەتایبەت لە جەنگی شاری ستالینگرادا دەرکەوت، توانای تەواوی لە دۆزینەوەی ئەڵقەی سەرەکی دەست بەسەرداگرتنی باری ستراتیژیدا هەبوو، دەیتوانی زاڵ بێت بەسەر بەرگری دوژمندا و بەرگرییان نەهێڵێت و دەیتوانی هێرشی گەورەو کردەوە سەربازییەکانی هەموولایەك ڕێك بخات، بێگومان ستالین سەرکردەیەکی گەورە و باڵای بەتوانابوو.

---

زۆکۆف خۆی دەڵێت کە خودی ستالین خۆی هەندێ بنەمای سەربازی سۆڤێتی داناوە، لە هێرشکردن بە تۆپ و جێبەجێکردنی دەستەڵاتی ئاسمانی و شێوازی

گەمارۆدانی دوژمن و بڵاوەپێکردنی یەکە سەربازییە گەمارۆدراوانی دوژمن و پاشان لە ناوبردنی یەکە یەکەیان. لەڕاستیدا ئەم مەسەلە هونەرییە سەربازیانە کە لە شەڕوپێکدادانەکاندا هەمواردەکران، بەری بەرهەمی بیروبیرکردنەوەی قووڵی کۆمەڵێکی زۆری شارەزایانی سەرکردە سەربازییەکان بوو"گەورەیی ستالین لەوەدابوو کە ڕێنماییەکانی شارەزایانی سەربازی گوێ لێدەگرت و بە شێوەیەکی گشتی پەرەی پێدەدا و دەیخستەناو ڕاپۆرت و ڕێنماییەکانەوە و بێ دواکەوتن وەك ڕێنماییەك بۆ جێبەجێکردنیان پێشکەشی هێزەکانی دەکرد."

دەربارەی ڕێکخستنیش من بەڕاشکاوییەوە دەڵێم هەرچی بەرە پێویستی بوایە، ئەوخۆی لە ڕێکخستندا خاوەن بەهرەیەکی گەورە و بەتوانابوو.

مارشاڵ زۆکۆف کۆتایی قسەکانی بەو ڕووداوە سەرنج ڕاکێشە کۆتا دێنێت کە لە نێوان، ئەو و ستالیندا ڕوویدا، مارشاڵ زۆکۆف وەك شارەزا و پسپۆڕێکی بواری سەربازی، گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی هێرشکردن بۆسەر مۆسکۆ لە ئارادا نییە و وابەزوویی ئەو کارەناکرێت.

هێرشکردنیش بۆسەر لینینگراد دوادەکەوێت هەتا ئەو کاتەی هێزەکانی فاشییەکان سەرکەوتنێکی یەکجارەکی لەبەرەی ناوەڕاستدا بەدەست دەهێنن، خۆ ئەگەر بەرەی ناوەڕاست هەرەس بێنێت و بشکێن، ئەوا ئەو کاتە مۆسکۆ دەکەوێتە ژێر هەڕەشەی مەترسییەوە.

مارشاڵ زۆکۆف بیری لە چارەسەرێك کردەوە، بیستی کە"تەنها ڕێگاچارەیەك و شتێك کە لەم بارودۆخە ناهەموارەی ئێستادا بکرێت ئەوەیە هێزەکانی سۆڤێتی پاشەکشە پێبکرێت بۆ دواوەی ڕووباری(دنیبر)، ئەمە سەرەتایەك بێت بۆخۆ ئامادەکردن بۆ هێرشێکی بەهێزی شێوە ستراتیژی دژ بە دوژمن، بەڵام ئەم ڕێگاچارەیەش مانای ئەوەیە ئێمە دەبێت شاری(کییف)ی پایتەختی ئۆکرانیا جێ بهێڵین.."

مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت من ئەوەشم دەزانی ئەمە چەندگران و قورسە و ئێش و ئازار بەگەلی سۆڤێتی و ستالین دەگەیەنێت، بەڵام خۆی نەخستەبەر شاڵاوی سۆزو دەروونییەوە.

کاتێك ڕووبەڕووی ستالین بۆوە ئەو ڕاستیانەی پێیووت، گفتوگۆ و چەنەحانێیەکی گەرم و توندوتیژ لە نێوانیاندا ڕوویدا.

ـ ئەم قسە هیچوپووچانە چییە، چۆن ئەمە دەکرێت و بە بیرتداهاتووە شاری(کییف) تەسلیم بە دوژمن بکەین؟!!

ـ ئەگەر ئێوە وابزانن کە سەرۆکی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ تەنها توانای بەسەرهەوادا(بەسەر هیچ)دا هەیە، ئەوا ئەوکاتە لێرەدا هیچ جێگایەکی نابێتەوە، باشتروایە، من داوابکەم لەسەرۆکایەتی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ لامببەن و بمنێرن بۆ بەرەی جەنگ، لەوێ (لەوەدەچێت)، زیاتر سوودم بۆ نیشتمان هەبێت؟!!

ـ تووڕەمەبە، لە سەرخۆبە بەم بۆنەوەیەوە ئەگەر تۆکێشەکە بەم شێوەیە دەخەیتەڕوو، ئێمە خۆمان دەتوانین کارەکە هەڵسووڕێنین و جێبەجێی بکەین.

ـ من بۆچوونی خۆم و هەڵوێستەو شێوازی چوونەناو جەنگەوەی تایبەتی خۆمم هەیە و بەو شێوەیە خستمە بەردەستتان لەوە دەچێت ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگیش هەمان هەڵوێستەیان هەبێت.

ـ ئێستا بڕۆرەوە سەرکارەکەی خۆت، پاشان ئێمە لێرە قسەو ڕاوێژی خۆمان دەکەین و لە دوایدا بانگت دەکەینەوە، نەخشەکانم کۆکردەوە و بەتووڕەییەوە لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە، پاش(٤٠) دەقیقە بانگکرامەوە بۆ چاوپێکەوتنی سەرکردەی باڵا.

ـ لەوبارەیەوە قسەو ڕاوێژی خۆمان کرد و بڕیارماندا لە سەرۆك ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ لاتبەرین و لە شوێنی تۆدا(شۆبۆشنیکۆف) دابنێین، لە ڕاستیدا تەندروستی باش نییە، بەڵام خۆمان یاریدەی دەدەین.

ـ بۆ کوێ ئەمرم پێدەکەن تاکو بچم..؟

ـ حەزدەکەیت بۆ کوێ بچیت..؟

ـ دەتوانم هەموو کارێك ئەنجام بدەم، دەتوانم سەرکردایەتی فیرقەیەك یا لەشکرێك یاخود بەرەیەکی جەنگ بکەم..

ـ تووڕەمەبە.. تووڕەمەبە.. تو لە ڕاپۆرتەکەتدا لە هەرێمی(یلین)دا باسی دژە

لێدانت کردووە کەواتە بڕۆ ئەم کارە بخەرە سەرشانی خۆت، ئێمە لەوێدا دەتکەین بە قائیدی بەرەی یەدەکی ئەوێ.. کەی دەتوانیت بەرەو ئەوێ بڕۆیت..؟

ـ دوای یەك سەعات..

ـ ئەوەش بزانە تۆ هێشتا هەرئەندامی لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی باڵادا.

ـ ڕێم پێبدەن بابڕۆم..

ـ دانیشە چامان لەگەڵدا بخۆرەوە، پاشان پێکەنی و لە دوایدا قسە لەسەر هەندێ باس دەکەین، لەسەر مێز دانیشتین و دەستمان بەچاخواردنەوەکرد، بەڵام قسە هەر نەبڕایەوە..

---

# بەشی دەیەم

(لە یلین ەوە بۆ لینینگراد)
-بەشمشێر، تەنها بەشمشێر- خەتەریات
لە ڕووی چالاکییە سەربازییەکاندا- بۆچوونی
ستالین دەربارەی فراوانبوونی جەنگ-

(لە بارەگای ئەرکاندا زۆر نەمامەوە.. بەڵکو بۆ شارەزایی بە هەرێمەکەدا گەڕام..) چی بوودەسووتا..؟ نەمدەزانی، بەڵام دیمەنی سووتاندنەکە لە دەروونمدا ئاسەوارێکی تفت و تاڵی وروژاند.. بەگڕی ئاگرەکە سەروەت و سامانی نیشتمانی و ڕەنج و دەسکەوتی چەند ساڵەی گەلی سۆڤێتی دەسووتاندو لە ناوی دەبرد.

لە خۆمم پرسی، چۆن و بەچ شتێك پێویستە گەلی سۆڤێتی وەڵامی ئەو دوژمنە بداتەوە کە بەدوای خۆیدا وێرانکاری و خوێن ڕشتن دەچێنێت؟ لە تاکە وەڵامێك زیاتر بەمێشکمدا نەهات، بە شمشێر، تەنها بە شمشێر پێویستە دوژمنی خوێنرێژ لەناوببرێت و ئاسەواریان نەهێڵین."

پاش گفتوگۆ و لێکۆڵینەوەی بارودۆخەکە لەگەڵ سەرکردەکاندا تێگەیشتم دوژمن شوێنی بەرگریکردنی خۆی بەباشی قایم کردووە، بێشك دوژمن بە توندی

و درانده‌یه‌تییه‌وه شه‌ڕ ده‌کات. له هێڵه‌کانی پێشه‌وه‌و له قووڵایدا خه‌نده‌قی بۆ ده‌بابه‌کانیان و یه‌که‌کانی تۆپه‌کانی دامه‌زراندبوو، به‌وه‌ش ناوچه‌کانی زمانه‌ی (یلسین)ی کردبووه ناوچه‌یه‌کی قایم و باشی حه‌شارگه‌و خۆی تێدا دامه‌زراندبوو.. له بیسته‌کانی مانگی ئابدا دژه لێدانه سه‌ره‌کیه‌کان ده‌ستی پێکرد که له‌شکری بیست و چوار هه‌ستان به‌لێدانی هێزه‌کانی دوژمن.

شه‌ڕو و پێکدادانی توندوتیژ به درێژایی هێڵی شه‌ڕکردن ده‌ستی پێکرد، ئه‌و شه‌ڕوچالاکیانه شه‌وورۆژ بێوه‌ستان به‌رده‌وام بوو.

له ئاسماندا ئێمه‌زاڵبووین و دووژن تۆپ باران و ئاگربارانی چڕوپڕیان ده‌کرده سه‌ر شوێن و مۆڵگاکانمان.

مارشاڵ زۆکۆف ئه‌وه‌ده‌گێڕێته‌وه که چۆن یه‌کێك له که‌تیبه پیاده‌کانمان توانییان ده‌ست به‌سه‌ر گوندی (فۆلۆسکۆفۆ)دا بگرن و داگیری بکه‌ن، به‌ڵام ئه‌و که‌تیبه‌یه که‌وته ناو گه‌مارۆی دوژمنه‌وه‌و به‌هاوکاری هێزی ئاسمانی و هه‌ندێك له یه‌که‌کانی فیرقه‌ی (١٠٧) ئه‌و که‌تیبه‌یه پاش شه‌ڕکردنێك که بێوه‌ستان سێ ڕۆژی خایاند توانییان له‌و گه‌مارۆیه قوتاریان بکه‌ن و به‌ڵکو به‌ته‌واوی دوژمنیان له ناوبردوو ده‌ستیشیان گرت به‌سه‌ر وێستگه‌ی هێڵی ئاسنیشدا..

ئا له‌م جۆره قاره‌مانی و ئازایه‌تیانه، چه‌ند له ته‌نیشت و له ده‌وورو‌به‌رو له هه‌موو شوێن جێگایه‌کدا له شه‌و و له ڕۆژدا له‌پێش چاوتدا دووپات ده‌بۆوه.

دوژمن بۆمانه‌وه و ده‌ست به‌سه‌رداگرتنی زمانه‌ی (یلسین) وه‌ك سه‌ره‌ڕمێك یاخود سه‌ره‌پردێکی په‌ڕینه‌وه، چه‌نده‌ها زه‌ره‌رو زیانی گه‌وره‌و زۆری لێکه‌وت.

من ستالینم له ئه‌نجامی چالاکی سه‌ربازی(یلین) ئاگادارکرده‌وه، دوژمن پێنج فیرقه‌ی تیاداچوو، (٤٧ تا ٥٠) هه‌زار سه‌ربازی بریندار و کوژراویان هه‌بوو. ژماره‌یه‌کی یه‌کجار زۆری تۆپ و هاوه‌نیان تێکشکێنران، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا نه‌مانتوانی گه‌مارۆی هێزه‌کانی دوژمن له زمانه‌ی(یلین)دا بده‌ین، چونکه ئێمه هێزو توانای ته‌واو و پێویستمان نه‌بوو، له‌(٧ی ئه‌یلول)دا دوژمنمان شکاند و ڕاومانن‌ان هه‌تا ڕووباری(ستریان).

له‌(٨ی ئه‌یلول)دا ڕێنمایم بۆ هێزه‌کانمان ده‌رکرد به هاوئاهه‌نگی هه‌وڵی تیپێکی

هێزی جەنەراڵ سۆبینکۆف، بەردەوامبن لە هێرشکردن و چوونە پێشەوەیاندا.

من زۆر دڵنیابووم لە ڕاستی هەڵوێستی خۆم کە پەیوەندی بە پاشەڕۆژی کردارە سەربازییەکانەوە هەبوو.

ـ ئەو هەڵوێستەی کە بووە هۆی لابردنی مارشاڵ زۆکۆف لەسەرۆکایەتی ئەرکانی جەنگدا.

بەو سیفەتەی من هێشتا ئەندام بووم لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی باڵادا، بە ئەرکی سەرشانی خۆمم دەزانی کە سەرکردایەتی باڵا قەناعەت پێ بکەم بە بیروراکەی خۆم.

لە(١٨ی ئاب)دا تەلگرافێکم بەم شێوەیە بۆ ستالین نارد:-

"دوژمن جارێ بۆ ماوەیەك هێرشکردنی بۆسەر مۆسکۆ ڕاگرتووە چونکە دەزانێت ژمارەیەکی زۆری هێزەکانمان بەرێوەن بەرەو پایتەخت، ئێستا کەوتۆتە بەرگریکردن دژ بە هەردووبەرەی خۆرئاواو یەدەکی. هەموو هێزە شەرکەرەکانی لە ئامێرە گەرۆك و دەبابەکانی دژ، بەرەی ناوەراست و باشوری خۆرئاواو باشور کردووە.

پلانی چاوەروانکراوی دوژمن ئەوەیە، دەیەوێت بەسەر بەرەی ناوەراستدا زاڵبێت و بگاتە هەرێمی(تشرینجۆف، کۆنتۆب، بریلوکی) و لەوێشەوە لێدانێك لە لەشکری بەرەی باشوری خۆرئاوابدات.

دوای ئەوە هێرش بکاتە سەر مۆسکۆ بۆ ئەوەی ڕێگا لەو پلانە ترسناکەی دوژمن بگرین.

وای بە پێویست دەزانم بەزووترین کات هێزێکی گەورە لە هەرێمی(تشرنیجۆف، کۆنتۆب، بریلوکی)دا کۆبکەینەوە بەو هێزەوە دەتوانین لێدان لە باڵی دوژمنی هێرشبەر بدەین".

بۆ ڕۆژی دوایی(١٩ی ئاب) ئەم وەڵامەی ستالینم پێگەیشت...

"بۆچوونتان دەربارەی ئەگەری هێرشکردنی دوژمن بۆ هەرێمی(تشرنیجۆف، کۆنتۆب، بریلوك)ی بەبۆچوونی ئێمەش ڕاستە، ڕێگای پێویست چۆن پێویست دەکات دەیکەین و بەرەیەکی نوێ پێکدێنین".

# بەرەو بەرە

من دەمزانی هێزی ڕاستی ئەو بەرە نوێیەی(برانسك) کە دەیانەوێت بە خێرایی پێکی بهێنن، چۆنە، لەبەرئەوە بە پێویستم زانی جەخت لە سەرۆکی باڵا بکەمەوە فەرمان بدات بە هەموو هێزەکانی باڵی ڕاستی بەرەی باشوری خۆرئاوا بکشێنەوە بۆ دوای ڕووباری(دنیبیر)، بەڵام ئامۆژگارییەکانم گوێی پێنەدرا.

ستالین وتی"من پێش کەمێك لەگەڵ خرۆشۆف و کیربونوسدا قسەم کرد، ئەو دوانە پێیان گوتم و ڕازییان کردم کە لەم بارودۆخەی ئێستادا بەهیچ جۆرێك نابێت پاشەکشە لە شاری کییف بکرێت."

ئەو خۆشی لەوباوەڕەدابوو بەرەی برانسك، ئەگەر نەتوانێت دوژمن لە ناوبەرێت، بەلایەنی کەمەوە دەتوانێت بەرەوپێش چونیان ڕاگرێت.

ئاشکرایە بەرەی باشوری خۆرئاوا لە دوایدا زیانێکی زۆرزۆری لێکەوت، ئەویش لەبەر ئەو هەڵوێستەبوو کە لێکدانەوەو شکردنەوەی وردی بارودۆخەکەی بۆنەکرابوو.

لە(٨ی ئەیلول)دا ستالین بانگهێشتی کردم.

ـ ئەوەی لە ناوچەی زمانەی(یلین)دا کردت کارێکی باش بوو، دەربارەی قسەو گفتوگۆکانی پێشومان کە توێژینەوەمان لە سەرکرد، تۆ ڕاست بوویت و لەسەر حەق بوویت.."مەبەستی لە ڕۆژی چەنەحانێ گەرمەکەی پێشووبوو.." ئێستا تۆ دەتەوێت بەرەوکوێ بڕۆیت..؟

ـ جارێکی تریش بۆ بەرەی جەنگ..!!

ـ بۆ بەرەی جەنگ؟

ـ بۆ ئەو بەرەیەی ئێوە پێتان باشە..

ـ بچۆ بۆ دەوروبەری نزیك لینینگراد، ئێستا لینینگراد لە بارودۆخێکی

خراپ و ناهەمواردایە.. ئەڵمانییەکان ئەگەر بتوانن دەست بەسەر لینینگرادا بگرن ئەوا ئەو کاتە لەگەڵ فیلەندییەکاندا یەکدەگرنەوە و پێکەوە لە باکوری خۆرهەڵاتەوە هێرش بەرەو مۆسکۆ دەبەن، ئەو کاتە بارودۆخەکە زیاتر بەرەو ئاڵۆزی و خراپی دەڕوات.

- ڕازیم هەرئێستا سەفەربکەم، تکایە ڕێم پێ بدەن دووسێ جەنەراڵ لەگەڵ خۆمدا بەرم بۆ ئەوێ، بیانخەمە جێگای ئەو سەرکردە هیلاك و ماندوانەی لەوێدان.

- کێت دەوێ برۆ لەگەڵ خۆتدا بیان بە(پاشان هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا) و وتی:

"بارودۆخ لەبەرەی باشوری خۆرئاوادا، تابێت بەرەو خراپی دەڕوات بڕیارمانداوە سەرکردایەتی ئەوێ بگۆڕین، تۆ بۆ ئەوێ کێ هەڵدەبژێریت؟

- مارشاڵ تیموشنکۆ لە ڕێکخستنی کاروباری سەربازیدا شارەزاییەکی گەورەو زۆر باشی هەیە، ئەو ئۆکرانیاش باش شارەزایە، لەبەرئەوە من پێشنیاری ناردنی ئەو دەکەم."

خەریکبوو بۆچوونە دەرەوە خۆم ئامادەبکەم، لەو کاتەدا ستالین پرسیاری لێکردم.

- بە بۆچوونی تۆ پلانی داهاتوو، و توانای دوژمن چۆن هەڵدەسنگێنیت؟

- لەم کاتەدا من وای دەبینم کە بەرەی باشوری خۆرئاوا ناوچەی خەتەرناکی یەکەم بێت دوای لینینگراد، من پێشنیارەکەی خۆم دووپات دەکەمەوە بەکشانەوەی هەموو هێزەکانی ئەوێ بۆ بەرەی لێواری خۆرهەڵاتی ڕووباری(دنیبر) لەسەر ئەو بناغەیە پێویستە لە شوێنێکی تری هەرێمی کۆنتوب هێزێکی یەدەکی سەربازی پێکبهێنرێت.

- ئەی باشە ئەنجام و پاشەڕۆژی کییف چۆن دەبێت..؟

- کارهەرچەندە ناخۆش و بەئازاربێت، ناچارییە بێشك دەبێت شاری کییف چۆڵ بکرێت، لەوەزیاتر هیچ چارێکی ترمان نییە..!!

# خۆڕاگری ڕێگای سەرکەوتنە

پێش ئەوەی بچم بۆ لینینگراد سەردانێکی(ناسیلیفسکی)م کرد، ئەوکاتە یاریدەدەری یەکەمی سەرۆکی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ بوو دەربارەی بارودۆخی لایەنی باشوری خۆرئاوا پرسیارم لێکرد، وەڵامیدامەوە..

ـ وابزانم ئێمە لە پاشەکشەپێکردنی هێزەکانی ئەوێ بۆدوای ڕووباری(دنیبیر) زۆر دواکەوتین، لێرەدا دەمەوێت زنجیرەی بەسەرهاتەکان بپچڕێنم... .

لەو ڕۆژەوەی جەنگ دەستی پێکردبوو، مانگ و نیوێکی تاڵ و ناخۆش بەسەردا تێپەڕی بوو. زەرەرو زیانەکانمان زۆر بێشوومارbوون، تەنها لە ڕۆژی یەکەمی جەنگدا، ئەو هێزانەی لە ناوچە سنوورییەکاندا دامەزرابوون و خۆیان قایم کردبوو، نزیکەی(١٢٠٠) فڕۆکەیان لە دەستدابوو و دوژمن بەدەبابە و زرێپۆش و فڕۆکەکانیانەوە هێرشیان دەکرد و دەهاتنە پێشەوە، هێرشیان دەکردە سەر مۆڵگاکانمان و لە باڵەکانیانی دەدا و هێڵو تۆڕی هاتوچۆکردنی وێران دەکرد، لەو پێناوەدا دەیەها هەزار سەرباز و هاووڵاتیانی سۆڤێتی تێداچوون و بوونە قوربانی.

لەگەڵ ئەوەشدا هەر لە سەرەتاوە بەسەر هاتەکان وەك ئەو حساب و خەملاندنەی سەرکردایەتی ئەڵمانیا نەبوو، ئەی چی بووە هۆی ڕێگرتنی هاتنە ناوەوەی ئەڵمانییەکان بۆ ناو خاکی وڵاتمان لەگەڵ ئەو ڕێژە لە پێشچوونە خێرابییەی لەبەرچاویان گرتبوو..؟

قارەمانی بە کۆمەڵی هێزەکانمان و بەرگری و خۆڕاگرتنە بەردەوامە شێرانەییەکە و نیشتمان پەروەری یەکەکانی سوپاو میللەت، بوونە هۆی ڕێگرتن و نەهاتنە ناوەوەی بەخێرایی دوژمنان بۆ ناو خاك و نیشتمان، ڕۆژگار و مێژوو نموونەو پەندی کەمی نەداوینێتێ بۆ هێزێك کە توانای بەرگری کردنی نەمێنێ و پەنا بەرێتە بەر ڕاکردن و چەکە باشەکانیان فڕێ بدەن و هەڵێن، هیچ کەسێك ناتوانێت هێڵی جیابوونەوە بکێشێت لە نێوان دەوری چەك و پێداویستییە جەنگییەکان

و له نێوان ئەو ڕۆحە مەعنەوی و له خۆبوردنەی هێزەکان له شەڕدا دەیبینن، بێگومان ئەگەر توانا چوون یەك بێت ئەوا سەرکەوتن له جەنگ و پێکدانە گەورەو توندوتیژەکاندا دەبووە بەشی ئەو هێزانەی بۆ سەرکەوتن خۆیان پڕچەك کردووە بە بیروباوەڕ و ئیرادەوپێزانینی مەبەستی شەڕکردنەکە و یەکبوونی دڵەکان و دڵسۆزی بۆ ئەو ئاڵایەی لە ژێر سێبەریدا دەجەنگێن. لەم بوارەدا من وای بەباش دەزانم بواری قسەکردن بدەم بە دوژمن کە لە جەنگی نیشتمانی گەورەدا بەرەنگاریان بووینەوە..

"لەمەوپێش ئاماژەماندا لە یەکێتی سۆڤێتی(ئەوسادا) بە جەنگی دووەمی جیهانییان دەوت، جەنگی نیشتمانی گەورە" ژەنەراڵ(کورت)ی بەڕێوەبەری هەواڵگری گشتی ئەڵمانی گلەیی و گازاندەی لەوەبوو، توانای سیخوڕی کردنی بەسەر یەکێــی سۆڤێتیدا بێهێز و لاوازە، ئەمەش وایکردووە"خەملاندنی هێزەکانی سەربازی یەکێتی سۆڤێتی نەزانێت گەرچی بەشێوەیەکی نزیکەیش بێت، ئەم کارە وایلێهاتووە ببێتە شتێك هەرگیز جێبەجێ نەکرێت."

(نێوەندە سیاسییەکانی ئەڵمانیا زۆر بەگەرمەوە پێیانوابوو دوای چەند شکاندنێکی سەربازی گەورە، یەکێــتی سۆڤێــی هەرەس دێنێت.

"یەکێتی سۆڤیەتی بەپێی توانا ,خۆی بۆ شەڕوپێکدادانی چەکداری ئامادەکردبوو..."

سەرکردایەتی سەربازی ئەڵمانی نەیدەتوانی پشت بە غەفڵەتگیری ستراتیژی ببەستێت، تەنها ئەو پەڕی ئەوەی ئێمە دەمانتوانی بیکەین ئەوەبوو کاتی هێرشکردنەکانمان بە نەهێنی دەهێشتەوە ئەمەش بۆ ئەوەی تەکنیکە غەفڵەتگیرییە یارمەتیمان بدات بچینە ناوخاکی دوژمنەوە.)

مەبەستی سەرەکی(پلانی بارباروس) بریتی بوو لە تێکشکان و لەناوبردنی توانای هێزەکانی لەشکری ڕووسی کە لە هەرێمەکانی خۆرئاوای ڕووسیادا بوون. (باشتروابوو بوترایە، تێکشکان و لەناوبردنی یەکێتــی سۆڤێتی چونکە ئەو هەرێمانە چەندەها کۆماری نەتەوایەتی وەك —ئۆکرانیا و بیلورووسیا و لاتیفیا و لۆتوانیا- یان تێدابوو، وە تێکدان و وێرانکردنی چەندەها شوێن و ڕێگاوبان

بەهۆی دەبابەکان و زرێپۆشەکانیانەوە کە بە خێراییەکی نەترسانەوە، دەچوونە ناو خاکی رووسیاوە بۆ ئەوەی رێگا لەو هێزە رووسیاییانە بگرن کە توانای شەرکردنیان هەبوو، وە نەهێڵن بەرێکوپێکی پاشەکشە بکەن بۆ ناو قوڵایی زەوییە بەر فراوانەکانی رووسیا.

وە دەبوو هێزەکانی ئەڵمانیا بەوپەری خێراییەوە برۆیشتنایەتە پێشەوە، تاکو وا لە هێزە ئاسمانییەکانی رووسیا بکەن نەتوانن هێرشی ئاسمانی بکەنە سەر خاکی ئەڵمانیا، مەبەستی کۆتایی ئەو کاروچالاکیانەشیان ئەوەبوو بگەنە هێڵی(فۆڵگا، ئەرخانجل) بۆ ئەوەی هێزە ئاسمانییەکانی ئەڵمانیا، ئەگەر پێویست کات بتوانن ئەو تەنها ناوچە پیشەسازیانەش کە لە رووسیادا مابوون لە کاربخەن و پەکیان بخەن.

ئەم پلانە پێویستە بەگەشبینییەوە رەچاوبکرێت، لەچاو ئەو سەرکەوتنە خێراییەی بەسەر فەرەنسا و دراوسێکانیدا هات، ئەو چاوەروانی ئەوەبوو دوژمن دەورێکی سەلبی بنوێنێت وەك ئەوەی ئەڵمانیا لە شەرەکانی پێشترا بینییوی.

(هیتلەر هیچ شك و گومانێکی لەوە نەبوو کە تاکە هێرش وچالاکییەکی سەربازی بەس بێت بۆ ئەوەی یەکێتــی سۆڤێتی پێ لە ناوببرێت"، دوژمن هێزو توانایەکی سەربازی بێوێنەی لە بەرگریکردندا نواند، تەنها ئەو زەرەرو زیانە گەورەیەی لە (هاوینی ساڵی ١٩٤١)دا بەرنەکەوت، بەڵکو لەو هێرشی زستانەیشدا بەرێکەت، کە ژمارەیەکی یەکجار زۆر گەورەی هێزەکانی ئەڵمانی هاوبەشیان تێداکرد و نەیانتوانی خۆراگری لەشکری سوور بشکێنن و لە ناویان بەرن.

چونکە هێشتا ئەمەندە کادری سەرکردەیی مابوو کە بتوانن پێکهاتەی نوێ دروستبکەن و مەشق و راهێنانیان پێ بکەن و ئامادەیان کەن بۆ شەروپێکدادان.

---

# جەنگی دووەمی جیهانی

(ف. س. فوللیر) لە کتێبەکەیدا(جەنگی دووەمی جیهانی) وتەکانی گۆڤارە ئەڵمانییەکانی ڕۆژی(٢٩ی حوزەیرانی ١٩٤١) دەکاتە بەڵگەنامەو لە نێوانیاندا ئەوەی لە ڕۆژنامەی(فولکشیر بیوباختر) هاتووە دەکاتە بەڵگەو دەڵێت"سەربازی ڕووسی لەبەرەی خۆرئاوادا بەوە سەرکەوتووە بەسەر دوژمنەکەیدا کە لە مردن سڵ ناکات و خۆراگری و خۆشەویستی کوێرانەی بۆ وڵات وایلێکردووە لە سەنگەردا بمێنێــەوە هەتا لەناو سەنگەرەکەیدا دەکوژرێت یاخود بە شەڕی دەستەویەخەی قەمەو خەنجەر لە ناودەچێت" وە لە ڕۆژنامەی(فرانکفۆرتر تسیتریج)دا لە(٦ی تەمموز)دا وتراوە.."ئەو شەلەل و تێکچوونە دەروونییەی لە خۆرئاوادا ڕەچاو دەکرێت، لەبەرئەو هاتنە لەناکاو و کتوپڕییە چاوەڕوان نەکراوەیە کە بەم شێوەیە لە خۆرهەڵاتدا ڕوو دەدات".

لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دوژمن هەر بەچالاکی سەربازییەوە ناوەستێت بەڵکو هەوڵی ئەوەش دەدات گەمارۆی سەرە مقاشەکانی ئەڵمانیا بدات، واتە(دژە سوراندنەوە بەدەوری دوژمندا..).

ئەمە تارادەیەك دیاردەیەکی نوێیە لە تەکنیکی جەنگیدا و دیاردەیەکی لەناکاووکتوپڕییە کە ئەڵمانەکان شتی وایان بە خەیاڵدا نەهاتووە.

وە لە بیرەوەرییە ڕۆژانەکانی سەرۆکی ئەرکانی جەنگی هێزە پیادەکانی ئەڵمانیای فاشیدا جەنەڕاڵ(جالدر) ئەمەی تێدایە:"٨ی تەمموزی ١٩٤١ ڕۆژی ١٧ هەمینی سەرەتای جەنگ سەعات ١٢...

پەیامێك بۆ فۆهرەر لە بارەگای سەرکردایەتی باڵادا.. سەرکردەی هێزە پیادەییەکان دوا گۆڕانکاری هەڵوێستی بەرەی جەنگی ڕوونکردەوە و منیش ڕاپۆرتی خۆم دەربــارەی بارودۆخی دوژمن و بارودۆخی هێزەکانی خۆمانم پێراگەیاندن و لە دواگفتوگۆ و چەنەحانێکەماندا گەیشتینە ئەوەی:

١ـ فوهرەر وای بەباش دەزانــێــت، چاکترین حەل ئەوەیە هێزەکانی لەشکری(ناوەڕاست) هەڵسن بەگەمارۆی ئەو هێزانەی دوژمن کە ڕووبەڕووتانە و

یەکجارەکی لە ناویان بەرن و ڕێگا بەرەو مۆسکۆ بکەنەوە.

٢ـ فوهرەر بڕیاری یەکلایی کردنەوەی یەکجارەکی داوە بەلەناوبردن و سرینەوەی یەکجاری مۆسکۆ و لینینگراد لەسەر گۆی زەوی، ئەمەش بۆ ئەوەی ڕزگارمان بێت لە دەست خەڵکانی ئەو دووشارە دەنا ئێمە ناچاردەبین بەدرێژایی ماوەی زستان خواردنیان بدەینێ و بیانژێنین.

هێزی فڕۆکەوانی پێویستە بۆ لەناو بردن و وێرانکردنی ئەو دووشارە هەڵسن بەو کارە، بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستە پێویست بەچوونە ناوەوەی دەبابە ناکات.

(جالدر) لە بیرەوەرییە ڕۆژانەکانیدا دان بەو زەرەرو زیانە گەورە و زۆرانەدا دەنێت کە تووشی هێزەکانی ئەڵمانی بوو.."تەنها لە دوومانگی یەکەمی جەنگدا هێزە پیادەکانی ئەڵمانیا نزیکەی(٤٠٠) هەزار سەربازی لەدەستدا.."

مارشاڵ زۆکۆفیش ئاماژە دەکات و دەڵێت...

"هێزە جەنگاوەرەکانی ئەڵمانی لە نێوان مانگی حوزەیران بۆ مانگی(کانونی یەکەمی١٩٤١) لە گشت بەرەکانی تردا بێجگەلە بەرەی ئەڵمانی سۆڤێتی تەنها(٩) هەزار سەربازیان لەناوچوون!! پاشان زیانی دوژمن تاکو کۆتایی کردەوە سەربازییەکانی وەرزی هاوین و پاییز بۆ٨٠٠ هەزار سەرباز زیادی کرد، ئەمانە هەمووی و لەگەڵ ئەو بارودۆخە خراپ و ناهەموارەی کە تووشمان هات و ئەو شارەزایی و پێزانینە شەرکردنانەی سەربازانی دوژمن هەیانبوو بەوەی ماوەیەکی دوورودرێژ لە جەنگدابوون، لە هێرشکردنە نارەواکانیاندا هەمووکات هێرشکردن لەلایەن دوژمنانەوەبوو. سەرکەوتن و زاڵبوونیش لە جەنگدا هەرچۆنێك بوایە هەربۆ ئەوان دەبوو، چونکە دەمێك بوو خۆی بۆ جەنگ ئامادەکردبوو.

تا سنورێکی زۆریش پەرەی بە پێشکەوتن و پێکهاتەی چەك و هێزەکانی دابوو، هەروەها سەرکەوتن و توانایەکی بەرچاوی لەداهاتە ئابورییەکانیشدا هەبوو، بەتایبەت دوای ئەوەی کە ئەوروپای داگیرکرد پاشان مارشاڵ زۆکۆف لە بیرەوەرییەکانیدا دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە داوایان لێکرد سەرکردایەتی بەرەی جەنگی ناوچەی لینینگراد بکات..و دەڵێت..

سواری فرۆکە بووم لە(٩ی ئەیلوولی١٩٤١)دا بەرەو شوێنە نوێییەکەم کەوتمەڕێ".

هەربەڕاستی لەو ماوەیەدا لینینگراد بەبارودۆخێکی خراپ و ناهەمواردا تێدەپەڕی، بارودۆخی هێزەکان و هاوولاتیان لەبارێکی قورس و ناهەمواردا بوو، ئەوەندەگران و ناخۆشبوو لەو باوەڕەدابووم جگە لە هاونیشتمانی سۆڤیاتی زیاتر کەسی تر نەیدەتوانی و بەرگەی ئەو ناخۆشی و ناهەمواریيە بگرێت.

ئێمە کە لە ژیاندا ماوین کاتێك یادی ئەو ڕۆژانەمان دەکەوێتەوە هیچمان لە دەست نایە لەوە زیاتر کە سەری ڕێزونەوازش و گەورەیی بۆ ئەو یادە ڕووناك و پرشنگدارە دانەوێنین بۆ ئەو قارەمانانەی کە بەنرخترین شتێك کە مرۆڤ هەیەتی بەخشییان و بۆ ئێمەیان بە نەمری جێهێشت و ژیانی خۆیان کردە قوربانی نیشتمان و پاشەڕۆژی نەوەکانی داهاتوو.

لە کۆتایی مانگی ئابدا هێزەکانی ئەڵمانیا توانییان بەتەواوی گەمارۆی لینینگراد بدەن بەشێوەیەك شارەکە هیچ پەیوەندییەکی بەنیشتمانە خۆڕاگرەکەیەوە نەما.

تەنها لە ڕێگای ئاسمانی و دەریاچەی(لادۆجا)وە نەبێت، فیلەندەییەکانیش لە باکوری شارەکەوە هەرکە فرسەتیان دەستکەوتایە، هێرشیان دەکردە سەرشارەکە.

لەگەڵ جەنەراڵ(جوزین) و جەنەراڵ(فیدیونبینسکی)دا گەیشتینە کۆشکی(سمولن) کە بارەگای جەنگی بەرەی لینینگراد بوو، لەوێدا پاسەوانی کۆشکەکە ڕایگرتین و نەیهێشت بچینە ژوورەوە، هەوڵی زۆرم لەگەڵیدادا و خۆمم پێناساند، بێهودەبوو چونکە کارتی ڕێ پێدادانمان پێنەبوو..(ئەمە خزمەتکردنی سەربازییە..؟)

"کۆشکی سمرلن لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری ئیشتراکی ساڵی(١٩١٧)دا بارەگای سەرۆکایەتی شۆڕشی ئۆکتۆبەربوو.."

کاتێك چوومە ناو بارەگای ئەرکانی جەنگەوە بینیم گفتوگۆ و چەنەحانێیەکی گەرم بوو لە نێوان ئەندامانی ئەنجومەنی سەربازی بەرەدا لەسەر ئەو کارانەی

پێویسته بیکەن، ئەگەر لینینگراد هەرەس بێنێت و بکەوێتە ژێردەستی ئەڵمانییەکانەوە و لەسەر ئەو دامەزراوە سەربازییانەی لەم حاڵەتەدا دەبێت وێرانی بکەن.

لە شەوی(١٠ی تشرینی یەکەمی١٩٤١)دا مارشاڵ زۆکۆف.. سەرکردایەتی بەرەی گرتەدەست، هەرخێرا بە هاوکاری ژمارەیەك سەرکردە"ئەوانەی باسی کردوون زۆربەیان شەهیدبوون" پلانێکی وردی بۆ بەرگریکردنی شاری لینینگراد بەرجەستە کرد، لینینگراد بێشکەی شۆرشی ئۆکتۆبەر و هەڵگری ناوی لینینی سەرکردەبوو".

(جراد) یاخود(گراد) بە ڕووسی بەمانای(شار)دێت لێرەدا ناوی هەندێ شار بەناوی سەرکردەکانی شۆرشەوە دەهێنرا وەك (لینینگراد، ستالینگراد).

پاش(٩٠٠) ڕۆژ خۆڕاگری کە لەشکری سوور کەشتیگەل و دانیشتوانی لینینگرادی شاخاوی بەسەریان برد، نەئەو قوربانییە زۆرەو نە ئەو برسێتییەو نەئەو سارد و سەرما زۆرە نەیانتوانی لە خۆڕاگری و ئازایەتی بەرگریوانانی شاری لینینگراد کەمبکەنەوە، لیژنەی مەرکەزی حیزب لە لینینگرادا ڕۆژانە سەرنج و چاو دێری هەڵوێستەکەی دەکرد و هەرچی تواناو داهاتێکی هەبوو خستبوویە خزمەت دانیشتوان و شارەگەمارۆدراوەکەوە، خۆڕاگری و قارەمانیی لینینگراد بوو بەداستانێك، حەزمدەکرد بە دوورودرێژی باسی ئەو ڕووداوانەی ئەو نۆ سەد ڕۆژە ناهەموار و کوێرەوەرییانە بکەم کە بەسەر لینینگرادا هات، بەڵام بەئاسایی نازانم چ وشەیەك دەربڕم کە شایستەی ئەو قارەمانییەی ئەوانەبێت کە پارێزگاریان لە لینینگراد کرد.

من شانازی بەوەوە دەکەم لە کاتێکدا داوایان لێکردم ببم بە سەرکردەی بەرەی لینینگراد، لە کاتێکدا دوژمن لە دەوروبەری شارەکەدا هەرەشەی ترسناکی کوشتن و لەناوچوونی لێدەکرد. لە(کانوونی دووەمی ١٩٣٤)دا لیژنەی بەرگریکردنی نیشتمانی داوایان لێکردم هەوڵ و هاوئاهەنگی لەگەڵ فۆرشیلوفدا یەك بخەین تاکو بە هاوکاری هەردوو بەرەی لینینگراد و فۆلخۆف پێکەوە گەمارۆی سەر شاری لینینگراد بشکێنین.

هەموو ئەوانە زیاتر منی بە لینینگراد و هاوولاتیانییەوە بەستەوەو زیاتر دەربارەیان و ئێستاش هەست بە گەورەترین پلەی ڕێزوخۆشەویستیان بکەم. زۆرکەس دەربارەی قارەمانی شاری لینینگرادی بێهاوتایان نووسیوە، بەلاّم من وای بەچاك دەزانم زنجیرە پەرتووکێك لەسەر داستانی قارەمانی لینینگراد و باقی شارە قارەمانەکانی تربنوسرێت(شاری قارەمان) ئەم نازناوە شایستەی چەند شارێکی سۆڤیاتین بۆ ڕێزلێنانیان لەو قارەمانێتییەی لە جەنگی دووەمی جیهانیدا نواندیان.

لە نێوان ئەو شارانەدا شاری(مۆسکۆ و لینینگراد و ستالینگراد)وە پێویستە ئەو پەرتووکە داستانیانە پربن لە وێنەو بەچاپێکی جوان و شایستەبن و لە پێش هەمووشتێکدا لەسەر بناغەی ڕاستی و بەڵگەنامەدابن و ڕووداو بەسەرهاتەکان بەڕاستی و دڵسۆزییەوە بنووسرێنەوە.

ئێمە لێرە شارمان هەیە ناویان دەبەن بە(شاری دەستەخوشکان) و بە(شارەهاوڕێکان) و لەم جۆرەناوانە، بەلاّم شاری قارەمان لە جیهاندا زۆرنیین و لەم جۆرە شارانە لە ولاّتی سۆڤێتی ئێمەدا زۆرێکی زۆرهەن.

---

# بەشی یانزەهەم

(شەڕو پێکدادان لە پێناو بەرگری کردنی مۆسکۆدا–
ئەڵمانەکان لە دەروازەکانی مۆسکۆدا–
ئەڵمانەکان گوندەکەمیان سووتاند و ماڵەکەی دایکیشم —
کێی بە هیتلەر دەڵێت نا)

لە(٥ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤١)دا ستالین پەیوەندی بەمارشاڵ زۆکۆفەوە کرد و داوایلێکرد بە فڕۆکە بێت بۆ مۆسکۆ، بۆ ئەوەی بیرورای وەرگرێت کەچی پێویستە بکرێت دەربارەی ئەو بارودۆخە خراپەی لەبەشی چەپی بەرەی یەدەکیدا ڕوویداوە، بەڵام ڕووداوو بەسەرهات لەبەرەی جەنگدا بە جۆرێك گۆڕرا نەیهێشت زۆکۆف سەفەرکات بۆ مۆسکۆ.

جارێکی تریش ستالین لە (٦ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤١)دا پەیوەندی پێوەکردووە:

ـ گۆڕانکاری بارودۆخ لای ئێوەچۆنە..؟ لەجموجۆڵ و چالاکییەکانی دوژمندا چ شتێکی نوێیان تێدایە؟

ـ ئەڵمانەکان هێرشەکانیان کەم کردۆتەوە، بەپێی ئەو لێپرسینەوانەی لەگەڵ گیراوەکانی دوژمندا کراوە لەشەڕوپێکدادانی مانگی ئەیلولدا هێزەکانیان زەرەرو زیانی یەکجار زۆریان پێگەیشتووە.

لەبەرئەوە لە دەوروبەری لینینگراددا پێگەو شوێنی بەرگرییان دامەزراندووە، ئێستا دوژمن بە فرۆکەو تۆپەکانیان ئاگری قینیان بەسەر شارەکەدا دەڕێژن، فرۆکە هەواڵگرییەکانی ئێمە جموجوولێکی گەورەو بەرفراوانی دەبابەکانی دوژمن و لێشاوی زرێپۆشەکانی دوژمنیان لە لینینگرادەوە بەرەو باشور دەست نیشان کردووە، لەوەدەچێت ئەوانە بەرەو مۆسکۆ بچن، ستالین هەمدیسان داوای لە مارشاڵ زۆکۆف کردەوە. بەزووترین کات گورج بگاتە مۆسکۆ و بەهەنووکەیی(مووەقەت) لە بریتیی خۆی یەکێکی تر بکات بە سەرکردەی بەرە. مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت:

"ئەندامانی ئەنجومەنی سەربازی بەرەی لینینگرادم بانگهێشت کرد، هەریەك لە(جدانۆف، کوزنیتسوف، کابۆشین، سۆلۆفیون) کە بەرۆحێکی دۆستایەتی و برادەرییەکی گەرم و پتەوەوە لە رۆژە ناخۆش و ناهەموارەکانی ڕۆژانی بەرگریکردن لە لینینگراد پێکەوە کارمان دەکرد.

لە(٧ی تشرینی یەکەم)دا مارشاڵ زۆکۆف بۆ چاوپێکەوتنی ستالین لە شوێنە تایبەتییەکەی خۆی لە کرملیندا کەوتەڕێ، گەرچی ئەو کاتەش تووشی ئەنفلۆنزاش ببوو، ستالین پێی وت سەرکردایەتی هیچ لەبارودۆخی ڕاستی بەرەی خۆرئاوا نازانێت و ئاگاداری نییە.

جا لەبەرئەوە ناتوانێت هیچ بڕیارێکی تایبەت دەربکات، داوای لێکرد بە زووترین کات هەرئێستا سەفەرکات بۆ ئەوەی تویژینەوەی بارودۆخ و چۆنێتی ئەوێ بکات، ئەم چاوەڕوانی تەلەفۆنی ئەو دەکات.

لە ڕێگادا لە ژێر ڕۆشنایی ئەو لایتەی بەدەستمەوە بوو تەماشای نەخشەکەم دەکرد و لێی دەکۆڵیمەوە، بۆ ئەوەی خەوم لێنەکەوێت ناوبەناو ئۆتۆمبیلەکەم ڕادەگرت و ماوەیەکی کەم بەپێ دەڕۆیشتم، لەوێ لەگەڵ سەرکردەکاندا لە بارودۆخەکە کۆڵیمەوە، دەربارەی ئەوەی کە لەبەرەی خۆرئاوادا لەسەرەتای هێرشەوە بەرەو مۆسکۆ چی ڕوویداوە..؟ ئەو دەروازەو ڕێگاوبانە دوورانەی بەرەو

پایتەخت دەچوون لەسێ بەرەوە توندوتۆڵ کرابوون.

لەبەرەی خۆرئاوادا بەسەرۆکایەتی جەنەراڵ کۆنیوف(لەبەرەی یەدەکیدا بەسەرۆکایەتی مارشاڵ بودیونی) و لە(برانسك)یشدا بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ بریمنکۆ. لە کۆتایی مانگی ئەیلوولدا لەو بەرانەدا نزیکەی(٨٠٠) هەزار جەنگاوەری ئازاو نەبەردیان لە ژێر دەستدابوو، هەروەها(٧٨٠) دەبابەو(٦٨٠٨) تۆپی مەیدانی و هاوەن و(٥٤٥) فڕۆکەیان لە ژێردەستابوو گەورەترین هێزو پێداویستی لە ژێر فەرمانی بەرەی خۆرئاوادابوو وە لەکاتی ئامادەبوون بۆ هێرشکردنە سەرمۆسکۆ، ئەو لەشکرو مۆڵگاو پێداویستییە جەنگییانەی دوژمن لە هەرسێ بەرەکاندا کۆیان کردبۆوە، زۆر زیاتربوو لەو سەرباز و تەقەمەنییانەی بەرەکانی ئێمە، بەرێژەی(١,٢٥)جار لەسەربازی پیادە، (٢,٢) جار لە ژمارەی دەبابە و(٢,١) جار لە تۆپ وهاوەن و(١,٧) جار لە ژمارەی فڕۆکە لە(٣٠ی ئەیلوول)دا دوژمن هێرشی کردە سەربەرەی(برانسك) و پاشان لە(٢ی تشرینی یەکەم)دا هێرشەکەیان گەیشتە هەردوو بەرەی خۆرئاوا و بەرەی یەدەکی، پاش ئەولێدانە توندوتیژانەی دوژمن لە هەرسێ بەرەکاندا، هێزە دەستوەشێنەکانیان توانییان بەرەوپێشەوە بڕۆن و لە باکور و باشوردا هێزەکانیان توانییان کۆمەڵێك لە هێزەکانی هەردوو بەرەی خۆرئاواو یەدەکیمان بخەنە ناو گەمارۆی دەمەمقاشەکانی خۆیانەوە(کماشە).

هێزەکانی دوژمن بە سەرۆکایەتی(جودریان) بەرەو باشور لە پێشکەوتندابوو، توانییان شاری(ئورل) داگیربکەن، چونکە ئێمە هێزی تەواو و پێویستمان نەبوو بەرەنگاری هێرشەکەیان ببنەوە. بەمەش هێزەکانی هەردوو لەشکری سێ و سیانزەی سەر بەبەرەی خۆرئاوا کەوتنە بارودۆخێکی ناهەموارەوە و کەوتنە بەرهەرەشەی گەمارۆی دوژمنەوە.

دوژمن توانی بەرەی(برانسك) ببڕێت و زەرەرو زیانێکی زۆری پێ بگەیەنێت و ناچار بە زنجیرە شەڕوپێکدادانێکی پچڕپچڕ بە ناچاری کشایەوە.

بارودۆخی ڕێگای(تۆلا) زۆر ترسناکبوو، لەشکری ئەڵمانی زیاتر لە پایتەختی سۆڤێتی نزیکبۆوە، لە کازیوەی بەیانی(٦ی تشرینی یەکەم)دا لە خۆرئاوای

ڕووباری(فیازما)دا کۆمەڵێکی زۆری هێزەکانی بەرەی(برانسك) و بەرەی خۆرئاوا کەوتنە ناو گەمارۆی دوژمنەوە، بەبیروڕای من هێزەکانمان دەیانتوانی لەو کارەساتە خۆیان ڕزگاربکردایە ئەگەر بیانتوانییایە بە شێوەیەکی باش شیکاری هەڵوێستەکەیان بکردایە و بیانزانییایە ئەو لێدانە چڕوپڕییە لە چ لایەکەوە دێت و هێزەکانیان کۆبکردایەتەوە و ئامادەیان بکردایە بۆ بەرەنگار بوونەوەی هێرشەکەیان.

لە کاتژمێری دوونیوی بەرەبەیانی ڕۆژی(٨ی تشرینی یەکەم)دا پەیوەندیم بەستالینەوە کرد و (ئەوکاتە ستالین بەخەبەربوو)، پێمراگەیاند:

ـ ئێستا ترس و خەتەری سەرەکی لە لاوازی بەرگریکەرانی ناوچەی(ماجایسك)دا دەبینم، لەبەر ئەوە پێویستە پشتگیری و یارمەتی ئەو ناوچەیە بکرێت، بە ناردنی هێز لە هەر شوێنێکەوەبێت، دەنا بە گەیشتنی دوژمن بۆ دەوروبەرو نزیکی مۆسکۆ کارێکی کتوپڕی و غەفڵەت گیری بۆ ئێمە نابێت. پاشان لەگەڵ ستالیندا لەسەر ئەوە پێکهاتین کە من بچم بۆ بارەگای سەرکردایەتی(بودیونی) و لەوێوە پەیوەندی پێوەبکەم.

لە بەیانی ڕۆژی(٨ی تشرینی یەکەم)دا گەیشتینە(ئۆنینینسکۆیا) (١٠٥ کیلۆمەتر لە مۆسکۆوە دوورە)، سەربازێکی بێتەلمان بینی وایەرێکی بەسەر ڕووباری(بروتفا)دا ڕادەکێشا، لێم پرسی..

ـ هاوڕێ ئەو وایەرە بۆکوێ ڕادەکێشێت..؟

سەربازەکە باڵای بەرزبوو، بێ ئەوەی ئاوڕم لێ بداتەوە، بەبێ گوێدانێکەوە، وەڵامیدامەوە.

ـ بۆ ئەو شوێنەی ڕادەکێشم کە فەرمانیان پێداوم.. ناچار خۆمم پێناساند و پێم وت، بەدوای بارەگای سەرکردایەتی(بودیونی)دا دەگەڕێم.

ئینجا خۆی ڕاست کردەوە، وتی..

ـ داوای لێبوردن دەکەم هاوڕێ فەریقی یەکەم، من لەمەوپێش نەمناسیت کە تۆ کێیت، لەبەرئەوە بەو شێوەیە وەڵامم دایتەوە، پاشان شوێنی بارەگای پیشانداین، چاوم کەوت بە سەرۆك ئەرکان جەنەراڵ(مەخلیس) پێی وتم، سەرۆك نازانرێت لە کوێیە.. ونە لەوە دەترسا مارشاڵ(بودیونی) کارێکی خراپی بەسەرهاتبێت، بەتایبەت مارشاڵ ئەمڕۆ لەناو هێزەکانی لەشکری چلوسێ دابوو ـ لەوەوە تێگەیشتم سەرۆك ئەرکان هەوڵی

کۆکردنەوەی یەکە سەربازییە پەرەوازەکان دەدات بۆ ئەوەی سەر لە نوێ بیانهێنێتەوە و پێکهاتەکانیان پڕچەك بکاتەوە.

دەربارەی دواگۆڕانکاری زانیارییەکی زۆرباشم دەستنەکەوت، لەبەرئەوە بڕیارمدا خۆم گەڕانێکی مەیدانی بەسەرکردنەوەبکەم، کاتێك بەسەر رووباری(برۆتفا)دا ڕەتدەبووم ساڵەکانی منداڵی خۆم بیردەکەوتەوە، من خۆم ئەم شوێنانە باش شارەزابووم چونکە لە هەرەتی لاوێتیما، بەپانی و درێژی هەموولایەکیدا گەڕابووم، لە دووری(١٠) کیلۆمەترەوە لە بارەگای سەرکردایەتی بەرەی یەدەکیدا گوندەکەی خۆمان(ستریلکۆفا)ی لێ بوو، لەو گوندەدا هێشتا دایکم و خوشکەکەم و هەرچوار کورەکەی لەوێدابوون، ئەبێ ئێستا ئەوان چۆن بن..؟!!

چی دەبێت بچم سەردانێکیان بکەم..؟..

نا .. نەخێر.. ناتوانم.. کاتی ئەوەم نییە سەردانیان بکەم.. ئەی ئەگەر گوندەکە بکەوێتە ژێر دەستی داگیرکردنی فاشییەکانەوە ئەبێ ئەوان چییان بەسەربێت...؟!!

ئەی ئەگەر ئەو فاشییانە بزانن ئەوانە دایك و خوشك و کەسوکاری فەریقی یەکەم زۆکۆفن چییان لێدەکەن..؟لەبەرئەوە پێویستە بە زووترین کات بیانبەم بۆ مۆسکۆ بۆ ماڵی خۆمان.

هەردووای دوو هەفتە لەوە هێزەکانی فاشیستەکان گوندی(ستریلکۆفا)یان داگیرکرد، بەڵام رۆڵەکانی گوندەکەم دەستەوەستان دانەنیشتن، بەڵکو هێزێکی پێشمەرگەییان پێکهینا.

زۆرجار هێرشی نەترس و دلێرانەیان دەکردە سەر ئەرکانی جەنگ و شوێن و مۆڵگای کاروباری بەڕێوەبردنی دوژمن. لەو هێرشانەدا جارێکیان بارەگای ئەرکانی جەنگی فەیلەقی هێزەکانی دوژمنیان وێران کرد.

کاتێك ئەڵمانییەکان ناچارکران بەکشانەوە لە دوا خۆیان ئاگریان بەردایە گوندەکان و هەموویان سووتاندو وێرانیان کردن، لەناو ئەو گوندانەشدا گوندی(ستریلکۆفا)شیان سووتاند و ماڵەکەی دایکیشم ئاگری تێبەربوو.

# گەڕان بەدوای بەرەدا

مارشاڵ زۆکۆف بیرەوەرییەکی کاریگەری دەگێڕێتەوە لە بەدوادا چوون و ئەو گەڕان و هیلاکییەی کە بەدوای ڕزگارکردنی بەرەیەکی تەواوی پەرەوازەدا دەگەڕێت، وەك سەرۆك ئەرکانێکی پێشووی ئەندامی سەرکردایەتی باڵاو سەرکردەی بەرەی لینینگراد. لەنزیك مۆسکۆوە بەدوای هێزێکی گەورەدا دەگەڕێت کە دوژمن بەشەڕوپێکدادان پەرش و پەرەوازەی کردبوونەوە، بەڵام ئەو هێزە بە هۆی ئەو ڕۆحی لە خۆبوردنەیان و پێداگرتنەیان لەسەر بەردەوامی جەنگکردن بە نەمری مانەوە.

هەر ئەویش مارشاڵ(بودیونی) لە شارۆچکەیەکی چۆڵ و هۆڵدا دەدۆزێتەوە و مارشاڵ بودیونی نازانێت بارەگا نوێیەکەی لە کوێیە کە سەرکردایەتییەکەی ڕوویان تێکردووە، هەروەها تووشی هێزێکی بچووك دەبێت کە ژمارەیان لە چەند سەد کەسێك تێناپەڕێ، بەرەوڕووی فیرقەیەکی تەواودەبنەوەو لەگەڵیاندا شەڕدەکەن.

هەروەها لە دارستانێکدا گوێی لە دەنگی سەربازێك دەبێت و ئاگاداری دەکاتەوە کە نەڕوات، چونکە ئەڵمانەکان چەند کیلۆمەترێك لێوەی دوورن. پاشان بۆی دەردەکەوێت ئەو سەربازە چاودێری لیوایەکی تەواوی دەبابە دەکات و توانیویەتی بەرێکوپێکی پاشەکشە بکات و سەرکردەکەی شوێنێکی دەستنیشان کردووە بەرای ئەو لەو شوێنەدا جەنگ و پێکدادان ڕوودەدات. هەروەها ڕێگای شارۆچکەیەك دەبینی چۆڵوهۆڵەو لە دوو پۆلیس زیاتری تێدانییە، هەروەها هەواڵی فەیلەقێك دەبیستێت گەمارۆدراون و بەردەوام هێشتا بەرگری دەکەن و لەناو ئەو گەمارۆیەشەوە دژە هێرش دەکەنەسەر دوژمن و هیچ شتێك لەبیروهزری سەرکردەو سەربازەکاندا نییە، تەنها یەك شت نەبێت ئەویش شکاندنی ئەو گەمارۆیەیە

لەپێناو ڕزگارکردنی خۆیاندا نەك تەنها هەر ئەوەندە بەڵکو یەکگرتنەوە لەگەڵ هێزەکانی بەرەکەی خۆیاندا بۆ بەردەوام بوون لە شەڕوپێکدادانیدا.

وە چەند شەڕوپێکدادانێکی سنووردار دەبینێت کە چەند کەسێکی کەم دەیکەن و ئەو شەڕوپێکدادانە دەورێکی گەورە دەبینێت لە کاتێکدا دوژمنان بەرەو مۆسکۆی پایتەخت دەکشێن، هەروەها باسی ئەوە دەکات چۆن ناوبەناو لە ڕێگادا دەوەستێت بۆ ئەوەی بزانێت ئایا بەو ڕێگایەدا دەڕوات کە دوژمن داگیری کردووە یاخود ئەو ڕێگایە کە خۆراگرە و بەرامبەر دوژمن ڕاوەستاوەتەوە.

لە ترسی ئەوەی نەبادا بکەوێتە دەست دوژمنانەوە، هەروەها مارشاڵ ژۆکۆف تابلۆی مرۆڤایەتی خەمباری داپیرەیەك دەکێشێ کە ئەو داپیرەیە لە ماڵێکی وێرانەدا بەدوای شتێکدا دەگەڕێت.

پیرێژنەکە زۆر هیلاك و ماندووبوو، ژۆکۆف زۆر بەزەیی پێدا دێتەوەو رادەوەستێت لێیدەپرسێت چی دەکەیت لێرەدا بەدوای چیدا دەگەڕێیت..؟!!

پیرێژن دەڵێت شارەکە ڕۆیشتوون و منیان جێهێشتووە پیرێژنێکی تر دەبینێت ئەویش لەخانووە وێران و خاپوورەکاندا بەدوای شتێکدا دەگەڕێت.

ئەم پیرێژنە لەسەر بیرەکە ئاوی دەردەهێنا لەوکاتەدا فڕۆکەکانی دوژمن ناوماڵەکانی شارەکە بۆمبباران دەکەن و بەچاوی خۆی دەبینێت چۆن ماڵەکەی هەرەسی هێناو لەوکاتەشدا دوو کوڕەزاکەشی تێدابوون و پیرێژن کە ئەوە دەبینێت شێت دەبێت.

مارشاڵ بە خەمبارییەوە پیرێژن جێدەهێڵێت و هەر خەریکی گەڕانە بەدوای دوو منداڵەکەیدا.

پیرێژنی یەکەم: لەناو ئەو وێرانەو دارو پەردوانەدا بەدوای جلوبەرگ و خواردنێکدا دەگەڕێت سوودی لێببینێت، پاشان مارشاڵ دێتەوە سەرباس و گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی، دەربارەی جەنگ و دەڵێت...:

لە(کالۆجا)دا بووم لە سەرۆك ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگەوە پەیوەندییەکی تەلەفۆنم بۆ هات و لەو تەلەفۆنەوە پێم ڕاگەیەندرا کەبچم بۆ سەرۆکایەتی ئەرکانی بەرەی خۆرئاواو لە(١٠ی تشرینی یەکەم)دا چاوەڕوانی تەلەفۆنی ستالین بم، لە

کاتی دیاریکراودا ستالین به تەلەفۆن پەیوەندی پێوەکردم:

ـ سەرکردایەتی بڕیاریداوە بتکەن بەسەرکردەی بەرەی خۆرئاوا، ئایا هیچ بەر هەڵستکردنێکت لەوە هەیە..؟

ـ نەخێر، هیچ بەرهەڵستییەکم لەوە نییە، تەنها تکاو داوکاریم ئەوەیە هێزی یەدەکی زیاتر بنێرن، چونکە لەوەدەچێت بەم زوانە دوژمن لێدان و چالاکییەکانی چڕتر بکاتەوە بەرەو مۆسکۆ.

# بەرگری کردنی لە توانا بەدەر

مارشاڵ ژۆکۆف دەڵێت هەر زۆرزوو و بەخێرایی دەستم کرد بەرێکخستن و جێبەجێکردنی پێداویستییە زەرورییەکان، بۆپێکهێنانی هێڵێکی بەرگری بەهێزی بەیەکەوە چەسپاو و پشت ئەستوور بەهێزێکی بەهێز لە پشتمانەوە، بە دڵنیابوون بە چەکداربوون و ناردنی هەموو یارمەتییەك بۆمان.

لەوەش گرنگتر ڕێکخستنی حیزبی و سیاسی بوو بۆ بەرزکردنەوەی ڕۆحی مەعنەوی جەنگاوەرەکانمان بۆ زیاتر کردنی باوەرو هێزیان بۆ ئەوەی بە دڵنیاییەوە لە دەروازەکانی مۆسکۆدا ڕووبەرووی دوژمن ببێتەوەو بیانشکێنین.

"بەرەی جەنگی خۆرئاوا شەوو ڕۆژ لە کاروتێکۆشانی بەردەوامدابوون، ئەوکەسانەی لەوێدابوون ماندونەناسبوون و لە تاو هیلاکی و بێخەوییاندا دەکەوتن و لە هۆش خۆیان دەچوون، بەڵام هەریەکەیان خۆیان بەرپرسیاردەزانی لە پاشەڕۆژی مۆسکۆ و پاشەڕۆژی نیشتماندا.

هەوڵوماندووبوونێکی بێوێنەیان گێڕا بۆ پێکهێنانی هێڵێکی بەرگری بەهێزو بەتوانا بۆ ئەوەی دوژمن نەتوانێ بگاتە مۆسکۆ، لە شەوی(٧ ی تشرینی یەکەم)دا سەرکردایەتی باڵا هێزێکی گەورەی ناردە بەرەوە، ئەوهێزە چوار لەشکری لێپێکهێنرا، کە ژمارەی هەریەکەیان(٩٠) هەزار جەنگاوەربوو، بێگومان ئەو

هێزانە بەشی ئەوەی نەدەکرد هێڵێکی بەرگری توندوتۆڵ بەدرێژایی بەرەی جەنگ پێکبهێنێت، بەڵام سەرکردایەتی باڵا لەوەزیاتر نەیدەتوانی هێز رەوانە بکات، لەبەرچەند هۆیەکی تریش لە ئامادەکردنی هێزی زیاتر دواکەوت کە لە رۆژهەڵاتی ناوەراستەوە کۆیانکاتەوە و بیانێرێت، "مەبەست لە رۆژهەڵاتی ناوەراست ئەو ناوچە سنوری سۆڤیاتییانەیە کە هاوسنوری یابان و چینن.."

ئاوا بەو شێوەیە(بەناچاری) بەرەی خۆرئاوا سەرلەنوێ دروستبۆوە ئەوبەرەیەی مێژوو بەرپرسیاری و گرانییەکی قورسی خستبووە سەرشانی ئەویش بەرگریکردن بوو لە شاری مۆسکۆ، هەتا ئەو کاتە هێزە گەمارۆدراوەکانمان بەردەوام بوون لە شەرەپێکدادان بۆ ئەوەی هێزو توانای دوژمن کەم بکەنەوە لە داگیرکردنی مۆسکۆدا.

لە رۆژی(١٣ی تشرینی یەکەم)وە شەرەپێکدادانی قورس لە هەموولایەکی گرنگی ئەو بەرانەی بەرەو مۆسکۆ دەچوون دەستپێکرد هەر بەراستی ئەو رۆژانە رۆژێکی ناهەموار و ناخۆشبوون..!! لیژنەی مەرکەزی و لیژنەی بەرگری نیشتمانی بریارياندا بە گواستنەوەی ستافی دیبلۆماسی و هەندێك رێکخراوی ناوخۆی حکومی لە مۆسکۆوە بۆ(کوبشیف)، هەروەها بریارياندا بە گواستنەوەی شتە ناوازە و گرنگەکان کە گرنگی تایبەتییان هەبوو بۆ(کوبشیف).

رۆژ بە رۆژ هێرشە ئاسمانییەکانی دوژمن بۆ سەر مۆسکۆ روو لە زیادبووندابوو. شەوێك نەبوو هێرش نەکرێتە سەر مۆسکۆ، بەڵام حیزب لەو کاتەدا کاری زۆری کرد بۆ پشگیری کردن لەو هێزانەی بەرگرییان لە ئاسمانی شارەکە دەکرد. بەپێی ئەو رێنماییانەی حیزب، ملیۆنەها کەسانی مۆسکۆ مەشقیان پێکرا و رایان هێنان لەسەرچۆنێتی خۆپاراستن لە هێرشە ئاسمانییەکانی دوژمن، هەتا وای لێهاتبوو مۆسکۆییەکان لەو(گرمە و تەقینەوانە) سڵیان نەدەکردەوە.

لە(٢٠ی تشرینی یەکەم)وە لە مۆسکۆو دەوروبەریدا حاڵەتی نائاسایی و کتوپری راگەیەندرا. ئەو یەکانەی بەرگرییان لە مۆسکۆدەکرد یاساو رێنماییەکی زۆر توندوتیژیان پەیرەودەکرد، وکاری یەکلایی کەرەوەیان لە حاڵەتی سەرپێچیکردن لە یاسادا دەستەبەر دەکرد، هەروەها خەڵکانی مۆسکۆ ئەو رێگایەشیان بنبڕکرد

لەو خەڵکانەی ترس و تۆقینیان لەناو دڵودەروونی خەڵکاندا دروستدەکرد کە بەو ترس و تۆقینەیان ڕێگایان بۆ هاتنە ناوەوەی دوژمن خۆش دەکرد. هەر بەڕاستی پایتەخت بە قارەمانییەوە لە ڕووی ئەو ترس و تۆقینانەدا ڕاوەستاو و خۆڕاگری نواند.

ئەو بانگەوازانەی لیژنەی مەرکەزی دەریدەکرد و بڵاویدەکردنەوە دڵی دوژمنی شەق پێدەبرد و مانای تایبەتی خۆی بۆ هەموو گەلی سۆڤێتی و مۆسکۆییەکان و جەنگاوەران هەبوو.

ئەو بانگەوازانە کاردانەوەیەکی قووڵی لە دڵودەروونی خەڵکیدا هەبوو. وای لە مۆسکۆییەکان کردبوو، مۆسکۆی پایتەخت و ئەو شوێنانەی بەسەر مۆسکۆدا دەیانڕوانی بکەنە قەڵایەکی پۆڵاینی قایم کە هەرگیز نەتوانرێت داگیربکرێت و بۆ هەموو ئەگەرییەك ئەو میللەتەی لە مۆسکۆدابوون سەدەها پەلی چەکداری و پێشمەرگەی بەرگری و کۆمەڵێکی زۆری بەرگریکردنی خۆکوژی دژی دەبابەیان پێکهێنا.

لەگەڵ ئەوەشدا(١٠٠) هەزار هاووڵاتی مۆسکۆیی لەسەر بەکارهێنان و فێربوونی چەك بەکارهێنان بەردەوام مەشق و ڕاهێنانیان پێدەکرا، ئەو کارە جۆراوجۆرانەی شوعییەکان لە مۆسکۆ و دەوروبەریدا دەیانکرد، بۆ ئەوەی هێزی میللەت یەکخەن بۆ بەرگریکردن لە مۆسکۆ دژی دوژمنی شەڕخواز هاوشان بوو لەگەڵ ئەو داستانە پڕ قارەمانییەی کرا.

بەپیرەوەچوون وە دەستپێشخەری ڕۆڵەکانی مۆسکۆ، لە مانگەکانی یەکەمی جەنگدا، ڕۆڵە خۆبەخشەکان پێنج فیرقەی بەرگری میللییان پێکهێنا بۆ بەرگری و هێرش کردن. سەربازە خۆبەخشەکان کەسانێك بوون لە هەموو چین و توێژو کارویپیشەکان و لە تەمەنی هەمەجۆردابوون، تەنها شتێکی هاوبەش پێکەوە کۆی کردبوونەوە ئەویش ئەو بڕواو خۆڕاگرییە بێوێنەیەبوو بە سەرکەوتن.

ئایا ئەوە تەنها ڕێکەوت بوو کە زۆرینەی هێزەکانی بەرگری چوونە ناوهێزە سەربازییە چەکدارەکانەوە؟"پاش ئەوەی بەباشی مەشقیان پێکرا" هەر ئەوانەش بوون بە باشترین و چاکترین جەنگاوەر لە پێکهاتە سەربازییەکاندا،

وە لە بەپیرەوەچوونی ئەو بانگەوازەی لیژنەی مەرکەزی کردی هەزارەها شوعیی کمسمۆل، لە مۆسکۆ و شارەکانی تردا هاتنە ڕیزی سەربازییەوە خۆبەخشی خۆیان ڕاگەیاند وەك ڕابەرێکی سیاسیی بەرەو بەرە، بڕۆن و پەیوەندییان پێوەبکەن. لە هەمانکاتیشدا لە شەڕیشدا ڕۆحی مەعنەوییان بە هەموو هێزو مانایەکەوە بەرزکردەوە.

---

## ئەی هاوڕێیان

لە ڕۆژە ڕەش و ناخۆشەکانی تشرینی یەکەمدا ئەنجومەنی سەربازی بەرەی خۆرئاوا بانگەوازێکی بۆ هێزە سەربازییەکان دەرکرد لەو بانگەوازەدا وترا..

"ئەی هاوڕێیان..: ژیانی هەرهەموومان مۆڵکی نیشتمانە لەم کات و ساتەدا کە دەوڵەتەکەمان تووشی خەتەری و ترسێکی بێوێنە بۆتەوە، نیشتمانمان داوا لە یەکەیەکەی ئێمە دەکات کە ئەوپەڕی خۆڕاگری و پیاوەتی و قارەمانی لە پێناویدا بەکاربهێنین، خاك و نیشتمانمان بانگەوازمان دەکات، بەربەستێکی توندو تۆڵ لە ڕێی شەپۆلی هێزەکانی فاشیستەکاندا دروست بکەین کە دەیانەوێت بەرەو مۆسکۆی خۆشەویست بکشێن... کات و زەمان"کە لەمەوپێش ڕووداوی وای بەخۆوە نەدیوە"داوامان لێدەکات و بەسەرماندا فەرزی دەکات کە وریاو ئاگاداربین و خۆڕاگرێکی پۆلایین بین و خۆمان یەکخەین و کاری یەکلایی کەرەوە بکەین و خۆڕاگر و جەخت لەسەر سەرکەوتن بکەینەوە و ئامادەی گیان فیدایی و لە خۆبوردن و قوربانیدانی گیانی خۆمان بین لە پێناو سەرکەوتندا" سەرکەوتن و ڕووداوی یەکلایی کەرەوە نزیك بۆتەوە.. لەبەرئەوەی هێڵی بەرگری"موجایسك، مالاویا و سلافیتس و سیریوخۆف" بەهێزێکی ئەوتۆی گەورەو بەهێز پشگیری

لێنەدەکرا، و دوژمنیش دەستی گرتبوو بەسەر هەندێ شوێن و جێگایدا و لە ترسی ئەوەی دوژمن لەو ڕێگایەوە بەرەو مۆسکۆ تێنەپەڕێت سەرکردایەتی بەرە بڕیاریدا بچنە هێڵی بەرگریکردنێکی ترەوە، لەبەرئەوەی ئەو هێڵەی تر ماوەکەی زۆردرێژتربوو، بەگران دەتوانرا لە کاتی جەنگدا دەست بەسەر ئەو هەموو هێزانەدا بگیرێت، سەرکردایەتی باڵا ڕازی بوونی خۆی لەسەر ئەو پێشنیارەی بەرەی خۆرئاوا دەربڕی بەچوونە پاڵی لەشکرەکانی.(بیست و دوو و بیست و نۆ و سی و سی و یەك) بۆ پاڵ بەرەی(کالیفین) کەسەر لە نوێ پێکدەهاتەوە لە ژێر سەرکردایەتی جەنەراڵ(کونیوف)دا.

بارودۆخی بەرەی(برانسك) هێشتا هەر خراپ و بەرەو خراپتر دەڕۆیشت، چونکە زۆربەی هێزەکانی ئەو بەرەیە لە ژێر فشاری گەمارۆدابوون.

پاش شەڕوپێکدادانێکی قارەمانانە ئەو هێزانە توانییان لەو گەمارۆیەی بەدەوریاندا لێدرابوو خۆیان قوتاربکەن، بەڵام سەربازە پێشڕەوەکانی لەشکرەکەی(جودریان) کەوتنە ڕاوەدوونانی هێزەکانی بەرەی(برانسك) و هەتا گەیشتنە دەوروبەری شاری(تۆلا) ڕاویاننان..

"تۆلا..: مـــاوەی(٢٥٠) کیلۆمەتر لە مۆسکۆوە دوورە، لە دەوروبەری ئەو شارەدا نوسەری گەورەی ڕووسیا(لیف تۆلستۆی) ژیاوە."، بە درێژایی مانگی(تشرینی دووەمی ساڵی١٩٤١) دوژمن هەوڵێکی لە توانابەدەری نا بۆ داگیرکردنی شاری تۆلا بۆ ئەوەی لە باشورەوە ڕێ ببڕێت و بەرەو مۆسکۆ بڕوات، بەڵام هەر هەموو هەوڵەکانی شکستی هێنا، تۆلا وەك قەڵایەکی بەرزی پۆڵایین لە ڕووی دوژمندا خۆی ڕاگرت. بەوە تۆلا توانی دەست و پێی باڵی ڕاستی هێزەکانی ئەڵمانی ببەستێتەوە و دوژمنی ناچارکرد لەوە زیاتر جەختێ لەوە نەکاتەوە کە شارەکە داگیر بکات، ناچار لەپشتی شارەکەوە لەشکر کێشی کردوو بەرەو پێشەوە هەنگاوینا، لەبەرئەوە دوژمن بەناچاری هێزەکانی بڵاوە پێکرد و بەمەش زۆروچڕوپڕی لەشکرەکەی(جۆدریان) کەمبۆوە.

کە ئەو لەشکرە بەو زۆری و چڕوپڕییە لەو چالاکییانەدا بەناوبانگبوو، شاری تۆلاو دانیشتوانەکەی سەروەری و دەستێکی باڵایان هەبوو لە تێکشکانی هێزەکانی

دوژمندا بۆ دەوروبەری مۆسکۆ.

---

## قارەمانێتی لە پێناو نیشتماندا

مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت"پێویست ناکات بەدوورودرێژی باسی هەموو چالاکییەکان بکرێت، ئەو کارانە لە پەرتووکە مێژووییەکانی یەکێتی سۆڤێتیدا زۆر باسیان لێوەکراوە، تەنها ئەوەندە بەسە ئاماژە بۆ ئەوەبکرێت کە هێزەکانی فاشییەکان بەدرێژایی چالاکییەکانی تشرینی یەکەم توانییان لە دەروازە و رێگای بەرەو مۆسکۆ ماوەی(٢٣٠-٢٥٠) کیلۆمەتر ببڕن.

ئەو پلانەی هیتلەر بۆ داگیرکردنی مۆسکۆ دایڕشتبوو پێش نیوەی مانگی تشرینی یەکەم تووشی نوشستی هات و سەرکەوتوو نەبوو، کاتێك دوژمن گەیشتە نزیك مۆسکۆ هیلاکوماندوو، هێزێکی هەڵوەشاو و پەرتوبڵاوبوون، هەروەها زۆکۆف دەڵێت ناوهێنانی ئەو قارەمانەی لە شەڕوپێکدادانەکانی (تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٤١)دا لەبەرگریکردنیاندا لە مۆسکۆ پایتەختدا دەرکەوتن کارێکی گونجاو نییە، چونکە ئەو قارەمانییە تەنها بۆ چەند کەسێك ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئەو قارەمانییانە لە هێزو توانای کۆمەڵانێکی تەواودابووە کە بەو قارەمانیانەیان گەورەیی و سەروەری جەنگاوەرییان لە پێناو نیشتماندا نواند.

ئەو جۆرە جەنگاوەر و پێکهاتانە لە هەموو شوێن و جێگایەکدابوون، لەرێڕەوی(موجایسك)دا فیرقەی پیادەی سی و دوو بە سەرکردایەتی عەمید(بولوسوخین) بەرەنگاری فەیلەقی میکانیکی چلەمینی دوژمن بوونەوە.

"لە زنجیرەکانی پێشوودا روونکرایەوە کە فەیلەقێك لە چەند فیرقەیەك یان بەلایەنی کەمەوە لە دوو فیرقە پێکدەهێنرابێت پاش نزیکەی سەدوسی ساڵ تێپەڕبوون بەسەر هێرشەکەی ناپلیۆندا بۆسەر رووسیا، ئەو شەڕو بەرەنگاربوونەوەیە بوو بە نسیبی ئەو فیرقەیە کە لەسەرخاك و زەوی(بۆرۆدینۆ)دا چەك لە رووی

دوژمندا بەرزکاتەوە و لەگەڵیاندا بکەوێتە شەڕەوە، لەسەر هەمان زەوی و خاکدا کە لە ماوەیەکی زۆر کۆنەوە، بووە بە خاکێکی پیرۆزی نەتەوایەتیمان، هەروەك پەیکەرێکی یادگار و سەروەریی سەربازی ڕووسی جەنگاوەرانی فیرقەی سی و دوو قارەمانانە بێزارنەبوون لەو سەروەرییە، بەڵکو زیاتر پابەندبوون پێیەوە و بەرزتریان کردەوە"خاکی بۆرۆدینۆ، ئەو پانتاییە کە لەشکرەکانی ناپلیۆن و کوتوزف لەسەر خاکەکەیدا کەوتنە جەنگ و پێکدادانەوە بووە یەکەم تێکشکاندنی لەشکرەکەی ناپلیۆن و دوای ئەوە بەردەوام تێکشکان هەتا ئەو هێزەشی ما لە ڕووباری(بریوزیفا)دا نوقوم بوون و خنکان".

لەسەرەتای مانگی(تشرینی دووەمی ساڵی١٩٤١)دا بانگەوازکرام بۆ سەرکردایەتی باڵا، ستالین پێی وتم"بەهۆی بیرەوەری شۆڕشی تشرینی یەکەمەوە ئێمە دەمانەوێت نمایشێکی سەربازی لە مۆسکۆدا سازبکەین لەگەڵ کۆبوونەوەیەکی سیاسیدا.

ڕای تۆ چۆنە.. ئایا بارودۆخی بەرە گونجاوە و ڕێمان پێ دەدات ئەو ئاهەنگ و نمایشە بکەین..؟"

وەڵامم دایەوە "بەم نزیکاتە دوژمن توانای هێرشێکی گەورەو بەربڵاوی نییە، چونکە دوژمن لەشەڕوپێکدانەکانی پێشوویدا زەرەرو زیانێکی گەورەی لێکەوتووە، ئێستا ناچارە و خەریکە پێکهاتەکانی هێزەکانی تەواو بکاتەوە.

بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی ئاسمانی دوژمن کە بێگومان بەم زوانە چالاکییەکانی دەست پێدەکاتەوە، پێشنیاردەکەم هێزی بەرگری ئاسمانیمان بەهێزتر بکەین، ئەویش بە بانگکردنەوەی هێزە ئاسمانییە شەڕکەرەکانمان کە نزیکن لە مۆسکۆوە"، ئاشکرایە کە کۆبوونەوە سیاسییەکان پێش ئەو جەژنی بیرەوەرییە لە ژێرزەمینی وێستگەی مترۆی(مایاکوفسکی)دا دەکرا، "ئەو شوێنە تونێلێك بوو لە ژێرزەویدابوو، سەدەها مەتر درێژ ببۆوە، ژمارەیەکی زۆری لە بانگەوازانی تیادا جێگادەبۆوە، زۆر زیاتری دەگرت لە هۆڵی ئاهەنگەکانی ناو کرملین، ڕەنگە ئەو جێگایە بۆیە هەڵبژێررابوو، وەك کارێکی ئەمنی لە بارودۆخی جەنگدا بەتایبەتیش کە بانگهێشت کراوانیش هەموو لە گەورە پیاوانی حیزب

و دەوڵەت و سەربازی بوون.."، نمایشە سەربازییەکە لە ڕۆژی(٧ی تشرینی دووەم)دا لە گۆڕەپانی سووردا نمایشکرا، ئەم کارە کاردانەوەو کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو بۆ سەر دڵودەروون و بەرزکردنەوەی ڕۆحی مەعنەوی سوپا و میللەت.

ستالین لە وتارەکەیدا سەرلەنوێ بروای حیزب و حکومەتی دووپات کردەوە و جەختی لەسەر سەرکەوتن بەسەر دوژمندا دووپات کردەوە، ڕۆژێکیان سەرکردەی باڵا تەلەفۆنێکی ناخۆشی بۆ کردم، ستالین لە تەلەفۆنەکەیدا پێی وتم:

ـ من و سەرۆکی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ دەمانەوێت بۆ بنبڕکردن و دوورکەوتنەوە لە تۆپ باران و لێدانەکانی دوژمن، وا بەپێویست دەزانین کە چالاکی ئاگادارکردنەوە دژی ئەو چالاکییانەی ئەوان بکەن و ئاراستەی لێدان و چالاکییەکانیشتان دەست نیشان بکەن.

ژەنەراڵ زۆکۆف وەڵامیدایەوە، وتی:

ـ بە چ هێزێك ئێمە دەتوانین بەرەنگاری ئەو لێدان و چالاکییانەی دوژمن بکەینەوە، بەرەی خۆرئاوا دەست بەتاڵین، ئێمە ئەوەندە هێزمان هەیە تەنها بەشی بەرگریکردن دەکات.

ستالین ئەو شوێنانەی ئاماژەپێدا کە دەتوانرێت هەندێ لە هێزەکانیان لێ بکشێننەوە.

ـ زۆکۆف وەڵامیدایەوە: ئێستا کاتی ئەوەمان نییە ئەوکارەبکەین ئێمە ناتوانین دوا سەربازی یەدەکی بنێرین بۆ ئەو لێدان و چالاکییانە، لە کاتێکیشدا ئەگەری سەرکەوتن جێگای گومانە.

ئێمە ئەوەندەمان هێزنییە کە پاڵپشتی بەرگریمانی پێ بکەین، لە کاتێکدا دوژمن بە هێزەکانیانەوە هێرشی درِاندانە بکات.

ستالین وتی"لەبەرەکەی تۆدا شەش لەشکری لێیە، ئایا ئەوەکەمە..؟!!

زۆکۆف وتی"هێڵی بەرگری بەرەی خۆرئاوا زۆر درێژبۆتەوە، لەگەڵ ئەو پێچو پەنایانەدا دەگاتە زیاتر لە(٦٠٠) کیلۆمەتر ئێمە لە قولاییدا هێزی یەدەکی زۆرکەممان هەیە، بە تایبەت لە ناوەڕاستی بەرەدا".

ـ ستالین، کێشەی لێدان وچالاکی دژایەتی وا کۆتایی پێهات، ئەمشەو پلانەکەم پێڕا بگەیەنە.

بەوشێوەیە ستالین گفتوگۆکەی بە تووڕەییەوە کۆتایی پێهێنا!!

---

## هەڕەشەی ستالین

دوای(١٥) خولەك(بولفانین) هات بۆلام و لەناو دەرگاکەوە، وتی:

ـ بێمێشك چییە ئێستا بۆوات لێبەسەرهاتووە..؟!!

ـ مەبەستت چییە..؟

ـ ستالین پێی وتم، تۆ و زۆکۆف لە خۆتان بایی بوون، دەبینن لە دوایدا چ سزایەکتان دەدەم، و داوایلێکردم هەر ئێستا بێم بۆ لات و پێکەوە چالاکی و دژەلێدان ڕێکبخەین بۆ بەردەوامی ڕۆیشتن بەرەو مۆسکۆ، سەرکردایەتی ئەڵمانی هێزی پشگیری زیاتری ئامادەکرد.

هەتا ئەو لێشاوەی ئەڵمانییەکان کۆیانکردبۆوە لە(١٥ی تشرینی دووەمی ساڵی١٩٤١)دا گەیشتە(٥١) فیرقە لەبەرەی خۆرئاوادا، و(١٣) فیرقە لەبەرەی کلین، فولکۆلامسك و (٩) فیرقە بۆ بەرەورووی تولا-کشیر، و(٤) فەیلەق بەرەو ئاراستەی باشور.

وە لە (١٥ی تشرینی دووەم)دا هەنگاوی هەڵمەتی دووەم هێرشیان بەرەو مۆسکۆ دەست پێکرد، شەڕوکوشتاری توندوتیژ و بێوچان تا(١٨)ی تشرینی دووەم بەگەرمی بەردەوام بوو...

بەتەواوی نازانم لە چ ڕۆژێکدابوو ئەو شەڕوکوشتارە بەماوەیەکی کەم ستالین بەتەلەفۆن پەیوەندی پێوەکردم و لێی پرسیم:

ـ ئایا تۆ دڵنیایت لە هێزو توانای ئێمە کە بتوانین پارێزگاری لە مۆسکۆ بکەین و نەهێڵین داگیربکرێت..؟

من لێت دەپرسم و جەرگم ژان دەكـات، وەك شوعییەك بەشەرفانەوە قسەبكە.

ـ بێگومان جەختم لەسەرئەوەیە كە ئێمە مۆسكۆ دەپارێزین و لەدەستی نادەین، بەڵام پێویستمان بە دوو لەشكرو بەلایەنی كەمەوە بە دووسەد دەبابە هەیە، سەرلەنوێ شەڕوپێكدادان لە هەموو بەرەكاندا بەگەرمی دەستی پێكرد و بەرەی بەرگری هەتا دەهات، دەهاتەوە یەك و كۆمەڵ دەبوون. ئەمەش وایكرد شوێنی لاوازیان تیا دەركەوێت و خەریكبوو كارەسات ڕوویدات، بەڵام ئەو كارەساتە ڕووی نەدا جەنگاوەران خۆیان ڕاگرت و پشتیان بە هێزو یاریدەدەرەكان بەست و هێڵێكی بەرگری بەهێزیان پێكهێنا كە لە شكاندن نەدەهات.

بارودۆخی بەرە زۆر ئاڵۆزبوو، ببووە جێگای گەورەترین دڵەڕاوكێ و هەڵچوون و دڵەخورپە و ناخۆشی، مارشاڵ ژۆكۆف بەسەرهاتێكی زۆر سەیروسەمەرە دەگێڕێتەوە دەڵێت ستالین بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوەكردم، وتی"پێم ڕاگەیەنراوە شاری(دیدوفسك) ئەڵمانییەكان داگیریان كردووە و لە ژێر دەستیاندایە(ئەم شارە لەدەوروبەری مۆسكۆدایە)"، كاتێك ژۆكۆف وەڵامی دەداتەوە كە بەوەی نەزانیوە، ستالین سەرزەنشتی دەكات، بەوەی ئاگای لە بارودۆخی بەرەكەی نییە. پاشان فەرمانی پێدەكات هەرئێستا گورج بچۆ بۆ ئەوەی هەڵمەتێكی دژە هێرش سازبكە و شاری(دیدوفسك) یان لێبسێنەوە، ژۆكۆفیش دڵنیای دەكاتەوە، ئەوخەبەرەی داویانێتێ هەڵەیە، ئەوەی كەوتۆتە ژێردەستی ئەوانەوە شاری(دیدوفسك) نییە، بەڵكو گوندی(دیدوفا)یە.

كاتێك ژۆكۆف ئەوڕاستییە بە ستالین دەڵێت، ستالینیش لەوكاتەدا لەوپەڕی تووڕەیی و دڵگرانیدا دەبێت، بە تووڕەییەوە، دەڵێت"مادام كاروایە هەر ئێستا دەبێت خۆت و جەنەراڵ(ڕۆكۆسوفسكی) پێكەوە بچن بۆ ئەوەی بەهێزی سەربازی ئەو گوندە نەفرەتییە ڕزگاربكەنەوە".

نەشدەتوانرا ستالین قەناعەت پێبكەیت لەو داوایە پاشگەزبێتەوە، ژۆكۆف دەگێڕێتەوە دەڵێت"كاتێك بە(ڕۆكۆفسكی)یم وت، ئەو و سەركردەی ناوچەكە سەیریان پێهات".

ئەو دێیەش لەوانەوە نزیکبوو، ماڵەکانی لە پەنجەی دەست تێنەدەپەڕین، دێیەکەش بەهێزی(پەلێك) لە دوژمن سێنرایەوە لە یەکی کانوونی یەکەمدا ئەڵمانەکان هێرشیان کردەوە سەرهەردوو لەشکری پێنجەم و بیست و سێ و هێرشەکەیان بەسەرنەکەوتن کۆتایی پێهات، هەر لە سەرەتای یەکەم ڕۆژەوە زۆربەئاشکرا دیاربوو دوژمن بەهەموو هێزو تواناو ئامێرەکانیانەوە توانای بەردەوامی هێرشکردنیان نەمابوو. لەو لێکۆڵینەوانەی لەگەڵ دەست بەسەرگیراوەکاندا دەمانکرد بۆمان دەرکەوت هێزەکانی ئەڵمانیا لەو باوەڕەدانین بتوانن مۆسکۆ داگیربکەن.

بەرەی خۆرئاواش لەلای خۆیەوە زەرەرو زیانێکی بێشوماری لێکەوت و هێزو توانایان نەما و هیلاك بوون، لەگەڵ ئەوەشدا پشتیان نەکردە دوژمن و نەیانهێشت لە هیچ لایەکەوە دوژمن بە بەرەکەیاندا تێپەڕێت، ئەوانەی بەرگرییان لە مۆسکۆدەکرد هێزو توانای خۆیان دەیەهاجار زیادکرد و زیاتر بەو پشتگیری و هاوکارییەی هێزە یەدەکییەکان و بەوبانگەوازانەی حیزب پشت ئەستوور و بەهێزتربوون.

لە قۆناغی دووەمی هەوڵەکانی ئەڵمانەکان بۆ داگیرکردنی مۆسکۆ ئەڵمانەکان زیاد لە(١٥٥) هەزار کوشتن و بریندار و بڕی(٨٠٠) دەبابە و نزیکەی(٣٠٠) تۆپی مەیدانی و نزیکەی(١٥٠٠) فڕۆکەیان لەدەستدا. ئەو زەرەرو زیانە زۆرە و بەدەست نەهێنانی مەبەست و ئامانجی ستراتیژی وای لە دوژمن کرد، تۆوی شکوگومانی لە دڵودەروونی جەماوەری هێزە چەکدارەکاندا ڕواندو کەوتنە گومانەوە و بڕوایان بەسەرکەوتنی یەکجارەکی جەنگ نەما.

سەرکردایەتی سیاسی سەربازی فاشیستەکان لە پێش چاو ڕای گشتی جیهانیدا وەك هێزێك کە(هەرگیز نەشکێت) ئەو سەرنج و تێڕوانینەیان نەما.

جەنەڕاڵ و مارشاڵەکانی هیتلەرییەکانی پێشوو، لێپرسیارێتی پووچەڵ بوونەوەو سەرنەکەوتنی پلانی داگیرکردنی مۆسکۆ دەخەنە سەرشانی هیتلەر، ئەویش بەوەی کە گوێی لێنەگرتن کە هێزەکانی لەشکری(ناوەڕاست) کە بڕیاربوو لە مانگی ئابدا دەست پێبکەن بۆ ئەو هێرشە سەرکەوتوەیان بەکاریان بهێنن

هیتلەر بڕیاریدا ئەو لەشکرە ڕاگرێت و ژمارەیەکی زۆری هێزەکانیانی ڕەوانەی ئۆکرانیا کرد.

ف. ملنتین، دەڵێت:"چالاکی لێدانی مۆسکۆ کە جەنەراڵ جودریان لەلایەنگرانی بوو سەرکەوتوو دەبوو ئەگەر لە مانگی ئابدا بە مووەقەت وازمان لێنەهێنایە بۆ ئەوەی یەکەمجار ئۆکرانیا داگیربکەین، خۆ ئەگەر بهاتایە ئەو چالاکییانە وەك لێدانێکی سەرەکی جەرگبڕ بەردەوام لە ڕووسیا بدرایە کە پاشەڕۆژی جەنگی لەسەر بەندبوو، ئەو کاتەش ڕووسیا بەولێدانە کوشندەیە تووشی هەرەس و دارمان دەبوو.

جەنەراڵ جودریان و جوت و ئەوانی تریش، هۆی سەرەکی تێکشکاندنیان لە دەوروبەری مۆسکۆدا دەگەڕێننەوە بۆ ساردی و خراپی کەش و هەوای ڕووسیا، لەگەڵ ئەو هەڵانەی هیتلەر کردی.

## باری کەش و هەوا

بێشك بارودۆخی کەش و هەوا لە هەموو کاروچالاکییەکی جەنگییدا دەوری تایبەتی خۆیان هەیە، بەڵام ئەو بارودۆخە بە هەمان شێوە کاردەکاتە سەر هەردوولای شەڕکەر، بەڵێ نیشتمانمان لەسەر ئەوە ڕاهاتووە کە ڕۆڵەکانی خۆی بە جلوبەرگی تایبەت بە زستان گەرم و گوڕ بکاتەوە، بەڵام ئەڵمانییەکان پەنایان دەبردە بەر ئەوەی ئەو جلوبەرگانەی دەستیان بکەوتایە بە زۆر لە خەڵکەکانیان دەسەند و رووتیان دەکردنەوە، بەڵام لە کۆتاییدا کێشە، کێشەی کەش و هەوا نەبوو، بەڵکو سەرکردایەتی ئەڵمانەکان سەربازەکانیان بۆ گەشتێکی خێرایی چەند هەفتەیی یا چەند مانگی ڕەوانەی ڕووسیا کردبوو، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەی خەملاندنی سیاسی و ستراتیژی بوو کە سەرکردە فاشیەکانی تێکەوت.

نا.. نەخێر.. بەفروباران نەبوو کە هێزەکانی فاشیەکانی لە دەوروبەری مۆسکۆدا ڕاگرت. ئەو ملیۆن سەربازە ئەڵمانییانەی لەسەر تاوێری ڕەقی بەرگری و پیاوەتی

و قارەمانی هێزەکانی سۆڤیاتیدا لە ناوچوون، دەرەنجامی ئەو قارەمانیی و پاڵەوانێتییەی هێزەکانی سۆڤێتی بوون کە گەل و نیشتمان و پایتەختەکە پشگیری و یارمەتیدەریان بوو، دەربارەی ئەوەی یەکەمجار ئۆکرانیا داگیربکەن، ئەگەر ئەوە نەبوایە بارودۆخی هێزەکانی لەشکری(ناوەڕاست)ی نازییەکان زۆرلەوە خراپتردەبوو کەبەسەریانداهات، وە بەسیفەتی ئەوەی من سەرکردەیەکی پێشووی بەرەی خۆرئاوابووم، من دەمەوێت هاوکاریی وەلامدانەوەی ئەو پرسیارە بکەم کە زۆرجار دێتەکایەوە، ئەویش ئەوەیە...:

چۆن هێزەکانی سۆڤیاتی توانییان ئەو لەشکرە گەورەو زۆرەی هێزەکانی ئەڵمانییە فاشییەکان لەدەوروبەری شاری مۆسکۆدا تێکبشکێنن و لەو بارودۆخی زستانە ساردەدا ناچاریان بکەن هێزەکانیان بەرەو خۆرئاوا پاشەکشە پێ بکەن؟ سەرکردایەتی بالای هیتلەرییەکان کاتێك پلانیان دانا بۆ ئەو کاروچالاکییە ستراتیژیە ئاڵۆزەی کە گرنگییەکی یەکجار زۆری هەبوو. چالاکی داگیرکردنی مۆسکۆ کە پێیان دەووت چالاکی(تیفون) و کەوتبوونە ناوچەواشەی ئەوەی هێزەکانی لەشکری سوور مەترسی ئەوەی نییەو هێزەکانی خۆیان مەترسیدارە، هەروەها لەم هەلانەی سەرکردایەتی هیتلەرییەکان کردیان ئەوەبوو هێزی پیادەی تەواویان کۆ و ئامادەنەکردبۆوە و پاشان دەرکەوت لەم چالاکییەدا کە پشتیان بەزرێپۆشەکانیان بەستبوو، ڕاست نەبوو، چونکە ئەو زرێپۆشانەی ئەوان پشتیان پێبەستبوو زەرەروزیانێکی یەکجار زۆریان پێ کەوت و توانای تێپەڕبوون(ڕەتبوون)یان نەما، هەروەها لەو هەلانەی کردیان تەنها لێدان و چالاکییەکانیان هەر لەسەر هەردوو باڵی بەرەکەبوو بێ ئەوەی هێرشی توندوچڕوپڕبکەنە سەر بەرەی ناوەڕاست و لەبارەی توانی مادیشەوە دەیانتوانی ئەو کارەش بکەن.

ئێمەش سوودمان لەو هەلومەرجە وەرگـرت، ئەویش بەوەی لەناوچە پشتگوێ خراوەکەوە(ناوەڕاست) هێزێکی زۆرمان کشانەوەو بەو هێزانە هاوکاری هەردووباڵەکانی خۆمانمان پێکرد، لە ڕۆژەکانی یەکەمی کانوونی یەکەمدا هێزەکانی ئەڵمانیا لێدانی توندو بەهێزیان لەلایەن تیپەکانی پێشمەرگەکانمانەوە لێدرا، کە زۆر بە توندوتیژییەوە هێرشیان دەکردە سەر هێڵەکانی گواستنەوە و

یارمەتی ناردنی دوژمن، ئەو هێڵانەش زیاد لە هەزار کیلۆمەتر دەبوون.
بەم چالاکییە قارەمانییەیانەی پێشمەرگەکانمان توانییان ترس و دڵەراوکێ و سەرلێشێوان بخەنە ناو ئەو یارمەتی و هاوکارییانەی بۆ هێزە شەرکەرەکانیان دەنارد.

هەروەها ئەو شەڕوکوشتار و خۆراگری و توندوتیژانەی هێزەکانی سۆڤێتی دەیان کردە سەر هێزەکانی ئەڵمانی بەدرێژایی ئەو ڕێگایەی دوژمن تادەگەیشتە مۆسکۆ داگیری کردبوو . وورەی سەربازەکانی ئەڵمانیای لاواز و ڕووخاو کردبوو. وایلێکردن شك و گومان بەتوانای سەرکەوتنیان پەیدابکەن، هەروەها جەنگاوەرانمان لەگەڵ ئەو هەموو زەرەر و زیانانەی پێیان کەوت، کۆمەك و یارمەتییان لە نیشتمانەوە پێدەگەیشت هەتا کۆتایی جەنگ بۆ بەرگریکردن لە مۆسکۆ بەو وورە بەرزەو بڕوا بەخۆکردنە لەبننەهاتوەی بەسەرکەوتن هەیانبوومانەوە.

---

# خۆشی یەکەم سەرکەوتن

گەلی سۆڤیاتی و هێزی چەکدارەکەی کات و ساتێکی تاڵ و ناهەمواری زۆریان بەخۆوە بینی و بەسەریدا تێپەڕین و لە یەکەم سەرکەوتنیاندا هەستیان بەخۆشی ئەو سەرکەوتنەکرد. کاتێك سوپای سۆڤێتی توانییان پلانی داگیرکردنی لینینگراد پووچەڵ بکەنەوە کە هیتلەر پلانی بۆ دارشتبوو.
وە بەو بەرەنگاربوونەوەیەی هێزەکانی سۆڤێتی لەگەڵ هێزە چەکدارەکانی فنلەندەدا (شاری لینینگراد دەکەوێتە لای باشووری فنلەندەوە)وە لەبەرەی باشوردا هێزەکانمان توانییان شاری روستوف کە کەوتبووە سەرکەناری رووباری(دون) لە چنگ دوژمن ڕزگاربکەن. هەروەها لە ناوچەکانی تریشدا ئەو هێرشە دژایەتییانەیان کە دەکردە سەر دوژمن مژدەی سەرکەوتنیان دەگەیاند. لە (٢٩ی

تشرینی دووەم)دا مارشاڵ زۆکۆف پەیوەندی بەسەرکردەی باڵاوەکرد و هەڵوێستی بەرەی جەنگی پێراگەیاند و داوایلێکرد فەرمانبدات هەردوو لەشکری یەکەم و دەیەمی گورز وەشێن (ئەو هێزانەی لە بەرەکانییەوە نزیکن) بخاتە پاڵ بەرەکەی ئەمەوە بۆ ئەوەی بتوانێت لێدانی توندوتیژتر لە دوژمن بدات و لە دەوروبەری مۆسکۆ دووریان بخاتەوە.

ستالین لێیپرسی..

ـ ئایا تۆ دڵنیایت لەوەی دوژمن لەبارێکی ناهەمواردایە و جارێکی تر لە توانایدا نییە کۆمەڵێکی گەورەتری هێزەکانی کۆبکاتەوە و بەکاریان بهێنێتەوە..؟

ـ دوژمن هیلاکە، بەڵام هێزەکانی بەرە ناتوانێت دەستبەرداری تێپەڕنەبوونی دوژمن بە هێڵەکانماندا بکات.

لە شەوی هەمان ڕۆژدا سەرکردایەتی ڕازی بوونی خۆی نیشاندا بەهاتنەپاڵی هەردوو لەشکری یەکەم و دەیەمی گورزوەشێنی هێزەکانی بەرەی خۆرئاوا و هەرهەموویەکە سەربازییەکانی لەشکری بیست بۆ ناوبەرەکەی ئێمە.

لەگەڵ ئەو هەموو هاوکارییە نوێیانەشدا بەرەی خۆرئاوا هێشتا نەدەگەیشتە ئەو ژمارەیەی کە هێزەکانی لەشکری(ناوەڕاست)ی هیتلەرییەکان هەیانبوو(جگە لە فڕۆکەوانی) دوژمن هێشتا لە دەبابە و تۆپەکانیاندا زۆر لە ئێمە زیاتریان هەبوو.

لە کۆتایی(٤ی کانونی یەکەم)دا سەرکردەی باڵا بەتەلەفۆن پەیوەندی پێوەکردم و لێیپرسیم...

ـ بێجگە لەوەی لە پێشدا پێشکەشمان کردن، بەچی تر دەتوانین یارمەتی و پشتگیری بەرەکەتان بکەین..؟

ـ بێشك دەبێت پشتگیری تەواومان بکەن، بەهاوکاری و یارمەتی هێزە ئاسمانییە یەدەکییەکان، و بریا بتوانرایە دووسەد دەبابەو تەواوی تاقمەکەیانتان بۆ بناردینایە چونکە بەرە هاوارێتی بەدەست کەمی دەبابەوە، لەبەرئەوەشە کە ناتوانێت پەرە بە دژە هێرشەکانی بەشێوەیەکی خێرابدات.

ـ دەبابەمان نییە، و ناتوانین پەیدای بکەین و هێزی ئاسمانیمان زۆرە، من

لەگەڵ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی جەنگدا ڕێکدەکەوم و هەر ئێستا پەیوەندییان پێوەدەکەم، لە(٦ی کانوونی یەکەم)دا هێزێکی چەپی بەرەی باشووری خۆرئاوا دەبێت دژە هێرشێك دژ بە دوژمن ئەنجام بدات.

## دژە هێرش

ئەوا ڕۆژی(٦ی کانونی یەکەم) هات، و بەرەی خۆرئاوا لە باکوروباشوری پایتەختەوە دژە هێرشەکەیان دەست پێکرد، و بۆماوەی دە ڕۆژ لە شەڕوپێکدادانی بەردەوام و توندوتیژدا هێزەکانی باڵی چەپی بەرەی خۆرئاوا لێدانێکی توندوتیژی جەرگبڕیان لە لەشکری دەبابەی دووەمی ئەڵمانییەکان سرەواند کە لە ژێر فەرماندەیی(جودریان)دا بوون.

هەروەها لەشکرەکەی جودریان لەبەر ئەو فشارە زۆر و بە توانایەی لە هەردوو باڵەوە دەکرایە سەرهێزەکانی، ناچاربوو پاشەکشە بەهێزەکانی بکات، و لە دوای خۆیەوە ژمارەیەکی زۆری ئۆتۆمبیل و تراکتۆر و دەبابە و چەکی قورسی لە گۆڕەپانی جەنگدا جێهێشت، لە بەشی چەپی بەرەی خۆرئاوادا، هێزەکانی بەرەی برانسك کە پێکهاتەکەیان سەرلەنوێ پێکهاتبۆوە، زۆر سەرکەوتوانە دژە هێرشیان کردە سەر هێزەکانی ئەڵمانیا و توانییان شاری(تولا) لە ژێر هەڕەشەیاندا ڕزگاربکەن، بەوەی هەنگاوی یەکەمی شەڕوپێکدادانی بەرگریکردن لە مۆسکۆ کۆتایی پێهات.

بەو شێوەیە هێزەکانی لای خۆرئاوا، کە بەرەکانی خۆرئاواو(برانسك و کالینیك)ی دەگرتەوە توانییان جێ و شوێنەکانی خۆیان بگرنەوەکە لە سەرەتای دەست پێکردنی پلانەکەی ئەڵمانیدا پێیان دەوت(تیفون).

وە لە ژێر کاریگەری ئەو تێکشکانەی هێزەکانی دوژمن لە دەوروبەری مۆسکۆدا بەسەریانداهات و ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی لەکاتی دژە هێرشەکاندا بەدەستهێنرا، سەرکردایەتی باڵا دڵخۆش و گەشبین بوو.

گەشبینی ئەوەی دەکرد، ئیتر ئەڵمانەکان جارێکی تر ناتوانن لە بەرەکانی تردا خۆیان لە بەرامبەر لێدانێکی تری سوپاکەماندا ڕابگرن، لێرەدا بیرۆکەی هێرشێکی سەرانسەری لە دەریاچەی(لادوجا) (لەنزیك لینینگراد)ەوە هەتا دەریای ڕەش دەست پێبکەن، ژەنەراڵ زۆکۆف بەوەی کە ئەندامێکی سەرکردایەتی باڵابوو، بۆ کۆبوونەوەی سەرکردایەتی ئەرکان بانگهێشتکرا.

ستالین داوایی لێکرد، بیروڕای خۆی دەربڕێت بۆ ئەو پلانەی دانراوە، بۆ ئەوەی لەزۆربەی بەرەکاندا هێرش بکرێتە سەر دوژمن و بیانشکێنین و لەناویان بەرین.

ژەنەراڵ زۆکۆف بەو پلانە ڕازی نەبوو، داوایکرد تەنها پەرە بە هێرشی لای خۆرئاوا بدرێت و لەشکری ناوەڕاستی ئەڵمانیش لە ژێر فشاری هێزەکانی سۆڤیاتی دان، بەڵام لە لینینگراد و شوێنەکانی تردا، هێزەکانی سۆڤیاتی لە بەرامبەر هێڵێکی بەرگری توندو تۆڵی دوژمندان، لە کۆتاییدا هێزەکانی سۆڤیاتی تووشی نوشوستی و زەرەرو زیانێکی یەکجار زۆردەبێتەوە، کە پێویست بەوە ناکات.

ستالین وتی: لەگەڵ تیموشنکۆدا لەو بارەیەوە قسەم کردووە ئەو بیرۆکەی دژە هێرشی پێخۆشە، بۆ ئەوەی بەدرێژایی زستان هێزی دوژمن لاوازبکەین و بەوە توانای هێرشی گەورەو بەربلاویان لە بەهاردا نەمێنێت.

- فۆزنیسنیکی نارەزایی خۆی دەربڕی و وتی:

- ئێستا توانای ئەوەمان نییە بتوانین دەستەبەری هێرشکردن لە هەموو بەرەکاندا بکەین.

ستالین لە ئامادەبوانی پرسی:

- کەس هەیە لەوبارەیەوە ڕای خۆی دەربڕێت..؟

کەس وەڵامینەدایەوە، ئینجا ستالین وتی..:

- کەواتە قسەکانمان لەم ئاستەدا کۆتایی پێدێنین، کاتێك لە هۆڵی کۆبوونەوە چووینە دەرەوە(شابوشنیکۆف)ی سەرۆك ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ پێی وتم..

- تۆ بە خۆڕایی چەنەحانێی دەکەیت، بیروڕای سەرکردەی باڵا لەسەر ئەوەیە(سەرکردەی باڵا.. مەبەستی ستالینە) وەڵاممدایەوە:

- ئەی کەواتە چ پێویست دەکات ڕای من وەرگرێت؟

سەرۆكی ئەركان هەناسەیەكی هەڵكێشاو وتی..!!

ـ هەر بەڕاستی ئەو پلانە جێبەجێكرا..!!

و لە هەندێ شوێندا چەند سەركەوتنێك بەدی هێنرا، بەڵام زەرەروزیانێكی یەكجار گەورەو زۆری لێكەوتەوە، هێزێكی گەورەوزۆری هێزەكانی سۆڤیاتی كەوتنە ناو گەمارۆی دوژمنەوە. لەناو ئەو گەمارۆدراوانەدا هێزێكی جەنەراڵ(بقریموف) كەوتنە ناو ئەو گەمارۆیەوە، هێزەكەش كەوتنە شەڕو بەرگرییەوە هەتا دواكەسیان لەناوچوون و كوژران.

خۆشی لەگەڵ ئەو هێزانەی مابوون لەگەڵ دوژمندا كەوتە جەنگەوە هەتا بەخەستی بریندارکرا و لە ترسی ئەوەی بكەوێتەبەر دەست دوژمن. ئەو جەنەراڵە ئازاو نەمرە خۆی دایە بەر گوللەو خۆی كوشت و كۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا..!!

مارشاڵ زۆكۆف وەك مرۆڤێك شانازی بە توانای سەربازیی و نەترسی و ئازایی و ئەو دەورە گەورەییەی ئەو جەنەراڵە دەكات كە لە شەڕوپێكدادانی بەرگری لە شاری مۆسكۆدا بینی.. ژەنەراڵ زۆكۆف دەڵێت..:

ـ (هەروەك شەڕوپێكدانەكان سەلماندیان كەمی زەخیرەی تۆپەكان بوونە هۆی هێرش نەكردنی تۆپەكانمان و نەماندەتوانی تۆپەكانی دوژمن بێدەنگ بكەین، هەروەها ئەو هێزە سۆڤیاتییانەی هێرشیان دەكرد، بەبێ پشگیری چڕوپڕی ئاگری تۆپەكان زەرەری یەكجار زۆریان لێدەكەوت، هێندەی ئەو سەركەوتنە نەبوو كە بەدەستیان دەهێنا.)

لە كۆتایی مانگی شوبات و سەرەتای مانگی ئـازاری ساڵی١٩٤٢دا سەركردایەتی باڵا بڕیاری هاوكاریی پشتگیری بەرەی جەنگیاندا، بەڵام ئەو بڕیارە بڕیارێكی درەنگ وەختبوو. لەگەڵ ئەو داواكارییە زۆرەمان كە هێرش بوەستێنین و بچینە حاڵەتی بەرگرییەوە، بەڵام سەركردەی باڵا(ستالین) بەردەوام ڕێنمایی بەردەوام بوونی هێرشكردنی دەردەكرد، بۆ ئەوەی ئەو مەبەستانە بەدی بهێنرێت كە خرابوونە بەردەم هێزەكانەوە، لە كۆتایی مانگی ئازار و سەرەتای مانگی نیساندا بەرەكانی لای خۆرئاوا هەواڵی جێبەجێكردن و بەدەست هێنانی ئەو

مەبەستەیاندا، بێسوود و سەرنەکەوتووبوون، لە کۆتاییدا سەرکردەی باڵا ناچاربوو بەپێشنیارەکەی ئێمە ڕازی بێت و فەرمانیدا بچنە حاڵەتی بەرگرییەوە.

ئێمەش ئەوکاتە لەوەرزی زستاندا نێوان ٧٠ بۆ ١٠٠ کیلۆمەتر چووبووینە پێشەوە وایکردبوو باری چالاکی ئیستراتیژی لای بەرەو خۆرئاوامان لە پێشتر چاکتر بێت.

ئەنجامی گشتی شەڕکردنی بەرگریکردن لە مۆسکۆ ئومێدی بەخشبوو بۆ وڵاتی سۆڤێتی و هاونیشتمانییەکانی، مەترسیدار و تۆقێنەریش بوو بۆ دوژمنان.

جەنەراڵ فستفالی ئەڵمانی لە باسکردنی شەڕوپێکدادانی مۆسکۆدا ناچاربووە ددان بەوەدا بنێ کە سوپای ئەڵمانی لە ڕابوردوودا نەدەشکاو بەزینی بۆ نەبوو، ئێستا لە دەوروبەری مۆسکۆدا لەسەر لێواری نەمان و تیاچووندایە.

فاشیستە ئەڵمانەکان لە شەڕی بەرگریکردن لە مۆسکۆ زیاد لە (نیو ملیۆن سەرباز و ١٣٠٠ دەبابەو ٢٥٠٠ تۆپی قورسی مەیدانی و ١٥ هەزار ئۆتۆمبیل و ئامێری جۆراوجۆری تریان لەناوچوو)، شەڕوپێکدادانی مۆسکۆ یەکەم ڕووداوی گەورەبوو کە لەو شەش مانگەدا سوپای سوور توانی بەسەر لەشکرە سەرەکییە مۆڵەکەی هێزەکانی ئەڵمانیای داگیرکەردا سەرکەوێت ئەو سەرپەرشتیار و بەڕێوەبەرایەتییە بەتوانایەی شەڕ و پێکدادانی بەرگری و ئەو گورز و چالاکی لێدانە توندوتیژانە و پاشان ئەو چوونە ناو هێرشە دژایەتییە خێراییەی سەربازانی سۆڤێتی نواندیان، دەریانخست سەرکردە سەربازییە سۆڤیتییەکان دەربارەی مەسەلەی چالاکی تەکتیکی و ئیستراتیجییەکانەوە بەرەو پێشکەوتن دەڕۆن و توانای شەڕوپێکدادانی خۆیان لە هەموو بوار و جۆرەکانی چەکی سوپاییدا دەرخست، ئەو تێکشکاندنەی هێزەکانی هیتلەر لەبەردەم شاری مۆسکۆدا گرنگییەکی گەورەی دەوڵەتە زل هێزەکانی بەدەست هێنا و سەرنجی لایەنە کۆنەپەرستەکانی یابان و تورکیای ڕاکێشا کە بە خۆیاندا بچنەوەو سیاسەتێکی ژیرانەتر دەربارەی یەکێتی سۆڤێتی بگرنەبەر و وای لە بیروڕای پێشکەوتنخوازە گشتیەکانی جیهان کرد هیوایەکی گەورەیان بەهێزوچەکی سۆڤێتی بێت بۆ تێکشکان و لەناوبردنی نازییەکان.

هێزەکانی سۆڤێتی هەستیان بەهێزو توانای سۆڤێتی کرد و بڕوایان بە توانای

هیتلەرییەکان نەما بەوەی ئەو مەبەستەی هیتلەر دایرشتبوو ئەنجامی بهێنن.

زۆرجار پرسیاریان لێدەکردم کە دەوری ستالین لە کاتی ڕۆژەکانی شەڕوپێکدادانی بەرگری مۆسکۆدا چیبوو..؟

ستالین بەدرێژایی ئەوکاتانە لە مۆسکۆدا هێزەکان و ئەو داهاتە پێویستیانەی پێویست بوون بۆ تێکشکان و لەناوبردنی دوژمن سازو ئامادە دەکرد.

وە پێویستە مافی خۆی بدەینێ، لەگەڵ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی نیشتمانی و ئەنجومەنی وەزیرانیشدا ستالین هەوڵێکی زۆری دەدا بۆ کۆکردنەوەی یەدەگییە ئیستراتیژییەکان و هۆکارە ماددی تەکتیکییەکان.

دەتوانم بڵێم بەوتوندوتیژی و زۆرداریـــەی توانی ئـــەوەی پێیدەوترێت موستەحیل، ئەو بەدەستیهێناو جێبەجێی کرد، کاتێك هەندێ کەس لێم دەپرسن: چ کاروبەسەرهاتێکی جەنگ لە هەمووشتێك زیاتر لە مێشکدا ماوەتەوەو بیرناچێتەوە؟ من دەڵێم"شەڕ و پێکدادانی بەرگریکردن لە شاری مۆسکۆ لە کات و ساتە ئاڵۆزو زۆر ناخۆشەکاندا هێزە چەکدارەکانمان زیاتر لەناو پیاوەتی و هاوکاری و شارەزاییدا دەتوانەوە، خۆ ئەگەر بەلایەنی کەمەوە پێداویستی تەکنیکیان ببوایە، دەیانتوانی ئەو هێزە بەرگرییە لاوازەیان بگۆڕن و بیکەن بە هێزێکی هێرشبەری گەورە.

ڕۆڵەو نەوە بەوەفاکانی داهاتوومان بەهیچ جۆرێك ئەو چالاکییە ڕێکخراوەییە بەتوانایە هەرگیز لەبیرناکەن کە حیزب پێی هەستاو کردی. ئەو داستانە قارەمانییەی میللەتی سۆڤێتی لە بیرناکەن کە لەو ماوەیەدا لەبەرەی داهاتدا بەدەستیانهێناو ئەو داستانە گەورەیی و سەروەرییەی جەنگاوەران لەبیرناکەن.

---

# (بەشی دوانزە)

(نەهامەتی بەردەوامە)
-(هەمووشتێک... لە پێناوی جەنگدا- داگیرکردنی نیوەدوورگەی قرم- بڕیاری ژمـــــارە(٢٢٧)- هێتلەر جەخت لەسەر داگیرکردنی ستالینگراد دەکاتەوە)

لەبەرچەند هۆیەك سەرلەنوێ وڵاتەكەمان لە ساڵی(١٩٤٢)دا تووشی نەهامەتییەكی قورس بۆوە، بەڵام هەروەك چالاكی جەنگ و پێكدادانی شاری مۆسكۆ لە ساڵی(١٩٤١)دا، سوپا و میللەت بەسەركردایەتی حیزب توانی بە ئازایی و خۆراگرییەوە بەسەر ئەو كارە ناهەموار و ناخۆشانەدا زاڵ بێت و بەسەر هێزێكی گەورەی مۆڵدراوی هێزەكانی ئەڵمانیادا كە لە نێوان هەردوو رووباری(فۆڵگاودون)دا بوون سەركەوێت.

بەوە توانی سەرەتای دەركردنی هێزەكانی ئەڵمانیای فاشی بۆ دەرەوەی سنووری نیشتمان دیاری بكەن.

لە كۆتایی بەهاری ساڵی(١٩٤٢)دا یەككگرتن و هاوپەیمانێتیەكی جیهانی لە نێوان(٢٦) دەوڵەتدا پێكهێنرا، لەناوخۆیاندا لەسەر ئەوە پێكهاتن كە هەرچی هەوڵ و داهاتێكیان هەیە دژی دەوڵەتە شەڕخواز و دوژمنكارییەكان بخەنەگەڕ. بەهیچ شێوەیەك پەیماننامەی ئاشتبوونەوە و رێكەوتننامەیەكی تەنهایی و سەربەخۆ ئیمزانەكەن.

وەلەبەرەی ئەڵمانی سۆڤیەتیدا بۆ ماوەیەك هێنمییەكی هەنووكەیی ڕوویدا و هەردوولا لە شوێنەكانی خۆیانەوە پەنایان بردە بەر بەرگری كردن.

لەناو یەكێــی سۆڤیەتیدا سەركردایەتی بە گرنگییەوە سەرنجی پێشكەوتنی ڕووداوەكانی دەدا.

گەلیش سەركەوتنەكانی جەنگ و پێكدانەكانی مۆسكۆ سەرگەرم و خۆشحاڵی كردبوو"هەموو شتێكیان لەپێناو بەرەدا) دەبەخشی.

لە دواوەی بەرەشدا داهاتی جەنگی چۆنت بویستایە ڕوو لە زیادبوون و پێشكەوتن و بوژاندنەوەدا بوو، ئەمە وای لە سەركردایەتی كرد، فەیلەق، بەڵكو لەشكری سەربەخۆی دەبابەیان پێكهێنا،هەروەها سوپای هێزی ئاسمانیش لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٢ دا پێكهێنرا كە ژمارەیان گەیشتە هەشت. هەروەها ئەوانەی شێوازی چەكی جۆراوجۆریان ساز دەكرد، چەندەها جۆر چەكی نوێیان دروست كرد. ژمارەی هێزە چەكدارەكان گەیشتە زیاتر لە(٥,٥) ملیۆن سەرباز و پرچەك كران بە(٤٩٥٩) دەبابە و(٤٠٧٩٨) تۆپی قورس و(٢٤٨٠) فرۆكە و هێزەكان زیاتر مەشق و ڕاهێنانیان پێدەكرا، بەڵام دوژمنیش خۆی ئامادەدەكرد، بۆ هێرشی هاوین، مۆڵگەی هێزەكانیان بەدرێژایی هەموو بەرە گەیشتە(٢١٧) فیرقە و(٢٠)لیواو هەتا مانگی(ئایاری ١٩٤٢) ژمارەی هێزە فاشییەكانی ئەڵمانی و هاوپەیمانەكانی لەشەش ملیۆن سەرباز تێپەری كرد و(٣٢٣٠) دەبابە و(٥٧) هەزار تۆپی مەیدانی و ئامێرو(٣٤٠٠) فرۆكەی جەنگی. زیادبوون و زۆری سەرباز و تۆپ هێشتا هەر ڕوو لە ئەڵمانییەكان بوو.

ستراتیژی سیاسی و سەربازی هیتلەر لە ساڵی(١٩٤٢)دا لە هەوڵی ئەوەدابوون هێزەكانی باشوورمان بشكێنن و لە ناویان بەرن و هەرێمی قۆقاز داگیربكەن و بگەنە(فۆڵگا) و پاشان دەست بەسەر ستالینگراد (ئێستا پێیدەڵێن فولگۆگراد و ئیستراخان) بگرن و بەوە بتوانن بارودۆخێكی گونجاو پێكبهێنن بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی یەكێتی سۆڤێتی وەك دەوڵەتێك.

لە(بەهاری١٩٤٢)دا من زۆر سەردانی سەركردەی باڵام دەكرد و لە زۆركێشەی ستراتیژیدا لەگەڵ سەركردەی باڵادا هاوبیربووم.

لەبەرئەوە من بیروڕایم زۆرباش دەزانی، دەربارەی هەڵسەنگاندنی ئەو بارودۆخەی لەئارادابوو، وە لەسەر پاشەڕۆژ و بەسەر هاتەکانی جەنگ لە ساڵی(١٩٤٢)دا.

زۆر ڕوون و ئاشکرابوو سەرکردەی باڵا زۆر بڕوای بەو بەڵێنانەی چەرچڵ و ڕۆزفڵت نەبوو بەکردنەوەی بەرەیەکی دووەم لە ئەوروپادا، بەڵام بێ ئومێدیش نەبوو کە لە ناوچەیەکی تردا کارێکی لەو شێوەیە بکرێت، ستالین زیاتر بڕوای بە ڕۆزفڵت هەبوو وەك لەوەی بڕوای بەچەرچڵ بێت.

## جەنگ لاوازکردن

ستالین دەیزانی ئێمە هێشتا نەگەیشتووینەتە ئەو ئاستەی هێزەکانمان بتوانن هێرشێکی بەرفراوان سازبکەین، لەبەرئەوە لەم ماوەیەدا پێویستە تەنها بەرگرییەکی ستراتیژی تەواو گورجوگۆڵ بکەین، لەگەڵ چەند هێرشێکی سنوردار لە (قرم و خارگۆف لەلای کۆرسك و سمولینسك)دا.

سەرۆکی ئەرکان وای بەچاکدەزانی، تەنها بەرگرییەکی ستراتیژی بەس بێت بۆ هیلاك کردنی دوژمن و لاوازکردنی هێزەکانی هەتا سەرەتای هاوین و پاشان کۆکردنەوەی هێزێکی شایستە کە بتوانێت چالاکی دژە هێرشێکی بەرفراوان ئەنجام بدات. من بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ سەرکردەی باڵادابووم، بەڵام دەربارەی هەڵسەنگاندنی چەندایەتی(کەمییەت) بۆ چالاکییەکان لەگەڵیدا نەبووم.

بۆ ئەوەی ئەو توانا یەدەکییانەمان لە چالاکی سنورداردا بە فیڕۆ نەروات کە دەبێتە دواخستن و وەستانی هێرشی گشتی هێزەکانی سۆڤێتی من وام بە چاکدەزانی دژە هێرشەکانمان ئاراستەی لای خۆرئاوابکرێت، بەمەبەستی ئەوەی وا لە دوژمن بکەین بەلایەنی کەمەوە بەم نزیکانە بیر لە هێرشێکی گەورە و بەربڵاونەکاتەوە.

لەسەر پێشنیاری ستالین ئەنجومەنی بەرگری نیشتمانی دانیشتنێکیان سازکرد بۆ قسەو گفتوگۆکردنی هەڵوێستەکە وپلانی چالاکی پێشنیازکراوی ساڵی(١٩٤٢).

لە کۆبوونەوەکەدا هەریەك لە(سەرکردەی باڵا، و فۆرشیلۆف و تیمۆشنکۆ و

شوبوشنیکوف و فاسیلیفسکی و باجرمیان و زۆکۆف) هاوکارییان تێدا کرد.

بیروڕاکان دژ بەیەکبوون و یەکیان نەگرت و کەسیش بەگەرمییەوە پشگیری بۆچوون و پێشنیارەکانی منیان نەکرد، جا لەبەرئەوە بیروڕای ستالینیان پەسەند کرد.

بەسەرهات و ڕووداوەکانی ئایار و حوزەیران سەلماندیان بۆچوونەکانی سەرکردایەتی باڵا ناڕاست و هەڵەبوون، هێزەکانمان لە باشوردا جارێکی ترتووشی ناهەمواری و مەینەتییەکی قورس و گران بوونەوە.

هێرشەکانیشمان لە هەرێمی(قرم)دا بەسەرنەکەوتوویی و زەرەر و زیانێکی بێشومار کۆتایی هات.

سەرکردایەتی باڵا ناچاربوو فەرمانی بە جەنەراڵ کۆزلۆفدا هێرشەکانیان ڕاگرن و بچنە حاڵەتی بەرگرییەکی توندو تۆڵەوە.

لـــە(ڕۆژی ٨ی ئایار)دا دوژمـــن لەبەرەی(قرم)دا هێرشێکی زەمینی بەربلاووچڕوپڕیان بە پشتگیری هێزە ئاسمانییەکانیان کردەسەر بەرەی(قرم) و ناچاریان کردن بشکێن و پاشەکشەیان پێکردن و شاری(کیرتس)یان پێچۆڵ کردن.

پاش ئەوەی شاری(کیرتس)یان داگیرکرد، سەرکردایەتی ئەڵمانەکان هەموو هێزەکانی تاوداو ڕوویان کردە بەرەو(سیفاستوبول) کە ڕۆڵە دلێرو پارێزەرەکانی لە مانگی تشرینی یەکەمەوە بە خۆڕاگرییەوە بەرگرییان لێدەکرد.

پاش(٩) مانگ لە شەڕوکوشتاری توندوخوێناوی لە(٤ی تەمموز)دا هێزەکانمان لە(سیفاستوبول)یش کشانەوە، بەوە بەتەواوی نیوەدوورگەی(قرم) کەوتە ژێر داگیرکردنی ئەڵمانییەکانەوە و وەزعی ئێمە تەواو خراپ و ناهەمواربوو، بێگومان هێزو توانای دوژمن زۆر بەهێزتر و بەتواناتر بوو.

لە(٣ی ئایار)دا هێزەکانی بەرەی باشوری خۆرئاوا هێرشێکیان کردە سەر شوێنەکانی لەشکری شانزەی ئەڵمانی لە هەرێمی(دیمیانسك)دا گەرچی دوژمن زەرەروزیانێکی گەورەی لێکەوت، بەڵام هێرشەکە سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا.

جارێکیان من بە تەلەفۆن لەگەڵ ستالیندا، دەربارەی قرم و بەرەی خۆرئاوا

قسەم دەکرد، سەرکردەی باڵا وتی:
ـ بینیت بەرگریکردن چی لێ بەسەرهات..؟!!
پێویستە بەتوندی سزای کوزلوف و میخلیس و کولیك بدەم لەسەر ئەو ئیهمال و گوێ پێنەدانەیان بۆ ئەوەی کەسی تر ئیهمال و بێ ئاگایی نەکەن.
ـ نەخێر، من وای بەچاك دەزانم دوژمن بە فڕۆکەو تۆپ بۆمب باران بکرێت و لێیان دەین و بەو بەرگری کردن و خۆڕاگریە سەختەمان بیانشکێنین و ئینجا بکەوینە هێرشکردنیان.
لە(١٢ی ئایار)دا بەرەی باشووری خۆرئاوا هێرشێکیان بەرەو خارکۆف کرد و دوولێدانی بەهێزیان بەرەو دوولای جیاجیا ئەنجامدا، لە(١٧ی ئایار)دا فیرقەی یانزەی ئەڵمانی هێرشیان کردە سەر هەردوو هێزی سوپای نۆو پەنجاو حەوتی سەر بەرەی باشور و هێڵی بەرگرییان بڕی و لەماوەی دوو ڕۆژدا ماوەی(٥٠) کیلۆمەتر هاتنە پێشەوە، ئەمەش بووە هەڕەشە کردن لەسەر هێزەکانی بەرەی باشوری خۆرئاوادا.
مارشاڵ زۆکـۆف شاهیدی لەسەرئەوە دەدات کە خۆی ئاگای لەو ئاگادارکردنەوەیەبوو کە ستالین سەرۆکی بەرەی خۆرئاوای لەوخەتەری و ترسە ناهەمواریيەی بارودۆخەکە ئاگادار کردەوە، بەڵام سەرکردەی بەرە لەسەلامەتی هەڵوێستەکە دڵنیای کردەوە، هەروەها دەڵێت من خۆم ئاگاداری ئەو تەلەفۆنەبووم کە لە نێوان سەرکردەی باڵاو ئەندامی ئەنجومەنی سەربازی بەرەدا(نیکێتا خرۆشۆف)کرا.
نیکێتا خرۆشۆف جەختی بۆ ستالین کرد(هەروەك چۆن سەرۆکی بەرەجەختی کردەوە) کەئەو ترس و خەتەرییە زۆر درۆیەو بارودۆخەکە پێویست ناکات چالاکییەکان ڕابگیرێت(مەبەستی چالاکی هێرش کردن بوو).
وە لەسەر ڕاپۆرتی سەرۆکی بەرەو ئەندامی ئەنجومەنی سەربازی ستالین پێشنیارەکەی جەنەراڵ فاسیلیفسکی کە بەکاری سەرۆکی ئەرکانی جەنگ هەڵدەسا، ڕەفزکرد.
ئەو باس و خواستەی لەو ڕاپۆرتەی هەردوو ئەنجومەنی سەربازی هەردووبەرەی

باشور و باشوری خۆرئاوا ناردوویانە و دڵەڕاوکێ و نائارامی دەردەبڕن شتێکی دەمی و هەڵبەستراوە و لەگەڵ ڕاستیدا نییە، من جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە چونکە خۆم ئامادەی ئەو تەلەفۆنەی سەرکردەی باڵابووم.

کاتێك سەرکردایەتی بەرە هەستی بەو خەتەری و ناهەمواریەی بارودۆخەکە کرد کارلەکارترازابوو، کات تێپەڕی کردبوو.

ئەو هێزانەی هەردوو سوپای (شەش و پەنجاوحەوتیان) پێکهێنابوو لەگەڵ هەندێ یەکەی سوپای نۆدا کەوتنە ناو گەمارۆیەکی توندوتۆڵەوە و نەیانتوانی ئەو گەمارۆیە بشکێنن، چەند هێزێکی کەمیان نەبێت و زۆربەی هێزەکانی خۆیان نەدا بەدەستەوە و تادوا دڵۆپی خوێنیان شەڕیان کرد و کوژران. و لەوشەڕوپێکدانانەدا سەرۆکی بەرەو قارەمانی جەنگی ناوخۆیی و جەنگی نیشتمانی گەورە، جەنەراڵ(کۆشنکۆ) کوژرا، هەروەها سەرۆکی سوپای شەشەم جەنەراڵ(بوولاس) و جەنەراڵ(یوبکین) کە لە خوێندنی سەربازی باڵادا هاوڕێم بوو، هەر هەموویان کوژران، ئەوانەش سەرکردەی گەورە و ڕۆڵەی دڵسۆزی حیزب و گەلەکەمان بوون.

- - -

## نائارامی لەبەرەدا

ڕۆژ بە ڕۆژ بارودۆخی بەرەی برانسك بەرەو خراپتر دەڕۆیشت سەرکردایەتی باڵا بڕیاریدا ئەوە بەرەیە بکرێت بەدوو بەرەی نوێوە، بەرەی(فورونج) لە ژێر سەرکردایەتی جەنەراڵ (فاتوتین یاردەدەری یەکەمی مارشاڵ زۆکۆف) لە کاتێکدا کە سەرۆکی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگبوو)، وە بەرەی(برانسك لە ژێر سەرکردایەتی جەنەراڵ(راکۆسۆفسکی)دا لە ئەنجامی ئەو زەرەر و زیانە یەك لەدوای یەکانەی هێزەکانماندا دوژمن ستراتیژی دەست پێکردنەوەی بەدەست هێنایەوەو هەوڵیدا

ڕێگای بەرەو ستالینگراد ببڕێت و پیایدا ڕەت بێت.
بەهۆی ئەو کشانەوە ناچارییە(دون و واڵدۆرنیاس) کە دووشوێنی زۆر گرنگ بوون کەوتنە ژێر دەستی دوژمنەوە، ڕاستەوخۆ خەتەری دوژمن لەوەدابوو کە بگەنە(فولگا) و باکوری قۆقاز و داگیرکردنی(کۆیان) و هەموو ڕێگاکانی هاتووچۆ کە لەگەڵ قۆقازدابوون بکەوێتە ژێردەستی دوژمنەوە.
(سەرۆکی باڵا بڕیارە گرنگ و بەناوبانگەکەی ژمارە٢٢٧ دەرکرد، بەپێی ئەو بڕیارە سزای قورس و توندوتیژی تیا ڕەچاوکرا بۆ سزادانی ئەو کەسانەی ترس و تۆقین بڵاودەکەنەوە و دژ بە یاساو پەیڕەوەکانن و کۆتایمان بەلایەنە ترسنۆك و بەزیوەکان هێنا) ئەو بڕیارە کاریگەرییەکی باشی لەسەر کاری سیاسی حیزبی هەبوو، ژمارەی ئەندامانی حیزب لە ڕیزەکانی سوپادا گەیشتە(١)ملیۆنەوە گەیشتە (٣) ملیۆن ئەندام.
هێزەکانی هەردوو بەرەی باشورو باشوری خۆرئاوا تواناو خۆڕاگری و بەربەستکردنی هاتنە پێشەوەی هێرشی دوژمنیان نەبوو، سەرکردایەتی بۆ ئەوەی ڕێگا لە دوژمن بگرێت و نەهێڵێت بگەنە(فۆلگا). لە (١٢ی تەمموزی ساڵی١٩٤٢)دا بڕیاری پێکهێنانی بەرەی ستالینگرادیدا.
هەروەك لە مۆسکۆدا کرا، هەزارەها کەسی خۆبەخش ڕاستبوونەوە بۆ هاوکاریکردن و سەنگەر دروستکردنی بەرگریکردن لەدەوری شارەکەدا. وە بۆ بەپیرەوەچوونی ڕێنماییەکان لیژنەی بەرگری نیشتمانی ڕێکخراوە حیزبییەکان لە کۆمارەکانی ئەرمینیا و جۆرجیا و ئازەربیجان هەستان بەهەڵمەتێکی میللی بۆ ناونووس و چوونە ڕیزی سەربازی سوپای سوورەوە.
بەوە سەرنەکەوتنیان بەو پلانە هیتلەرییە هێنا کە دەیویست بەگەیشتنی هێزە داگیرکەرەکانی فاشیستەکان کۆمارەکانی قۆقاز لە یەکێتی سۆڤێت دابڕن.
پێشمەرگەکانیش دژی دوژمنان لە خەباتدا دەورێکی گەورەو بەرچاویان بینی، لەو چالاکییە ئازایی و نەترسیانەیاندا و شارەزایی تەواویان لە چۆنێتی ئاووهەواو خاکی وڵاتدا، زەرەروزیانێکی گەورەوگرانیان بەگیان و ئامێرەکانیان گەیاند.
بەرەی جەنگ پێکهاتبوو لە(١٨٧) هەزار جەنگاوەر و(٣٦٠) دەبابە و(٣٣٧)

فرۆکەی جەنگی و(٧٩٠٠) تۆپی مەیدانی و ئامێری جۆراوجۆر وە لە بەرامبەر مۆڵگاکانی دوژمندا(٢٥٠) هەزار سەرباز و (٧٤٠) دەبابە و(١٢٠٠) فرۆکە و(٧٥٠٠) تۆپی مەیدانی و ئامێری جۆراوجۆریان لێ بوو، پاشان دوژمن زۆرێکی زۆری هێزەکانی خۆی و هێزەکانی هاوپەیمانییەکانی بۆ جەنگ و پێکدادان رەوانەی پێشەوەکرد، لە هەموو ئەو رێگایانەوە کە دەچوو بۆ شاری ستالینگراد شەروپێکدادانی قورس قەوما، بەڵام دوژمن بەردەوام زاڵ دەبوو بەسەر ئەو بەرگرییە توندو بەهێزەدا و دەیشکاندن، هەتا گەیشتە نزیك ستالینگراد، لەوێدا هاوشان لەگەڵ هێزە سەربازییە چەکدارەکاندا گەلیلای کرێکارانی چەکدار زەرەروزیانێکی قورس و بێشوماریان بە دوژمن گەیاند. وە لە بەرەی خۆرئاوادا هێزەکان لە ژێر سەرکردایەتی ژەنەراڵ زۆکۆفدا هەستان بە زۆرێکی زۆری چالاکی دژە هێرش ئامانجی سەرەکی ئەو هێرشانە هیلاك کردن و راگرتنی دوژمنبوو هەتا نەتوانن پشتیوانی ئەو هێزانەیان پێ بکەن کە بەرەو بەرەی ستالینگراد چووبوونە پێشەوە. گەرچی ئەو هێرشانە نەبوونە سەرکەوتنێکی یەکجاری و یەکلایی کەرەوە، بەڵام ئەوانە بەپێی ددانپیانانی جەنەراڵی ئەڵمانی(ك. تیلیسکیرخ):-

"توانییان بەو رێگایە بەربەستی هێرشکردن بگرن و(٣) فیرقەی دەبابە و زۆرێکی زۆری فیرقەی پیادە کە ئامادەکرابوون، بیانگوێزنەوە بۆ سەر شانۆی چالاکییەکانی بەرەی باشوور رابگرن و بیانهێڵنەوە، ئەو هێزانە بۆیەکی مابوونەوە بۆ ئەوەی بەرەنگاری هێرشی دوژمن بێتەوە و پاشان پشتگیری دژە هێرشیان پێ بکرێت.."

بەهەرحاڵ پێویستە ئەوەبڵێم سەرکردەی باڵا هەستی بەو بارودۆخە نالەبارەکرد کە لە هاوینیساڵی(١٩٤٢)دا روویدا ئەوەش بۆ ئەو هەڵانەی خۆی دەگەرایەوە کە لەکاتی بریاری پلانی چالاکییەکانی هێزە چەکدارەکانماندا لە هەڵمەتی هاوینی ساڵی(١٩٤٢)دا تێیکەوت.

لەبەرئەوە، ئەو لەناو ئەندامانی سەرکردایەتی باڵاو ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگدا، نەدەگەرا بەدوای ئەوانەدا کە بەرپرسیارن لەو تێکشکاندنە.

لە(٧ی ئابی ساڵی١٩٤٢)دا (بوسکریشیف)ی سکرتێری ستالین پەیوەندی

پێوەکردم و پێی وتم...

"لیژنەی بەرگری نیشتمانی دایانناوم بەیاردەدەری سەرکردەی باڵا". هەردوای ئەوە بەماوەیەکی کەم ستالین پەیوەندی پێوەکردم..:

- "پێویستە بەزووترین کات بێیت بۆ سەرکردایەتی باڵا، سەرۆك ئەرکان شوێنەکەت جێ بهێڵەو بیربکەرەوە کێ بە شایستە دەزانی لە شوێن تۆی دابنێین".

قسەکردنەکە لەم ئاستەدا کۆتایی پێهێنا، بێئەوەی پێم بڵێ کە دامناوی بەیاریدەدەری خۆم.

بەهەرحاڵ هەمووکات سەرنجمانیان بۆ ئەوە رادەکێشا کە لە کاتی قسەکردن بە تەلەفۆن ئاگامان لە خۆمان بێت، بەتایبەت لە ناوچە چالاکییە جەنگیەکاندا کە نەدەتوانرا بەشفرە قسەبکرێت.

سەرکردەی باڵا وتی لە باشور بارودۆخ زۆرخراپە و گۆرانکاری و بەسەرهاتەکان لەوەدەچێت داگیرکەرە ئەڵمانییەکان ستالینگراد و باکوری قۆقاز داگیربکەن، ئەوەشی وت کە لیژنەی بەرگری نیشتمانی بریاریان داوە زۆکۆف دابنێین بەیاریدەدەری سەرکردەی باڵا. رەوانەکردنیشت بۆ ناوچەی لینینگراد، ئێستا لە ستالینگراددا(فاسیلیفسکی و مالینکۆف و مالیشیف)ی لێیە.

مالینکۆف لەگەڵ زۆکۆفدا لەوێ دەمێنێتەوە و فاسیلیفسکی دەگەرێتەوە بۆ مۆسکۆ.

ـ کەی دەتوانیت سەفەربکەیت و بچیت بۆ ئەوێ؟

ـ پێویستم بە(٢٤) سەعاتە بۆ لێکۆڵینەوەی هەڵوێستەکە. ئاشکرابوو جەنگ و پێکدادانی ستالینگراد گرنگییەکی سیاسی و ستراتیجی گەورەی هەبوو، بەداگیرکردنی ستالینگراد سەرکردایەتی دوژمن دەیتوانی باشوری وڵات لە ناوەراستی دابرێت، و خۆ ئەگەر(فۆلگا)شمان لە دەست بچێت مانای ئەوەیە گرنگترین رێگای هاتوچۆی ئاویمان لەدەست دەچێت.

کە بەو رێگایەدا یارمەتی و هاوکاری گەورەمان لە قۆقازەوە پێدەگەیشت سەرکردایەتی باڵا هەرچی لە تواناو لەژێر دەستدابوو ناردی بۆ ستالینگراد،

جگە لەو هێزە یەدەکییە ستراتیژییە نوێیانە نەبێت کە بەم زوانە پێکهێنرابوون و کۆکرابوونەوە، دایاننابوون بۆ پاشەڕۆژی ڕووداوەکان.
دوای ئەوەی سەرنج و لێکۆڵینەوەی هەڵوێستەکەم کرد، بەبێتەل پەیوەندیم بەسەرکردەی باڵاوەکرد و پێمراگەیاند دژە چالاکی و لێدان هەتا پێش(٦ی ئەیلوول) ناتوانین ئەنجام بدەین، ئەویش پێیوتم"لەسەر ئەوە هیچ قسەو بەرهەڵستییەکی نییە".

---

## بارودۆخ لە ستالینگرادا

لە(٣ی ئەیلول)دا بروسکەیەکم بەئیمزای سەرۆکی باڵاوە پێگەیشت(بارودۆخی ستالینگراد) تابێت زیاتر بەرەوخراپی دەڕوات، ئەگەر هێزەکانمان لە باکورەوە یارمەتی کتوپڕ و خێرایان بۆ نەنێرن، ستالینگراد ئەمڕۆ یا سبەی هەرس دێنێت و دەکەوێتە ژێرچنگی دوژمنەوە.
داوا لەو هێزانە دەکەم کە لە باکور و باکوری خۆرئاوای ستالینگرادا دامەزراون بەزووترین کات دەست بەلێدانی دوژمن بکەن، وبچنە پێشەوە بۆ یارمەتی و هاوکاریکردنی ستالینگراد، لەهیچ دواکەوتنێك خۆش نابین، چونکە دواکەوتن لەئێستادا تاوانە، هەرچی هێزی ئاسمانی هەیە بنێرە بۆ ستالینگراد، چونکە لەناوشاردا هێزی فرۆکەوانی کەم هەیە..)
ـ مارشاڵ زۆکۆف پەیوەندی بە ستالینەوە کردەوەو پێیراگەیاند فەرمان بەهێرشکردن، شیاوەودەکرێت، بەڵام تواناو پێداویستییەکانی هێرشکردن زۆرکەمەو لە دەستماندا نییە و ئەگەر بکەوینە شەڕەوە تۆپەکانمان بێ زەخیرەدەبن، هەروەها هەمئاهەنگی کارکردن لە نێوان هێزی ئاسمانی و تۆپەکان و دەبابەکاندا ناتوانرێت بکرێت تا پێش ڕۆژی(٤ی ئەیلول) نەبێت.

جا لەبەرئەوە داواکارم لێت کەڕێمان پێ بدەیت کارەکان لە(٥ی ئەیلول)دا هەڵسووڕێنین، هەروەك لەمەوپێش لەسەری ڕێککەوتبووین، و هەر ئێستا بە زووترین کات فەرمان دەدەم بەفڕۆکەکانمان ڕێوشوێنەکانی دوژمن بۆمب باران بکەن.

ـ زۆرباشە، بەڵام ئەگەر دوژمن هێرشی سەرانسەری کردە سەر شارەکە، تۆش بەخێرایی هێرشیان بکەرەسەر بێئەوەی چاوەڕوانی تەواوکردنی پێداویستییەکانی شەرکردن بکەیت.

لە(٥ی ئەیلوول)دا هێرشی گشتی بەدرێژایی بەرە بۆسەر دوژمن دەستی پێکرد. بەهۆی تۆپ بارانی فڕۆکەو تۆپەکان و تەقاندنی مووشەکی(کاتیوشا)وە، هێزەکانمان بەرەوپێشەوە کشان.

من لە شوێنی سەرکردایەتییەوە چاودێری جەنگ و پێکدانەکانم دەکرد دڵنیابووم ئێمە هیچ ئەنجامێکی گەورەو سەرکەوتن بەدەست ناهێنین، لەبەرکەمی چڕوپڕی ئاگری بۆمبەکانمان.

بەدرێژایی یەکەم ڕۆژی جەنگ کردن هێزەکانمان لەیەك کیلومەتر زیاتر نەیانتوانی بچنە پێشەوە، ڕۆژی دواتر شەڕ لە پێشتر بە قورسی و توندوتیژتر ڕوویدا لە ڕۆژەکانی سێیەم و چوارەمدا شەڕ بە هاویشتنی ئاگری گوللەتۆپەکان و هێرشی ئاسمانی بەردەوام بوو.

وە لە(١٠ی ئەیلوول)دا پەیوەندیم بەسەرکردەی باڵاوەکرد و لە پەیوەندییەکەمدا پێم وت..

"بەردەوامبوونی شەڕ بە هەمان هێز کە لە ژێردەستی بەرەی ستالینگراددایە، نابێتە هۆی ئەوەی گەمارۆکە بشکێنین و بتوانین بڕۆین و لەناو شارەکەدا بەهێزەکانی بەرەی خۆرهەڵات بگەینەوە، بەردەوام بوونی هێرش کردن بەهەمان هێز و پێکهاتەکانی لە دوایدا بێمانا دەبێت، بێگومان لەدوایدا هێزەکانمان تووشی شکستی و زەرەرو زیانێکی گەورە دەبنەوە".

لەسەر فەرمانی ستالین مارشاڵ ژۆکۆف لە(١٢ی ئەیلول)دا سەفەری بۆ مۆسکۆکرد و لە هەمان ڕۆژدا لە کرملین لەگەڵ سەرکردەی باڵاو سەرۆکی

ئەركانی جەنگ جەنەراڵ(فاسیلیفسكی)دا كۆبۆوە، پاش ئەوەی مارشاڵ زۆكۆف راپۆرتەكەی خۆی پێشكەش كرد، ستالین لێیپرسی..:

ـ بەری ستالینگراد چی پێویستە بۆ ئەوەی بتوانێت هێزی گەمارۆی دوژمن بشكێنێت و بتوانێت بچێتە پاڵ هێزەكانی بەرەی باشوری خۆرهەڵاتەوە..؟

ـ بەلایەنی كەمەوە: سوپایەكی زەمینی تەواو و فەیلەقێكی دەبابە و (٣) لیوای دەبابە و(٤٠٠) تۆپی هاوەن، لەسەر ئەمانەشەوە پێویستە سوپایەكی ئاسمانی ئامادەبكرێت بۆ هاوكاری شەڕوپێكدادان، فاسیلفیسكی بۆچوون و مەزندەكانی منی پەسندكرد.

سەرۆكی باڵا نەخشەی دابەشكردنی هێزە یەدەكییەكانی سەر بەسەركردایەتی باڵاكردەوە. ماوەیەكی دوورودرێژ بە وردی تێیڕوانی، من و فاسیلفیسكی چوینە لایەكەوە، بەهێواشی و چرپەچرپ لەسەر پێویستی و حەلێكی تركەوتینە قسەو چەنەحانێوە، ئەوحەلەی تر چییە؟

كتوپڕ ستالین سەری بەرزكردەوە و ئەو پرسیارەی لێكردین، من بەهیچ شێوەیەك لەو باوەڕەدا نەبووم هەستی بیستنی ستالین ئەمەندە سووك بێت، كە گوێی لە قسەكانمان بێت، پاشان سەركردەی بالا لەسەر قسەكانی خۆی بەردەوام بوو، وتی:

ـ ئێستا ئێوە بڕۆن بۆ سەركردایەتی ئەركان پێكەوە لەسەر هاوكاریكردن و كۆمەككردنی بەرەی ستالینگراد ڕاوێژبكەن، بەچی..؟ ولەكوێوە..؟ یەكجارەكی بیر لەوەبكەنەوە كە دەبێت لەبەرەی قۆقازیشدا چی بكرێت.

سبەینێ لێرە لە سەعات نۆی شەودا یەكتردەبینینەوە، بەدرێژایی ماوەی ڕۆژەكە زۆكۆف و فاسیلفیسكی پێكەوە لێكۆڵینەوەیان لەسەر هێزو توانای هێزەكانی ئەڵمانیا و توانای هێزەكانی ڕووسیا و هەرچی پەیوەندی بەو بەرەیەوە هەبوو، لە هۆكاری سەربازی و سیاسی و سیكۆلۆجی بەرەكە، لێكۆڵینەوەیان لەسەركرد، پاشان لەكاتی دیاریكراودا بەستالین گەیشتنەوەو سلاوی لێكردن و وتی:

ـ دەیەها و سەدەها هەزار هاونیشتمانیانی سۆڤێت قوربانی بە ژیانی خۆیان

دەدەن و دژی فاشیستەکان لە خەباتدان.

چەرچلیش بە(٢٠) فڕۆکەی جۆری(هاریکیین) توجارەتمان لەگەڵدا دەکات، کە ئەو فڕۆکانەش لە خراپترین جۆری فڕۆکەن و فڕۆکەوانەکانی ئێمەش حەزیان لەو جۆرە فڕۆکانە نییە.

دوای ئەوە، بێ هیچ پێشەکییەك بە شێوەیەکی زۆر هێمن و لەسەر خۆ کەوتە قسەکردن و، وتی:

ـ بیرتان بۆچی چوو..؟ کێتان قسەدەکات و راپۆرتەکە پێشکەش دەکات..؟

ـ فاسیلفیسکی وەڵامی دایەوە، فەرمان بەهەرکاممان دەدەیت، رای هەردووکمان وەك یەکەو یەك رامان هەیە، هەردوو جەنەراڵەکان پێشنیاریان بۆ سەرکردەی باڵاکرد ... کە لە هەرێمی(سیرافیموفیتش)دا بەرەیەکی نوێ پێکبهێنرێت، ستالین لە توانای جێبەجێکردنی ئەو چالاکییە گەورەیەدا لێیپرسین..

وەڵامیان دایەوە ئەو کارە لەماوەی(٤٥) رۆژدا دەتوانرێت جێبەجێ بکرێت، ستالین لەسەر قسەکەیان وتی..

ـ ئەی تەنها ئەو چالاکی و لێدانانە چاکترو بەس نییە بۆ ئێمە کە لە باکورەوە بۆ باشورو لە باشورەوە بۆ باکور بەدرێژایی رووباری(دون) لێیان بدەین..؟

زۆکۆف وەڵامیدایەوە..

ـ لەم حاڵەتەدا دوژمن دەتوانێت وەرگەڕێتەوەو بەرەنگاری چالاکی و پرۆسەی لێدانەکانی ئێمە بێتەوە، بەڵام ئەگەر لە خۆرئاوای رووباری(دون)ەوە چالاکی و پرۆسەی لێدان ئاراستەی دوژمن بکەین، ئەوا ئەو کاتە توانای وەرگەڕانەوەی نابێت لەبەرئەوەی بەرهەڵستی ئاوی لە پێشدایە.

هەردوو جەنەراڵ ئەوەیان بۆ سەرکردەی باڵارروونکردەوە کە ئەم پلانە دوو مەرحەلەی هەیە..

یەکەم: بڕینی هێڵی بەرگری دوژمن، گەمارۆی هێزێکی هێزەکانی دوژمن کە لەناوچەی ستالینگراد دان و دابڕانی ئەو هێزە لە هێزە سەرەکییەکانی ئەڵمانی.

دووەم: تەفروتوناکردن و لە ناوبردنی دوژمنی گەمارۆدراو و لەناوبردن و زاڵبوون بەسەر ئەو هەوڵانەی کە دەدرێن بۆ رزگارکردنی گەمارۆکە.

ـ ستالین وەڵامیدایەوە.. ئەم پلانە پێویستی بەبیرکردنەوە و هەڵسەنگاندنێکی زۆری توانای سۆڤێتی هەیە.. ئامانجی دیاری کراوی کاتیی ئێستامان ئەوەیە کە نەهێڵین ستالینگراد بکەوێتە ژێردەستی دوژمنەوە و هەرەس بهێنێت و نەهێڵین دوژمن پێشرەوی بەرەو(کامیشین) بکات، لەوکاتەدا(بیمشکۆ) پەیوەندی بەسەرکردەی باڵاوەکرد و پێیراگەیاند، دەبابەکانی دوژمن بەرەورووی شارەکە دەکشێن و واچاوەڕوان دەکرێت سبەینێ چالاکی و پرۆسەی لێدانی نوێ دەست پێ بکات.

دوای ئەوە ستالین فەرمانیدا بە زۆکۆف بگەڕێتەوە بۆ سەرکردایەتییەکەی، فەرمانیدا بە فاسیلفیسکی هەندێ پێداویستی و پشتگیری جێبەجێ بکات و لە کۆتاییدا وتی:

ـ ئەمەی لێرەدا گفتوگۆمان لەسەرکرد، لەم سێ کەسە زیاتر کەسی تر پێی نەزانیوە... بەموەقەت نابێت کەسی تر پێی بزانێت.

## ڕۆژانی تەنگە شەو ناخۆشەکان

ڕۆژانی(١٣ و ١٤ و١٥ی ئەیلول) دەربارەی خەڵکانی شاری ستالینگراد ڕۆژانێکی تەنگەشەو پڕ ناخۆشی بوون، ڕۆژانێکی نەهامەتی و ناهەمواربوو. دوژمن بێ گوێدانە هیچ شتێك هەنگاو بە هەنگاو لەسەر وێرانکردنی شارەکە بەرەو(فۆڵگا) دەهاتە پێشەوە.

خەڵکی بێورەبوون و خەریکبوو خۆیان بدەن بەدەستەوە، بەڵام هەرکە دوژمن هەنگاوی بەرەوپێشەوە نا.. قارەمانانی سەربازانی هەردوو سوپای(٦١ و ٦٤) لێیان ڕاپەڕین و ڕاستەوخۆ لەگەڵیاندا کەوتنە شەڕێکی گەرم و خوێناوییەوەو کەلاوەکانی شاریان کردە قەڵاوسەنگەر، بەڵام هێزەکانمان تادەهات سەعات لە دوای سەعات بێهێزدەبوون، بەڵام لەکاتی پێویستدا هەڵوێست گۆڕا. ئەویش بەگەیشتنی فیرقەی سیانزەی زرێپۆش بە سەرکردایەتی(رودمنسیف) کە بە

فەرمانی ستالین نێردرابوو، پرۆسەی چالاکی و لێدانەکەی بۆ دوژمن کارێکی کتوپڕی بوو، هێزە ئاسمانییەکانیش دەورێکی گەورەو ترسناکیان لە شەڕو پێکدادانی بەرگری کردنی ستالینگراد دا بینی.

لە کۆتایی مانگی ئەیلولدا ستالین بانگهێشتی کردم بۆ گفتوگۆ و مناقەشەکردنی پلانی دژە هێرش بانگهێشتی کردین، پلانەکە هەریەکە لە زۆکۆف و فاسیلفیسکی ئیمزایان کرد و ستالینیش لەسەری نووسی.."پشتی پێدەبەسرێت.." بەدرێژایی مانگی تشرینی یەکەم شەڕوپێکدادان بە توندوتیژی لەناوشار و دەوربەریدا نەدەوەستاو بەردەوام بوو.

چونکە هیتلەر جەختی لەسەرکردایەتی و هێزەکانی سوپای(ب) و جەنەراڵ(باولوس)ی سەرکردەی سوپای شەشەم دەکردەوە کە بەزووترین کات دەست بەسەر ستالینگرادا بگرن و داگیری بکەن.

لە ناوەڕاستی(تشرینی یەکەم)دا دوژمن هێرشێکی نوێتری کردەوە، بەهیوای ئەوەی لە بەرژەوەندی خۆیدا یەکجارەکی لە ستالینگرادا هەڵوێست یەکلایی بکاتەوە، بەڵام ئەمجارەشیان، هەروەك جارەکانی پێشوو لەلایەن هێزەکانی سۆڤێتییەوە تووشی بەرگرییەکی توندو بەهێزبۆوە.

بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك شەووڕۆژ جەنگ و کوشتار لە شەقامەکانی شاروماڵەکان کارگەکان و لە ڕۆخی ڕووباری فۆڵگاو هەموو شوێن و جێگا پێیەکدا بەردەوام بوو، هێزەکانمان زەرەر و زیانی گەورە و جەرگ بریان لێکەوت و دوژمن لە ناو شاری ستالینگرادا چەند شوێنێکی بچووکیان داگیر کرد.

وە لە(١٩ی تشرینی یەکەم)دا هێزەکانی بەرەی(دون) ڕاپەڕین و بەهاناو یارمەتی و کۆمەك کردنی ستالینگرادەوە هاتن، لە هەمانکاتیشدا سوپای شەست و چوار لێدانێکی توندو بەهێزیان لە باشوورەوە سرەواندە هێزەکانی دوژمن.

خۆ ئەگەر ئەوە نەبوایە بارودۆخی سوپای شەست و دوو باش نەدەبوو وە بەیەکجارەکی شارەکە دەکەوتەژێر چنگی دوژمنەوە.

شەڕوکوشتار بۆ ماوەی سێ مانگی بەردەوام بەگەرمی و توندو تیژییەوە بەردەوام بوو، هەرچی گەلانی جیهانیش بوو بە هەناسەبڕکێو پەرۆشەوە دەیانڕوانییە

جەنگ و پێکدانە گەورەکەی شاری ستالینگراد.

چونکە سەرکەوتنی هێزەکانی سۆڤییەتی و ئەو شەڕ وخۆبەخشینە قارەمانیانەیان لە بەرامبەر دوژمندا ببووە سەرچاوەی ئیلهام بۆ هەموو مرۆڤایەتی پێشکەوتنخواز لە جیهاندا.

ئەوە بڕوای سەرکەوتنی کۆتایی بەسەر فاشیستەکاندا لە دڵودەروونی خەڵکیدا ژیاندەوە.

جەنگ و پێکدادانی ستالینگراد قوتابخانەیەکی گەورەبوو بۆ مەشقکردن و ڕاهێنانی هێزەکانمان بۆ وەدەستهێنانی سەرکەوتن، سەرکردایەتی و سەرۆکایەتی ئەرکان ڕاهاتن و شارەزابوون لەسەر هەم ئاهەنگی نێوان هێزەکانی پیادەو دەبابەو تۆپەکان و هێزی فڕۆکەوانیدا.

جەنگاوەرانیش لەناو شاردا فێری چۆنێتی و خۆراگری و بەرگریکردن بوون و لەگەڵ پەلهاویشتن و هەڵپەکردن بەلای هەردوو باڵەکاندا، بڕواو ورەی هێزەکانمان تا ئاستێکی زۆر بەرزبۆوە.

کۆبوونەوەی ئەم هەموو هۆیانە پێکەوە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لە پێکهێنانی بارودۆخێکی لەبار بۆ چوونە ناوەوەی هێزەکانی سۆڤێتی بۆ هەڵمەت بردن و دژە هێرشکردن بۆسەر دوژمنان.

بەم جەنگی بەرگرییەی لەستالینگراد و باکوری قۆقازدا کرا لە نیوەی مانگی تشرینی دووەمدا کۆتایی بە هەنگاوی یەکەمی جەنگی نیشتمانی گەورە هێنرا.

کە ئەمڕۆ شوێنێکی ناوازەو نەمری لە ژیانی گەلی سۆڤێتیدا داگیرکردووە. ئەو ماوەیە ماوەیەکی پڕمەینەتی گران و ناخۆش بوو بۆ گەلی سۆڤێتی و هێزە چەکدارەکانی، بەتایبەت لەکاتێکدا هیتلەرییەکان لە ڕێگایاندا بۆچوونە، مۆسکۆ و لینینگراد ئەو هەموو کوشتار و لەناوبردن وێرانکاریانەیان ئەنجامدا، هەتا ئەوکاتە دوژمن نزیکەی ملیۆنێك و ٨٠٠ سەد هەزار کیلۆمەتر خاك و زەوی وڵاتیان داگیرکردبوو وە دەستیان بە سەر نزیکەی(٨٠) ملیۆن هاونیشتمانیدا گرتبوو.

ملیۆنەها هاوڵاتی ناچارکران لە شوێنە داگیر کراوەکانی وڵاتەوە واز لە ماڵ

و حاڵی خۆیان بێنن و بەرەو خۆرهەڵاتی وڵات کۆچ بکەن. هێزەکانی سۆڤێتیش لەکاتی کشانەوە بە زۆر و ناچارییەکانیاندا بۆ ناوەوەی وڵات لە ڕۆح و گیان و پێداویستیەکانی خۆیاندا زەرەروزیانێکی یەکجار زۆریان لێکەوت.

دوژمنانیش بەهۆی ئەو بەرگرییە توندوتیژو بەردەوامەی تووشیان بوو، زەرەروزیانێکی زۆری لێکەوت.

هەتا نیوەی مانگی(تشرینی دووەمی ساڵی١٩٤٢) زیانەکانی گیانی دوژمن گەیشتە(٢) ملیۆن کوژراو و بریندار و ونبوو.

---

## هاریکاریکردنی هاوپەیمانەکان

ئەو کۆمەککردن و هاوکارییە سەربازی و پیشەسازیانەی هاوپەیمانەکانمان لە ساڵەکانی(١٩٤١ و ١٩٤٢)دا بۆ ئێمەیان دەنارد چ دەورێکیان هەبوو..؟

مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت "ئەو کۆمەکی، سووتەمەنی و باروودو ئاسن و ئۆتۆمبیل و ئازووقەو خواردەمەنیانەی کە بەدەستمان دەگەیشت زۆرکەمتربوون لەو ڕێژەیەی کە هاوپەیمانان بەڵێنیان پێدا بووین.

بێگومان ئەو کۆمەککردنانە دەورێکی باشی هەبوو.بەڵام ڕێژەو حەجمەکەی ئەوەندە کەمبوو بەشی پێداویستی و نەبوونی یەکێتی سۆڤێتی نەدەکرد. فڕۆکەوانەکان و دەستەوتاقمی دەبابەکانیشمان لەو جۆرە فڕۆکەو دەبابانە ڕازی نەبوون، کە هاوپەیمانەکانمان بۆیان دەناردین . بەتایبەت ئەو دەبابانەی بە بەنزین کاریان دەکرد، لە جەنگدا وەك بڵێسە گریان دەگرت و دەسوتان"، ئەو دوژمنانە چ جۆرێك بوون کە هێزەکانی سۆڤێتی لە سەرەتای یەکەمی جەنگدا بەرەنگاریان بوونەوە..؟

مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت "وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە زۆر گرنگ و پێویستە

بۆ ئەوەی نەوەو لاوەکانی داهاتووی سۆڤیێت تێبگەن و هەست بەو خەبات و تێکۆشانە سەختە بکەن کە گەلی سۆڤیێتی دژی ئەو دوژمنە شارەزاو دووربینە کردی.."

مارشاڵ زۆکۆف دێت ئەو جەماوەرە زۆرەی هێزەکانی دوژمن هەڵدەسەنگێنێت.. واتە سەربازان و زابت سەف و ئەفسەرەکانیان، دەڵێت "هێزەکانی ئەڵمانیا بەخۆشی و مەستیی ئەو سەرکەوتنە کتوپڕیانەی لە وڵاتە ئەوروپیەکاندا بەدەستیان هێنا، هاتنە ناوخاك و وڵاتمانەوە، هەروەها مەست و سەرگەرمی ئەو پڕوپاگاندەو بانگەوازەی(جوبلز)بوون، و باوەڕی تەواویان هەبوو کە بەئاسانی دەتوانن بەسەر سوپای سووردا زاڵبن".

لە مانگەکانی یەکەمی جەنگدا ماوەی پرسیارو لێکۆڵینەوەمان هەبوو لەگەڵ سەربازە دیل و دەست بەسەرداگیراوەکاندا، پێویستە ئەوە بڵێم من هەستم کرد ئەوانە بڕوای تەواویان بەهەر هەموو بەڵێنەکانی هیتلەر هەبوو.

وە دەربارەی مەشق و ڕاهێنانیان و ئامادەییان بۆ جەنگکردن، ئەوانە لەلایەن هەموو چەکێکەوە لە ئاستێکی زۆر بەرزدابوون بە تایبەت لەلایەن دەبابەو فڕۆکەوە، وە دەربارەی جەنگ و بەگژداچوونەوەو خزمەتی سەربازی مەیدانی. سەربازی ئەڵمانی پێویستی سەرشانی خۆی باش دەزانی و خۆڕاگرو نەترس و شانازی بەخۆوە دەکرد بە پێی ئەوە جەنگاوەرانی سۆڤیێتی بەرامبەر دوژمنێکی بەهێزی شارەزاو قاڵبوو ببوو نەوەکە نەدەتونرا هەروا بەئاسانی سەرکەوتنیان لە دەست بسێنەوە، هەروەها(ئەرکانی جەنگ)ی یەکە سەربازییەکان و پێکهاتەکانی سوپا شارەزای چۆنێتی بەڕێوەبردنی نوێی جەنگ و چالاکی و شەرکردن و بەگژداچوونەوە بوون. لە شەڕوپێکدادانەکاندا بەڕێوەبردنی هێزەکان بە ڕێگای بێتەلەوە بەڕێوەدەبرا، کە لای هێزەکان ئەو ئامێرانە زۆربوون، هەروەها لە هاوکاری و هەم ئاهەنگی نێوان هێزی ئاسمانیەکان و هێزە پیادەکانیاندا تواناو ئاستێکی بەرزیان هەبوو، لەسەرەتای جەنگدا بۆچوونی من دەربارەی سەرکردایەتی باڵای ئەرکانی جەنگی هێزەکانی ئەڵمانی بۆچوونێکی باش بوو، چونکە ئاشکرابوو ئەوان ئەو چالاکی و لێدانە سەرانسەرییەیان بەچاکی ئەنجام دەدا و ڕێبازی هێرشکردنی ستراتیجیان

باش دەستنیشان دەکرد، هەروەها لە دەستنیشان کردنی سەرکردەی پێکهاتە مەیدانییەکاندا سەرکەوتووبوون.

زۆرجاریش لە دەستنیشان کردنی کات و چرپری و شێوازی هێرشکردنەکانیاندا سەرکەوتوو نەدەبوون، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەرکەوت بۆچوونی (سیاسی-ستراتیژی) سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانی، لە بناغەوە بۆچوونێکی هەڵەبوو، لە نێوان ئەو بۆچونە بناغەییە هەڵانەدا، هیتلەرییەکان بیریان بۆ ئەوە نەچوو کە گەلی سۆڤێتی لە ماوەیەکی کەمدا توانای ئەوەی دەبێت بە سەرکردایەتی حیزب خۆی ڕێکدەخاتەوە و هەوڵی ڕێکخستنەوەو بووژاندنەوەی ئابوریی نیشتمان دەداتەوەو ئەوەی هێزە جەنگاوەرەکانی پێویستیانە لە دەبابەو فڕۆکە و تۆپ و ئازووقە و شتەکانی تر بەرهەم دەهێنێتەوە و وایلێدێت سەرکەوتنی هێزەکانی سۆڤێتی بەسەر هێزەکانی فاشیستەکاندا بهێنێت و ئەم سەرکەوتنە ببێتە سەرکەوتنێکی کۆتایی یەکلایی کەرەوە و ڕزگارکردنی خاك و زەوییە داگیرکراوەکانی.

---

# بەشی سیانزە

## (تێکشکانی هێزەکانی فاشییەکان لە ناوچەی ستالینگراددا)
## -دووەم زستـانـی ڕووســــــی-(٦,٢) ملیۆن سەربازی ئەڵمانی لەبەرەدا-بۆچوونێکی هەڵەی هەواڵگرییەکانی ئەڵمانی-

لەتشرینی یەکەمیساڵی(١٩٤٢)دا زۆرئاشکرابوو کە سەرکردایەتی ئەڵمانی ناچارە بەدرێژایی هەموو بەرەی خۆرهەڵات بچێتە بارێکی ستراتیژییەوە، چونکە ئەو زەرەروزیانە گەورانەی لە هێزەکانی هیتلەری کەوت بەتەواوی توانای هێرشکردنی لێبڕی.. ئەمە- دوای نوشوستی و سەرنەکەوتنی مەبەستی هەنگاوی یەکەمی داگیرکردن- مانای سەرنەکەوتن و شکستخواردنی دووەمی هیتلەرە لە جەنگدا دژی یەکێتی سۆڤێتی.

پروپاگاندەکانی فاشیەکان هەڵمەتێکی بەرفراوانیاندا لە پێناو خۆئامادەکردن و بەرەنگاربوونەوەی دووەم زستانی ڕووسیدا بە شێوەیەکی وردترو خۆئامادەکردنێکی باشتر..

سەرکردایەتی ئەڵمانییەکان داوایان لە هێزەکانیان کرد سەنگەری بەرگریکردنی توندو بەهێزپێکبهێنن کە ڕێگا خۆشکەربێت بۆ کاتی سەرکەوتن و کۆتاپێهێنانی جەنگ لە ساڵی(١٩٤٣)دا. لەسەرەتای مانگی تشرینی دووەمی ساڵی(١٩٤٢)دا هێزەکانی ئەڵمانی لەبەرەی ئەڵمانی سۆڤێتیدا پێکهات بوو لە (٦,٢) ملیۆن سەرباز و زیاد لە(٧٠) هەزار تۆپی مەیدانی و ئامێری جۆراوجۆر و(٦٦٠٠)

دەبابە و(٣٥٠٠) فرۆکەو(١٩٤) کەشتی جەنگی. هێزەکانی ئێمەش هەر لەهەمان کاتدا پێکهات بوو لە(٦,١) ملیۆن سەربازی جەنگاوەر و (٧٢,٥) هەزار تۆپی مەیدانی و ئامێری جۆراوجۆر و (٦٠١٤) دەبابەو (٣٠٨٨) فرۆکەی جەنگی و ئەو یەدەکییە ستراتیژیانەی لە ژێردەستی سەرکردایەتی باڵادابوون بریتی بوون لە(٢٥ فیرقە و ١٣ فەیلەقی دەبابە و زرێپۆش و ٧ لیوای پیادەو دەبابە، لەسەر ئەو بناغەیە هەنگاوی دووەمی جەنگ دەست پێکرد و تای تەرازووی هێز گۆڕا و بەلای بەرژەوەندی یەکێتی سۆڤێتدا شکایەوە.

سەرکردایەتی هێزە پیادەکانی ئەڵمانی لە بریاری ژمارەیەکی (١ی بەرواری ١٤ی تشرینی یەکەمی١٩٤٢)دا دەڵێت"هێزەکانی رووس لەم شەڕوپێکدانانەی ئەم دواییەدا هێزەکانیان لاوازبووە و لە توانایاندا نەماوە لەم زستانی(١٩٤٢-١٩٤٣) یەدا بتوانن هێز هێندەی زستانی رابوردوو کۆبکەنەوە."

لەسەرکردایەتییە باڵاکانی ئێمەشدا کاری خێرایی و گورج و گۆڵ لەبەرەی خۆرئاوادا دەکرا، بەمەبەستی سەرلێشێوان و هەڵخەڵەتاندنیان کەوا سەرچاوەی خەتەری بەتەواوی لەم بەرەیەوەیە هەر بەراستی دوژمن بروای کرد و کەوتە ناو داوی ئەو خەڵەتان و فێڵەوە، لەبەرئەوە ئەویش هێزو مۆڵگاکانی خۆی لەوێدا ئامادەکرد. لەراستیشا سەرکردایەتی باڵای سۆڤێتی لە بەرەی ستالینگرادەوە خۆی بۆ هێرشێکی گشتی ئامادەدەکرد، بارودۆخی دوژمن زۆرخراپ بوو، چونکە هەواڵگرییەکانیان شکستیان هێناوە نەیانتوانی دەستنیشانی شوێنی خەتەربکەن، لە ناوچەی ستالینگراددا ئەو هێزانەی ئێمە لەوێدا کۆمانکردبوونەوە، گەیشتبووە یانزە(١١ سوپا و چەند فەیلەقی سوارەو دەبابەو زرێپۆش).

پاش مردنی ستالین جۆرێك لە نەهێنی و نادیاری دروستبوو کە پەیوەندی گرنگی بەدانانی پلانی دژە هێرش بردنەوە هەبوو لەمەوپێش ئاماژەم بەو هەوڵ و کارانەدا کە لە دانانی ئەو پلانەدا، درا، گەرچی ئەمڕۆ ئەو کێشەو مەسەلەیە گرنگییەکی تایبەتی ئەوتۆی نییە، بەڵام من وای بەچاکدەزانم، پێویستە هەڵوێستەکە روونبکەمەوە.

بۆچوونێك هەبوو کە چالاکی هێرشی داهاتوو رایەڵە بناغەیی و سەرەکییەکانی

لە مانگی(ئابی ١٩٤٢)دا لەسەرکردایەتی باڵاوە دانراوە و ئەو پلانە بناغەییە لە ناوەڕۆکدا شێوازێکی سنوورداری هەیە، بەڵام ئەوەپلانێکی بناغەیی نەبوو بۆ چالاکی دژەهێرش، بەڵکو تەنها چالاکی لێدانێك بوو بۆ مەبەستی ڕێگاگرتن بوو لە دوژمن لە چوونە پێشەوەیدا بەرەو ستالینگراد، بۆچونێکی تریش هەبوو کە ئەو پلانە لەسەر دەست پێشخەری خودی بەرەی ستالینگرادەوەبوو.

جەنەراڵ(فاسیلیفسکی) لەبیرەوەرییەکانیدا وەڵامی ئەو بۆ چوونانە دەداتەوە و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە گەورەیی دانانی ئەو پلانە دەگەڕێتەوە بۆ سەرکردایەتی باڵا و ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ.

بۆ دانانی پلانی کارێکی ستراتیجی گەورە، وەك ئەوەی کە سێ بەرە لە ناوچەی ستالینگراددا هاوبەشیان تیاکرد.. نابێت تەنها لەلایەکی سنوورداری کارەکانەوە بەرەو پیری بچیت، بەڵکو دەبێت حسابات بۆ توانای ماددی و تەکنیکی بکرێت و لەوەوە دەست پێبکرێت. کێ بۆ ئەو ئاستە دەتوانێت دەستنیشانی داهات و هێزی پێویست بۆ ئەو کارانە بکات..؟

بێگومان ئەو لایەنەیە کە دەستی بەسەر داهات و هێزەکاندا گرتووە لەم حاڵەتەشدا ئەو لایەنە جگە لەلایەنی سەرکردایەتی باڵا و ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ نەبێت کەسی تر نییە.

مارشاڵ زۆکۆف ئاماژە بۆ قارەمانی و ئازایی و خۆراگری هێزەکان و سەرکردایەتییەکەی دەکات لە جێبەجێکردنی ئەو چالاکییە ستراتیجیە گەورەیەدا و دەڵێت"لەبەرئەوە نابێت باسی(مافی دانان) بە تایبەت بۆ من بکرێت." مارشاڵ زۆکۆف باسکردنی ڕووداوەکان بە دوورودرێژی بە پێویست نازانێت، چونکە پەرتووکە مێژووییەکانی یەکێتی سۆڤێت بە شێوەیەکی گشتی و بەڕاستی تیشکیان خستۆتە سەر ئەو باسانە.

لەسەرەتای هەنگاوی یەکەمی پلانی دژە هێرشەکەدا بەرەی باشووری خۆرئاوا بە سەرکردایەتی جەنەراڵ(فاتۆتین) دەورێکی گەورەو باڵایان بینی.

وە دەبوو بەرەی(دون) دوو لێدانیان بسرەواندایەتە دوژمن، یەکەمیان بەمەبەستی بڕین و تێپەڕبوونی بەرگری دوژمن لە ڕۆخی چەپی ڕووباری(دون)ەوە.

لێدانی دووەمیش بە لێواری بەشی ڕاستی ڕووباری دوندا بە مەبەستی دابڕانی هێزەکانی دوژمن لەو ناوچەیەدا لە هێزە سەرەکییەکانی ناوچەی ستالینگراد.

وە بەرەی ستالینگرادیش دەبوو لەوناوچەیەوە کە کەوتبووە نێوان(ئیفانۆفکا) و سنووری باکوری دەریاچەی(بارمنتاك) هێڵەکانی بەرگی دوژمن ببڕێت و پاشان پەرە بە چالاکی و هێرشەکانی بدات بەرەو باکوری خۆرئاوا هەتا لە(کالانش-خرۆتۆسوفیتسکی)دا بە هێزەکانی بەرەی باشوری خۆرئاوا بەیەك دەگەنەوە، بەو شێوەیە دەتوانرێت لە ناوچەی ستالینگراددا گەمارۆی دوژمن بدرێت.

مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت ئامادەکاری بۆ ئەو چالاکی و کردارانە پێویستی بە کۆکردنەوەو و ئامادەکردنی هێزو پێداویستی و هاریکاری کردنێکی گەورەو بە توانابوو.

لە ماوەی نێوان(١) تشرینی دووەم تا ١٩ی تشرینی دووەم لەو ماوەیەدا بەرێگای ڕووباری(فولگا)دا (١٦٠) هەزار سەرباز و (١٠) هەزار وڵاخ و(٤٠٠) دەبابە و(٦٠٠) تۆپی مەیدانی و(١٤) هەزار ئۆتۆمبیل و نزیکەی(٧٠٠٠) هەزار تەن ئازوقەو جبەخانە ڕەوانەکرا.

"وە لە کۆتایی تشرینی یەکەم و سەرەتای تشرینی دووەمدا من و فاسیلیفسکی و کەسانی تری نوێنەرانی سەرکردایەتی پێکەوە بەناو هێزەکاندا گەراین و هەوڵێکی زۆرماندا بەمەبەستی یارمەتیدانی سەرکردەو سەرۆك ئەرکانەکانی جەنگ بۆ شارەزایی کردنی تەواویان بۆ فێربوون و شارەزایی پلانی دژە هێرش و شێوازی جێبەجێکردنی، ئەو کۆبوونەوانەمان لەگەڵ سەرکردایەتی بەرەکان و لەشکرو پێکهاتەکانیاندا دەریخست کە سەرکردایەتی سەربازی و سیاسی لە هەموو لایەنێکەوە بەرۆحێکی هەست بە لێپرسیارێتی یەکی گەورەو شارەزاییەکی نوێوە بەکارەکانیان هەستان، هەروەها ڕێکخراوە سیاسی و حیزبییەکان و کە کەسایەتییە بەرپرسەکان لە ناو یەکە جەنگاوەرەکاندا بەکاری سیاسی گەورە هەڵدەسان، ئەم لایەنە گەورەیە و ئامادەکارییە بۆ شەڕو ڕووبەڕووبوونەوەیە، زۆر بە تواناوە لە ژێر چاودێری ئەنجومەنی سەربازی و بەڕێوەبردنی سیاسی بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ(ڕۆداکۆف) بەڕێوە دەبرا.

(له مانگی تشرینی دووەمدا سەرکردەی باڵام ئاگادارکردەوە لە هەڵوێستەکەو ئەو کەموکوڕی و خۆئامادەکردنەی کە دەبێتە دواخستنی کاتی کاروچالاکییەکە)
پێویستە ئەوە بڵێم کە سەرکردەی باڵا ئاسایی لە کاروچالاکییەکاندا بۆ دڵنیایی زۆرگرنگی تەواوی بەهێزە ئاسمانییەکان دەدا. لەبەرئەوە هەرکە سەرکردەی باڵا شکات و گازاندەکەی منی دەربارەی کەموکوڕی و ئامادەکاری هێزەکانی ئاسمانی بۆ کارەکە پێگەیشت..

ئەم نامەیەی بۆ ناردم..

(بۆ هاورێ کۆنستنتینۆف.. (نازناوی حیزبی زۆکۆف)ە ئەگەر ئامادەکاری ئاسمانی بۆ چالاکییەکە لای برمینکۆ و فاتۆتین تەواو نەبێت لە دوایدا ئەنجامی چالاکییەکە سەرکەوتوو نابێت و شکست دێنێت. قاڵبوون و شارەزایی جەنگ لەگەڵ ئەڵمانەکاندا دەیسەلمێنێت چالاکی دژی ئەڵمانەکان هەرگیز سەرکەوتوو نابێت لەیەك باردا نەبێت، ئەویش ئەوەیە کە دەبێت لە هێزی ئاسمانیدا بەسەریاندا زاڵبین، لەبەرئەوە پێویستە هێزە ئاسمانییەکانمان سێ کار جێبەجێ بکەن..

١ـ چالاکی هێزە ئاسمانییەکانمان ئاراستە بکەنەسەر ناوچەی پێشکەوتنی هێزە دەست وەشێنەکانەوە بۆ ئەوەی فڕین و هاتوچۆی فڕۆکەکانی ئەڵمان پەك بخەن و لە کاریان بخەن.

٢ـ بەردەوام بۆمب بارانی ئەو هێزە ئەڵمانیانە بکەن کە ڕووبەڕووی هێزەکانمان دەبێتەوە و ڕێگا بکەنەوە بۆ پێشەوەچوونی هێزە هێرش بەرەکانمان.

٣ـ بە دواکەوتن و ڕاوەدوونانی ئەو هێزانەی دوژمن کە پاشە کشێ دەکەن، بە بۆمب باران و هێرشکردنی بەردەوامیان بۆ ئەوەی بە تەواوی بڵاوەیان پێ بکرێت.

تاکو نەتوانن بەزوویی لە نزیکترین هێڵی بەرگرییاندا کۆببنەوە، ئەگەر(نۆفیکۆف) دەزانێت هێزە ئاسمانییەکانمان، لەم کاتەدا توانای ئەو کارانەیان نییە، باشتروایە ئەو چالاکی و کارانە ڕابگرێت، هەتا بە تەواوی ئاپۆرەی هێزە ئاسمانییەکانمان تەواودەکەین"

ئیمزا: فاسیلیف

(فاسیلیف.. نازناوی ستالینه..

هەر ئەو نازناوەشە لە کاتی خۆی لە کارە نەهێنیەکانی خۆ ئامادەکردن بۆ شۆڕشی ئیشتراکی هەیبوو.. ناوی ڕاستیشی(جیفاشیفللییە..)

---

# پلانێکی نوێ

لە(١٣ی تشرینی دووەم)دا ژەنەراڵ زۆکۆف و ژەنەراڵ فاسیلیفسکی گەڕانەوە بۆ مۆسکۆ، خودی سەرکردەی باڵایان لە پلانی کۆتایی چالاکی هێرشکە بەپێی بارودۆخی واقیعی ئاگادار کردەوە. لەو کاتەدا ئەندامانی ئەنجومەنی بەرگری نیشتمانی و هەندێك لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی حیزب هاتنە ژوورەوە.. لەبەرئەوە دەبوو هەردوو جەنەراڵ هێڵە سەرەکییەکان سەرلەنوێ بە کورتی بخەنەوە ڕوو.

پاش گفتوگۆ و چەنەحانێیەکی کورت.. پلانەکە پەسەندکرا .. ئێمە سەرنجی سەرکردەی باڵامان بۆ ئەوە ڕاکێشا کە سەرکردایەتی ئەڵمانییەکان کاتێك لە ستالینگرادا ڕووبەڕووی هەڵوێستێکی ناهەموار دەبنەوە، ناچاردەبن هەندێك لە هێزەکانیان لەو هێزانەی لە هەرێمەکانی تردا جێگیربوون بیانکێشێتەوە و بۆ شەڕ بیانێرێت، بەتایبەت ئەو هێزانەی لە هەرێمی(فیازما)دایە بۆ هاوکاری و یارمەتیدانی ئەو کۆمەڵە هێزانەی لەبەرەی باشووردایە. وە بۆ ئەوەی ڕێگا لەو کارەبگیرێت و ئەوە ڕوونەدات، پێویستە ئامادەکاری و چالاکی هێرشکردن لە هەرێمی باکوری(فیازما)دا جێبەجێ بکرێت، پێشنیارمان کرد بۆ جێبەجێکردنی ئەو چالاکییە داوا لە بەرەی(کالینین) و بەرەی خۆرئاوا بکرێت بەو کارەهەڵسن، ستالین وەڵامیدایەوە.

ـ ئەوە کارێکی موناسب و باشە و لە شوێنی خۆیدایە.. کامتان لە ئێوە بەو

کاره هەڵدەسێت..؟

لەبەرئەوەی من و فاسیلیفسکی هەردووکمان پێشەکی لەسەرئەوە پێکهاتبووین.. وتم...

ـ کاروچالاکی ستالینگراد لە هەموو لایەنێکەوە ساز و ئامادەیە لەبەرئەوە(فاسیلیفسکی) دەتوانێت سەرکردایەتی چالاکی و هەمئاهەنگی لە نێوان هێزەکانی ناوچەی ستالینگرادد‌ا بکات و منیش سەرکردایەتی و ئامادەکاری بۆ دژە هێرش دەکەم لەبەرەی(کالینین) و بەرەی خۆرئاوادا. سەرکردەی باڵا ڕەزامەندی لەسەر پێشنیارەکانمان دەربڕی.. پاشان وتی.. "سبەینێ بەیانی پێکەوە بچن بۆ ستالینگراد و جارێکی تریش جەخت لەسەر ئامادەکاری هێزەکان و سەرکردایەتی بکەنەوە بۆ دەست پێکردنی ئەو کاروچالاکییە."

لە(١٤ی تشرینی دووەم)دا سەرلەنوێ گەڕامەوە بۆ ناو هێزەکانی(فاتۆتین) (فاسیلیفسکی)یش بەرەو هێزەکانی(بریمنکۆ) کەوتەڕێ)

بۆ ڕۆژی دوایی لە ستالینەوە ئەم بروسکەیەم پێگەیشت..!

(بۆ هاوڕێ.. کۆستنتینۆف).. تەنها بۆ خودی خۆی.. ڕۆژی بەڕێکەوتنی.. (فیدرۆف و ئیفانۆف) تۆ چۆنت دەوێت خۆت دەتوانیت دەستنیشانی بکە.. پاشان کە گەڕایتەوە بۆ مۆسکۆ لەوە خەبەردارم بکە...

ئەگەر ویستیشت یەکێکیان بە ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ پێش ئەوی تریان بکەوێت.. من خۆت سەرپشك دەکەم بە پێی بۆچوونی خۆت ئەو مەسەلەیە جێبەجێ بکە.

ئیمزا... فاسیلیف

١٩٤٢/١١/١٥

سەعات١٣,١٠دەقیقە

بەڕاوێژکردن لەگەڵ فاسیلیفسکیدا بڕیارماندا بەرەی باشوری خۆرئاوا و سوپای شەست و پێنجی بەرەی(دون) لە(١٩ی تشرینی دووەم)دا هێرشەکەی دەستپێبکات.

و بەرەی ستالینگرادیش هێرشەکەیان لە ٢٠ ی تشرینی دووەمدا دەست پێبکەن... و سەرکردەی باڵاش پشتگیری لە بڕیارەکانمان کرد لە(١٧ی

تشرینی دووەم)دا گەڕامەوە بۆ مۆسکۆ. بۆ ئامادەکاری چالاکی دژە هێرش کە ڕێککەوتبووین لە کاتژمێری(٧,٣٠) حەوت و نیوی بەیانی(١٩ی تشرینی دووەم)دا دەست بە هێرشە بکرێت.

بەباشی و.. پاش شەڕوپێکدادانێکی توندوتیژ لە هەموو لایەکی دیاریکراوی ناو پلانەکە، لە ڕۆژەکانی یەکەمی کانوونی یەکەمدا، توانرا گەمارۆی هێزەکانی دوژمن بدرێت، بەوە کۆتایی بە هەنگاوی یەکەم هێنرا و دەستکرا بە هەنگاوێکی تر، ئەویش پاککردنەوەو نەهێشتنی هێزە فاشییە گەمارۆدراوەکان بوو، لە درەنگ وەختێکی شەوی (٢٨ی تشرینی دووەم)دا ستالین بۆ بنکەی بەرەی کالینین پەیوەندی بە زۆکۆفەوەکرد و هەواڵ و پرسیاری گۆڕانکاری و بەسەرهاتەکانی ناوچەی ستالینگرادی لێپرسی و دەربارەی پاککردنەوەو نەهێشتنی هێزە ئەڵمانییە گەمارۆدراوەکانی دەوروبەری ستالینگراددا داوای پێشنیاری لێکرد.

(لە٢٩ی تشرینی یەکەم)دا جەنەراڵ زۆکۆف بروسکەیەکی بۆ سەرکردەی باڵانارد لەو بروسکەیەدا دەستنیشانی ئەگەری گۆڕانکارییەکانی هەڵوێستەکەی تیادا کرد، و پێشنیازی گرتنەبەری ڕێگای پێویستی کرد کە نەهێڵرێت هێزەکانی ئەڵمانی لە هەرێمی(نیجیتی تشرسکیا و کۆتیلنسیکۆ)دا بچنە پێشەوە و لەگەڵ هێزە ئەڵمانییە گەمارۆدراوەکاندا یەك بگرنەوەو ڕێگایەکی زەمینی پێکبهێنن بۆ شکاندنی گەمارۆکە. وە پێویستە هێزە گەمارۆدراوەکانی ئەڵمانی بکرێت بەدوو بەشی لە یەکتر جیاوازەوە.

پاش جیاکردنەوەی دوو کۆمەڵەکە لە یەکتر.. دەبێت دەستبکرێت بەلێدان و لەناوبردنی بەشە بێ هێزەکەیان لەدوای ئەوە هێزەکان دەستبکەن بەلێدانی ئەو هێزەی وان لە ناوچەی ستالینگراددا..

لە نیوەی یەکەمی مانگی(کانونی یەکەم)دا چالاکی لەناوبردن و پاککردنەوەی هێزە گەمارۆدراوەکان بە شێوەیەکی زۆر هێواش بەڕێوەدەچوو..

چونکە ئەو هێزە ئەڵمانییانە.. هیتلەر خودی خۆی بەڵێنی کۆمەك و یارمەتی پێدابوون... لە گشت لایەکەوە بە شێوەیەکی ئازایانە و دڕندانە شەڕیان دەکرد و هێزەکانی ئێمەش لەو هێرشانەیاندا ئەوسەرکەوتن و پێش چوونەی چاوەڕوان دەکرا

بە دەستیان نەهێناو ئامانجیان نەپێکا.

چونکە بەشێکی زۆری ئەو هێزانەمان رووبەرووی ئەو هێزانەی ئەڵمانیا ببوونەوە کە لە هەرێمی(کۆتیلینیکۆنۆ)وە هاتبوون، بەنیسبەت ئەڵمانەکانەوە لە رووی ستراتیژییەوە، تێکشکان لە شەڕی ناوچەی ستالینگراددا بۆیان دەبووە هەرەشەو کارەساتێکی گەورەو ترسناك.

---

## بۆ رزگارکردنی بارودۆخەکە

بۆ رزگارکردنی بارودۆخی گشتی سەرکردایەتی هیتلەرییەکان لە پێش هەمووشتێکدا دەیانویست پارسەنگی ئەو هێزانەی لەبەرەی بەرگریکردنی لای ستالینگرادان وەك خۆی راست بکاتەوە، ئەویش بەوەی لە ژێر چاودێری و پاراستنی خۆیدا هێزەکانی سوپای(أ) لە قۆقازدا بکشێنێتەوە.

بۆ ئەو مەبەستە سەرکردایەتی هیتلەرییەکان سوپایەکی نوێیان پێکهێنا بەناوی(سوپای دون)ەوە بەسەرکردایەتی فیلدمارشاڵ(مانشستین) کە سەرکردە ئەڵمانییەکان دایاننابوو بەسەرکردەیەکی شارەزاو بەتواناو گەورەترینی سەرکردەکان. بۆ پێکهێنانی ئەو لەشکرە هەندێ هێزی ئەڵمانی کە لە هەرێمەکانی بەرەی ئەڵمانی. سۆڤێتی و هەروەها لە بەرەکانی فەرەنسا و ئەڵمانیادابوون کێشرانەوە. هەروەك لە دوایدا ئاشکرابوو، فیلد مارشاڵ مانشستینی پێشنیازی کردبوو بۆ رزگارکردنی ئەو هێزانەی گەمارۆدرابوون دەبێت دووهێزی گورزوەشێنی پێکبهێنرێت.

یەکەمیان لە ناوچەی(کۆتیلینیکۆ) و دووەمیان لە ناوچەی(تۆرموسین)دا بێت، بەڵام قەدەر(خوا) نە بەدەم پێشنیارەکەی مانشتین و نە بەهانای هێزە گەمارۆدراوەکانی ئەڵمانیاوە.. هات، چونکە سەرکردەی باڵای ئەڵمانی لەو

کاتەدا بەدەست کەمی هێزە یەدەکییەکانییەوە گرفتاربوون.

وە ئەو هێزانەشی کە توانی کۆیان بکاتەوە زۆر بە هێواشی توانییان بەو هێڵی گواستنەوە دوورودرێژانەدا رەتبێت چونکە پێشمەرگەکانمان لەپشت دوژمنەوە دەیانزانی هێزەکانی ئەڵمانی لەبەرچی لە رۆیشتنیاندا بەرەو باشور پەلەیانە لەبەرئەوە ئەو پێشمەرگانە هەرچییان لە تواناادا بوو بۆ پەکخستن و دواکەوتنی ئەو هێزانەی دوژمن کردیان و تێکۆشان.

لەگەڵ ئەو هەموو رێگاوکارە توندوتیژییە ئەمنییە بەهێزانەی لەلایەن هێزەکانی ئەڵمانییەوە گیرابووە بەر پێشمەرگە نەبەزو دلێرەکانمان توانییان دەیەها کاروانی هێزەکانی هیتلەرییەکان تێکبشکێنن و لەناویان بەرن، کات بە خێرایی تێپەردەبوو، ئەو پلانەی دایانرشتبوو بۆ رزگاربوون و دەرچوون لەو گەمارۆیە بەردەوام تووشی شکست و دارمان دەبۆوە.

کاتێك هیتلەر لە دەوروبەری ستالینگراددا هەستی بە نزیکبوونەوەی مەرگی هێزە گەمارۆدراوەکانی کرد، فەرمانی بەمانشستیندا دەست بە هێرش و چالاکییەکانی بکات، بێئەوەی چاوەروانی کۆکردنەوەی تەواوی هێزەکان بکات، لە(١٢ی کانونی یەکەم)دا مانشستین لە ناوچەی(کۆتیلینکۆفۆ) بە لێواری هێڵی ئاسنینی شەمەندەفەردا هێرشەکەی دەست پێکرد.

پاش شەرو کوشتارێکی توندوتیژ هێزە هێرشبەرەکەی ئەڵمانی و هێزە بەرگری کارەکانی سۆڤێتی زەرەرو زیانێکی بێشوماریان لێکەوت و هێزەکانی مانشستین توانییان بێنە پێشەوە و(٤٠) کیلۆمەتر لە ستالینگرادەوە دووربوون، دیاربوو دوژمن وایدەزانی زۆر لە سەرکەوتن نزیکبۆتەوە، بەڵام ئەو هیوایەی لە شوێنی خۆیدا نەبوو.. چونکە بەپێی فەرمانی سەرکردایەتی باڵا(فاسیلیفسکی) سوپای دووەم بەسەرۆکایەتی(مالینوفسکی وەزیری بەرگریی پێشووی سۆڤێت کاتێك ژەنەراڵ زۆکۆف ئەم بیرەوەرییانەی دەنووسێت مالینوفسکی ئەوکاتە دووساڵ لەوەپێش کۆچی دوایی کردبوو)

رەوانــەی کۆری جەنگ دەکات. ئەو سووپایەش لەشکرێك بوو بەباشی پرچەککرابوو بە دەبابەو تۆپی مەیدانی، ئەو سوپایە توانی بەو لێدان و

دەستوەشاندنەی پاشەڕۆژی جەنگ بە سەرکەوتنی هێزەکانی سۆڤێتی یەکلایی بکاتەوە.

لە(١٦ی کانونی یەکەم)دا هێزەکانی بەرەی باشوری خۆرئاوا و سوپای شەشەمی سەربەبەرەی(فورتیچ) دەستیانکرد بە جوولاّن و هێرشکردن بەرەو ناوەندی حەوزی رووباری دوون بۆ لە ناوبردنی ئەو هێزە ئەڵمانییانەی لەوێدابوون و لەوێوە هێرشبکەنە سەر دواوەی هێزەکانی دوژمن کە لە(تۆرموسین)دابوون.

لەسەر ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی ئەو هێزانە(مانشتین) ناچاربوو ئەو هێزانەی دانرابوون بۆ هێرشکردن لە ناوچەی(تۆرموسین)دا دابەشبکات و بلاّوە پێبکات.

ئەو هێزانەی سوپای(دوون) کاتێکیان زانی رووبەرووی هێزەکانی بەرەی باشوری خۆرئاوابوونەوە کە لەپشت و هەردووباڵەوە هێرشیان دەکردنەسەریان و دەستیان لێدەوەشاندن لە(٢٨ی کانونی یەکەم)دا جەنەراڵ(فاتۆتین)ی سەرکردەی بەرەی باشوری خۆرئاوا پەیوەندی بەسەرکردایەتی بالاّوە کرد و وتی"دەتوانم بڵێم ئەو هێزانەی دوژمن کە لە بەرامبەر بەرەدا بوون و بریتی بوون لە(١٧) فیرقە بە تەواوی لە ناوبران و تیاچوون.

زیاد لە(٦٠) هەزار سەربازی دوژمنمان دیل کردووە و نزیکەی ئەو ژمارەیەش لەو شەڕ و کوشتارەدا کوژران و بریندداربوون، ژمارەیەکی کەم نەبێت لە پاشماوەی هێزەکانی دوژمن هیچی تر نەماون کە بتوانن بەرگری بکەن."

---

# قارەمانێتی

مارشاڵ زۆكۆف هەڵوێستە لەسەر قارەمانێتی فەیلەقی بیست و چوار دەكات، بەسەرۆكایەتی جەنەراڵ بادانۆف ئەو فەیلەقە توانییان بەرگریكردنی دوژمنی گەمارۆدراو ببڕن و ماوەی(٣٠٠) كیلۆمەتر بچنە پێشەوەو پاش شەڕو كوشتارێكی گەرم لەو شەڕەدا توانییان(٦٧٠٠) سەربازی هێزەكانی دوژمن لەناو بەرن و بەرەو لای وێستگەی(تەئتسیك) بڕۆن و لە هەمووولایەكەوە(یەكسەر) واتە بێ ڕاوەستان هەڵمەت بەرن هەتا هەل بەدوژمن نەدەن بۆ خۆكۆكردنەوەی تەواو بۆ بەرەنگاربوونەوە. لەو كاتەدا نەقیب(فۆمین) توانی بەهێزی دەبابەكانییەوە بچێتە ناو ویستگەكەوە و هێڵی ئاسنی (ستالینگراد- لیخایاتیك) بشكێنێت و بەجارێك هێزی ویستگەكە لەناوبەرێت و دەست بەسەر ئەو شاحینە فڕۆكانەدا بگرێت كە تەنها ئەوەندەیان مابوو بیانبەستن و سازیان بكەن، بەڵام بەداخەوە لەو كاتەدا قارەمان نەقیب(فۆمین) بە گوللەیەكی وێڵ شەهیدكرا و بە مردنێكی قارەمانانە شەهیدبوو.

دوای ئەوە هێزی دەبابەكان بە سەرۆكایەتی نەقیب(نیتشایف) هێرشی كردە سەر فڕۆكەخانەكە كە(٢٠٠) فڕۆكەی گواستنەوە لەسەر زەوی فڕۆكەخانەكە ئامادەی فڕین بوون، بەڵام ئەو فڕۆكانە نەیانتوانی بەرزببنەوە، دەبابەكانمان هەموویان شێلاو تێكوپێكیان دان، بەڵام هێزەكانی دوژمن توانییان گەمارۆی دەبابەكانی فەیلەقی بیست و چوار بدەن و ماوەی پێنج شەو و پێنج ڕۆژ ئەو فەیلەقە توانییان بە بەردەوامی شەڕبكەن.

وە لە(٢٩)ی تشرینی دووەمدا بە هۆی ئازایی و نەترسی جەنگاوەران و سەرۆكایەتی لەبەرچاوی جەنەراڵ(بادانۆف)ەوە ئەو فەیلەقە لەو گەمارۆیە ڕزگاربكەن.

وە لەبەر ئەو دەورە گەورەو لەبەرچاوەی فەیلەقی بیست و چوار، لە شەڕوپێكدادانی(فۆڵگا) و (دوون)دا نواندیان جەنەراڵ(بادانۆف) بۆ یەكەمجار لە

یەکێتی سۆڤێتیدا مەدالیای(سۆفۆرۆف)ی پلەدووی پێدرا و ژمارەیەکی زۆری ئەفسەرو سەربازانی فەیلەقەکە مەدالیاو ویسامی جۆراوجۆریان پێدرا.



دوای ئەو شەڕوپێکدانە سەرکەوتوانەی هێزەکانی بەرەی ستالینگراد و بەرەی باشوری خۆرئاوا پێی هەستان. سەرکردەی سوپای(دوون)ی ئەڵمانی فیڵد مارشاڵ(مانشستین) نائومێدبوو لە شکاندن و لابردنی گەمارۆی سەرهێزە گەمارۆدراوەکانی فیڵدمارشاڵ(باولۆس)ی ئەڵمانی لە ناوچەی ستالینگراددا.

کاتێك سەرکردایەتی و هێزەکانی ئەڵمانی هەستیان بەوە کرد، ئەوەی لە توانایاندابوو، بۆ خۆقوتارکردن لەو گەمارۆیە هەوڵیاندا، هەتا بە تەواوی لە ئاخریدا نائومێدبوون.

سەرکردایەتی سیاسی سەربازی هیتلەرییەکان دوای ئەوەی دڵنیابوون لە شکستی و سەرنەکەوتنی کۆتایی لەلابردنی گەمارۆی سەر هێزەکانی فیڵدمارشاڵ(بارلۆس)

و له مردنی تەواوەتی ئەو لەشکرە.

وایان لێهات واز له مەبەستی سەرەکی ئەو لەشکرە بهێنن که ڕزگارکردنی ژیانی گەمارۆدراوەکانی بوو، هاتن ناچاریان کردن تا چەند دەتوانن له شەڕو کوشتاردا بەردەوام بن به مەبەستی هیلاك و ماندوکردنی هێزەکانی سۆڤێتی، چونکه پێویستیان به کاتێکی یەکجار زۆرهەبوو بۆ ئەوەی هێزەکانی قۆقازی بکشێنێتەوەو لەبەرەکانی تریشییەوە هێز کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی بەرەیەکی نوێ پێکبهێنێت که تا ڕادەیەك بتوانن دژە هێرشەکانی سۆڤێتی ڕابگرن.

# پاككردنەوەی هێزەكانی ئەڵمانی

سەرکردایەتی باڵای سۆڤێتی وای به چاکزانی بەزووترین کات هێزە گەمارۆدراوەکانی دوژمن پاك بکرێنەوە، بۆ ئەوەی هێزەکانی ئەو دووبەرەیەی لەو ناوچەیەدان بتوانن ئەو هێزانەی که ئەڵمانیا له قۆقاز و بەشی باشوری یەکێتی سۆڤێتیدا دەیانکێشێتەوە له ناوبەرن.

له کۆتایی کانوونی یەکەمدا، له کۆبوونەوەی ئەنجومەنی بەرگری نیشتمانیدا.. سەرکردەی باڵا وتی..

ـ پێویستە سەرکردایەتی کردنی چالاکی پاككردنەوەی گەمارۆدراوەکانی دوژمن بدرێت بەیەك کەس، چونکه ئەگەر دووسەرکردە بێت و له دوو بەرەیەدابن کارەکان بەباشی ناڕوات بەڕێوە و تێکدەچێت، ئەندامانی ئەنجومەن بەگشتی ئەو بیروڕایەیان پەسەند کرد.

ـ ئەو سەرکردەیە کێیە که ئێمە ئەو کارەی پێبسپێرین و داوای لێبکەین بەتەواوی دوژمن لەناوبەرێت..؟!! پاشان سەرکردەی باڵا ڕووی کردە من و وتی...

ـ تۆ.. بۆچی بێدەنگییت..؟!!

ـ هەردوو سەرکردەکان جێگای باوەڕپێکردنن، بەڵام(بریمنکۆ) لە دڵا پێناخۆش دەبێت سەرکردایەتی بەرەی ستالینگراد تەسلیم بە ڕاکا سۆفسکی بکات..

ـ ئێستا کاتی لەبەرخاتروخۆتر نییە.. ستالین بەوە قسەکەی پێبڕیم و فەرمانی پێدام بڕیاری ئەنجومەنی نیشتمانی بە(بریمنکۆ) ڕابگەیەنم، هەرلەهەمان شەودا بەبێتەڵ پەیوەندیم بە جەنەراڵ بریمنکۆوە کرد.. پێم وت:-

ـ ئەندریە ئیفانۆفتیش، ئەنجومەنی بەرگری نیشتمانی بڕیاریانداوە، سەرۆکایەتی پاککردنەوەی کۆتایی... ئەو هێزانەی دوژمن کە لە ناوچەی ستالینگرادا بدرێت بەڕاکاسۆفسکی، لەبەرئەوە پێویستە تۆ هێزەکانی سوپای پەنجاوحەوت و شەست و دوو، چوار، وشەست و چواری سەربە بەرەی ستالینگراد بخەیتە پاڵ بەرەی(دوون)ەوە بۆ ئەوەی بچنە ناو هێزەکانی ئەوەوە...

ـ بریمنکۆ... لێیپرسیم.. مەبەست لەوە چییە؟

منیش مەبەستی ئەو بڕیارەم بۆ باسکرد.. دیاربوو(ئەندریە ئیفانوفیتش) لەو بڕیارە زۆر دڵگران و تووڕەبوو.. دیاربوو لە حاڵێکدابوو نەیدەتوانی بەهێمنی و لەسەرخۆ قسە بکات.

ـ پێم وت.. پاش تۆزێکیتر تەلەفۆنم بۆ بکەرەوە.. پاش(١٥) دەقیقە سەرلەنوێ زەنگی تەلەفۆن لێدرایەوە.

ـ هاوڕێ فەریقی یەکەم.. من هێشتا لەوە ناگەم هۆی چییە کە سەرکردایەتی دوون بە چاکتر دەزانن..؟

من تکات لێدەکەم بە هاوڕێ ستالین ڕابگەیەنە من هەتا دوا پاککردنەوەی دوژمن حەزدەکەم لێرە بمێنمەوە.. منیش پێشنیازم بۆ کرد.. وتم..

ـ تۆ خۆت لەو بارەیەوە پەیوەندی بەسەرکردەی باڵاوە بکە.. بریمنکۆ.. وەڵامی دامەوە وتی..

ـ من خۆم هەوڵی ئەوەمداوە، بەڵام(یوسکریبیشیف) سکرتێری ستالین پێی وتم هاوڕێ ستالین دەڵێت بۆ ئەو مەسەلەیە پێویستە لەگەڵ خودی تۆدا قسەبکەم.. ناچار بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ سەرکردەی باڵادا کردو ئەوەی لە نێوان من بریمنکۆدابوو پێم ڕاگەیاند..

ستالین لەوبارەیەوە سەرزەنشتی کردم و پاشان وتی..
ـ هەر ئێستا بە گورجی فەرمان دەربکە کە هەرسێ بەرەکەی ستالینگراد بچنە ژێرفەرمان و سەرکردایەتی(راکاسۆفسکی)یەوە ئەم فەرمانە لە(٣٠ی کانونی یەکەمی ١٩٤٢)دا دەرکرا..(لەیەکی کانوونی دووەمی ١٩٤٣)وە بەرەکانی(دوون) پێکدێن لە(٣١٢) هەزار جەنگاوەری گورجوگۆڵ و نزیکەی(٦٥٠٠) تۆپی مەیدانی و ئامێر، و زیاد لە(٢٥٠) دەبابە و نزیکەی(٣٠٠) فرۆکە.
لە (کانونی دووەمــی١٩٤٣)دا لە ئەنجامی ئەو شەڕوپێکدانانەی بەرەی باشوری خۆرئاواو بەرەی ستالینگراد کردیان هێڵی بەرەی خارجی لە ناوچەی دوندا گەیشتە نزیکەی(٢٠٠-٢٥٠) کیلۆمەتر و بارودۆخی هێزە گەمارۆدراوەکانی ئەڵمانی زۆر لە پێشتر خراپتربوو.
وە بۆ ئەوەی لەوە زیاتر خوێن نەڕژێت، سەرکردایەتی باڵای سۆڤێتی، سەرکردایەتی بــەرەی(دوون)ی ئاگادارکردەوە کە بانگەواز و ئاگاداری هێزە گەمارۆدراوەکانی ئەڵمانی بکەنەوە کە وەك دیلی جەنگ و بەپێی ئەو ڕێنماییە بڕواپێکراوانە خۆیان بدەن بەدەستەوە، بەڵام سەرکردایەتی ئەڵمانییەکان گوێیان بەو بانگەوازە نەداو داوایان لە سەربازەکانیان کرد تا دوا فیشەك بجەنگن و بەڵێنی ڕزگاربوونیان پێدان، کە هەرگیز شتی وانەدەبوو سەربازە ئەڵمانییەکانیش هەستیان بەوەکردبوو، لە(١٠ی کانونی دووەمی١٩٤٣)دا دوای دەستپێکردنی تۆپ بارانێکی چڕوپڕ هێزەکانی بەرەی(دوون) هێرشیانکردە سەر دوژمن بەمەبەستی بڕین و تێکشکاندنی بەرگری دوژمن و پەرشوبڵاوەپێکردنی مۆڵگاکانیان بۆ ئەوەی هەنگاوبەهەنگاو لەناویان بەرن، بەڵام هێرشەکە مەبەستی نەپێکا و سەرکەوتوونەبوو، لە(٢٢ی کانوونی دووەم)دا پاش دەست پێکردنی تۆپبارانێکی چڕوپڕ دووبارە هێزەکانی بەرەی(دوون) هێرشی دووەمیان دەستپێکردەوە.
دوژمن لەبەردەم ئەو هێزو لێدانەدا خۆی پێڕانەگیرا هێزەکانیان لە یەکتردابڕان و هەڵوەشان، لەم شەڕوکوشتارەدا سوپای پەنجاو حەوت بەسەرکردایەتی جەنەراڵ(تالبۆخین) و سوپای شەست و شەش بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ(جادون) باشترین ئەنجام و دەستکەوتیان بەدەست هێنا.

وه له بیرەوەرییەکانیدا له ژێرناوی(کارەسات له فۆڵگادا) (أ) فیدیری ئەفسەری هەواڵگری پێشووی سوپای شەشی ئەڵمانی(بارلۆس).. دەڵێت.. "ئێمه ناچاربووین بەدرێژایی هەموو بەرەدا بکشێینەوەو پاشەکشەبکەین، بەڵام پاشەکشەکەمان بوو بە هەڵاتن و ڕاکردن... ئەو ڕێگایەی پیایدا دەکشاینەوە بە لاشەی کوژراو داپۆشرابوو، زریان و گەردەلوولی بەفریش وەك ئەوەی بەزەیی بە ئێمەدا بێتەوە لاشەکانی داپۆشیبوو.. ئێمە بەبێ فەرمان و ڕێنمایی دەکشاینەوە لەگەڵ مردندا پێشبڕکێمان دەکرد، مردن بێ ماندووبوون بەردەوام بەدوامانەوەبوو، بە کۆمەڵ قوربانی لە ڕیزەکانماندا دادەبڕی سوپاکەمان لە شوێنێکی بچووکدا گیرسایەوە..".

له(٣١ی کانونی دووەم)دا بەیەکجاری پاشماوەی کۆمەڵانی باشوری هێزەکانی ئەڵمانی لەناوبران و ئەوەشی کە مابوو لە سەروو هەموویانەوە (فیلدمارشاڵ باولۆس) خۆیاندا بەدەستەوە. لە (٢ی شوباتی ١٩٤٣)دا پاشماوەی هێزەکانی باشور خۆیاندا بەدەستەوە.

بەوەش بەتەواوەتی کۆتایی بەشەڕوپێکدادانی قورس و گەورە هێنرا کە لە ڕۆخی ڕووباری(فۆڵگا)دا کرا، کۆتایی بەگەورەترین مۆڵگای هێزەکانی ئەڵمانی و هێزە هاوپەیمانییەکانی ئەڵمانیای فاشستی هێنرا. (لەو شەڕوپێکدانانەدا ژمارەیەکی گەورەی هێزەکانی ڕۆمانی تێدابوو، بەڵام ئەو هێزانە زۆر بە ئاسانی لە(٢١ی تشرینی دووەمی ساڵی١٩٤٣)دا خۆیاندا بەدەستەوە) و ژمارەی دیل و دەستبەسەرداگیراوەکان گەیشتە زیاد لە(٣٠) هەزار سەرباز و ئەفسەر.

---

# شەڕوپێکدادانی دڕندانە

شەڕوپێکدادانی ستالینگراد لەوپەڕی دڕندانەیی و توندوتیژیدابوو من ناتوانم ئەو شەڕوپێکدانە بەهیچ شتێك بشوبهێنم و بەراوردی پێبکەم بە شەڕوپێکدادانی بەرگریکردنی شاری مۆسکۆ نەبێت، لە ماوەی نێوان(١٩ی تشرینی دووەمـی١٩٤٢)دا تا (٢ی شوباتی ١٩٤٣)، (٣٢ فیرقە و ٣ لیوا) بەجارێك تێکوپێکدران و لەناوبران و ئەو شانزە فیرقەیەش کە مابوون (٥٠٪ تا ٧٥٪) لەسەدی پێکهاتەکانیان لەناوچوون و کوژران.

کۆی گشتی زەرەروزیان و کوژراوانی دوژمن لە ناوچەی(دوون)و (فۆلگا) و (ستالینگراد) گەیشتە نزیکەی(١,٥) یەك ملیۆن و نیو سەرباز و(٣٥٠٠) دەبابە و ئامێری جۆراوجۆری هێرشکردن و(١٢) هەزار تۆپی مەیدانی و ئامێر و(٣) هەزار فڕۆکە و ژمارەیەکی زۆر زۆری پێداویستییە جەنگییەکانی تر... ئەو بارودۆخە چی بوو کە بووە هۆی ئەو تێکشکاندنە ناخۆش و خەمبارییەی هێزەکانی ئەڵمانیا و یارمەتی دەربوو بۆ وەدەستهێنانی ئەو سەرکەوتنە مێژوویییە گەورەیەی ئێمە؟ سەرنەکەوتن و شکست خواردنی گشت پلانە ستراتیجیەکانی هیتلەرییەکان لەساڵی(١٩٤٢)دا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چەواشەکاری و بەسووك زانینەی هێزو تواناکانی دەوڵەتی سۆڤێتی و ئەو هێزو توانا ڕۆحییە گەورەو نەمرەی گەلی سۆڤێتی هەیبوو. هەروەها دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چەواشەکاری و بەزلزانین و بەتوانایییەی کە لە توانای هێزەکانی ئەڵمانیدا هەبوو، ئەو سەرەتاو پێشەکییە گرنگانەی سەرکەوتن لە کاروچالاکییەکانی(ئۆرانۆس) و(زوحەلی بچووك) و(الطوق-گەمارۆ)دا هاتنەدی..

"ئەو ناوانە ناوی نەهێنی چالاکییە گەورەکان بوو کە هێزەکانی سۆڤێتی لە ساڵی(١٩٤٢)دا ئەنجامیاندا"، هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕێکخستنە شارەزاو بە توانایانەی دەیانکرد بۆ ئەو کاروچالاکییە تەکنیکییە کتوپڕیانەو دەستنیشان

کردنی شوێنی سەرەکی لێدان و چالاکی و دەستنیشان کردنی خاڵی ڕاست و دروستی بێهێزی بەرگریکردنی دوژمن . هەروەها بەباشی و دەستنیشانکردنی پێداویستییەکانی هێزەکان و ئەو شتانەی زۆر پێویست بوون بۆ بە خێرایی برین و تێپەڕبوون بەناو بەرگرییە تەکنیکییەکانی دوژمنداو ئەو پێشکەوتنە خێرایی و گورجوگۆڵانەی دەکرا بۆ برین و تێکشکاندن بۆ مەبەستی گەمارۆی یەکجارەکی هێزە سەرەکییەکانی دوژمن، ئەم هەڵسەنگاندنە ڕاست و تەواوانە دەورێکی یەکجار گەورەو گرنگیان بینی.

دەبابەکان و فڕۆکەکانیش دەورێکی گەورەیان هەبوو لە ڕاپەڕاندن و لە پێش چوونی کاروچالاکییەکاندا بۆ گەمارۆدانی یەکجارەکی و کۆتایی دوژمن.

بۆ خۆئامادەکاری دژە هێرشکردن بەکردەوە لەلایەن سەرکردایەتی و ئەرکانی جەنگەوە بەو پەڕی سەرنج و تێڕوانین و بیرکردنەوەی قووڵەوە جێبەجێ دەکرا.

وە لە کاتی هێرشکردندا بەڕێوەبەری هێزەکان لە هەموو ئاستەکاندا بەوپەڕی وریایی و خۆڕاگری و نەترسییەوە بەرەو ئامانجەکانیان دەچوون، کاری سیاسیش دەورێکی لەبەرچاوی هەبوو لە پێگەیاندن و بڕواکردنی سەربازەکان بە هێزو توانای خۆیان و نەترسی و پیاوەتی و قارەمانی بە کۆمەڵ لە کاتی جەنگدا.

سەرکەوتنی هێزەکانمان لە شەڕوپێکدادانی ستالینگراددا خاڵی وەرچەرخانی بنەڕەتی جەنگبوو بۆ سوودی یەکێتی سۆڤێتی و سەرەتای دەرکردن و ڕاوەدوونانی هێزی دوژمنەکانمان بوو لەسەر خاك و زەوییەکانماندا. هەروەك جەنەڕاڵ(فیستفاڵ)ی ئەڵمانی وتی"ئەو تێکشان و لە ناوچوونەی لە ستالینگراددا بەسەر سووپادا هات، گەلی ئەڵمانی و سوپا بەهێزەکەی تۆقاند، بەدرێژایی هەموو مێژووی ئەڵمانی وەك ئەو کوشتن و لەناوچوونە ناهەموارەو گەورەیە بەسەر هێزەکانیدا نەهاتبوو" لەناو نێوەندەکانی جەنەڕاڵ و ئەفسەر و لەناو ڕیزەکانی گەلی ئەڵمانییدا شێوازی پەیوەندی خراپ و سەلبی بە شێوەیەکی گەورە و فراوان دەربارەی خودی هیتلەر دەرکەوت چونکە گەلی ئەڵمانی هەستیان کرد کەوا هیتلەر و دەوروبەرەکەی وڵاتیان بەرەو سەرکێشی وێرانکارییەکی ئاشکرا بردووە.

ئەو سەرکەوتنانەی بەڵێنی پێدابوون لەگەڵ هێزەکانیدا لە کارەساتی دوون و

فۆڵگاو باکوری قۆقازدا تیاداچوون و نەمان. دوای تێکشکانی هێزەکانی ئەڵمانی و ئیتاڵیا و مەجەر و رۆمانییەکان لە دوون و فۆڵگادا، دەستەڵاتی ئەڵمانیا لەناو هاوپەیمانییەکانیدا هەرەسی هێنا و ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە و لەناو ئەو دەوڵەتانەدا هەندێ هەوڵ و پەلەقاژێ دەرکەوت بۆ خۆ رزگارکردن لەو داوەی هیتلەر خستبوونیە ناوێوە.

وە لەناو دەوڵەتە بێلایەنەکاندا و لەو ولاّتانەی هێشتا سیاسەتی چاوەروانکردنیان گرتبووەبەر.. تێکشکانی ئەڵمانییەکان لە ستالینگرادا دەورێکی گەورەی هەبوو لە وریاکردنەوەیاندا و بروای تەواویان بە گەورەیی و دەستەڵاتی یەکێتی سۆڤێتی هێناو بەتیاچوونی یەکجارەکی ئەڵمانیای نازی. وە لای هەموان ئاشکرابوو کە ئەو تێکشکانەی هێزەکانی ئەڵمانیا لە ستالینگرادا چۆن لە هەموو جیهاندا بلاّوبۆوە، چۆن ئیلهام و گروتینێکی خستەناو دڵودەروونی میللەتانەوە بۆ خەبات و تێکۆشان دژی فاشیستە داگیرکەرەکان، دەربارەی خودی خۆم چالاکی بەرگریکردن لە ستالینگراد گرنگییەکی یەکجار مەزنی هەبوو بۆم. لە رووی ئامادەکاری دژە هێرش و هاوبەشکردن لە چارەسەری ئەومەسەلانەی پەیوەندی بە چالاکییەکانی خۆرئاواوەهەبوو.

لێرەدا مەشق و راهێنانی زیاتر فێربووم دەربارەی دژەهێرشی گەورەو زیاتر، وەك لەوەی لە ناوچەی مۆسکۆ لە ساڵی(١٩٤١)دا کرا. کە ئەو کاتە ئەوەندە توانا نەبوو کە دژە هێرش ساز بکەین بە مەبەستی گەمارۆدانی مۆڵگاکانی دوژمن، وە بۆ رێزو گەورەیی و ئەو سەرکەوتنانەی سەرکردەکان لە دژی هێرشەکانیاندا کە لە ناوچەی ستالینگرادا نواندیان و بووە هۆی ئەو سەرکەوتنانەو کاردانەوەی گەورەو کاریگەریان هەبوو لەسەر پاشەرۆژی خەباتی چەکداریدا، دژ بە داگیرکردنەکانی نازییەکان.

حکومەتی سۆڤیاتی ژمارەیەك مەدالیاو ویسامی بەسەر هەندێ لە جەنەراڵەکاندا دابەشکرد و زۆکۆفیش یەکێك بوو لەوجەنەرالاّنە، هەروەها ئەو تێکشانەی لە ناوچەکانی ستالینگراد و دوون و قۆقازدا بەسەر ئەڵمانییەکاندا هات، بارودۆخێکی لەباری رەخساند بۆ پەرەپێدانی دژە هێرش لە هەموو بەرەکانی

جەنگداو لەبەرەی باشوری خۆرئاوادا.

لە ماوەی وەرزی زستاندا هێزەکانی سۆڤێتی بەرەی خۆرئاوا هێرش و چالاکییەکانیان فراوانترکرد و زیاتر پەرەیان پێداولەو ماوەیەدا توانییان(رۆستۆف، نۆفۆتشرکسك، کورسك، خارکۆف) و هەندێ ناوچەی گرنگی تریش رزگاربکەن، لە درێژایی بەرەی ئەڵمانی، سۆڤێتیدا باردودۆخی ستراتیجی هێزەکانی ئەڵمانی زۆر خراپ بوو.

(لە سەرەتای (کانونی دووەمی ١٩٤٣)دا سەرکردایەتی باڵا داوایان لێکردم بە هاوکاری فۆرشیلۆف هەوڵوتێکۆشانی هاوبەشی نێوانمان لە نێوان بەرەی لینگراد[٥] و بەرەی فۆلخۆفدا یەکخەین بۆ ئەوەی ئەو گەمارۆیەی لەسەر لینگراد دایە لەلای دەریاچەی لادۆوە بشکێنین و نەیهێڵین) پلانی پێویست بۆ ئەوە دارێژرا..

لە(١٢ی کانونی دووەم)دا دەست کرا بە هێرشکردن بۆسەر هێزە بەرگرییەکانی ئەڵمانییەکان، بە هاوکاری هێزە زەمینی و ئاسمانییەکانی سەر بە هەردوو بەرەو بە هاوکاری ئەو هێزە ئاسمانییانەی سەر بەکەشتیگەلی بەلتیك بوون.

وە لە(١٨ی کانوونی دووەم)دا پاش شەڕو کوشتارێکی توندوتیژ و خوێناوی هێزەکانی هەردوو بەرەی لینگراد و فۆلخۆف لە ناوچەی شارە جیهانییەکانی ژمارە(١،٥)دا بەیەك گەیشتنەوە.

من خۆم ئەوکاتە لە ناوچەی شاری ژمارە(١)دا بووم بەچاوی خۆم بینیم چۆن جەنگاوەرانی هەردوو بەرەکە لە خۆشی و تێکشکانی گەمارۆکە باوەشیان دەکرد بەیەکداو یەکتریان ماچ دەکرد.

بێئەوەی گوێبدەنە ئەوتۆپ بارانەی تۆپەکانی هێزەکانی دوژمن کە لە گردەکانی(سینیافینسك)ەوە دەکراو و خۆیان تێدا مەڵاسدابوو.هەر بەراستی خۆشییەکبوو زۆر لە دەمێکەوە چاوەڕوانی بووین. لابردن و تێکشکانی گەمارۆ لەسەر لینگراد لەبارەی سیاسی و سەربازییەوە گرنگییەکی یەکجار گەورەی هەبوو، بەنیسبەت گەلی سۆڤێتییەوە.

ئەو پلانەی هیتلەر دانابوو بۆ قەڵاچۆکردنی خەڵکی لینگراد کە لە برساندا بیانکۆژێت شکستی هێناو سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. لێرەدا دەمەوێت ئاماژە

بۆ ئەو کارە مەزنە بکەم کە ڕێکخراوی حیزبی لینگراد لە کاتی ئەو نەهامەتی و ناخۆشییەی گەمارۆکەدا کردی...

لە(١٨ی کانونی دووەمـــی١٩٤٣)دا ڕۆژی کۆتایی پێهێنانی گەمارۆی سەرشارەکە... سەرکردایەتی ئەنجومەنی سۆڤێتیی باڵا پلەی(مارشاڵ)ی یەکێتی سۆڤێتییان پێبەخشیم لە(٢٠ی کانوونی دووەم)دا من و فۆرشیلۆف چووینە ناوشاری لینگرادەوە.

لەوێدا هەستمان بە خۆشی و شادییەکی یەکجار زۆرکرد، چونکە کەس نەبوو لەوانەی بینیمانن لەو زەرەر و نەهامەتیەی بەهۆی ئەو گەمارۆیەوە توشیان هاتبوو.. بێزاری دەربڕن یا گلەیی و گازاندە بکەن، بەڵکو هەموو قسەو باسەکانیان لەسەرئەوەبوو کە تازووە پەلەبکەین بەپێدانی ئەو پێداویست و هۆکارە مادییە ئشتراکییانەی پێویستن بۆ بەرهەم هێنان و چاککردنەوەی ئەو ئامێرە جەنگییانەی هێزە چەکدارەکانمان پێویستیان پێیەتی.

# بەشی چواردە

تێکشکانی ئەڵمانییەکان–لە ناوچەی کۆرسک و ئەریول و خارکۆف–دەستنیشانکردنی کات بۆ هێرشکردن– ئازادکردنی ناوچەی کۆبان،–امادەکاری بۆ چالاکی کۆرسک،– ڕێکخستنی ڕیزەکانی دواوەو دابەشکردنی ئازوقەی بەرە.لەو کاتەوە کە دەستمان کردووە بە دژە هێرش

لە ناوچەی ستالینگرادا لە (تشرینی دووەمی ١٩٤٢وە هەتا ئازاری١٩٤٣)، هێزەکانی سۆڤێتی زیاد لە(١٠٠) فیرقەی دوژمنیان لەناوبردووە.

بێگومان هێزەکانمان ئەم سەرکەوتنەمەزنانەیان هەروا بەئاسانی بەدەست نەهێناوە، ئێمەش زەرەرو زیانی گەورەو زۆرمان لێکەوتووە.

مارشاڵ زۆکۆف بۆ هێرشکردن دەستی بەئامادەکاری کرد. یەکەمشت کە بۆ ئامادەکاری شەڕوپێکدادانی کۆرسك کردی وەك خۆی باسی دەکات ئەوەبوو چۆن هەواڵگری سۆڤێتی دەستیکرد بە سیخوری و چاودێری کردن بەسەر هەڵسوکەوت و جموجووڵی هێزەکانی ئەڵمانییدا بۆ ئەوەی ئاگاداریان بێت هەتا لە ناکاو نەدەن بەسەریاندا، هەروەها باسی چالاکی پێشمەرگە رووسییەکان دەکات کە سوپای ئەڵمانی ناچاربوو هێزی تایبەتی لە سووپاکەیدا دابنێت بۆ ڕاوەدوونان و شەڕکردن لەگەڵیاندا.

# چالاکی کۆرسک

بەشێوەیەکی گشتی هێزەکانی سۆڤێتی پێش دەستپێکردنی شەڕوپێکدادانی کۆرسك لەبارەی هێزو لە ڕووی چۆنێتییەوە هێزەکانیان لە هێزەکانی ئەڵمانییە فاشیستەکان زیاتربوون وە بۆ دەستپێکردنی چالاکییەکانی کۆرسك، سەرکردایەتی ئەڵمانی(٥٠) فیرقە و(١٠) هەزار تۆپی مەیدانی و ئامێر و(٢٧٠٠) دەبابە و زیاد لە دووهەزار فڕۆکە واتە لەسەدا شەستی(٦٠٪)ی هێزە ئاسمانییەکانی ئەڵمانی کە لە خۆرهەڵاتدا بوون و(٩٠٠) هەزار سەرباز کە لەوپەڕی ئامادەباشیدابوون بۆ شەڕکردن کۆکردەوە.

سەرکردایەتی ئەڵمانی لەسەرکەوتن دڵنیابوو میدیاکان و هۆکارە پڕوپاگاندەکانیان ئەوپەڕی هەوڵیاندا بۆ بەرزکردنەوەی ورەی هێزەکانیان و بەڵێنی سەرکەوتنی یەکجارەکییان لەو شەڕوپێکدانەی لە پێشیانەوەبوو ڕاگەیاند.

"سەرکردایەتی باڵای ئێمەش دەبوو یا بەرگری بکات یاخود هێرشکردن؟ پاش گفتوگۆ و چەنەحانێیەکی وردودرێژ ستالین بڕیاری یەکلایی کەرەوەیدا، کە لە نزیکی نیوەی مانگی ئایاردا ڕووبەڕووی هێرشی دوژمن ببینەوە بە هەمووجۆرە چەکێکی خێرای بەرگریکردن و بە بۆمببارانی چڕوپڕی هێزە ئاسمانییەکان و بەدژەلێدان و چالاکی لەلایەن هێزە یەدەکییە تەکنیکی و ستراتیجییەکانەوە.

پاش ئەوەی دوژمن هیلاك دەکرێت و هێزەکانیان بێ هێزو بێ توانادەکرێن بەدژە هێرشێکی زۆر بەهێزو بە تواناوە هێزەکانی دوژمن لەبەرەی(بلجوراد و خارکۆف و ئەریۆل)ەوە هێرش بکرێنە سەریان و تێکیان بشکێنن.. دوای ئەوە لە هەموو لایەکەوە هێرشی سەرانسەری دەست پێبکرێت و هێرشیان بکرێتەسەر)

دوژمن بۆ کاتی دەست پێکردنی هێرشەکەی چەند چالاکییەکی چەواشەکاری ئەنجامدا. بۆ شاردنەوەی مەبەستە ڕاستییەکەی وەك پێکهێنانی درۆینەی سەربازی وەهمی و چەند ڕێگاو شێوازی چەواشەو سەرلێشێوانی دیکە.

پێویست بوو ئەنجومەنی ئەرکانی باڵای جەنگ زۆربەباشی لەوە بگات و بتوانێت جیاوازی لە نێوان ڕاستی و درۆکانیاندا بکات.

---

کاری وەها لەسەر بناغەی بـیروڕاو پێشنیاری تاکەکەسی ئەم و ئەو ڕێکنەدەخرا.. بەڵکو لە توانایەکی بەرفراوان و لە ژێر سەرپەرشتی و چاودێری ناوخۆیی بە کۆمەڵ و گشت هەوڵ و بۆچوونەکاندا دەبوو ڕێکبخرایە(بێگومان لەسەر ئاستی جیهانیشدا دەبوو هەندێ هەڵە ڕوویبدایە بۆ نموونە سەرکردایەتی و ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ وای بۆ دەچوون کە بەهێزترین مۆڵگای دوژمن کە ڕووبەڕووی بەرەی ناوەڕاست بوەستێتەوە لە ناوچەی-ئەریول-ەوەیە، بەڵام پاشان ڕاستی دەرکەوت کە گەورەترین مۆڵگا ئەو هێزانەیە کە ڕووبەڕووی بەرەی —فۆرونیج- بۆتەوە)

"لەدوا ڕۆژەکانی حوزەیرانی ۱۹٤۳دا هەڵوێستی یەکجارەکی ڕوون بۆوە بۆمان ئاشکرابوو کە دوژمن لە نزیکترین کاتدا لە —کۆرسك-ەوە بە تایبەت هێرشەکەی دەست پێدەکات و لە هیچ شوێن و ناوچەیەکی ترەوە هێرش ناکات.."

هەر بەڕاستی وابوو، هێرشەکەی دەست پێکرد و سەریش نەکەوت. ڕووبەڕوویان وەستاینەوە لە شوێنەکانی خۆماندا نەجوولەمان کرد و نەپاشەکشەمان کرد، بەبڕواو ئیمانەوە، ڕووی هەموو چەکێکمان تێکردن هەتا هێرشەکەیمان شکاند و لە شوێنی خۆیاندا ڕامانگرتن پاش ئەوەی ڕووسەکان سەرەتا هەڵوێستی بەرگرییان نواند، دوای ئەوە دەستیان کرد بە هێرشکردن.

# هێرشکردن

لە بەیانی (٣ی ئابدا) هێرش دەستی پێکرد...

وە لە دوای نیوەڕۆدا هێزەکانی بەرەی(فۆرنیچ) توانییان بەرگری تەکنیکی دوژمن بشکێنن و ماوەی(٣٠ تا ٣٥) کیلۆمەتر چوونە پێشەوە و لە کاتژمێری شەشی بەیانی ڕۆژی (٦)ی ئابدا پێشرەوی هێزەکانمان چوونە ناوشاری(بیلوگراد)ەوە، لە (٧ی ئاب)دا هێزەکانی بەرەی(فۆرنیچ، شاری، یودجودخۆف)یان ڕزگارکرد و پاش شەڕوپێکدادانێکی توندوتیژ و خوێناوی سەرکەوتن بووە یاری هێزەکانی سۆڤێتی و سوپای بەرەی پیادە مەیدانییەکان(لبراری) لە بەردەم دەروازەکانی- خارکۆف-دا بوون، هەروەك جەنەراڵ(ماناجارۆف) بەڵێنی بە مارشاڵ زۆکۆف دابوو ماناجارۆفی(نازناو) بە تۆپچی لە دەوروبەرو نزیك شاری(خارکۆف)دا تۆپەکانی خستەکار.

لەوەدەچوو ڕۆحی ئازایی جەنەراڵ لەناو سەربازەکانیشدا بێت، مارشاڵ زۆکۆف دەگێڕێتەوەو دەڵێت"پەلێك لە سەربازەکانی کە تەنها(١٦) سەربازبوون گردۆڵکەی (٧، ٢٠١) یان داگیرکرد، کاتێك ئەو پەلە سەربازە دەستیان گرت بەسەر ئەو تەپۆڵکانەدا تەنها حەوت قارەمانیان لە ژیاندا مابوو، سەرکردەکەیان مولازمی یەکەم(بیتربیشیف) هاواری لێکردن وتی..

- هاوڕێیان ئێمە لەسەر ئەم تەپۆڵکەیەدا خۆمان ڕادەگرین و دەمێنینەوە شەڕدەکەین هەر وەك چۆن(ئەلبنفیلۆفیون) لە(دوبوسیکوف)دا خۆی ڕاگرت.. ئێمەش دەمرین و ناگەڕێینەوە.."!!

هێزەکانی ئەڵمانیا لە ترسی ئەوەی گەمارۆبدرێن ناچاربوون لەشاری(فارکۆف) پاشەکشێ بکەن و چۆڵیان کرد و هێزە مەیدانیەکان(البراری) و لەناویاندا هێزەکانی(ماناجارۆف) چوونە ناوشارەکەوە.

وە لە(٥ی مانگی ئاب)دا هێزەکانی بەرەی(برانسك) توانییان شاری(ئەریول) ئازاد بکەن.

کاتێك پەیوەندیمان کرد بە سەرکردەی باڵاوە پێمانڕاگەیاند لە تواناماندایە

لە ناوچەی(ئەریول)دا گەمارۆی هێزێکی گەورە بدەین و بەتەواوی ناوچەکەیان لێپاکبکەینەوە.

سەرکردەی باڵا پێی وتین..

ـ ئامانجی سەرەکی ئێمە ئەوەیە بە زووترین کات ئەڵمانەکان لە وڵاتماندا دەربکەین، بەڵام گەمارۆ و پاککردنەوە لە دواییدا دەیکەین، کاتێك کە دوژمن زیاتر بێ هێز دەبێت، ئێمەش زیاتر جەختمان لەسەر پێشنیارەکەمان نەکردەوە، هەڵەمان کرد کەپێمان لەسەر جەختەکەمان دانەگرت، دەبوایە من و فاسیلفیسکی و ئەنتۆنۆف زیاتر بەرگریمان لە بیروباوەڕەکەمان بکردایەوە و توندوتیژبووینایە و زیاتر پێمان لەسەر قسەکانمان دابگرتایە.

چونکە هێزەکانمان لەو کاتەدا دەیانتوانی و توانای ئەوەیان هەبوو هەستن بەگەمارۆدان و پاککردنەوەیان، لە ئەنجامی ئەو سستی و هێواشییەی لە دژە هێرشەکانماندا لە هەر سێ بەرەکەدا دەکرا، دوژمن توانی هێزەکانی خۆی کۆبکاتەوەو بەهێزی نوێ پشگیرییان بکات و بەرێکوپێکی هێزەکانی لە ناوچەی(ئەریول) کشاندەوە.

بە ڕزگارکردنی(خارکوف) لە (٢٣ی ئابی ١٩٤٣)دا کۆتایی بەو شەڕوپێکدانە گەورەو مەزنە هێنرا، ئەنجامی گشتی شەڕوپێکدادانی(کۆرسك)چیبوو..؟

دوای(٥٠) ڕۆژ لە شەڕوپێکدادانی توندوتیژ هێزەکانمان توانییان(٣٠) فیرقە لە باشترین و چاڵاکترین فیرقەکانی دوژمن لە ناوبەرن و لە ناو ئەو فیرقانەدا(٧) فیرقەی دەبابە یان تێدابوو.

کۆی زەرەرو کوشتاری دوژمن گەیشتە(٥٠٠٠) سەرباز و(١٥٠٠) دەبابە و(٣٠٠) تۆپی قورس و ژمارەیەکی زۆری فرۆکە. لەو کاتەشدا سەرکردایەتی ئەڵمانی نەیدەتوانی قەرەبووی زەرەروزیانێکی واگەورە بەهیچ شێوەیەك بکاتەوە..

لە کاتی جەنگدا هێزەکانمان لە ناوچەی(کورسك)دا پیاوەتی بێ وێنەو قارەمانییەتی بە کۆمەڵ و هونەر و شارەزاییەکی بێ وێنەی شەڕکردنیان نواند.

حکومەت و حیزب ئەو دەورەی قارەمانە ئازاکانمان لەو شەڕانەدا نواندیان

بەرزنرخاند و لە پاداشتی ئەوەدا نزیکەی سەد هەزار سەرباز و ئەفسەر و جەنەراڵ ویسام و مەدالیاو خەڵاتیان بەسەردا بەشکرا. هەروەها زۆرێکی زۆریش نازناوی قارەمانی یەکێتی سۆڤێتییان پێبەخشرا ئەڵمانییە فاشیستەکان هەستیان بەتارمایی تێکشکان کرد. لە ترسی تێکشکان هیتلەرییەکان ناچاربوون لە (هاوینی ١٩٤٣)دا چواردە فیرقە و چەند هێزێکی گەورە ڕەوانەی بەرەی سۆڤێتی – ئەڵمانی بکەن، ئەو هێزانەش لەبەرەکانی ترەوە کشاندەوە و بووە هۆی لاوازکردنی بەرەکانی فەرەنسا و ئیتاڵیا.

هەرچی هەواڵ و تێکۆشانی هیتلەر بوو بۆ وەرگرتنەوەو وەدەست هێنانەوەی پێشرەوی کردن لەسەرکردایەتی سۆڤێتی شکستی هێنا.

ئیتر لەو کاتانەوە هەتا کۆتایی جەنگ ئەڵمانییە فاشیستەکان تەنها شەڕوپێکدادانی بەرگرییان دەکرد و هێزی ئەڵمانییەکان بەرەو نەمان دەچوون و کەسیش نەبوو لەو تیاچوونە قوتاریان بکات، ئەو کێشەیە، کێشەیەکی چارەساز و یەکلایی کەرەوەبوو..

مەسەلەی تیاچوونەکەش تەنها مەسەلەی کات نەبێت هیچی تر نەبوو. سەرکردایەتی سەربازی سۆڤێتی لە سەرکردایەتی کاروچالاکییە ستراتیجی و تەکنیکییەکاندا شارەزایی و زانیارییەکی گەورەیان وەدەستهێنا. لە هونەری شەڕکردندا ئاستیان گەیشتە ئاستێکی زۆر گەورە و مەزن.

شەڕوپێکدادانی(کۆرسك) زۆرجیاوازتربوو لە شەڕوپێکدادانی مۆسکۆ و ستالینگراد، چونکە ئەمە یەکەم شەڕوپێکدادانێکی گەورەبوو کە بەلێدانێکی گورچك بڕ بەدەست هێنراو بەپێی پلانێك کە لەوەپێش ئامادەکاری باشی بۆ کرابوو جێبەجێکرا. لە شەڕی(کورسك)دا بۆ یەکەمجار بە شێوەیەکی بەرفراوان دەبابە و یەکە سەربازییەکان و پێکهاتە زرێ پۆشەکان بەکارهێنران.

ئەو شەڕوپێکدادانە دەورێکی یەکلایی کـەرەوەی لە کاتی چالاکی و ڕووبەڕووبوونەوەدا بینی و لەو گۆڕانکارییە خێراییە و سەرکەوتنەی لە قوڵایی ڕیزی هێزەکانی دوژمندا کرا و لە ڕێگرتن و دابڕانی نێوان هێزەکانی دوژمن و پاشەکشێی هێزەکانیاندا... ئەو هێزە زۆرەی دەبابەکانمان و فیرقەو فەیلەقی

تۆپەکانمان و لەشکری فرۆکەوانی بەرەکانی جەنگ تواناو دەستەڵاتی ئێمەیان بە شێوەیەکی یەکلایی بووژاندەوە و شێوازی چۆنێتی ئەو چالاکییانەیان گۆری کە لەبەرەکانی جەنگدا دەکرا چ لە رووی دووری و چ لە رووی مەبەستەوە بوایە.

لە(هاوینی ١٩٤٣)دا لە توانامان‌دا بوو لەیەك کیلومەتری بەرەی جەنگدا(١٥٠ تا ٢٠٠) تۆپی قورسی مەیدانی و(١٥) تا (٢٠) دەبابە ئامادەبکەین.

پێشمەرگە قارەمانەکانیشمان لە جەنگی(کۆرسك، خارکۆف، ئەریول)دا دەورێکی یەکجار گەورەیان بینی و بووە هۆی یارمەتی و وەدەستهێنانی سەرکەوتنمان. هەروەها جەنگێکی گەورە و خۆراگرییەکی بێ وێنەیان لە بیلورووسیا، و سمۆلینك، و شوێنانی تردا بەهێزەکانی دوژمن نواند.

وە لەو هۆکارە یەکلایی کەرەوانەی کە سەرکەوتنیان بەدەستهێنا دەتوانین بڵێین ئەو رۆحی مەعنەوی و لە خۆبووردنە سیاسییە گەورەیە بوو کە لە ناو ریزەکانی هێزەکانماندابوو، هەروەها دەتوانین بیگەرێنینەوە بۆ ئەو کارە سیاسی و حیزبییە گەورەو گرانانەی سەرکردە سەربازییەکان و سیاسییەکان و رێکخراوی لاوان و حیزبییەکان پێی هەستان و لە کاتی خۆئامادەکردن بۆ شەروپێکدادان لە کاتی جەنگدا، هەوڵێکی زۆر و توانایەکی رۆحی و مەعنەوییان خستە گەر بۆ ئەوەی توانای شەرکردنی هێزەکان زیاتر بەرز بکەنەوە.

لە(٢٥ی ئاب)دا بۆ سەرکردایەتی باڵا بانگهێشتکرام بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ئەومەسەلانەی پەیوەستبوون بە ئایندەی هێرشی سەرانسەری هێزەکانی سۆڤێتیەوە، کە لە دوای ئەو سەرکەوتنە نوێیانەی لەبەرەکانی(کۆرسك)دا بەدی هێنران.

---

## رزگارکردنی ئۆکرانیا

ستالین دەیزانی ئەڵمانیا هێشتا لە توانایدا ماوە دژی یەکێتی سۆڤێتی لە جەنگدا بەردەوامبێت، بە تایبەتیش کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا هێشتا بە نیازنەبوون هێرشێکی سەرانسەری گەورە لە ئەورووپادا بکەن.

دابەزاندنی هێزی سەربازیش لە باشوری ئیتاڵیادا هیچ گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە هەڵوێستەکەدا نەکرد، گەرچی وای لە هیتلەرکرد هەندێ گرنگی پێبدات، من خۆم لەوەدا لەگەڵ ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگدابووم، کە ئەڵمانیا لە خۆرهەڵاتدا توانای هێرشێکی بەرفراوانی نییە، بەڵام توانای ماددی و تەکنیکی ئەوەندە هەیە کە بتوانێت بەرگرییەکی گەورە و بەهێزو خێرایی پێ بکات.

بەکردەوەش ئەوەی سەلماند کاتێك هێزەکانی ئەڵمانی توانییان تا ئاستێکی گەورە چالاکی دژە لێدان و هێرشی کاریگەر ئەنجامبدەن و هەندێ سەرکەوتنی کاتی گەورە بەدەست بهێنن.

## سەرکەوتنەکان

لە ساڵی(١٩٤٣)دا یەکێتی سۆڤێتی(٣٥) هەزار فڕۆکەی جەنگی نایابی بەرهەمهێنا، هەروەها(٢٤) هەزار دەبابەو تۆپی(ئۆتۆماتیك)ی بەرهەمهێنا. بەوەئێمە لە ڕووی ژمارە و چۆنێتیەوە سەرکەوتنمان بەسەر ئەڵمانیادا بەدەستهێنا..

لە(٢٥ی ئاب)دا لە سەرکردایەتی باڵادا کۆبوونەوەیەك کرا بۆ ئاگاداری و تاووتوێکردنی هەڵوێست لە هەموو بەرەکانی جەنگدا، من ئێستا بیرم نایە لەوکۆبوونەوەیەدا باسی چی کرا، بەڵام ئەوەی بیرم بێت ئەو پێداگرتن و جەختەی

سەرۆکی باڵابوو، کە جەختی لەسەر ئەوەدەکردەوە کە پێویستە پەلە بکرێت لەدەست بەسەرداگرتنی هەردوو ڕووباری(دنیبر)و(مولوتشنیا)دا، بۆ ئەوەی دوژمن نەتوانێت ئۆکرانیا وێرانکات و بیکات بە بیابان.

سەرۆکی باڵا لە بۆچوونەکانیدا ڕاستی دەکرد، چونکە هیتلەرییەکان لە کشاندنەوەیاندا زۆر بە دڕندانە هەرچی شتێکی باش و بەبەهایان بکەوتایەتە دەست خاپوریان دەکردو لە ناویان دەبردن... کۆشك و تەلارو کارگەکانیان وێرانکرد و تەخت و تاراجی شارو گوندەکانیان تێکوپێکدا و کردیانن بەوێرانە.

وێستگەی کارەباو فڕنە بڵندەکان و ساختمانەکانیان دەڕووخاند و خاپوریان دەکردن.

ئاگریان لە خوێندنگاو قوتابخانەکان و خەستەخانەکان بەردەدا و هەزارەها ژن و منداڵ و پیرەمێردیان لە سێدارە دەداو دەیانکوشتن لە ڕۆژی(٦ی ئەیلوول)دا لەسەرکردایەتی باڵاوە پێیانڕاگەیاندم ئەوبەرانەی سەربە سەرکردایەتی گشتی منن بەرەو ڕووباری(دنیپر) ڕەوانەبکەم.

هێرشەکەمان زۆر بە هێواشی بەڕێوە دەچوو..

هێزەکانی دوژمـــن خۆڕاگری و بەرگرییەکی توندو بە هێزیان دەکرد زەرەروزیانێکی یەکجار زۆریان لێکەوت، ناچار لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلوولدا لە ناوچەی(دنیاس) و (بۆلتانا) بەرەو(دنیبر) هێزەکانی کشاندەوە. بەرەکانی ئێمەش هەموو ڕێگایەکیان گرتەبەر بۆ دڵنیابوون لە ڕاوەدوونانی هێزەکانی دوژمن هەتا(دنیبر) و دەست بەسەرداگرتنی چەند پردێك لە چەند شوێنێکدا بۆ ئەوەی بەخێرایی لەو بەربەستە ئاوییە گەورانە بپەڕنەوە، بۆ ئەوەی ورەی دوژمن بەتەواوی بڕوخێنن بەرەکانی جەنگ هەرچی هێزو تواناو دەستەڵاتێکی هێزە ئاسمانییەکانمان هەبوو بۆ جەنگکردن و بۆمب باران کردنیان خستەکار.

هەر بۆ ئەو مەبەستە یەکەی سەربازی بچووك و خێرای پێکهێنا بۆ ئەوەی بەخێرایی بکشێن بۆ پشت دوژمن بە مەبەستی ئەوەی دەست بەسەر ئەو شوێنانەدا بگرن کە دوژمن دەشیا لە کاتی پاشەکشەیاندا پەنابەرنە ئەو شوێنانە بۆ ئەوەی هێڵی بەرگرییان تێدا دابمەزرێنێت و بۆ ئەوەی ورەو ڕۆحی مەعنەوی هێزەکانمان

له كاتی تێپەڕبوون بەو بەربەستە ئاوییانەدا بەرزكاتەوە.
سەركردایەتی باڵا له(٩ی ئەیلوول)دا ڕایگەیاند كە ویسامی(سۆفوروف) پێشكەش ئەو سەركردانە دەكرێت كە سەركردایەتی چالاكی پەڕینەوەی ڕووباری(دسنا)یان كردووەو نازناوی قارەمانی یەكێتی سۆڤێتیش دەدرێت بەو سەركردانەی سەركردایەتی چالاكی پەڕینەوەی ڕووباری(دنیپر)یان كرد. له باكوری شاری(كییف)ەوە هێزەكانی جەنەڕاڵ(تشیبسوف) كە سەربەبەرەی زەمینی(بەراری)بوون، توانییان پاش شەڕو پێكدادانێكی قورس و خوێناوی له ڕووباری(دنیبر) بپەڕنەوە وە یەكەیەكی سەربازی بە سەرۆكایەتی نەقیب(نیفیدۆف) ئازاییەتیەكی بێ وێنەیان نواند، له پاداشی ئەوەدا نازناوی قارەمانی یەكێتی سۆڤێتی پێ بەخشرا.
لەبەرەی مەیدانی زەمینییەوە بۆ تێپەڕبوون له ڕووبارەكە جەنگ و پێكدادانێكی گەورەوگران ڕوویدا، له ئەنجامدا بەسەركەوتنێكی گەورە و بێ وێنە له بەرژەوەندی ئێمە كۆتایی پێهات.
له ژێر چاودێری و دەستەڵاتی هێزە ئاسمانییەكانماندا كە هەوڵ و خەباتێكی بێ هاوتایاندا له پشگیریكردنی هێزە پیادەكانماندا لەو چالاكی و شەڕوپێكدانانەدا هێزی فڕۆكەوانی بەرەكانی جەنگ و فڕۆكە دوورهاوێژەكانی سەربە سەركردایەتی باڵا ڕاستەوخۆ هێزەكانیان توانییان لێدانی توندوتیژ و كاریگەر له فڕۆكەخانەكانی دوژمن و شوێنی بەرگری و یەدەكییەكانیان بسرەوێنن، هەتا كۆتایی مانگی ئەیلوول هێزەكانمان بەرگرییەكانی دوژمنیان تێكشكاندو تێكوپێكیان دان و له ڕووبارەكە پەڕینەوەو له ناوچەكەدا ماوەی(٧٥٠) كیلۆمەتر له(لویف)ەوە بۆ(زابوروجی) له ڕووبارەكە پەڕینەوە.
لەوپەڕی ڕووبارەكەشەوە دەستیانگرت بەسەر ڕێگاو چەند پردێكی تردا و ئەو شوێنانەیان كردەناوچەیەكی پەڕینەوە بۆ ڕزگاركردنی بەشی خۆرئاوا.
وە له پێناو بەرز نرخاندنی چالاكی ئەو پەڕینەوە سەركەوتوانەی هێزەكانمان له(دنیبر)دا، له پاداشتی ئەو قارەمانی و پیاوەتی و هونەرەجەنگییەدا له پێناو بەرزنرخاندن و تێكشانی بەرگری دوژمندا له(دنیپر)دا.

سەرکردایەتی باڵا نازناوی قارەمانی یەکێتی سۆڤیێتی بەخشییە زیاد لە(٢٥٠٠) سەرباز و ئەفسەر و جەنەراڵ. دوای پەڕینەوە لە ڕووباری(دنیبر) ناوی بەرەکان گۆڕرا بەرەی(فورتیچ) ناونرا بەبەرەی یەکەمی ئۆکرانی و بەرەی مەیدانی زەمینی(براری) ناونرا بەبەرەی دووەمی ئۆکرانیا.

ئیتر لە(١٢ی تشرینی یەکەم)وە تا(٢٣ی کانوونی یەکەم) هەردوو بەرەکە کاروچالاکییە ستراتیجییەکانی(کییف)یان ڕادەپەڕاند.

لە کازیوەی بەیانی ڕۆژی(٥ی تشرینی دووەمی ساڵی١٩٤٣)دا هێزەکانی سوپای(٣٨) بەسەرکردایەتی جەنەڕاڵ(مۆسکولینکۆ) پاش چەند شەڕوپێکدادانی قورس و بەهێز توانییان بگەنەدەوروبەری شاری(کییف).

لەکاتژمێری(٤ی بەیانی ڕۆژی٦ی تشرین)دا هێزەکانی جەنەڕاڵ(مۆسکۆلینکۆ) و فەیلەقی دەبابەکانی(کرافتشنکۆ) بەتەواوی شاری(کییف) یان کۆنترۆڵ کرد و ڕزگاریان کرد.

دوای ئەوە یەکسەر ئەم بروسکەیە بۆ سەرکردەی باڵا ڕەوانەکرا "بەخۆشی و شادییەکی زۆرەوە پێتان ڕادەگەیەنم کە هێزەکانی بەرەی یەکەمی ئۆکرانیا توانییان کارەکانی خۆی جێبەجێ بکات. ئەویش بە ڕزگارکردن و دەست بەسەرداگرتنەوەی شارەجوانەکەمان شاری کییف، پایتەختی ئۆکرانیا و پاشان پاککردنەوەی شارەکە لە داگیرکەرە فاشیستەکان و بەرەی یەکەمی ئۆکرانیا بەردەوامە لە جێبەجێکردنی ئەو کاروچالاکییانەی بۆیان دەستنیشان دەکرێت".

لە داڕشتنی پلان و ڕێکخستنەکانی کاروچالاکییەکان و دەست بەسەرداگرتنی شاری کییف و لە ناوبردن و پاککردنەوەی ئەو هێزانەی دوژمن کە لە ناو کییفدا مابوون. ئەنجومەنی سەربازی سوپای(٣٨)بەسەرکردایەتی جەنەڕاڵ(مۆسکۆلینکۆ) و ئەندامێتی جەنەڕاڵ(بیشوف) دەورێکی گەورەو گرنگیان بینی.

کۆکردنەوەو پێکهێنانەوەی هێز بۆ داگیرکردنەوەی شاری(کییف) و پەرەپێدانی ڕێگا وەك(سەرەڕم)ێك بۆ ناوشاری کییف لە ژێر سەرکردایەتی ڕاستەوخۆی جەنەڕاڵ(ئەندریە جریتشکۆ)ی نوێنەری بەرەدا(وەزیری بەرگری ئەوسای یەکێتی سۆڤیێتی)دا دەکرا.

وە لە(٣٠ی ئەیلول)دا هێزەکانی بەرەی دووەمی ئۆکرانیا لە ڕووباری(دنیبر) پەڕینەوە و بەدرێژایی(٣٠) کیلۆمەتر و بە قولاّیی(١٥) کیلۆمەتر یان وەك سەرەڕمێك داگیرکرد.

سەرکردایەتی بالاّ بەهۆی لایەنە هەواڵگرییەکانییەوە ئاگاداربوو کە هیتلەر پێش دەستپێکردنی کاروچالاکییەکان هاتبووە بنکەی ئەرکانی جەنگی سوپای باشور و داوای لە هێزەکانی کردبوو کە تا دوا سەرباز و بەهەرنرخێك بێت پێویستە بەرگری لە دنیبر بکەن.

هیتلەرییەکان دەیانزانی و هەستیان بەوەکردبوو ئەگەر ئۆکرانیایان لە دەست بچێت، ئەوا ئەو لە دەستدانە لە باشوری ولاّتماندا دەبێتە هۆی هەرەسهێنانی یەکجارەکی و کۆتایی بەرەکانیان و نیوەدوورگەی(قرم)یشیان لەدەست دەچێت. ئەو کاتە بە ماوەیەکی کەم هێزەکانی سۆڤێتی دەتوانن بگەنەوە سەرسنوری یەکێتی سۆڤێتی، بەلاّم لەگەڵ ئەو ڕێنماییانەشدا کە هیتلەر و فیڵدمارشاڵ(مانشتین) بۆ هێزەکانیان دەرکرد، هێزەکانی ئەڵمانیا لە شەڕوپێکدادانی ڕووباری دنیبردا تێکشکان و شکستیان هێنا، هەروەها ئەڵمانیا ئەو هەولاّنەشی سەری نەگرت و شکستی هێنا کە دەیویست هێڵی بەرگری نوێ لە(کیرفتشوج و دنیبر و بترونسك و زایورجی)دا پێکبهێنێت.

بەپێی ئەو ڕاپۆرتانەی ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ، هێزەکانی سۆڤێتی توانییان زیاد لە نیوەی ئەو زەوییانەی کە دوژمن لە ساڵەکانی(١٩٤١-١٩٤٢)دا داگیریان کردبوو ڕزگاربکەن. وە لە سەرەتای دەستپێکردنی دژە هێرشەکانی سەرستالینگرادەوە هێزەکانی سۆڤێتی(٥٦) فیرقەی ئەڵمانی بە تەواوی لەناوبردووەو دەسگیری کردوون و بەسەر(١٦٢) فیرقەدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە و دوژمن ناچاربووە سەرلەنوێ پێکیان بهێنێنەوە و قەرەبووی ئەو زەرەرو زیانە زۆرانەیان بکاتەوە. هەروەها دوژمن زیاد لە(٧٠٠٠) هەزار دەبابەو زیاد لە(١٤) هەزار فرۆکە و زیاد لە(٤٠) هەزار تۆپی مەیدانی و ئامێری تێکشکاوە، و ژمارەیەکی یەکجار زۆری لە باشترین و چاکترین سەرباز و ئەفسەرو جەنەڕاڵی کوژران و لەناوچوون.

له کاتێکدا ئەڵمانیای فاشستی تادەهات زیاتر بێتواناو بێدەستەڵات دەبوو، یەکێتی سۆڤێتیش تادەهات زیاتر بەهێزو بە تواناتر دەبوو.

له ساڵی(١٩٤٣)دا یەکێتی سۆڤێتی(٧٨) فیرقەی نوێی پێکهێناو لە کۆتایی ساڵدا(٥) سوپای دەبابەو(٣٧) فەیلەقی دەبابەو زرێپۆش و(٨٠) لیوای سەربەخۆی دەبابەو(١٤٩) کەتیبەی دەبابە و تۆپ و(٢٦) فیرقەی تۆپ و(٧)فیرقەی موشەك و ژمارەیەکی زۆری یەکەی تۆپی تریشمان هەبوو، ئەنجامی وەرچەرخان و گۆرانکارییەکان بە سوود و بەرژەوەندی یەکێتی سۆڤێتیدا وەرچەرخا.

هەروەها دابەزین و جێگیربوونی هاوپەیمانییەکان لە ئیتاڵیاداو واز هێنانی ئیتاڵیا لە جەنگدا لە سوود و بەرژەوەندی سۆڤێتیدا بوو. سەرهەڵدانی ئەو راپەرینانەی لە هەموو وڵاتە داگیرکراوەکاندا دەکرا و تێکچوونی بارودۆخی وڵاتە هاوپەیمانییەکانی ئەڵمانیای فاشیستی هەرهەموویان لەبەرژەوەندی ئێمەدابوو، قین و تووڕەیی دژی فاشیستەکان و ئەو مەیل و ئارەزوانەی بۆ کۆتایی پێهێنانی جەنگ لە ئارادابوو هەرهەمووی لەناو ریزی میللەتاندا سەری هەڵداو پەرەی سەند، لە پۆڵندە و یوگۆسلافیاو چیکۆسلۆفاکیای ئەوسا و یۆنان و فەرەنسادا گەردەلوولی رزگارخوازی نیشتمانی هەڵیکرد.

لە ناو ئەڵمانیاشدا سەرنج و تێروانین دەربارەی فاشیستەکان گۆردراو هێزە نەیارو دژ بە فاشیستەکان مەیلی کەسانێکی زۆریان بەلای خۆیاندا راکێشا.

له وڵاتی خۆشماندا بڕوا بەخۆکردن پەرەی سەند، لەگەڵ ئەو زەرەروزیانە یەکجار زۆرانەشماندا میللەتی سۆڤێتی لەسەر ئەرکی سەرشانی خۆی باش گەیشتبوو.

دەیانووت پێویست و ئەرکی سەرشانمانە تاسەرکەوتنی کۆتایی و یەکجارەکی لە دژی دوژمنان بجەنگین.

---

# گەریلاکان

هێزی پێشمەرگە لە یەکێتی سۆڤێتیدا گۆڕراوبووە هێزێکی بە تواناو گەورەی وەها کە ببێتەجێگای هەرەشەی گەورەو ترسناك بۆ دوژمن.

لە ساڵی(١٩٤٣)دا هێزەکانی پێشمەرگە زەرەروزیانی یەکجار گەورەو گرانیان بە دوژمن گەیاند، (١١) هەزار شەمەندەفەریان تەقاندەوە، (٤٠) هەزار فارگۆن و هێڵی ئاسنینیان تێکشکاندو، (٦) هەزار قاتیرە و زیاد لە(٢٢) هەزار لۆری و زیاد لە(٩٠٠) پردی هێڵی ئاسنین شەمەندەفەریان تەقاندەوە.

لە ساڵی(١٩٤٣)دا حیزب چەند بریارێکی دەرکرد بۆ پێکهێناوەی بەرهەم لە ناوچە ڕزگارکراوەکاندا. هەروەها لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە یارمەتی گەورەو زۆرمان بۆهات.

ئەو یارمەتییانە زۆر زیاتربوون لەو یارمەتییانەی لە ساڵی(١٩٤٢)دا بۆیاندەناردین، بەڵام ئەویارمەتییانە زۆر کەمتربوون لەو برەی کە بەڵێنیان پێدابووین، وە لە کۆتایی ساڵی(١٩٤٣)دا بەتەواوی برو قەبارەکەی کەمتربوونەوە.

بێگومان ئێمە بەو سەرکەوتنانەی کە هاوپەیمانان لە ئیتاڵیاو عەلەمەین و تونس و جێگاکانی تردا بەدەستیان هێنا شاد و دڵخۆشبووین، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوەنەبوو کە ئێمە لە هاوپەیمانەکانمان چاوەڕوانمان لێدەکردن کە ببێتە مایەی ڕێزوپێزانینی ئێمە لەو دەورەی کە گێراوییانە.

ستالین پاش گەڕانەوەی لە کۆنگرەی (تەهران)دا وتی"ڕۆزفڵت خۆی بۆ خۆی بەڵێنی تەواویداوە کە لەساڵی ١٩٤٤دا لە فەڕەنسادا دەستدەکات بەکاروچالاکی بەرفراوان. منیش لەو بـاوەڕەدام بەڵێنەکەی خۆی بەجێدێنێت. خۆئەگەر بەڵێنەکەشی نەباتە سەر و بێ بەڵێن بێت.. هێزەکانمان هێزی ئەوەندەیان هەیە کە بتوانن هێزەکانی ئەڵمانیای فاشیست تێك بشکێنێت."

لە کۆتایی ساڵی(١٩٤٣دا هێزەکانمان لە دوولاوە ئەنجامی گرنگیان بەدەست هێناو توانییان بەتەواوی هەردوو هەرێمی کالینین و سمولینسك و بەشێکی گەورەی بیلورووسیای خۆرهەڵات ڕزگار بکەن).

وە لەلای باشوری خۆرئاواوباشوردا هێڵی بەرە وایلێهات بە(بولیسیا و جیتوتیر و فاستۆف و-کیرۆفۆگراد و-زایوروجی و خرسون)دا تێپەڕبوو، بەڵام نیوەدوورگەی(قرم) هێشتا هەر لە ژێرداگیرکردنی ئەڵمانیادا بوو.

وە لە ناوچەی لینینگراد و باکوردا بارودۆخ لە پێشوو زۆر چاکتربوو، ئەندامانی ئەنجومەنی بەرگری نیشتمانی و هەروەها ئێمەش ئەندامانی سەرکردایەتی باڵا دەمانزانی سەرکەوتنی گەورەمان بەدەست هێناوە و دوژمن تووشی شکستی دڵتەزێن و ناخۆش بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هێزو توانای ماوەو بەهێزە وە لە ساڵی(١٩٤٤)دا دوژمن توانی بچێتە ناو بەرگری کردنێکی زۆربەهێزەوە چونکە لە ئەوروپادا بەرەیەکی دووەم نەبوو، لەساڵی(١٩٤٤)دا هێزەکانی ئەڵمانیا لە خاکی یەکێتی سۆڤێتیدا نزیکەی(٢) ملیۆن سەرباز و(٥٤,٥)هەزار تۆپی مەیدانی و ئامێرو ٤٥٠٠ دەبابە و زرێپۆش و زیاد لە ٣ سێ هەزار فڕۆکە بوون. پاش لێکۆڵینەوەو وردەکارییەکی سەرانسەری قوڵی هەڵوێستەکە سەرکردایەتی باڵا بڕیاریدا، هێرشێکی سەرانسەری زستانە لە لینینگرادەوە هەتا قرم دەست پێبکرێت و هێرش بکرێتە سەر دوژمن.

بۆ ئەو کارەش داوایان لە من و فاسیلیفسکی کرد کە پلان و ئامادەکاری تەواو و کۆتایی بۆ ئەو مەبەستە ڕێکخەین و بیخەینە بەردەم بەرە جیاجیاکانی جەنگەوە.

بۆ ئەو کارەش ئێمە لە ئەنجومەنی ئەرکاندا ماوەی پێنج ڕۆژ بەردەوام هەوڵو لێکۆڵینەوەمان بۆ کرد. لە ڕۆژی(٣٠ی کانونی دووەمی١٩٤٤)دا گەمارۆی هێزێکی گەورەی مۆڵگای دوژمنماندا لە ناوچەی(کۆرسۆن، شیفشینکۆفسکی)دا.

هێزەکە هەوڵێکی تەواویدا بۆ تێکشکاندنی ئەو گەمارۆیە، جیاوازتر لە هێزەکەی جەنەراڵ(باولۆس) لە ستالینگراددا، کە چاوەڕوانی هێزەکانی(مانشیتن)بوو بۆ تێکشکاندنی ئەو گەمارۆیەی بە دەوریاندابوو.

لەبەرئەوە بۆ تێکشکان و قوتاربوون لە هێڵەکانی هێزەکانی سۆڤێتی کە گەمارۆیاندابوون، هەموو هەوڵ و تێکۆشانێکی خۆیان خستەکار.

لە ڕۆژی(٨ی شوباتی١٩٤٤)دا هێزەکانی سۆڤێتی ئاگادارکردنەوەیەکیاندا

به هێزەکانی ئەڵمانی کە خۆیان بە دەستەوە بدەن، بەڵام سەرکردایەتی هێزە گەمارۆدراوەکانی ئەڵمانی گوێیان بەو بانگەوازە نەداو لە ڕۆژی(٩)دا ڕازی نەبوونی خۆیان ئاشکراکرد.

لە(١٧ی شوبات)دا پاش شەڕوپێکدادانێکی قورس و خوێناوی توانرا کۆتایی بەبەرگری هێزەکانی دوژمن بهێنرێت و پاکیان بکەینەوە.

وە بەرەی ئۆکرانی توانییان(١٧)هەزار سەربازی ئەڵمانی دەسگیربکەن، بەو سەرکەوتنەی لەو شەڕوپێکدانەدا بەدی هێنرا بارودۆخێکی لەباری ڕەخساند بۆ ڕزگارکردنی هەموو ئۆکرانیای خۆرهەلات.

---

# بەشی پانزە
# گەریلاکان

تێکشکانی هێزە فاشییەکان لە بیلورووسیا و
کشانەوەی یەکجارەکییان لە ئۆکرانیادا
- سەرکەوتنەکانی لەشکری سوور وای لە میللەت کرد هەر هەموویان ببنە هێزی جەنگاوەر-
- گەمارۆدانی سوپای چواری ئەڵمانی- شاری(مینسک) چۆن ڕزگارکرا-
- ئێستا پرسیار ئەوەیە.. کەی دەستبکەین بەڕزگارکردنی پۆڵندا؟-
- سەربازێکی سۆڤێتی بۆمبێک هەڵدەداتە سەر دەبابەیەک و خۆی دەخاتە ژێر زنجیری دەبابەیەکی ترەوە و دەیتەقێنێتەوە-

گەلی بیلورووسیا(ڕووسیای سپی) ماوەی سێ ساڵیان لە ژێر زەبروزەنگی داگیرکەراندا بەسەربرد. هیتلەرییەکان لەو ماوەیەدا دەستدرێژی و ئەتکی ناموسیان دەکردن. ماڵ و خانوی(١٢٠٠) لادێیان سوتاند(٧) هەزار قوتابخانەیان تەقاندەوە و(٢) ملیۆن و(٢٠٠) هەزار کەسی شارولادێکانیان بەندکرد و کوشتیانن

و لەناویان بردن.

هیچ خێزانێك نەما بەدەست ئێش و ئازار و ناخۆشییەكانی جەنگەوە نەیاننالاَندبێت، بەلاَم بیلۆڕووسیا لەگەڵ ئەم هەموو ناخۆشی و ناهەمواریانەشدا سەربەرزانە لەبەردەم دوژمندا خۆڕاگربوو.

كاتێك هەواڵی سەركەوتنەكانی سوپای سوور لە ڕزگاركردنی ئۆكرانیا بلاَوبۆوە، پێشمەرگە قارەمان و ئازاكان هێزوتینێكی نوێیان لە بەرامبەر ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا پەیداكردەوە.. و هەتا هاوینی(١٩٤٤) ژمارەی پێشمەرگە لە بیلۆڕووسیا- ڕووسیای سپی-دا گەیشتە(٣٧٤) هەزار جەنگاوەر.

لە كۆماری بیلۆڕووسیادا سەركردایەتی گشتی خەباتی پێشمەرگەكان لە ژێر چاودێری و سەرپەرشتیی لیژنەی مەركەزی حیزبدابوو بە سەرۆكایەتی سكرتێری یەكەم(بۆنۆمارینكۆ) كە لە هەمانكاتیشدا سەرۆكی ئەركانی جەنگی هێزی پێشمەرگەكانی یەكێتی سۆڤێتیش بوو.

چالاكییەكانی بیلۆڕووسیا بە پانتایی زیاد لە هەزار كیلۆمەتر بە درێژایی و قووڵایی زیاد لە(٦٠٠) كیلومەتر ئەنجام دەدرا. وە لە بەرامبەر(٩٠٠) هەزار سەرباز لە باشترین و شارەزاترین سەربازانی دوژمن و (٩٥٠٠) تۆپی مەیدانی و ئامێر و(٩٠٠) دەبابە و(١٣٠٠) فڕۆكەی جەنگی.

هێڵی بەرگری دوژمن بە قووڵایی(٢٥٠-٢٧٠)كیلۆمەتربوو، سەرەتای كاروچالاكییەكان لە كاتی یادكردنەوەی سێیەم ساڵی جەنگدابوو. پاش ئەوەی هێزەكانمان سەركەوتنی گەورەیان بەسەردوژمندا بەدەست هێنابوو.

ئەوەش وای لە سەربازەكانمان كردبوو كە بەوپەڕی دڵنیایی و باوەڕكردن بە سەركەوتن بچنە كۆڕی جەنگەوە. بێگومان وورەی جەنگاوەران بەرزتربۆوە كاتێك هەواڵیان پێگەیشت كە هاوپەیمانان هێزەكانیان لە نۆرماندی فەرەنسادا دابەزاندووە. بەوەش بەرەیەكی نوێیان لە ئەورووپادا كردەوە لەگەڵ ئەوەی كە ئایندەی ئەڵمانیای فاشی بەشێوەی یەكجاری كۆتایی پێهاتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هێزەكانی سۆڤیاتی شادوپێخۆشحاڵ بوون بە كردنەوەی ئەو بەرەنوێیە، چونكە ئەوە دەبێتە زووتر كۆتایی پێهێنانی جەنگ.

له(٢٣ی حوزەیران)دا هێرشی سەرانسەری دەستپێکرد بڕیاردرا بەرەی یەکەمی(بەلتیك)بولوتنسك ڕزگار بکات و لەپێش چوونیان بەردەوام بێت بەرەو(جلوبوکیا) و هەردوو بەرەی دووەم و سێیەمیش شاری(بفسك)ی پایتەختی بیلورووسیا ڕزگاربکەن.

بەرەی یەکەمی بیلورووسیاش بەهێزە سەرەکییەکانییەوە بەرەو(سلوتسك) بکشێت و هەندێ لە هێزەکانیش ڕەوانەی لای(مینسك)ەوە بکات و لەوێوە دەست بووەشێنن و لە دوژمن بدەن بۆ ئەوەی لە باشور و باشوری خۆرئاواوە داگیری بکەن.

ئەم پلانە بەپێی ڕەزامەندی سەرکردایەتی بالاّبوو. بۆ ئەوەی لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی ئەو تیپ و هێزانە سوپای(ناوەڕاست)ی ئەڵمانی بدرێت و بەتەواوەتی لەناوببرێت و پاکبکرێنەوە، هێزەکانی سۆڤیێتی بەپێی ئەو پلانەی بۆیان دیاری کرابوو مەبەستەکانیان پێکا جێبەجێکردنی ئەو پلانە نیشانەی کامڵبوون و دووربینی و شارەزایی گەورەی هونەری سەربازی و ستراتیجی سەرکردایەتی سۆڤیێتی بوو.

بارودۆخ گەیشتبووە ئاستێك لەباربوو کە گەمارۆی هەموو یەکە سەربازییەکانی سوپای چواری ئەڵمانی بدەین. ئێمە هەمووومان لە سەرکردایەتی بالاّو ئەنجومەنی ئەرکانی جەنگ و گشت بەرەکاندا بیروهۆشمان لای ئەو بڕیارە بوو کە دەشیا سەرکردایەتی ئەڵمانیا دەری بکات.

هەروەك لەم حاڵەتانەدا پەیڕەودەکرا، سەرکردایەتی هەمووپشتێکی بە هەوڵەکانی هەواڵگران بەستبوو بۆ زانینی بیروڕای دوژمن و ئەو هەوڵو ڕێگایانەی سەرکردایەتی ئەڵمانییەکان بە نیازن بیانگرێتەبەر، بەلاّم هەوڵەکانمان سەرنەکەوت و هیچ زانیارییەکی ئەوتۆی بەسوودمان دەستنەکەوت.

پێشمەرگەکانمان پێیانڕاگەیاندین کە دوژمن لە شاری(مینسك)ی داگیرکراودا دەوروبـەری بارەکا حکومییەکان و بارەگای لیژنەی مەرکەزی حیزبیان مین ڕێژکردووە.

ئێمەش بۆ پاراستنی ئەو تەلارە گەورانە لە ڕووخان وێران بوون، بڕیارماندا

هێزێکی دەبابە بەزووترین کات بنێرێنە ناوشارەکەوە بێئەوەی لە دەوروبەری شاردا لەگەڵ دوژمندا شەڕ بکات.

لەگەڵ هێزەکەشدا یەکەیەکی هێزی ئەندازیاریمان لەگەڵدا نارد بۆ ئەوەی مینەکان هەڵگرنەوە.

چالاکییەکە سەرکەوتوانە جێبەجێکرا..

هەر لەبەرەبەیانی(٣ی تەمووزدا) فەیلەقی دووی دەبابەکان لە خۆرهەڵاتەوە بەسەرکردایەتی(بوردلین) خۆیانکرد بە ناوشاردا و لە هەمانکاتیشدا فەیلەقی یەکەمی دەبابەکانی سەر بەبەرەی یەکەمی بیلورووسیا لەلای باشوری خۆرهەڵاتی شارەکەوە دەوروبـــەری شاریان داگیرکرد، دوای ئەوە هەرچی قایم کاری و ئامادەباشیبوو بۆ داگیرکردنی شارەکەکرا.

لە کاتی خۆرئاوابوونی ڕۆژی(٣ی تەمموز)دا بە تەواوی شاری (مینسك) ڕزگارکراو گەمارۆی(١٠٠)هەزار سەربازی هێزەکانی دوژمندرا.

شارەکە زۆر گۆڕرابوو.. لەمەوپێش من(٧) ساڵ لەو شارەدا ژیابووم و هەموو کوچەو شەقامەکانی شارەزابووم، کواشانۆ و پردو یاریگەکانی.. کوا ئوتێل و کۆشکە بەرزەکانی.. هەر هەموویان رووخێنرابوون و ببوونە کەلاوە. ئەوەی کە لە هەمووی ناخۆشتر و ئازاری بەدڵودەروون دەگەیاند سەروسیمای خەڵکەکەبوو زۆربەیان هەر قەوارەکەیان مابوو. لەتارمایی دەچوون و فرمێسك بەلێشاو بەسەر گۆنایاندا دەهاتەخوارەوە. لە(٨ی تەمموزدا هێزە گەمارۆدراوەکان پاککرانەوە ئەوەی کوژرا کوژرا ئەوەشی کەمایەوە دەست بەسەرکران، ژمارەی دیلەکان(٥٧) هەزار سەرباز و ئەفسەربوون، لەناو بە دیلگیراوەکاندا(١٢) جەنەڕاڵیان تێدابوو، سیان لەوانە سەرکردەی فەیلەق بوون و نۆکەی تریشیان سەرکردەی فیرقەبوون.

هەندێ لە دیلکراوەکان توانییان هەڵبێن، بەڵام لەو هەڵاتنەیاندا نەیانتوانی بگەنە ئەو هێزانەی پاشەکشەیان دەکرد، چونکە سوپاکە بەخێرایی هەڵدەهات. پاشان ئەو هەڵاتوانە کەوتنە بەردەستی پێشمەرگەکان و گرتیاننەوە، ئەو پێشمەرگانەی سەردار و دەستەڵاتداری ڕاستی دارستانەکانی بیلورووسیابوون.

کێشەی تێکشکانی ئەڵمانیا لە جەنگدا کێشەیەکە یەکلایی کراوەبوو.

کەسیش گومانی لەسەر ئەوەنەبوو. ئەو شەڕەی لە ساڵانی(١٩٤٣-١٩٤٤)دا لە بەرەکانی سۆڤیاتی- ئەڵمانیدا کرا ئەو کێشەیەی یەکلایی کردبۆوە، بەڵام بیرکردنەوە تەنها لە کات و ساتی کارەکەبوو، هەروەك لە ئامانجە سەربازی و سیاسییەکاندا دیاربوو.

ستالین بە وردی و قوڵی لە کارەکان گەیشتبوو لەو باوەڕەشدابوو(باوەڕەکەشی ڕاستبوو) کە یەکێتی سۆڤێتی دەتوانێت خۆی بە تەنها بجەنگێت و پشت بە هێزەکانی یەکێتی سۆڤیاتی خۆیان ببەستێت و بە تەواوی هێزەکانی ئەڵمانیای فاشیست تێکبشکێنێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردەی باڵا پێخۆشحاڵ بوو بە کردنەوەی بەرەیەکی نوێ لە ئەوروپادا.

چونکە ئەو بەرەیە دەبووە کۆتایی پێهێنانی خێرایی یەکجارەکی جەنگ. ئەو کارەش دەربارەی گەلی سۆڤێتی کارێکی یەکجار چاکبوو، چونکە گەلی سۆڤێتی لەو چەند ساڵانەدا قوربانی یەکجار زۆریدابوو پرسیارێك دەکرێت، ئەڵمانیا لەم بارودۆخەدا بەتەمای چییە؟ ستالین بەم شێوەیە وەڵامی ئەو پرسیارەی دایەوە،

- ئەڵمانیا وەك قومارچییەك بەتەمایە هەرچییەکی پێماوە دایبنێت و بیدۆڕێنێت.

ـ مۆلۆتۆفیش وتی(هیتلەر) وادیارە دەیەوێت ڕێکەوتنێکی یەکلایی لەگەڵ گەورەو کاربەدەستانی ئەمریکاو بەریتانیادا بکات.

ـ ستالین وەڵامیدایەوە شتی وا هەرگیز نابێت.. ڕۆزفلت و چەرچڵ ڕازی نابن و ڕێکەوتن لەگەڵ هیتلەردا بکەن. ئەوان هەوڵدەدەن بەرژەوەندی سیاسی خۆیان لە ئەڵمانیادا بەدی بێنن، ئەویش بەوەی کە حکومەتێکی ئەڵمانی پێکبهێنن کە سەربەخۆیان بێت، نەك بەو ڕێگایەی هاوکاری لەگەڵ هیتلەرییەکاندا بکەن کە گەل بڕوایان پێنەماوە، پاشان سەرکردەی باڵا لێپرسیم..

ـ ئایا هێزەکانمان دەتوانن پۆڵندا ڕزگاربکەن و بێوەستان بکشێن هەتا دەگەنە(فیسلو)

منیش وەڵامم دایەوە..

ـ هێزەکانمان نەك هەرتوانای ئەوەیان هەیە، بەڵکو دەتوانن دەست بەسەرپردی

سەر ڕووبارەکانیشدا بگرن بۆ ئەوەی دڵنیابین لە کاروچالاکی هێرشی ستراتیجی بەرەو(بەرلین).

هێزەکانی سۆڤێتی دەستیان کرد بە هێرشکردن و بەرەوپێشچوون، وتوانییان بەسەر سێ سوپای(ناوەڕاست)ی ئەڵمانیادا زاڵبن و تێکیان بشکێنن، ئەویش سوپای سێی دەبابە و سوپای چوار و نۆی پیادەبوو.. دەرەنجامی ئەوەبووە چۆلکردنی پانتاییەك کە دوژمن دەستی بەسەردا گرتبوو.

پانتاییەك بە درێژایی(٤٠٠)کیلۆمەتر و بە قوڵایی(٥٠٠) کیلۆمەتر هێزەکانی ئەڵمانیا نەیانتوانی ئەو بۆشاییە بە یەکەی سەربازی تر پڕبکەنەوە.

هێزەکانی سۆڤیاتی لە ناوچەی(دیمبلین) گەیشتنە(فیسلین) و لەسەربازگەی(میدانیکا)دا ئەوەی لەدەست کوشتن و لەناوبردنی نازییەکاندا مابوون، لەوسەربازگەیەدا ڕزگاریان کردن، چونکە نازییەکان دوو ملیۆن و نیو کەسیان لەوێدا کوشتبوو.

وە لە(٢٨ی تەمموز)دا هێزەکانی بیلورووسیا لە هەرێمی(بریست)دا بەسەر هێزەکانی دوژمندا زاڵبوون و توانییان شارەکە و قەڵاخۆراگرەکەی شارەکە ڕزگاربکەن، ئەم شوێنە یەکەم شوێن بوو کە لە(٢٢ی تەممووزی١٩٤١)دا کەوتە ژێردەستی فاشیستە شەڕخوازەکانەوە.

پێشمەرگە قارەمانەکانمان دەورێکی گەورە و پڕ لەسەروەرییان بینی لە یارمەتیدانی هێزە چەکدارەکانمان، بەلە ناوبردنی هێزێکی سوپای ناوەڕاستی دوژمن.

لە(٢٧ی تەممووزدا) هێزەکانی سۆڤێتی دەستیان کرد بە پەڕینەوە لە ڕووباری(فیسك) ئەو پەڕینەوەیە پاشان دەورێکی گرنگی بینی لە ڕزگارکردنی پۆڵندادا.

هێزەکانی ئەڵمانیا هەستیان بە ترسناکی ئەوپەڕینەوەیە کردبوو. لەبەرئەوە هێزێکی زۆرتریان نارد بۆ بەرەنگاری و ڕووبەڕووبوونەوەی هەر دوو سوپای هەشتەم و شەست و نۆ، کەدەیانویست لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە. شەڕو کوشتارێکی قورس لە نێواندا هەڵگیرسا و هێزەکانی سۆڤێتی توانییان بەرهەڵستی هەموو هێرشەکانی

دوژمن بکەن و زەرەرو زیانی بێشوماریان پێ بگەیەنن.
خۆراگری لە کەناری ئەوپەری رووبارەکەوە و شەرکردن لەوێدا ئەوەندە قورس و توندوتیژبوو بەدەم باس ناکرێت، ئەمە یەکێك لەو قارەمانە بریندارانەی ئەوێ بۆی گێرامەوە..
ـ فەرمان بەلقەکەی ئێمەدرا لە کازیوەی بەیاندا لە رووباری(فیسلو) بپەڕینەوە ئەوبەری کەناری رووبارەکە، لقەکەی ئێمە لە پەنجا کەس کەمتربووین بەسەرکردایەتی مولازم(بوریا)
هەرکە گەیشتینە کەنار رووبارەکە دوژمن ئاگربارانی کردین و دەستیان بە تەقەکردن کردو هێرشیان بۆ هێناین. بەرهەڵستی هێرشی یەکەمیانمان کرد و پاشان دووەم و سێیەم.. بۆ رۆژی دوایی دوژمن بەدەبابەو هێزی پیادەوە هێرشیان بۆ هێناین بەتایبەتی هێرشەکەی دواییان زۆر قورس و توندوتیژبوو.
تەنها(١٢) کەسمان مایەوە، ئەوانی تر هەموویان کوژران پێش هێرشی دوایی دوژمن، مولازم(بوریا) پێی وتین..
ـ کورینە ژمارەیەکی کەممان ماوینەتەوە لە شەودا یارمەتیمان بۆدێت... هەتاشەو دەبێت تا دوا دڵۆپی خوێنمان بجەنگین و خۆمان نەدەین بەدەستەوە، دوای ئەوە بەماوەیەکی کەم دوژمن بەدەبابەو لقێکی سەربازی پیادەوە هێرشیان بۆ هێناین..
چەند دەبابەیەك زۆر لێمان نزیك بۆوە، مولازم(بوریا) بۆمبێکی دەستی هاویشت بۆ دەبابەیەکیان و تێکیشکاند، پاشان بەبۆمبێکی ترەوە خۆی هاویشتە ژێر زنجیری دەبایەیەکی ترەوە و خۆی و دەبابەکەی تەقاندەوە، دوژمنمان گەڕاندەوە، بەڵام سەرکردەکەمان شەهیدبوو.. لە لقەکەی ئێمە تەنها(٦) سەرباز مابووینەوەکە بە هانامانەوەهاتن و بەرگریمان لە شوێنەکە کردو نەمانهێشت بکەوێتە ژێردەستی دوژمنەوە.
لە کاتێکدا ئەو سەربازە ئەو قارەمانی و ئازاییەی سەرکردەو هاورێکانی دەگێرایەوە، فرمێسك بە چاوەکانیدا بە خوڕ دەهاتە خوارەوە.
منیش لە کاتی گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتەدا خۆم پێڕانەگیرا و تووشی خەم و

خەفەتێکی یەکجار زۆربووم.

ئەمە چیرۆك و بەسەرهاتی پیاوە ئازاو قارەمانەکانمانە و نازناوی قارەمانی یەکێتی سۆڤێتیش بە مولازمی شەهید(بوریا)ی قارەمان بەخشرا.

---

## هەواڵگری

لێرەدا دووبارە دەمەوێت باسی هەواڵگری بکەم بەشێوەی ئەوەی ئەم هەواڵگرییە لە خەباتی چەکداریدا دەورێکی گەورەو ترسناك دەبینێت.

شارەزایانی جەنگ جەخت لەسەرئەوە دەکەنەوە، ئەو زانیارییە راست و دروستانەو شیکردنەوەیان بۆ هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی کاروچالاکییە بناغەییەکان پێویستە بکرێتە بناغە، خۆ ئەگەر هەواڵگرییەکان نەیانتوانی زانیارییەکی راست و دروستبدەن، یاخود لە شیکردنەوەی ئەو هەواڵانەدا هەڵەیەك روویدا، بێشك بریارەکانی سەرکردە و ئەرکانەکانیش لە هەر ئاستێکدا بێت لە رێرەوی راستی لادەدات و دەکەوێتە هەڵەوە. ئەمەش لە کاتی بەرێوەچوونی کاروچالاکییەکاندا ئەنجامی چالاکییەکە وەك ئەو پلانەی چاوەروانی لێدەکرا وەك خۆی دەرناچێت و ناروات بەرێوە.

بەو شێوەیە لەماوەی دوومانگی شەروکوشتاری بەردەوام و توندوتیژدا لەو ماوەیەدا توانرا دوو مۆڵگە لە گەورەترین مۆڵگا ستراتیژییەکانی ئەڵمانی فاشی لەناوخاکی سۆڤیاتیدا لەناو ببرێت و کۆماری بیلورووسیا رزگاربکرێت و هەروەها کۆماری ئۆکرانیاش رزگاربکرێت و بەشێکی گەورەی کۆماری لیتوانیا و خۆرهەلاتی پۆڵنداش لە دوژمن پاکبکرێتەوە و رزگاربکرێت.

---

# بەشی شانزە
# بەرەو ڕێگای بەرلین

- زۆکۆف و سەرکردایەتیکردن بەرەوبەرلین-
هاوپەیمانان فەڕەنسا و بەلجیکا و هۆڵندە ڕزگار دەکەن و لە سنووری ئەڵمانیا نزیکدەبنەوە-
- ئەو گەرماوە خوێناوییانەی پیاوانی(جستابو) پێکیانهێنابوو- فاشییە بەربەرییەکان شاری وارسۆیان وێرانکرد- ستالین بە چالاکی و کاری داگیرکردنی بەرلیندا دەچێتەوە-

لە کۆتایی مانگی (ئەیلولی ١٩٤٤)دا لە بولگاریاوە گەڕامەوە بۆ سەرکردایەتی باڵا. پاش چەند ڕۆژێکی کەم سەرکردەی باڵا داخوازی لێکردم سەفەرکەم بۆ ناوچەی وارسۆ.

چونکە هەردوو بەرەی یەکەم و دووەمی بیلورووسییەکان لەوێ کۆدەبنەوە، پێش هەمووشتێك من دەمویست بە تایبەت هەڵوێست لە وارسۆدا بزانم، چونکە سەرکردایەتی ئەڵمانییەکان بە دڕندایەتی و قین و تووڕەیی خۆیان بەتایبەت

ڕژاندبوو بەسەر ئەوانەی کە لەناو شاردا هاوکاری ڕاپەڕینیان کردبوو، ئەڵمانەکان ژمارەیەکی یەکجار زۆری خەڵکی شارەکەیان کوشتبوو، شارەکەشیان تاسەر بناغەکاولکردبوو.

لەو وێرانکاری و کاول کردنەدا هەزارەها هاوڵاتی پۆڵەندی کەوتبوونە ژێر کەلاوەکانییەو لەناوچوون.

مارشاڵ زۆکۆف تێگەیشت کە هێزەکانی سۆڤیاتی هیچ زانیارییەکیان لە کات و ساتی ڕاپەڕینەکەی وارسۆنەبووە هەر لەبەرئەوەبووە کە نەیانتوانیوە هیچ یارمەتی و هاوکارییەك پێشکەش بەرگری میللی شاری وارسۆ بکەن. کاتێك هێزەکان ویستیان بچنە ناوشارەکەوە، تووشی شکست و زەرەرو زیانێکی یەکجار زۆربوونەوە.

مارشاڵ زۆکۆف بڕوای بەوەهێنا بەردەوام بوون لەسەر هێرشکردن هیچ ئەنجامێکی باشی نابێت لە زەرەرو زیانی زۆرو زیاتر هیچی تریان دەست ناکەوێت، بۆ ئەو زەرەروزیانە گەورانەش هیچ پاساوێك نییە.

جەنەراڵ(واکۆسوفسکی)یش لەو بیروڕایەیدا هاوبیری بوو.. مارشاڵ زۆکۆف و جەنەراڵ واکۆسوفسکی گەڕانەوە بۆ مۆسکۆ بۆ ئەوەی داوا لە ستالین بکەن فەرمانبدات واز لە هێرشکردن بهێنن و لەبەرەی یەکەمی بیلورووسیادا بچنەباری بەرگرییەوە، ستالین لەسەر بیروڕای خۆی سووربوو.

مارشاڵ زۆکۆفیش دژی ئەوبیرەی ئەو بەرهەڵستی دەکرد و لەسەر بیروڕای خۆی پێی داگرتبوو، دەیوت"هێرشکردن لە قوربانیدانی زۆرزیاتر هیچ دەرەنجامێکی تری نییە.

ئاخری ستالین ڕازی بوو..

بۆ ڕۆژی دوایی ستالین لە زۆکۆفی پرسی..

ـ بیروڕای تۆ چۆنە لە ئایندەدا سەرکردایەتی هەموو بەرەکان لە ژێردەستی ڕاستەوخۆی سەرکردایەتی باڵادا بێت..؟ لەمەبەستەکەی گەیشتم کە ئەو نیازی ئەوەیە هەرچی نوێنەرانی سەرکردایەتی باڵا هەیە بۆ هاوئاهەنگی لە نێوان هەموو کۆمەڵانی بەرەکاندا لابەرێت و وازیان لێ بهێنێت، دیار ئەم بیرەش دەمێکە وا لە

مێشکیدایە و دەرەنجامی قسەکانی دوێنێ نییە.
- سەرکردایەتی باڵا توانای تەواوی هەیە کە ڕاستەوخۆ هەموو بەرەکان بەڕێوەبەرێت، چونکە ژمارەی بەرەکان کەم بوونەتەوە و درێژایی بەرەکانیش بەگشتی کەم بوونەتەوەو ژمارەی سەرکردەکانیش کەمیانکردووە.
- ئایا ئەوە بەبێ بێزاری و ناخۆشییەوە دەڵێیت..؟
- بێزاری بۆچییە، وابزانم من و فاسیلیفسکی هێشتا بێکارنین(مەبەستی ئەوەیە دەستمان لەکارنەکێشراوەتەوە) لە شەوی هەمان ڕۆژدا سەرکردایەتی باڵا بانگی کردم بۆ لای خۆی و پێیوتم.
- بەرەی یەکەمی بیلورووسیا بەرەو ڕێگای بەرلین ڕێدەکات ئێمەش دەمانەوێت تۆ بەرەو ئەو لایەنە بنێرین، وەڵامم دایەوە وتم،
- من ئامادەم سەرکردایەتی هەر بەرەیەك بێت بیکەم.
- لە ئایندەشدا هەر نوێنەری منیت، ئێستاش پەیوەندی بە براکاسوفسکی یەوەدەکەم و پێیدەڵێم، بچێتەبەرەی دووەمی بیلورووسیاوە.
ئەوداهات و لەپێش چوونە گەورەیەی باری ئابوری یەکێتی سۆڤێتی ڕێگای خۆش کرد و توانای پێویستییەکانی زیاتر کرد، نەك تەنها هەر بۆ هێزە چەکدارەکانی سۆڤیاتی بەڵکو بۆ گەلە تێکۆشەر و خەبات گێرەکانی ناوەڕاست و باشوری خۆرهەڵاتی ئەوروپاش، بۆ نمونە یەکێتی سۆڤێتی(٣٥٠٠) تۆپی مەیدانی و(١٢٠٠) فرۆکە و(١٠٠٠) دەبابە و(٧٠٠) هەزار تفەنگ و تۆپ و ڕەشاش و(١٨) هەزار ئۆتۆمبیلی پێشکەش بە هێزەکانی ڕزگاری پۆڵندی کرد، و(٤٤٢٩) تۆپی مەیدانی و ئامێر و(٥٠٠) فرۆکە و زیاد لە(١٣٢٩) وێستگەی ڕادیۆ و ژمارەیەکی زۆری پێداویستی جەنگی جۆراوجۆری پێشکەش بەهێزەکانی ڕزگاری یۆگۆسلافی کرد. هەر لەو ماوەیەشدا یەکێتی سۆڤێتی خاك و زەوییەکانی لە ژێر دەستی داگیرکەرانی ئەڵمانیدا ڕزگار کردو سنوورە دەوڵەتێکانی خۆی گرتەوە بێجگە لە کۆرلیاندا.. کارو چالاکییە جەنگییەکانی گواستەوە بۆ ناوخاکی دەوڵەتە ئەوروپاییە خۆرهەڵاتەکان و بۆ ناوخاکی ئەڵمانیای فاشیست هێزەکانی بولگاریاش لەبەرەی جەنگدا شوێنەکانی خۆیان گرتەوە، هەروەها هێزەکانی

سوپای ڕزگاری خوازی میللی بەسەرکردایەتی مارشاڵ تیتۆ گەیشتنە دەریای ئەدریاتیك، هێزەکانی ولاٚتە یەککگرتووەکان و بەریتانیا و فەرەنسا..

فەرەنسا و بەلجیکا بەشێکی هۆڵندەیان ڕزگارکردوو نزیك سنووری ئەڵمانیای فاشی بوونەوە کە پێیاندەوت(زیجفرید).

---

## ئەڵمانیا لە بارێکی ناهەمواردا-

ئەڵمانیا کەوتە بارێکی ناهەموارەوەو توانای بەرهەم هێنانی چەك و تەقەمەنی لە کۆتایی ساڵی(١٩٤٤)دا زۆر دابەزی لە خۆرهەلاٚت و باشوری خۆرهەلاٚت و باشور و خۆرئاواو هەمووولایەکەوە فشاری زیاتری کەوتەسەر بەوەش کەوتە ژێر گەمارۆیەکی ستراتیژییەوە.

زۆرگران بوو بتوانێت لەو فشارە ڕێگا چارەیەك بدۆزێتەوە و خۆی لێ قوتار بکات. لەو کاتانەشدا پیاوانی(جستابو)[٦] هەر جۆرە شێوازێکی بڕوا نەبوون بە نیزامەکەیان، یا هەر ناکۆکی و جیاوازییەك لەبیروباوەڕدا سەریهەڵدایە، بێ بەزەییانە لەناویان دەبردن و سەرکوتیان دەکردن.

بە تایبەتی دوای ئەوەی کە لە(٢٠ی تەمموزی١٩٤٤)دا هەوڵی کوشتنی هیتلەردرا و هێزێکی یەدەکی بەسەرکردایەتی(هملر) لە پیاوانی تەمەن(١٨) ساڵ تا (٦٠) ساڵیان بۆ سەرکوتکردن دامەزراند.

هەر بۆ ئەو مەبەستە فەیلەقێکیشیان لە ئافرەتان پێکهێنا ئەڵمانییە فاشییەکان بۆ بەرهەڵستیکردن لەو کارەساتە چاوەڕوانکراوە بە نائومێدییەوە دوا هێزی خۆیان کۆکردەوە. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەڵمانیا هێشتا لە توانایدابوو کە بچێتە جەنگێکی بەرگری بەهێزەوە.

چونکە لەو کاتەدا سوپایەکی(٧,٥) ملیۆن و نیو سەربازی هەبوو لە نێوایاندا(٥,٣) ملیۆن سەربازی لەناو سوپادا لە بەرەکاندا لەکاردابوون. هەتا

ئەو کاتەش ئەڵمانیا هێزە سەرەکییەکانی کە بریتی بوو لە(٣,١) ملیۆن سەرباز و(٢٨,٥) هەزار تۆپی مەیدانی و ئامێر و نزیکەی(٤٠٠٠) هەزار دەبابە و نزیکەی دووهەزار فرۆکەی جەنگی لەبەرەی خۆرهەڵاتدابوو، دەبێت ئەوەش رەچاوبکەین کە هێڵی بەرەی سۆڤیاتی – ئەڵمانی زۆر لەوەو پێشتری کورتر ببۆوە، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند چروپری هێزەکانی ئەڵمانیا هێشتا لە بەرزی دابوو، بەڵام هێزەکانی سۆڤیاتی ئەوکاتە زۆر سەرکەوتووتربوون بەسەر هێزەکانی ئەڵمانیادا لە هەموو لایەنێکەوە.

نزیکەی(٦) ملیۆن سەربازی لە سوپادا لە کاردابوو، زیاد لە(٩١,٤) هەزار تۆپی مەیدانی و ئامێری هەبوو، نزیکەی(١١)هەزار دەبابەو موشەکی ئۆتۆماتیکی هەبوو، وە زیاد لە(١٤,٥) هەزار فرۆکەی جەنگیشی هەبوو.هەروەها(٣٢٠) هەزار سەربازی هێزەکانی پۆڵنداو چیکۆسولوفاکی و بۆلگاری و رۆمانیمان لەگەڵدابوو، وە لە ریزی هێزەکانی بەرەی سێیەمی بیلورووسیادا کەتیبەیەکی فرۆکەوانی فەرەنسێکان(نورماندیا – نیمان) بە قارەمانی و نەترسییەوە دەجەنگان.

لە خۆرئاواشدا هێزەکانی ئەمریکا و ئینگلیز و فەرەنسییەکان کە لە(٨٧) فیرقەی زۆربەباشی پرچەککراو و(٦٥٠٠) دەبابە و زیاد لە(١٠) هەزار فرۆکەی جەنگی پێکهات بوون، وە لە لەبەرامبەر ئەو هێزانەدا ئەڵمانیا(٧٤) فیرقەی بچووکی کەم ژمارەو(١٦٠٠) دەبابەو(١٧٥٠) فرۆکەیان کۆکردبۆوە.. پاش لێکۆڵینەوەو سەرنجدانێکی وردی هەڵوێستەکەو توانای هەموو هێزە جەنگاوەرەکان.

سەرکردایەتی باڵای سۆڤێتی بریاریدا لە سەرەتایساڵی(١٩٤٥)دا لە هەموو لاو بەرەکانەوە هەستن بە چەندەها هێرشی بەرفراوان بۆ...

ـ پاککردنەوەی مۆڵگاوهێزەکانی دوژمن لە بروسیای خۆرهەڵات و دەست بەسەرداگرتنیان.

ـ پاککردنەوەی هێزەکانی دوژمن لە پۆڵندا و چیکۆسلۆفاکیا و مەجەر و نەمسادا..

ـ خۆگەیاندن بۆ هێڵی رووباری-ڤیسلو- برومبرج- بۆزنان- برسلاو- ودوورگەکانی- مۆرافیا- هەر لەو کاتانەشدا پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی

باڵای سۆڤیاتی و نێوان سەرکردایەتی هاوپەیمانان پەیوەندییەکی باش و پتەویان پێکهێنا.

"لێرەدا پێویستە ڕاستیەکی گرنگ باس بکەم ئەویش ئەوەیە کە شاری بەرلین لەبەرەی سۆڤیاتی و بەرەی هاوپەیمانانەوە وەك یەك دووربوون، ئەوە کارێکی ڕێکەوت نەبوو کە ونستۆن چەرچڵ لە بیرەوەرییەکانیدا لە زۆر شوێندا باسی شاری بەرلین دەکات، وەك مەبەستێك کە هاوپەیمانان ئارەزوومەندبوون کە داگیری بکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە سەرکردەی هەموو دەوڵەتەکان کۆك بوون لەسەرئەوەی کە هێزەکانی سۆڤیاتی هەستێت بە داگیرکردنی شاری بەرلین"

پێویستە ئەوەبڵێم "کە ستالین زۆر بروای بەو زانیارییانە هەبوو کە لەلایەن ئەیزنهاوەرەوە بۆی دەهات" لەو نامانەی کە ستالین و ڕۆزفلت بۆ یەکتریان دەنارد لە جێبەجێکردنی ئەو ڕێککەوتننامانەی لە بواری هاوردەکردن و لە بواری مەسەلە ستراتیژییەکانی نێوان یەکێتی سۆڤێتی و وڵاتە یەکگرتووەکاندا هەبوو بەروون و ئاشکرا دیاربوو، بەڵام ئەمە دەربارەی ونستۆن چەرچڵ نەدەتوانرا بوترێت، چونکە وتارەکانی ڕوون و ئاشکرانەبوون، پیاو هەستی دەکرد لە قسەکانیدا جۆرە پێچ و پەناو ئەملاوئەولای تێدابوو، هەوڵیدەدا و جەختی لەسەر داگیرکردنی هەرێمی ناوەراستی ئەڵمانیا دەکردەوە، ئەمە وای لە حکومەتی سۆڤیاتی کردبوو، زیاتر هۆشیاری و هەڵوێستە لە ئاستیاندا بکات".

لە کۆتایی مانگی تشرینی یەکەمدا سەرکردایەتی باڵا داخوازییان لێکردم پلانی کۆتایی و سەرەکی بۆ چالاکی جەنگ دابنێم، لەپێش هەمواندا پلانی هێرشکردن بەرەو بەرلین و داگیرکردنی فەرمانمدا بەپێکهێنانی(پێشبڕکێیەکی جەنگی) لەسەرئاستی بەرەو سوپادا ئەو پێشبڕکێیە لەسەرئاستی هاوسەنگی نێوان هێزەکانی سۆڤیاتی و هێزەکانی دوژمندا سازدەکرا.

ئەو پێشبڕکێبە سوودێکی گەورەی هەبوو بۆ ئەوەی هەموو یەکە سەربازییە جەنگاوەرەکان هەست بە ڕۆڵی خۆیان بکەن لە شەڕوپێکدادانی داهاتوودا.

پێش ئەوەی هێرشکردن و لێدان بەرەو بەرلین دەست پێبکات وابڕیاربوو دوو

هێرشی سەربازی بەرفراوان بەرەو خۆرئاوای ستراتیژی دەست پێبکات.

یەکەمیان لە بروسیای خۆرهەڵاتەوەو دووەمیشیان.. بەرەو(وارسۆ- بەرلین)

بەرەی یەکەمی ڕووسیای سپی، داوایان لێکردبوون هێرش و لێدانەکەیان بەگشتی بەرەو(بوزنان) بێت، بەرەی یەکەمی ئۆکرانیش داوایان لێکرابوون بگەنە ڕووباری(ئۆدیر) و باکوری خۆرهەڵاتی(جلوجاو) و(برسلاو وراتیبور)، بەڵام بەرەی دووەمی بیلوڕووسی(ڕووسیای سپی) داوایان لێکرابوو بەرەنگاری ئەو کۆمەڵ و مۆڵگایانەی دوژمن ببنەوە کە لە برووسیای خۆرهەڵاتدان.. دەربارەی داستانی شەڕوپێکدادانی- فیسلو- جەنەراڵی ئەڵمانی(تیبیلکرنج) لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێت.. "شەڕولێدانەکە ئەوەندە قورس و بەهێزبوو نەك بەتەنها فیرقەی هێڵی بەرگری یەکەمی بەرەو دوا کشاندەوە، بەڵکو ئەو هێزە یەدەکییە گەورە و جووڵەجوڵکەرەشی کە لەسەر ڕێنمایی توندوتیژی هیتلەر هاتبوونە پاڵ هێزەکانمانەوە.. ئەوانیش کشانەوە ئەو هێزانە لە کاتی(ئامادەکاری تۆپەکانی ڕووسیدا) (تۆپ بارانێك کە پێش هێرشکردن دەکرێت) تووشی زەرەروزیان بوونەوە.

دوای ئەوە ئیتر ئەو هێزانە لە کاتی کشانەوەی سەرانسەریدا هەر بەکار نەهێنران."

مارشاڵ زۆکۆفیش دەڵێت.. "ئەو هێزانە هەرنەمان و بێسوودبوون چونکە هێزەکانی بەرەی یەکەمی ئۆکرانیا بەتەواوی لەناویان بردن لە(١٧ی کانوونی دووەم)دا سوپای سۆڤێتی چووە ناو شاری(وارسۆ)وە."

---

# وێرانکردنی فەرصۆفیا

هەروەك لە دوای هەموو تێکشکانێکی گەورەی سەربازی دەکرێت هیتلەر گۆڕانکارییەکی نوێی لەناو سەرکردەکاندا سازدا.

جەنەراڵ(جاربی) بە جەنەراڵ(شیرنر) گۆڕی و جەنەراڵ(لیوتفتیش)ی بەجەنەراڵ(پرسی) گۆڕی. کاتێك هێزەکانی سۆڤیاتی چوونە ناو شاری وارسۆوە بینیان شارەکە وێرانکراوەو بووە بەکەلاوە، ئەنجومەنی سەربازی بەرە، بروسکەیەکی بۆ سەرکردەی باڵا نارد...

"بەربەرییە فاشیستەکان وارسۆی پایتەختی پۆڵندایان خاپوورکردووە. بەشێوەیەکی هونەری دڕندانەیی یەك لە دوای یەك هەر هەموو گەڕەك و ناوچەکانی وارسۆی پایتەختیان وێرانکردووە. لەسەر زەوی شارەکە هیچ ئاسەواری کارگەو ساختمانێکی پیشەسازی گەورە نەماوە، ئوتێل و تەلارەکانی کە خەڵقی تێدا دەژیان، هەر هەموویان بەمین وێرانکراون و ئاگریان تێبەردراون، ئابوری شارەکە بە جارێك وێران و خاپورکراوە دەیەها هەزاران کەس کوژراون و لە ناویان بردوون و شاربەدەریان کردوون. شارەکە بەجارێك وێرانکراوە و مردووە..!!"

سەرکردایەتی ئەڵمانی(٦) فیرقەی ڕەوانەکرد بۆ ئەوەی بەر لە لێشاوی بەرەی یەکەمی بیلوڕووسیابگرن، بەڵام ئەو هێزانە پێش ئەوەی شوێنەکانی خۆیان بگرن وتیادا دابمەزرێن.

بەلێدانێکی گورچك برپشتیان شکاندن و هیوابراویان کردن لە هێشتنەوەی پۆڵندا لە ژێر دەستیاندا وە لە(٢٣ی کانونی دووەم)دا هێزەکانی سۆڤێتی دەستیانگرت بەسەر شاری(برومبرج) و پاشان لە(٢٥ی کانونی دووەم)دا دەستیان گرت بەسەر شاری(بۆ زنان)دا.

مارشاڵ زۆکۆف پەیوەندی بەستالینەوە کرد و لە سەرکەوتنی هێزەکانی ئاگاداری کردەوە، داوای ئیزنی لێکرد کە ڕێگای پێبدا با بەردەوام بێت لە هێرشەکەیدا تادەگاتە ڕووباری(ئۆدیر)، بەڵام ستالین ئاگاداری کردەوە کە هێزەکانی بەرەی دووەمی بیلوڕووسی هێشتا کارەکانیان جێبەجێ نەکردووە گەیشتنی بەرەی

یەکەمی بیلورووسیا بە تەنها بۆ ڕووباری(ئۆدیر) دەبێتە ئەوەی لە دوایدا لای باڵی ڕاستی ئەو چۆڵ بێت.

ئەم.. (ستالین) وای بەباش دەزانێت کە ئەو هێرش و بەرەوپێش چوونە، ماوەی دە ڕۆژ دوابخات هەتا هێزەکانی بەرەی دووەمیش بەتەواوی هێزەکانی دوژمن لە بڕووسیای خۆرهەڵاتدا پاك دەکەنەوە.. هێزو کۆمەڵانی خۆی لەلایەکی تری ڕووباری(فیسلۆ)دا جێگیردەکات.

لە ژێر فشار و پێداگرتنی مارشاڵ زۆکۆفدا.. پاش چەند ڕۆژێك ستالین ڕازی بوو لەگەڵ ئاگادارکردنەوەیدا کە پێویستە بیرێکی ڕاست و دروست بکاتەوە لە دڵنیابوونی لە باڵی ڕاستدا..

مارشاڵ زۆکۆف ددان بەوەدا دەنێت کە ستالین لەبۆچوونەکانیدا ڕاست و لەسەر حەق بوو، چونکە بەسەرهاتەکان ڕاستی و دروستی قسەو بیرەکانی ئەویان سەلماند.

ترس و خەتەری لە کاتی شەڕدا تادەهات زیادو گەورەتر دەبوو، بەڵام بەرە لە(١ی شوبات تا٤ی شوبات) توانی بگاتە ڕووبارەکەو لێی بپەڕێتەوە و لە ناوچەی(کۆستربمد)دا پردێك داگیر بکات، کە لەو ناوچەیەدا ئەو پردە ئەوپەڕی گرنگی هەبوو.. بەهۆی ئەو پەیوەندییانەوە کە بە سەرکردەی باڵاوە دەمکرد لەوە ئاگاداربووم کە هێزەکانی بەرەکانی دووەم و سێیەم و چوارەمی ئۆکرانیا لە کانوونی دووەمەوە هەتا ناوەڕاستی مانگی نیسان لە شەڕوپێکدادانێکی قورس و گراندابوون و لەو ماوەیەدا توانییان خاکی(مەجەڕ) و بەشێکی گەورەی وڵاتی چیکۆسلۆفاکیا لە هێزەکانی ئەڵمانیای فاشیست پاکبکەنەوە و توانییان بچنە ناو وڵاتی نەمساوەو(ڤیینا) ڕزگاربکەن و دریان بە دوژمن داو بەرەو ڕێگای هەرێمەکانی ناوەڕاستی چیکوسلوفاکیا کەوتنە ڕێ.

لەبەرەی خۆرئاواشدا هێزەکانی هاوپەیمانەکانمان لە مانگی شوبات و ئازاردا لە ڕووباری(ڕاین) پەڕینەوە و لە ناوچەی(رور)دا گەمارۆی هێزێکی گەورەی هێزەکانی ئەڵمانیایاندا.

و لــە(١٧ی نیساندا خۆیاندا بەدەست هاوپەیمانانەوە، لە ئەنجامی

پاككردنەوەی هێزە سەرەكییەكانی ئەڵمانیا لە بەرەی سۆڤیاتی- ئەڵمانیدا و لە ئەنجامی پەڕینەوەی هاوپەیمانان لە ڕووباری(ڕاین)دا ئەڵمانیا توانای بەردەوام بوونی جەنگی نەماو هەرچی كێشەیەك لەو بارەیەوە هەبوو گشتی حەلكراو كۆتایی پێهێنرا.

كۆتایی جەنگ نزیكبۆوەو پەیوەندییە سیاسییەكانمان لەگەڵ هاوپەیماناندا شێوازێكی توندو تیژیان بەخۆوە بینی. ئەمەش زۆر لە ڕێكەوتەوە دووربوو، ئەو هێواشی كارییەی لە جووڵانی سەركردایەتی ئەمریكی و ئینگلیزی دابوو، گۆڕرا بۆ خێراییەكی زۆربەپەلە. هەردوو حكومەتی ئەمریكاو بەریتانیا پەلەیان لە سەركردایەتی سەربازی هێزەكانی هاوپەیمان دەكرد، لە ئەورووپادا بۆ داگیركردنی هەرێمەكانی ناوەڕاستی ئەڵمانیا پەلەبكەن و خێرابن. پێش ئەوەی هێزەكانی سۆڤیاتی بتوانن بگەنە ئەوێ، لە(١ی نیسانی ساڵی١٩٤٥)دا چەرچڵ بۆ ڕۆزفلتی نووسی:"سوپای ڕووسیا بێشك هەموو خاكی نەمسا داگیردەكات و پاشان دەچێتە(ڤێنا)وە خۆئەگەر(بەرلین)یش داگیربكات.. ئایا لە دواییدا تەسەورناكەن و ناڵێن ئێمە لەو سەركەوتنە گشتیانەدا هاوكاری بەشی گەورەی ئەو سەركەوتنانەمان كردووە..؟"

ئەمە زۆر لەڕاستییەوە دووربوو ئایا ئەوە ئەوانە ناخاتە ناوچوارچێوەیەكی بیركردنەوەو لە ئایندەدا كێشەو دەردیسەرییەكی گەورە و جیدی بۆ ئێمە دروست بكات..؟ لەبەرئەوە من لە ڕووی سیاسییەوە وای بۆدەچم كە پێویستە ئێمە لە خۆرهەڵاتی ئەڵمانیاوە چەند دەتوانین بچینە ناو خاكی ئەڵمانیاوە خۆ ئەگەر شاری(بەرلین)یش لەمەودواو توانامان بوو بێشك دەبێت داگیری بكەین هەروەك لە دواییدا زانیم سەركردایەتی بەریتانیا و ژمارەیەك لە جەنەراڵە ئەمریكییەكان هەرچی ڕێو شوێنێكی پێویست هەبوو گرتبوویانە بەر بۆ ئەوەی شاری (بەرلین و ئەوزەوییانەی كەوتوونەتە باكوروباشورییەوە) داگیری بكەن..

---

# کوڕە بەدیل گیراوەکەی ستالین

لە(٧ی مانگی ئازاردا)بوو، لەسەرداواکردنێکی بەپەلەی سەرکردەی باڵا سەفەرمکرد بۆ مۆسکۆ، لە فڕۆکەخانەوە یەکسەر چووم بۆ(داتشا)کەی ستالین، لەوێدا ستالین تۆزێك تەندروستی باش نەبوو، دوای ئەوەی دەربارەی هەڵوێستی بەرە هەندێ پرسیاری لێکردم سەرکردەی باڵا.. وتی..

ـ دەی بابڕۆین تۆزێك پیاسەبکەین، من هەست بە بێتاقەتی و ماندووبوون دەکەم، بەگشتی لەسەروسیماو هەڵسوکەوت و قسەکانیدا دیاربوو زۆر ماندوو بێتاقەت بوو. ئەو چەند ساڵانەی جەنگ ستالینی تا ئەوپەری هیلاك کردبوو.

بەدرێژایی ساڵ و ڕۆژەکانی جەنگ لە بیرکردنەوەو دڵەڕاوکێیەکی گەورەو بەهێزدا دەژیا، زۆربەکەمی دەخەوت، بەدەست ناخۆشی تاڵی تێکشکاندنەکانەوە دەیناڵاند، بەتایبەت تێکشکاندنەکانی هەردوو ساڵی(١٩٤١ – ١٩٤٢).

بێگومان ئەوەش کاردانەوەی لەسەرمێشك و تەندروستی هەبوو. کتوپڕ لە کاتێکدا کە پیاسەمان دەکرد.. ستالین کەوتە باس و گێڕانەوەی منداڵی خۆی بۆم، باس و گێڕانەوەکەی نزیکەی سەعاتێکی خایاند..

پاشان پێی وتم..

ـ دەی بابڕۆین چا بخۆینەوە، چەند باسێکی تریش هەیە لەوێدا باس دەکەین.

لە ڕێگای گەڕانەوەماندا لێمپرسی..

ـ هاوڕێ ستالین دەمێکە دەمەوێت لێت بپرسم بزانم هەواڵی(یاکۆف)ی کوڕت چییە.. هیچ؟

هەواڵ و زانیارییەکت لەسەر ژیانی کوڕەکەت هەیە؟ گورج وەڵامی پرسیارەکەمی نەدایەوە، پاش ئەوەی ماوەی سەد هەنگاوێك ڕۆیشتین بە خەمباری و دەنگێکی گیراوەوە وتی.

ـ یاکۆف.. لەدیلی ڕزگاری نابێت ئەو خوێنڕێژانە هەردەیکوژن. بەپێی ئەو زانیارییانەی پێم گەیشتووە ئەوان لە بەندکراوەکانیان دوورخستۆتەوە، دەیانەوێت کاربکەنە سەری وای لێبکەن ناپاکی لە نیشتمان بکات.

پاش دەقیقەیەك بێدەنگی وتی..

ـ نا.. نەخێر.. یاکۆف زیاتر حەز بە مردن دەکات وەك لەوەی خیانەت لە نیشتمان بکاتـ هەستم کرد بۆ ئەوەی بەسەر کورەکەیدا هاتووە زۆردڵگران و خەمبارە لەسەر مێزی نان خواردنەکە دانیشت و ماوەیەکی زۆر بە خەمبارییەوە، بێدەنگ دانیشت بێ ئەوەی دەست بەرێت بۆ خواردنەکە، هەروەك ئەوەی لە مێشکیدا تاووتوێی شتێك بکات.. پاشان بە خەمبارییەوە وتی..

ـ ئای کە جەنگ دڵرەق و بێ بەزەییە.. چەندەها ژیانی خەڵقی لەناوبرد.. بڕواناکەم خانەوادەیەك هەبێت خۆشەویستێکی لێ نەکوژرابێت.. ستالین بۆ زۆکۆف باسی کۆنگرەی(باڵتا)و باسی ئەو ڕێزەی خۆی بۆکرد کە دەربارەی(ڕۆزفلت)ی هەیە باسی ئەو ڕێککەوتننامەیەی بەڕێوەبردنی ئەڵمانیای دوای خۆبەدەستەوەدانی بۆکرد.

باسی دابەشکردنی ئەڵمانیای بۆ چەند ناوچەیەکی دابەشکراوکرد و باسی ئەو هێڵانەی بۆکرد کە پێویستە هێزەکانی هاوپەیمان و هێزەکانی سۆڤیاتی تیادا بووەستن، باسی ئایندەو پاشەڕۆژی سنوری پۆڵندای بۆ کرد و باسی ئەو ناکۆکییە سەرەکییانەی کرد کە لەسەر پێکهێنانی حکومەتی داهاتووی پۆڵندا ڕوویداوە ستالین وتی..

ـ چەرچڵ نیازی وایە لەسەرسنووری یەکێتی سۆڤیاتی حکومەتێکی بۆرجەوازی پۆڵندایی نامۆ بە ئێمە دابمەزرێنێت. ئێمەش دەمانەوێت بەیەکجارەکی و بۆ هەتاهەتایە حکومەتێکی پۆڵندایی دۆست لە تەنیشتمانەوە بێت و گەلی پۆڵندەیش هەر ئەوەیان دەوێت.

لە کاتی قسەکردندا(بوسکریشیف)ی سکرتێری ستالین هاتەژوورەوەو هەندێ ئەوراقی خستە بەردەم ستالین.

سەرکردەی باڵا چاوێکی پیاخشاند و پاشان وتی..

ـ ئێستا بڕۆ بۆ ئەنجومەنی ئەرکان و لەگەڵیاندا حساباتی کاروچالاکی بەرلینیان لەگەڵدا بکە.. سبەینێ لێرەدا لە سەعات سیانزەدا یەکتر دەبینینەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی سەرکردەی باڵا بڕیاری لەسەر کاروچالاکی بەرلیندا.

# بەشی حەڤدە

کرداری چالاکی بەرلین
- گرنگی مێژوویی شەڕوپێکدادانی بەرلین - هاوپەیمانان ڕووباری ڕاین بێ بەرهەڵستیکردن دەگرن - لێدانێکی جەرگ بڕ لە دوژمن لەسەر ڕووباری ئۆدیردا - ئەو پلانە هێتلەرییەی کە بۆ ڕزگارکردنی بەرلین داڕێژرا -

جەنگ و پێکدادانی شاری بەرلین لە مێژوودا جێگای تایبەتی خۆی گرتووە.. بەسیفەتی ئەوەی ئەو جەنگە کردارێکی کۆتایی پێهێنانی جەنگی دووەمی جیهانی بوو لە ئەوروپادا بەوە گەیشتنە حەلکردنی ژمارەیەك کێشەو مەسائیلی سیاسی و سەربازی گرنگ کە(بۆ ماوەیەکی دوور) دەوری پێکهاتەی ئەڵمانیای دوای جەنگ لە ئەوروپادا دەستنیشان دەکرد.

هێزە چەکدارە سەربازییەکانی سۆڤیاتی لە خۆئامادەکردنیان بۆ کاروچالاکی سەرشاری بەرلین.. لە ئەنجامی ڕۆحێکی پاك و دڵسۆزییەوەبوو، بۆ ئەو ڕێکەوتننامەیەی کە لە نێوان هاوپەیمانان‌دا بەسترا. بۆ خۆبەدەستەوەدانی ئەڵمانیا بێ هیچ قەیدوشەرتێك لە بواری سەربازی و سیاسی و ئابورییەوە.

مەبەستی سەرەکی ئێمە لەو قۆناغەدا تەنها پاککردنەوەی یەکجارەکی فاشیشەکان بوو لە فەرمانڕەوایی کردنیان و لەسەرکارولادانیان لە حوکمڕانی کردنی ئەڵمانیادا. هەروەها تۆمەتبارکردنی هەموو تاوانبارە سەرەکییەکانی

نازییەکان و بەرپرسیارێتی تەواویان لەو خراپەکاری و تاوانانەو لە کۆمەڵ کوژی و وێرانکاری و ئەو زۆرداریيانەی لە وڵاتە داگیرکراوەکانی ژێردەستیاندا کردبوویان، بەتایبەت لە وڵاتی ئێمەدا کە زۆرێکی زۆر زوڵم و ناهەمواریيان بەدەستیانەوە چەشت.

بیرۆکەی کاروچالاکی داگیرکردنی(بەرلین) لە ناو سەرکردایەتی باڵادا لە(تشرینی دووەمی ساڵی١٩٤٤)دا سەری هەڵداو هێڵی کۆتایی پێهێنانی لە کاتی کرداروچالاکی(فیسلو – ئودیر) و(بروسیای خۆرهەڵات و بۆمیرانیا)دا دانرا، وە لە کاتی سازدانی پلانەکەدا هەوڵ و تێکۆشانی هێزەکانی هاوپەیمانان لە ئەوروپادا خرابووە پێشچاو.. کە لە مانگی (ئازار و نیسانی ساڵی ١٩٤٥)دا هاوپەیمانان توانییان بگەنە ڕووباری(ڕاین) لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆنگرەی(یاڵتا) دەستنیشانی شوێنی داگیرکردنەکانی سۆڤیاتی لە خۆرئاوای بەرلین و زیاتریش کردبوو، وە لەگەڵ ئەوەشدا کە هێزەکانی سۆڤێتی لەسەر هەردوو ڕووباری(ئودیر و نیسی) بوون(٦٠ تا ١٠٠) کیلومەتر لە بەرلینەوە دووربوون.

لەگەڵ ئەوانەشدا هێزەکانی بەریتانیا وازیان لەو خەونانەیان نەدەهێنا بۆ ئەوەی پێش لەشکری سووری سۆڤێتی بگەنە بەرلین و داگیری بکەن.

وە لەگەڵ ئەوەی لەسەر هێڵی ستراتیجی (دراین) قۆناغی کۆتایی جەنگ هیچ یەکێتی و ڕێککەوتنێك لە نێوان سەرکردە سیاسی و سەربازییەکانی بەریتانیا و ئەمریکادا نەبوو.

سەرۆکایەتی یەکگرتووی هێزە هاوپەیمانەکان لە ئەوروپادا.. ئارەزوومەندبوون و حەزیان دەکرد ئەگەر هەلیان بۆ برەخسێ بەرلین داگیربکەن.

وە لە(٧ی نیسانی ساڵی ١٩٤٥)دا لە کاتێکدا ئەو بڕیارەی خۆمانمان دەربارەی کرداری کۆتایی جەنگ بەسەرکردایەتی یەکگرتووی هاوپەیمانان ڕاگەیاند..

جەنەراڵ(دوایت ئەیزنهاوەر) وتی..

(ـ دوای گرتنی(لیبزغ) ئەگەر دەرکەوت ئێمە دەتوانین بەرلین داگیربکەین، من خۆم دەمەوێت ئەو کارە ئەنجام بدەم.. دوای ئەوە..

ـ من یەکەم کەسم کە کۆکم لەسەرئەوە کە جەنگ بۆ وەدەست هێنانی مەبەستی سیاسی دەکرێت.

خۆ ئەگەر سەرکردایەتی یەکگرتووی هاوپەیمانان هەوڵ و داگیرکردنی بەرلینیان لەسەر شانۆی سیاسی لە ئیعتبارە سەربازییە رووتەکان لە پێشترزانی.

ئەوا من بە هەموو خۆشی و ئارەزوویەکەوە پلان و رای خۆم بەشێوەیەك دەگۆرم زامنی جێبەجێکردنی ئەو کارە بکات.) یوسف ستالین دەیزانی و لەوە گەیشتبوو، سەرکردایەتی هیتلەرییەکان لەو کاتانەدا لە هەوڵ و چالاکییەکی گەورەو بەردەوامدابوون لە پێناوەی ئەوەی کە رێککەوتننامەیەکی(جودایی) سەربەخۆ لەگەڵ هەردوو حکومەتی ئەمریکی و بەریتانیادا سازبکەن.

وە ئەو بارە ناهەموار و هەناسە ساردییەی کە هێزەکانی ئەڵمانیای تێکەوتبوو، لەپێش چاویدابوو، وە چاوەروانی ئەوەی لێدەکردن کە هیتلەرییەکان لە خۆرئاواوە واز لە بەرگریکردن بهێنن و لەبەردەم هێزەکانی ئەمریکا و ئینگلیزیدا رێگا بۆ داگیرکردنی بەرلین بکەنەوە، بۆ ئەوەی تەسلیمی سوپای سووری سۆڤێتی نەکەن.

## چۆن هێزەکانی ئەمریکی و بەریتانیاییەکان چوونە ناوچەی(ڕاین)ەوە..؟

ئاشکرابوو هیتلەرییەکان بەربەستێکی بەهێزیان لە هەرێمەکەدا نەبوو تا پارێزگاری لێ بکەن، بەڵام ئەڵمانییەکان دەیانتوانی بکشێنەوە بۆ دوای ڕاین و لەوێدا بەرگرییەکی بەهێز پێکبهێنن، بەڵام ئەوەیان نەکرد چونکە هێزە سەرەکییەکانیان لە خۆرهەڵاتدا لەبەرامبەر سوپای سووری سۆڤێتیدا بوون.

لەسەرەتای دەستپێکردنی هێرشە ئەمریکی، بەریتانییەکەدا، هێزەکانی ئەڵمانیا لە خۆرئاوادا(٦٠) فیرقەی بێهێز بوون کە هاوسەنگی **٢٦** فیرقەی تەواوی دەکرد، ڕووبەڕووی(٨٠) فیرقەی تەواو ڕاوەستابوون، کە لەناو ئەو (٨٠) فیرقانەدا(٢٣) فیرقەی دەبابەی تێدابوو، هەروەها دەربارەی هێزی ئاسمانیش، هێزەکانی هاوپەیمانان لەولایەنەشەوە لەوان زۆر زاڵتر و بەهێزتربوون، ئەمەش وایکرد کە پەڕینەوە لە ڕاین کارێکی سووك و ئاسان بێت.

هەتا دەتوانین بڵێین لە ڕاستیدا بەبێ بەرگری و بێ هیچ بەرهەڵستییەك دەستیان بەسەر(ڕاین)دا گرت.

---

## پێشبڕکێکردن بەرەو بەرلین

لەو چاوپێکەوتنە زۆرانەی دوای جەنگ کە لەگەڵ ژمارەیەك جەنەڕاڵی ئەمریکی و بەریتانیدا کرا.. لەوانە (ئەیزنهاوەر و مۆنتۆگومری و ڕۆبرتسون و سیمس)، دەرکەوت مەسەلەی دەست بەسەرداگرتنی هاوپەیمانان بەسەر شاری(بەرلین)دا تەنها چاوپۆشی بوو.. پاش ئەوەی کە هێزەکانی سۆڤیاتی ئەو لێدانە قورس

و بەهێزەیان بە تۆپ و تەیارە و دەبابە و بەهێزی پیادە سرەواندە(ئودیر و نیس) و لە ئەنجامدا بەرگری هێزەکانی ئەڵمانیایان لە بناغەوە تێکوپێکداو هەڵیانوەشاندن.

کاتێك سەرکردایەتی باڵا ئاگاداریییەکی لە جەنەراڵ ئەیزنهاوەرەوە پێگەیشت و لەو بریارە ئاگاداری کردەوە کە دوو لێدان لە باکوری خۆرهەڵات و باشوری ئەڵمانیاوە دەسرەوێنرێتە هێزەکانی ئەڵمانی و لەو بریارە کە هێزەکانی ئەمریکا نیازیان وایە لەسەر ئەو هێڵەی کە بەرەو بەرلین لەسەری رێکەوتوون رابووەستێت.

ستالین جەنەراڵ ئەیزنهاوەری بەراستگۆ وەسف کرد لە گوێرایەڵی ئەو بریارەی کە خستبوویە سەرشانی خۆی، بەڵام لە دوایدا دەرکەوت ئەو بریارە بریارێکی پێش وەخت بوو. لە(٢٩ی کانوونی دووەم)دا لەبەرئەوە ستالین بانگهێشتی کردنم بۆلای خۆی و لە نووسینگەکەیدا لە کرملین بە تەنها چاوپێکەوتنم لەگەڵدا کرد.

هەروەك پیشەی خۆی بەبێدەنگی دەستی بۆ درێژکردم هەروەك ئەوەی لە قسەکردنیدا بەردەوام بێت.. .......... -بەوەی ئەڵمانی لە خۆرئاوادا بە تەواوی هەرەسی هێنا و رووخا ئەڵمانەکان وەك دەردەکەوێت هیچ نیازێکیان نییە لە بەرامبەر لێشاوی هێرشی هێزەکانی هاوپەیمانانندا هیچ جۆرە بەرگرییەك بکەن و رایانگرن و لە هەمان کاتیشدا بەرگری خۆیان لە هەموولایەکەوە لە بەرامبەر هێزەکانی ئێمەدا توندوتۆڵ دەکەن..

ـ من لەو باوەڕەدام ئەو جەنگ و پێکدادانە شەڕێکی یەکجار قورس و گەرم بێت.

ستالین دەربارەی هەڵسەنگاندنی دوژمن لەلای بەرلینەوە پرسیاری لێکردم ... و دەربارەی کاتی چالاکییەکە لێیپرسیم :

- منیش پێم راگەیاند کە بەرەی یەکەمی بیلورووسیا و بەرەی یەکەمی ئۆکرانیا دەتوانن لە ماوەی دووهەفتەی تردا کاروچالاکییەکە ئەنجام بدەن، بەڵام بەرەی دووەمی بیلورووسیا هەتا ناوەراستی مانگی نیسان دوا دەکەوێت.

پاشان ستالین نامەی کەسێکی خێرخوازی پیشاندام... لە نامەکەدا ئەوکەسەی نامەکەی بۆ ناردبوو باسی ئەوە دەکات کە لەپشت پەردەوە پەیوەندی

لە نێوان کارمەندانی هیتلەرو لە نێوان نوێنەرانی فەرمی هاوپەیمانانداندا هەیە، لەو پەیوەندی و چاوپێکەوتنانەیاندا ئەڵمانەکان ئەوەیان داوالێکردوون کە گرێ بەستێکی ڕێکەوتنیان لەگەڵدا ببەستن و ئەوانیش بەرامبەر ئەوە هەموو خەبات و چالاکییەکی خۆیان دژ بەوان ڕادەگرن.

لە نامەکەدا ئەوەش هاتبوو لەگەڵ ئەوەی کە هاوپەیمانان بەوە ڕازی نەبوون و پشتگوێیان خستبوو، ئەڵمانەکان هەر ڕێگای بەرلین لەبەردەم هاوپەیمانانداندا دەکەنەوە.

ـ ستالین وتی.. "بیروڕای تۆ دەربارەی ئەوەچییە؟"

ستالین ماوەی ئەوەی نەدام تا وەڵامی بدەمەوە..

خۆی وەڵامی دایەوە وتی..

ـ وابزانم ڕۆزفلت لە ڕێککەوتننامەکە پاشگەزنابێتەوە، بەڵام چەرچڵ هەمووشتێکی لەدەست دێت..

لەسەرەتای مانگی(نیسانی١٩٤٥)دا.. فەرمانی دەست بەکاربوونی هەرسێ بەرەکەی بۆ کاروچالاکی هێرشی سەر بەرلین ئیمزا کرد.

"من بەدرێژایی جەنگ هاوبەشی هێرشکردنی گەورەی زۆرم کردووە، بەڵام هیچ یەکێك لەو هێرشانە نەدەگەیشتە هێرشی سەرشاری بەرلین، هێرشی سەرشاری بەرلین جیاوازییەکی زۆر زیاتری هەبوو.

لە مێشکی خۆمدا شەڕوپێکدادانی سەرشاری مۆسکۆم هێنایەوە پێش چاوی خۆم و سەرنجی هەڵەکانی هەردوو لامدا.. ویستم سوود لەو هەڵانە وەربگرم.

چونکە دەمزانی شەڕوپێکدادانی بەرلین لەوپەڕی توندوتیژی و دڕندانەیدا دەبێت. لەوبیرکردنەوەوتێڕوانینەمدا بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێت چی بکەین ببێتە کارێکی کتوپڕی و هێزو توانای بەرگری دوژمن شپرزەکات و لەکاریان بخات.

لێرەدا بیرۆکەی هێرشی شەوانەم لەژێر تیشکی ڕووناکایی ئاشکراکەرەکان(کشاف) کە بەشەو بە ئاسماندا هەڵدەدرێن بە بیرداهات.. هەردوای ئەوە لەسەر ئەوە دەستکرا بە مەشق و ڕاهێنانی سەربازەکان.. ئەوەبووە جێگای ڕەزامەندی

سەربازەکان."

لە (١٤ نیسان)دا هیتلەر لە بانگەوازێکیدا کە بۆ گەلی ئەڵمانی بڵاوکردەوە.. وتی "ئێمە چاوەڕوانی ئەو چالاکی و لێدانەی دوژمنمان کردبوو، بۆ ئەو مەبەستە لە بەرامبەریاندا بەرەیەکی بەهێزمان کۆکردۆتەوە... بە ئاگربارانی تۆپەکانمان.. بەوپەڕی توندوتیژییەوە پێشوازی دوژمنانمان دەکەین.. بەرلین هەردەبێت وەك خۆی بەبەرلینی ئەڵمانیا بمێنێتەوە".

---

## قایمکاری شاری بەرلین

دەربارەی لایەنی ستراتیژی ئەو ڕێگاوبانانەی کە بەرەو شاری بەرلین دەچوون خرابوونە ژێر دەستەڵاتی هێز و گروپەکانی (فیسلو)ی فاشیستییەوە.

کە ڕێگاکانی لای خۆرهەڵات و باکوری خۆرئاوای ڕێگای بەرلینی دەپاراست و گروپی (ناوەڕاست) کە سکۆفیاو ناوچە پیشەسازییەکانی چیکۆسلۆڤاکیایان لەلای باکوری خۆرهەڵاتەوە دەپاراست و گروپی باشوور کە نەمساو ڕێڕەوەکانی باشووری خۆرئاوای چیکۆسلۆفاکیایان دەپاراست.

بەڵام ڕێگای سەرەکی بۆ ناو بەرلین پارێزگاریکردنی خرابووە ژێر دەستەڵاتی (هملر) و جەنەراڵەکانی (جستابۆ)وە، پاشان و لەکاتی لێپرسینەوەو لێکۆڵینەوە لەگەڵ سەرۆکی تۆڕی کارەکانی سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانیادا جەنەراڵ (کیتل) وتی..

"بەمەبەستی پشگیری و بەهێزکردنی بەرەی خۆرهەڵات پێش هێرشە رووسییە یەکلایی کەرەوەکە.. ناچاربووین هەرچی سوپایەکی یەدەکی هەبوو بنێرین بۆ یارمەتی و شەڕکردن.. واتە هەرهەموو یەکەکانی تۆپخانە و پیادەو دەبابەو هێزە تایبەتییەکان و دانیشگا سەربازییەکان" سوپای نۆیەم لە ژێر سەرکردایەتی

جەنەراڵ(بووس)دا بە هەموو کەس و پێداویستی سەربازییەوە بۆ پاراستنی شارەکە هاوکاری کرا..

لەپشت ئەوانیشەوە چەند فیرقەو چەند لیوایەکی نوێ پێکهێنرا. سەرکردایەتی ئەڵمانی بەدەبابەو مووشەکی ساروخی بۆ بەرگریکردن و بەهێزکردنی شار کۆمەك و گرنگی تایبەتی پێدا. لە ڕووباری(ئۆدیر)ەوە هەتا بەرلین تۆڕێکی بەرگری یەکجار بەهێزیان دامەزراندبوو.

ئەوتۆرە لە چەند هێڵێکی بەرگری یەك لەدوای یەك پێکهاتبوون لەسەر هەر هێڵێك لەو هێڵانە زنجیرەیەك سەنگەری یەك لەتەنیشت یەکەوەو بەڕیزی یەك لە دوای یەك کە ژمارەیان پێنج ڕیز، پێنج ڕیزبوون دامەزراندبوو، هەروەها دوژمن هەرچی شوێنە سروشتییەکانیش هەبوو وەك ڕووبارو دەریاچەو نۆکەند و دۆڵەکانیشی بەکارهێنابوو..

لەناوشاریشدا گەڕەك و ماڵەکانیشی کردبووە سەنگەر و بەشێوەی بازنەیی بۆ بەرگریکردن ئامادەی کردبوون.

وە لە ناوچەی باکوری خۆرهەڵاتی شارەکەوە گروپی سوپای(شتینیر)ی لێبوو کە لێدان و بەرەنگاربوونەوەی باڵی بەرەی یەکەمی بیلوڕووسی پێسپێردرابوو. ئەم گروپە بەیەکەکانی پیادەی کەشتیگەلی پشتگیری کرابوو لەسەر ئەوانەشەوە(کاری تایبەت) بۆ بەرگریکردن لە بەرلین گیرابووەبەر، شارەکە کرابووە(٨) بەشی بەرگرییەوە و بەدەوی شارەکەدا دامەزرابوون.

بەشێکی تایبەتیش کە بەشی نۆیەم بوو، تایبەت بوو لە پاراستنی ناوشارەکە کەبینای فەرمانگە حکومییەکان و کۆشکی ئیمپراتۆری و جستابۆ و کۆشکی ڕایختاجی لێبوو، وە لەسەر سنوری شارەکە ڕاستەوخۆ سێ هێڵی بەرگری تیا دامەزرابوو.

ناوچەی بەرگری دەرەوەی شار..، بازنەی بەرگریکردنی دەرەوەی شار.. و بازنەی بەرگریکردنی ناوخۆیی شار.

لە شەقامەکانی ناوشاریشدا سەنگەرو بەربەستی گەورەو توندوتۆڵیان دامەزراندبوو.. وە بەربەستی دژە دەبابەیان دانابوو. دیواری کۆنکرێتی و شتی

تریشیان دروستکردبوو. ئەنجومەنی پارێزگارکردنیشیان بۆ پاراستن و بەرگریکردن لە بەرلین پێکهێنابوو.

ئەو ئەنجومەنە خەڵکانی شارەکەی فێردەکرد و سازی دەکردن بۆ شەڕی خوێناوی ناو شەقامەکان و شەڕکردنی ناوماڵ و خانووەکان و لەسەر زەوی و لەژێر زەمینەکاندا و خەڵکانی هەڵدەناو فێردەکردن کە تونێڵی میترۆکان بۆ شەڕکردن بەکاربهێنن هەتا وایلیهات هەموو شەقام و ماڵ و پردو باخچە گشتییەکان هەر هەموویان بوونە شوێن و سەنگەری شەڕکردن و پێکدادانی سەرانسەری.

بیست کەتیبەی هێزە تایبەتییەکانیان فێری شەڕکردنی ناو شەقامەکان کردبوو، وە هاوکاری و پشتگیریکردنی هێزەکانی بەرگریکردن لەشارەکەیان بە(٦٠٠) موشەکی دژە فڕۆکە کردبوو بۆ ئەوەی دژی دەبابەو سەربازە پیادەکان بەکاریان بهێنن، هەروەها تۆپی دەبابە لە کارکەوتووەکان و ساغەکانیشیان بەکاردەهێنا بۆ بەرهەڵستیکردن لە دەبابە. گەنج و لاوە هیتلەرییەکانیان لەسەرکاری خۆکوژی ڕاهێناو مەشقیان پێکردن.

بۆ پتەوکردن و شووراکردنی شاری بەرلین زیاد لە(٤٠٠) هەزار کەس هاوبەشییان کرد، هەرهەموو هێزەکانی پۆلیس و جستابۆیان بۆ بەرگریکردن ئامادەکرد.

(مونکیسە)ی سەرۆکی پاسەوانە تایبەتیەکانی هیتلەر سەرکردایەتی هێزە پارێزگارەکانی بەشی ناوجەرگەی شاری دەکرد. سەرکردایەتی فاشییەکان وایاندەزانی کە دەتوانن بەرگری و پارێزگاری لە بەرلین بکەن وەك چۆن ئێمە پارێزگاری و بەرگریمان لە مۆسکۆ کرد، بەڵام هەر هەموو حساب و ئەندێشەکانیان بە هەدەرچوو، سەرنەکەوتن و شکستیان هێنا، بەسەرهاتەکان بەجۆرێك گۆڕرا وایلێهات هیچ ماوەیەکمان بۆ نەمایەوە کە مەبەستی خۆمان لە دوژمن بشارینەوە.

هەتا نەشارەزاترین کەسیش لە زانیاری سەربازییەوە دەیزانی و هەستی بەوەکردبوو کە کلیلی داگیرکردنی بەرلین وابەسەر ڕووباری(ئۆدیر)ەوە، پەڕینەوە لە ڕووباری ئۆدیرمانای ڕێگا خۆشکەر و چوونە ناوەوەی شاری بەرلینە، (هەروەك لەو توێژینەوەیەدا کە لەگەڵ جەنەراڵ گۆدیلدا کرا دەرکەوت ئەنجومەی ئەرکان

هەستیان بەوەکردبوو، دەیانزانی ئایندەی بەرلین لەسەر ڕووباری(ئۆدیر)دا یەکلایی دەکرێتەوە جا لەبەرئەوە زۆرینەی هێزەکانی سوپای نۆیەم کە بەرگرییان لەشاری بەرلین دەکرد ڕەوانەی باکوری بەرلین کرا، بۆ خۆ ئامادەکردنیان کە دژەلێدانی خۆی ئاراستەی باڵی هێزەکانی مارشاڵ زۆکۆف بکات..)

وە لە کاتی ئامادەکاری هێرشەکەدا.. ئێمە بەباشی دەمانزانی کە ئەڵمانەکان دەیانزانی کە ئێمە دەست لە بەرلین دەوەشێنین، لەبەرئەوە سەرکردایەتی بەرە بە دوورودرێژی دەستیکرد بە لێکۆڵینەوەو وردەکاری هێرشەکە لە پێناوی ئەوەدا کە چالاکی و لێدانە سەربازییە چاوەڕوانکراوەکە لەوپەڕی کتوپڕیدا بێت، بریارماندا بەوپەڕی هێزو تواناوە و بەتوندی هەڵمەت بەرینە سەردوژمن و بەخێرایی لێدانێکی وایان لێدەین تا ناخیان بیانتۆقێنین و سەرسامیان بکەین.

ئەویش بەبەکارهێنانی هێرشی فرۆکە و تۆپ و دەبابەکانمان، بەڵام ئێمەش بۆ ئەم کارەمان پێویستمان بەهێزێکی گەورەو بێشوماری پێداویستی و هۆکارە جەنگییەکان هەیە.. کە لە نزیك شانۆی چالاکییەکەدا بەنەهێنی کۆیان بکەینەوە کە دوژمن پێی نەزانێت، وە ماوەی دوو ڕۆژ پێش دەست پێکردنی شەڕوپێکدانەکە لە ماوەی(١٤ و ١٥)ی نیساندا، (٣٢) کەتیبەی هێزە پیادەکانمان دەستیان کرد بە تەماشاکردن و تێڕوانین بۆ ئەوەی تۆری دابەشکردنی تەواوی ئاگری تۆپەکانی دوژمن دەستنیشان بکەن. هەروەها بۆ مەبەستی ئەوەش کە سەرنجی دوژمن ڕاکێشین کە گەورەترین و زۆرترین سەرباز و چەك و پێداویستییە جەنگییەکانیان بهێنە سەرهێڵی بەرەنگاربوونەوە.

بۆ ئەوەی لە کاتی بەرایی تۆپبارانی پێش هێرشەکەدا بتوانین گەورەترین و زۆرترین هێزیان لەناوبەرین.

---

# هێرش دەستپێکردن

هەڵمەتە مێژووییەکە بۆ سەر بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیای فاشیست دەستی پێکرد.. لە(٢١ی نیسان)دا یەکە سەربازییەکانی سوپای:

ـ (٢،٤،٤٧،٥) سنوری دەوروبەری شاری بەرلینیان بەزاند و تێپەڕین و چوونە ناو هەندێ بەشی شارەکەوە وە هەندێ لە یەکە سەربازییەکانیش گورج بەرەو ڕووباری(ئەلبا)کشان، کە شوێنی بەیەکگەیشتن بوو لەگەڵ هاوپەیمانانداوە لە(٢٣-٢٤)ی نیساندا هێزەکانی بەرەی یەکەمی بیلورووسی لەو ڕێگاو دەروازانەی دەچوونە ناوجەرگەی شارەوە هێزەکانی دوژمنیان تێکشکاند.

وە لە(٢٥ نیسان)دا یەکە سەربازییەکانی بەرەی یەکەمی بیلورووسیا لەبەشی خۆرئاوای شاری بەرلیندا بەیەکە سەربازییەکانی بەرەی یەکەمی ئۆکرانیا گەیشتنەوە. ئەو هێزانەی بەرگرییان لە شاری بەرلین دەکرد کە ژمارەیان(٤٠٠) هەزار کەسبوو بوون بە دوو بەشەوە. لەناوشاری بەرلیندا شەڕوپێکدادان بەچاکی بەڕێوەدەچوو. دیاربوو بەرگریکردن لەناو شارەکەدا لە کاتی سنووربەزاندنی شارەکەدا زۆر بێ هێزببوو، چونکە سەرکردایەتی ئەڵمانییەکان هەندێ یەکەی تۆپخانەکانی کشاندبۆوە بۆ هاوکاری و پشتگیری کردنی ئەو هێزانەی لە گردودۆڵەکانی دەوری شاردا دامەزرابوون، بەڵام هەتا لە ناوجەرگەی شار نزیك دەبووینەوە شەڕو بەرگریکردن زیاتر گەرم و قورستردەبوو.

هەردوولا زۆر بەرق و توندوتیژی و دڕندانەییەوە شەڕیان دەکرد. بێگومان ئەڵمانییەکان شارەزای شارەکەبوون و سوودیان لەو شارەزاییە بینی و بە فرسەتیان زانی. لە ماڵ و تەلارە بەرزەکانەوە ڕووی چەکەکانیان دەکردە هێرشبەرەکان و ئاگربارانیان دەکردن، هەروەها خۆیان دەکرد بەژێرزەمینەکان و تونێلەکانداو بەژێرزەویدا.. لە گەڕەکێکەوە بۆ گەڕەکێکی تردەچوون کتوپڕ لەپشت هێرش بەرانەوە دەردەکەوتن و زەربەی خۆیان دەوەشاند.

ڕووباری(شبریە) شارەکەی کردبوو بە دووبەشەوە، کۆشك و تەلاری وەزارەتەکانی دەپاراست. زۆرجاریش کەتیبەیەك بەتەواوی هەرهەموویان بەرگرییان لە تەنها

ماڵێك دەكرد.

ئێمەش بە دوورودرێژی و بەوردی بۆ هەر لەشكرێك لێپرسیارێتی هێرشكردنی بەشێك لە بەشەكانی شارمان پێسپاردبوون، لەگەڵ ئەوەشدا شەڕ لەوەدەچوو كە لەخۆوە ئەنجام دەدرێت و بێسەروبەرەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا وانەبوو.. شەڕكردن لە نێوان هەردوولادا بەپێی بەرنامە، پلانی بەرگری و هێرشكردنی بۆ دانرابوو مەبەستی ئێمە لەشەڕی ناوشەقامەكان بۆ ئەوەبوو كە نەهێڵین دوژمن بتوانێت هێزەكانی خۆی كۆكاتەوە و سەرلەنوێ بۆ شەڕ ئامادەیان بكاتەوە.

لە(٢١ی مانگەوە تا ٢ی ئایار) ژمارەی ئەو گوللە تۆپانەی نران بەشاری بەرلینەوە گەیشتە (٢) ملیۆن و(٨٠٠) هەزار گولە تۆپ و بەرگریكردنی بەرلین تێكشكێنرا مارشاڵ(كیتل) لە كاتی لێپرسینەوە لەگەڵیدا وتی..

"ئاشكرابوو بەرلین هــەرەس دێنێت.. ئەگەر هەرهەموو هێزەكانی سەرڕووباری(ئەلبا) نەكشێنینەوەو نەیانبەین بەهانای شارەكەوە..

پاش ئەوەی هیتلەر كۆبوونەوەی لەگەڵ (من و غۆبڵز و جودیل)دا كرد بڕیاریدا سوپای دوانزە كە لەبەرامبەر هێزی ئەمریكییەكاندا بوو.. لە شوێنەكانیاوە بكشێنەوە و بیانهێنن بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو ڕووسانەی هێرشیان كردۆتەسەر شاری بەرلین و چەند یەكەیەكی سەربازی وەك ڕەمزێك لە شوێنەكەیاندا بهێڵنەوە"

گودیل وتی..

"غۆبڵز لێیپرسیم.. ئایا بەشێوازی سەربازی دەتوانرێت نەهێڵرێت بەرلین هەرەس بهێنێت و داگیرنەكرێت؟"

وەڵامدایەوە..

ئەشێت ئەگەر سوپای دوانزە بكشێنینەوەو بەرهەڵستی ڕووسەكانیان پێبكەین.

غۆبڵز ئیشارەتی پێدام كە ئەم پێشنیارە بە فۆهرەر ڕابگەیەنم..

فۆهرەر ڕەزامەندی لەسەر ئەوە پیشاندا و فەرمانی بە من و (كیتڵ)دا لە بەرلین بچینە دەرەوە و سەركردایەتی ئەو دژە هێرشەبكەین..

سەرکردەی سەربازگەکانی بەرلین.. وتی..

"هیتلەر پێیووتم لە (٢٥ی نیسان)دا بارودۆخ چاك دەبێت..!!، وا سوپای نۆ لە بەرلین نزیك دەبنەوە و بەهاوکاری سوپای دووانزە، دەست لە دوژمن دەوەشێنن و پێکەوە لێیدەدەن.

ئەم لێدانە لە باشوورەوە دەبێت و پاشان هێزەکانی(شتینێر)یش لە باکورەوە لێیان دەدەن.."

ئەم هەموو پلانانە لای هیتلەر و یاریدەدەرەکانی تەنها خەون و خەیاڵبوون. تواناییان بەسەر بیروهۆشی خۆیاندا نەمابوو..

---

## بەشی هەژدە

خۆبەدەستەوەدانی ئەڵمانیای فاشیست بێ هیچ مەرجێک

- لەپێناوی ڕێککەوتندا جەنەڕاڵ(کریبس) داوای دانووسان دەکات.
- ساتە مێژوویيە گرنگ و یەکلایی کەرەوەکانی خۆبەدەستەوەدانی ئەڵمانیای هیتلەری.

جەنگ کۆتایی هات، نۆبەی ساڕێژکردنی برینەکانە.

لە کاتژمێری چواری ڕۆژی یەکی ئایاردا جەنەڕاڵ(تشۆکۆف) پێیڕاگەیاندم کە سەرۆك ئەرکانی جەنگی هێزە پیادەکانی ئەڵمانیا جەنەڕاڵ(کریبس) هاتووە بۆ سەرکردایەتییەکەی داوای دانووسان و ڕێککەوتن دەکات و جەنەڕاڵ کریبس دەڵێت هیتلەر لە ڕۆژی(٣٠ی نیسان) و لە کاتژمێری (١٥,٥٠) دەقیقەدا خۆی کوشت و لەگەڵ خۆیدا نامەیەکی(غۆبلز)ی هێناوە لە نامەکەیدا(غوبلز) دەڵێت..

"بەپێی وەسیەتی(فۆهرەر)ی کۆچکردوو بەجەنەڕاڵ(کریبس)ی ڕاگەیاندووە کە بەسەرۆکی گەلی سۆڤیاتی ڕابگەیەنێت کە(فۆهرەر) بەدەستی خۆی لە

کاتژمێری(١٥,٥٠) دەقیقەدا لە ڕۆژی(٣٠ی نیسان)دا خۆی کوشت و داوای لە بورمان کردووە پەیوەندی بەسەرۆکی سۆڤیاتییەوە بکات.

ئەم پەیوەندییە زۆر پێویستە لە پێناو سازدانی دانووسانی ئاشتیدا لە نێوان ئەو دەوڵەتانەی لە جەنگدا گەورەترین زەرەریان لێکەوتووە.

ئیمزا: غۆبلز"



وەسییەتنامەکەی هیتلەر لەگەڵ نامەکەی غۆبڵزدابوو. هەر خێرا پەیوەندیم بەسەرکردەی باڵاوەکرد..

سەرۆك ئەوکاتە نوستبوو لەخەو هەستا و لە ڕووداوەکە ئاگادارم کرد و داوام لێکرد دوای ئەوە فەرمانی بەچییە؟

وتی..

- ئەو ناپاکە گەمەکەی دۆڕاند.. بەداخەوە کە بە زیندوویی نەمانگرت..
- لاشەکەی هیتلەر لە کوێیە..؟
- جەنەراڵ کریبس دەڵێت لاشەکەی سووتێنراوە..
- هیچ دانووسانێك نە لەگەڵ کریبس و نە لەگەڵ غەیری ئەویشدا ناکرێت.

هیچ شتێك ناکرێت جگە لەخۆ بەدەستەوەدانیان نەبێت بێ هیچ قەیدوشەرتێك.

کاتێك سەرکردایەتی سۆڤیاتی بیروڕای خۆیان بە(غۆبڵز) ڕاگەیاند.. بۆ ڕۆژی دوایی(غۆبڵز)وەڵامیدایەوە..

کە بەهیچ جۆرێك بێ قەیدوشەرت خۆیان نادەن بەدەستەوە. هێزەکانی سۆڤیاتیش لە وەڵامدانەوەی ئەو وەڵامەیاندا زۆر بە توندوچڕوپڕییەوە، بۆمب بارانێکی قورسی بێ وێنەیان کردن.

لە کاتژمێری(١٥,٠٠)ی ڕۆژی(٢ی ئایار)دا، دوا قەڵاو سەنگەری دوژمن لەبەرلیندا پاککرایەوە. پاشماوەی هێزەکانی بەرلین هەرهەموویان بە کۆمەڵ خۆیاندابەدەستەوە، کە ژمارەیان زیاد لە(٧٠) هەزار سەربازدەبوون.

دیاربوو زۆربەی ئەوانەی لە شەڕەکاندا شەڕیانکردبوو لە دوا ڕۆژەکاندا هەڵاتنیان پێ باشتربووە و ڕایانکردبوو پاش دەست بەسەرداگرتنی بارەگای ئیمپراتۆرییەت لەگەڵ جەنەراڵ(برزارین)ی یەکەم قوماندانی بەرلین داگیرکراو جەنەراڵ(بۆکۆف) هەندێکی ترداچووین بۆ سەردان و چاوپێکەوتنی ئـەوێ.. لەکاتێکدا کە دەمانویست کۆشکی ئیمپراتۆری جێبهێڵین پێیان وتین لە ژێرزەمینەکەدا لاشەی شەش منداڵەکەی غۆبلزمان دۆزیوەتەوە.

من خۆم ددان بەوەدا دەنێم غیرەتی ئەوەم نەبوو بچم بە چاوی خۆم لاشەی ئەو

شەش منداڵە ببینم کە بەدەستی دایك و باوکی خۆیان کوژرابوون، سەربازەکانیش لە نزیك ژێر زەمینەکەوە هەردوو لاشەی غۆبلزو ژنەکەیان دۆزییەوە.

بۆ دڵنیایی لە کەسایەتی هەردوو خۆکوژەکە دوکتۆر(فریتش)ی جێگری وەزیری پڕوپاگاندەی نازییەکان(جێگری غۆبلز) بانگکرا بۆ دڵنیایی و ڕاستی ئەو کەسانە. ئەویش جەختی لەسەر ڕاستی ئەوانە کردەوە.

من لە سەرەتادا گومانم وابوو کە هیتلەر و بۆرمان ڕەنگە ڕایان کردبێت و خۆیان شاردبێتەوە، بەڵام دوای ئەو لێکۆڵینەوەیە شك و گومانم نەما و بۆ خۆکۆشتنی هیتلەریش هیچ شك و گومانێکی تێدانییە.

سەرکردەوکارمەندە فاشییەکانیش وەك حاڵی قومارچییەك هیوایان بەو(وەرەقە خۆشبەختی)یە مابوو کە لە ژێر پەردەی حکومەتەکەی(دیونستی)دا.

"ئەو حکومەتەی کە هیتلەر دوای خۆی حوکمی دایە دەست" بێنە ناو بەرلینەوە بۆ ئەوەی دانووسانی تایبەت بەخۆبەدەستەوەدان بکات و هەتا کۆتایی لە ژێر ئەو پەردەیەدا ئەملاوئەولایان دەکرد.

لە(٧ی ئایار)دا سەرکردەی باڵا پەیوەندی پێوەکردم و پێیووتم..."ئەمڕۆ لە شاری(ڕایمس)دا ئەڵمانییەکان بەڵگەنامەی خۆبەدەستەوەدانی بێ قەیدوشەرتیان لەگەڵ هاوپەیماناندا ئیمزا کردووە، گەلی سۆڤیاتی لە جەنگدا گەورەترین قوربانی داوە نەك هاوپەیمانان..

جا لەبەرئەوە پێویستە بەڵگەنامەی خۆبەدەستەوەدان بە ئامادەبوونی سەرکردایەتی گشتی هەموو ئەو دەوڵەتانەی دژی هیتلەربوون ئیمزابکرێت، نەك بە تەنها بە ئامادەبوونی سەرکردایەتی هێزی هاوپەیمانان هەروەها من ڕازی نیم بەڵگەنامەی خۆبەدەستەوەدان جگە لەناو بەرلینی ناوەندی دوژمنایەتی فاشیستەکان زیاتر لە هیچ شوێنێکی تردا ئیمزابکرێت.

من لەگەڵ هاوپەیماناندا ڕێککەوتووم کە ئەو ئیمزاکردنی پێشترە، ئیمزاکردنێکی مەبدەئی بێت. پاشان سبەینێ(سەرکردایەتی ئەڵمانییەکان و سەرکردایەتی هێزەکانی هاوپەیمانان دەچن بۆ بەرلین"بۆ ئیمزاکردنی بەڵگەنامەی خۆبەدەستەوەدان، تۆ...(مارشاڵ زۆکۆف) دانراویت بە نوێنەری سەرکردایەتی

بالاَی هێزەکانی سۆڤیاتی"

له نیوەڕۆی(٨ی ئایار)دا نوێنەرانی دەوڵەته هاوپەیمانەکان گەیشتنه فرۆکەخانەی..(تیمبلجۆف)، مارشاڵ(جوئارسرتیدر) نوێنەری بەریتانیا و جەنەراڵ(سباتس)ی سەرکردەی هێزه ئاسمانییه ستراتیجییەکانی ئەمریکا نوێنەری وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکابوو، وه جەنەراڵ(دیلاتردی تاسینیه) نوێنەری فەرەنسابوو له فرۆکەخانەدا جێگری جەنەراڵ سوکولوفسکی و قومندانی بەرلین جەنەراڵ(برزراین) و هەندێکی تر پێشوازیان لێکردن. له بەشی خۆرهەڵاتی شاری بەرلیندا و له بینایەکی دوو نهۆمی که لەپێشدا چێشتخانەی کۆلیجی قوتابیانی ئەندازیارێتی سەربازی بوو.. ئیمزای بەڵگەنامەی خۆبەدەستەوەدان ئیمزاکرا..

"من بەم وتانەم کۆبوونەوەکەم کردەوە.."

"ئێمه که نوێنەرانی سەرکردایەتی بالاَی هێزه چەکدارەکانی سۆڤێتی و سەرکردایەتی بالاَی هێزه چەکدارەکانی هاوپەیمانانین. ڕایدەگەیەنین که ئێمه ڕێ پێدراوین لەلایەن ئەو حکومەتانەی هاوپەیمانن له دژایەتیکردنی هیتلەرییەکاندا..

که ڕازیبین له بەخۆ بەدەستەوەدانی ئەڵمانیا بێ هیچ مەرجێك له سەرکردایەتی هێزه چەکدارەکانی ئەڵمانیا.. نوێنەرانی سەرکردایەتی ئەڵمانییەکان بانگبکەن بابێن بۆ ناو ئەم هۆڵه..."

هەرهەموو ئامادەبوان ڕوویان وەرچەرخاند بۆلای دەرگاکەوه بۆ ئەوەی هەرهەموو ئەو له خۆبایی بوونانه ببینن که به جیهانیان ڕادەگەیاند، دەتوانن و له توانایاندایه له ماوەی مانگونیوێك، ئەوپەری تا دوومانگ فەرەنسا و ئینگلتەره و ئەمریکا تێکبشکێنن و یەکێتی سۆڤێتی له ناوبەرن و تێکیبشکێنن جەنەراڵه ئەڵمانییەکان لەو شوێنانەی بۆیان دیاری کرابوو دانیشتن.. پاشان من ڕووی دەمم تێکردن و پێمووتن..

ـ ئایا بەڵگەنامەی خۆبەدەستەوەدانی بێ هیچ مەرجێکتان پێیه..؟

ئایا بەباشی لێکۆڵینەوه و تێڕوانینی تەواوی ئەو بەڵگەنامەیەتان کردووە..؟

مارشاڵ(کیتل) بەدەنگێکی نووساوەوه وەڵامیدایەوه..

ـ بەڵێ لێکۆڵینەوەو تێروانینمان کردووە .. ئامادەین بۆ ئیمزاکردن.

لە کاتژمێری چلوسێ دەقیقەی تەواوی نیوەشەوی ڕۆژی(٨) ئایاردا کۆتایی بە ئیمزاکردنی بەڵگەنامەکە هێنرا..

داوام لە نوێنەرانی سەرکردایەتی ئەڵمانییەکان کرد هۆڵی کۆبوونەوەکە جێ بهێڵن..

برگەی یەکەمی بەڵگەنامەکە بەم شێوەیە بوو..:

"ئێمە کەوا لە ژێـرەوە ئیمزامان کردووە بەسیفەتی ئەوەی نوێنەرانی سەرکردایەتی باڵای ئەڵمانین ڕازین بەخۆبەدەستەوەدانی هەموو هێزە چەکدارەکانمان کە لە وشکانی و دەریا و هێزی ئاسمانییەکاندایە.. هەروەها هەرهەموو ئەو هێزانەشی کە ئێستا لەسەرکردایەتی ئەڵمانییدایە، تەسلیمی سەرکردایەتی باڵای سوپای سوور، و لە هەمانکاتیشدا تەسلیمی سەرکردایەتی باڵای هاوپەیمانانیان بکەین."

ئاوا بەم شێوەیە کۆتایی بە جەنگی خوێناوی هێنراو وە بە تەواوی ئەڵمانیای فاشی و هاوپەیمانەکانی لەناوچوون و لە ناوەڕاستی مانگی ئایاری(١٩٤٥)دا ئەنجومەنی سەربازی بەرە بۆ کۆبوونەوەیەکی جەماوەری بانگەوازێکی بڵاوکردەوە. لەو کۆبوونەوەیەدا پێکهاتە میللییەکان و بەرپرسانی بەشی پیشەسازییەکان و ڕێگاوبان و تەندروستی و ڕۆشنبیری و زۆرێکی تر هاوبەشیان تێداکرد. لەو کۆبوونەوەیەدا گفتوگۆ لەسەر ئەو کێشەو مەسەلانە کرا کە پەیوەست بوون بە گەڕانەوەی ژیانی ئاسایی لە شارەکاندا لەو کۆبوونەوەیەدا..(ئەنستاس میکۆیان)ی جێگری سەرەك وەزیرانی سۆڤێتی و(والترا و لبرێخت) سکرتێری حیزبی شیوعی ئەڵمانی تێدابوو...

# ئەگەر... نەبوایە... سەرکەوتن نەدەبوو

مارشاڵ زۆکۆف لە کۆتایی بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت..: جەنگی گەورەی نیشتمانی(پێکدادانێکی سەربازی ترسناك بوو لە نێوان ئیشتراکییەت و فاشیستیەتدا و شەڕوپێکدادانێکی میللی گشتی بوو دژی دوژمنێکی چینایەتی شەڕخواز کە دەستدرێژی کردەسەر پیرۆزترین پیرۆزییەکانی گەلی سۆڤیاتی ئەویش دەستکەوتەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ئیشتراکی مەزن بوو.."

"ڕاستەوخۆ بێ پێچوپەنا دەڵێم، ئەگەر ئێمە حیزبێکی بەهێزی خاوەن جەماوەریمان نەبوایە و پەیڕەوپرۆگرامێکی ئیشتراکیمان نەبوایە ئەو سەرکەوتنە مەزنەمان بەدی نەدەهانی.. ئەو توانا مادی و ڕۆحیەتەی نیزامی ئیشتراکی سۆڤیاتییە بوو کە ماوەی دا(لە ماوەیەکی کەمدا) ڕێکوپێکی ژیانی وڵات، ڕێکبخرێتەوە بەشێوەیەك شان بەشانی ئەوەش شکستی و تێکشکان بە هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیای ئیمپریاڵی بگەیەنێت.)

"یەکێتی و تەبایی میللەتان و گەلانی ئیشتراکی..."

"لە ناو یەکێتی سۆڤیاتیدا زیاد لەسەد نەتەوەی تێدایە)[7] هێزو توانای ئێمەیان بەهێزترکرد و یەکێتی کرێکاران و جوتیاران و گەنجە ڕۆشنبیرەکانی لە دەوری دروشمی"هەمووشتێك لە پێناوی بەرەدا" و "هەمووشتێکیش لە پێناوی سەرکەوتندا" کۆکردەوە. وە لە ژێر کاریگەری شێوازی ژیانی سۆڤیاتی و ئەو کارە پەروەردەییە گەورانەی حیزبدا.. لە وڵاتماندا مرۆڤ پێگەیشت و بڕوای بەرەوای کێشەکەی هێناو لە ناخی دەروونییەوە هەستی بە لێپرسیارێتی خۆی کرد بەرامبەر پاشەڕۆژی نیشتمانە ئیشتراکییەکەی.. مارشاڵ زۆکۆف دەڵێت.. جەنگ بەو شێوەیە ترسناك نییە ئەگەر باش خۆتی بۆ ئامادەبکەیت و هەموو کەسێك لە کاتی جەنگدا لە پێناوی بەرگریکردن لە نیشتمان دەوری خۆی بزانێت. پاشان مارشاڵ زۆکۆف دێتە سەرباسی ئەو پێشکەوتنە زانیاریانەی سەردەمی نوێ

و ئەو هونەرو شێوازە نوێیانەی لە پێناوی پڕچەککردن و ڕێکخستنی سەربازیدا هاتوونەتە کایەوە و دەڵێت:

"ئێستا لە ملاولەولا هەندێ دەنگ بەرزدەبێتەوە، باس لەوەدەکەن کە ئێستا سەدەی جەنگی(دووگمە) هاتۆتە پێشەوە و لەو جۆرە جەنگانەشدا مرۆڤ دەورێکی لاوەکی و سانەوی هەیە.

ئەو بیروباوەڕە هەڵەیە لەگەڵ ئەو هەموو گرنگییەی کە چەکی ئەتۆمی و موشەکییەکان هەیانە.. هەردەم لەو بوارەدا ئینسان باڵادەستەو خاوەنی دەوری سەرەکییە. جەنگ هەر چەندە مەزەندەو شێوازی تەبیعەتێکی هەبێت هەر پێویستی بە جەماوەری میللی هەیە..

جا بۆ هاوکاریکردنی یەکسەری بێت لە خەباتی چەکداریدا یاخود بۆ وەبەرهێنانی داهاتی جەنگی بێت هەر مرۆڤ باڵادەستەو ناتوانرێت لە خەباتی چەکداریدا وازی لێبهێنرێت و پشتگوێ بخرێت، دوا وتەی مارشاڵ لە پەڕتووکە دوورو درێژەکەیدا..(بیرەوەری و سەرنجدان)دا دەڵێت:

- زۆرم بیرکردەوە کە بەچی کۆتایی بەبیرەوەرییەکانم بهێنم لە چەند وتەیەکی(لینین) زیاتر هیچی ترم بەباشترنەزانی کە دەڵێت:

"هەرگیز ناکرێت گەلێك لەناوببرێت کە زۆربەی زۆری کرێکاران و جوتیارانی ئەوگەلە هەست بەوەبکەن کە سەرکەوتنی ئەو کێشەیەی لە پێناویدا خەباتی بۆ دەکەن، هەلێك بۆ نەوەکانی دوای خۆیان دەرەخسێنێت کە سوود لە سامانی ڕۆشنبیری و بەری ڕەنجی مرۆڤایەتی وەردەگرن."

لێرەدا بیرەوەرییەکان کۆتایی پێدێت.



پەیکەری زۆکۆف لە مۆسکۆ

## پەراوێز:

* (شبیر) ماوەی بیست و یەك(٢١) ساڵ لە بەندیخانەی هاوپەیمانەکاندا بەندبووە، دوای بەربوونی لە بەندیخانە، لە ساڵی(١٩٦٥)دا ئەم بیرەوەرییانەی نووسیوە.

[١]. (دایك و باوکی.. مەبەستی زڕدایك و زڕباوکەکەیەتی) ش.ع

[٢]

[٣]. موتابچی: پێستە خۆشکەر.. دەباغچی.. ومووسێنیش دەگەیەنێت.

[٤]. کەمین: بۆسە

[٥]ـ لینگراد-لە بیرەوەرییەکەدا تەنها- لینگراد- نووسراوە نەك- لینگراد (ش. ع. وەرگێڕ).

[٦] جستابوو.. پیاوان و ئەنجومەنی موخابەراتی ئەڵمانی...

[٧] ئەو ساکەوابوو، بەڵام ئێستا تەنها(ڕووسیا) ماوەتەوەو ئەو گەلانەشی ئەم باسیان دەکات ئێستا گشتیان سەربەخۆن و خاوەن کیان و ئاڵای سەربەخۆی خۆیانن.. (ش.ع)